# شەش سال لەناو...

# ژنە وەحشیەکانی ئامازۆن

## بەرگی دووەم

نوسینی : مەنوچهێری مۆتیعی

و: زاهیر محەمەد رەشید

بەناوی خوای گەورە

پێشکەشە بە نڤاری تازە

**پێناسی کتێب**
ناوی کتێب: شەش ساڵ لە ناو ژنە وەحشیەکانی ئامازۆن
بابەت : بیرەوەری
بەرگی دووەم
نوسینی: مەنوچهێری مۆتیعی
وەرگێڕانی : زاهیر محەمەد رەشید
تایپ: سورکێو مستەفا عبدالله
نۆبەتی چاپ : چاپی سێەم ٢٠١٣
شوێنی چاپ : چاپەمەنیچوارچرا
تیراژ : ٢٠٠٠ دانە
نرخ: ٦٠٠٠ دینار
دیزاین و نەخشەسازی : کامیل محەمەد قادر
ژمارەی سپاردنی ( ٧٣٥) ساڵی ( ٢٠٠٦) ی پێدراوە

( ١٢ )

دڵم داکەوت چونکە تەنیا شتێك بیرم لێ نەکردبوویەوە ئەوەبوو کە بۆهۆزی ئامازۆن بگەڕێینەوە.

یوری وتی:

ئێمە بەهەڵەدا چووین، لە جیاتی ئەوەی لەهۆز دووربکەوینەوە، دوای راکردن لەناو وەحشیەکان لە ئامازۆن نزیك دەبووینەوە، بەهەرحاڵ ئێستا لئۆنا دێت....

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو کە تاقمێك لەژنانی ئامازۆن کە زۆربەیانم دەناسی، دەوریان گرتین. ئەمانە لە دەستەی لایەنگرانی لئۆنا بوون بەڵام لەناو ژنانی ئامازۆنیشدا تاقمێك لایەنگریان لە مووناك دەکرد.

بەهەرحاڵ ئەوان دەوریان گرتین، لەهەڵس و کەوتیان زانیم نایانەوێت بمانکوژن.

دیارنەبوو کام شوێنەی جەستەم زیاتر ئازارم دەدات. ئێستاش بەجوانی ناتوانم دیاری بکەم لەو رۆژە شوومەدا کوێی جەستەم یان کام یەك لە ئەندامەکانم زیاتر ئازاری بوو.

هەم ئازارم بو هەم نارەحەت بووم و کاتێك سەرم لە نووکی خەنجەرەکەی ئەوان دەبردە دواوە، بەشێکی جەستەم گیرۆدەی ئازار دەبوو، دەتوت ئەو ناوچەیان بە پیکێکی قورس کوتاوە.

ژنەکان بەدەورماندا سەمایان دەکرد، پیاوەکانیش سەمایان دەکردو هورایان دەکێشاو هەلهەلەیان لێ دەدا. دەتوت شەوی بوکێنی یەك یەکی ئەوانە و لەناخەوە شادمانی دەکەن.....

وەك پێشتر وتم لەگەڵ من و مووناك و یوریدا ئاشنابوون و لەبینینی ئەم دیمەنە نیگەران و خەمبار دەبوون بەڵام نەیاندەوێرا هاوکاریمان بکەن و نیشانیان دەدا بارودۆخی ئێستا لەگەڵ کۆندا زۆر جیاوازە و لئۆنا بەهێزەو فەرمانڕەوایی دەکات. یەك لە ژنان کە دەتوت دڵی لە من پرە و رەنگە لەوەی گوێم پێ نەداوە ئازارزی بوو، لێم نزیك بوویەوە و نووکی خەنجەرەکەی لەسەر بازووی بەستراوی من داناو هێواش هێواش بردیە ناو. نووکی خەنجەر لەکاتێکدا بزەیەکی شەیتانی لێوی ئەوی کردەوە لەبازووم

چەقی و بەکزانەوەیەکی کوشندە، هاتەدەر. دەتوت هەموو جەستەمیان ئاگرداوەو دەمسوتێنن. خوێن وەك جۆگەیەکی باریك لەبازووم هاتە خوار و ژنی ئامازەپێدراو بەشادمانی دەستی بە سەما کردن و شادی کردو لەو قەرەباڵغیەدا لەچاو ون بو.

بەشێوەیەك دەست و پێمیان بەستبوویەوە کەتوانای هیچ جووڵەیەکم نەبوو بەڵام بۆ ئەوەی شوێنی برینی خەنجەرەکە لەسەر بازووی خۆم ببینم، بەدژواری خۆم تەکان داو سەرم بۆ پێشەوە چەماندەوە.

تا ئەم کاتە بەدژواری بەری قاچم لەزەوی دەدا و بەهێزی تەنافەکان کەمنیان پێ بەستبوویەوە، قوورسایی منی رادەگرت بەڵام کاتێك سەرم بۆ پێشەوە خوارکردەوە، تازەو لەم کاتەدا بو ئازارێکی کوشندە لەڕانی راستم دا پەیابوو.

ئەی هاوار.....؟ دەتوت بە پیك پیایان کێشاوم و هەمو ئێسقانەکانمیان شکاندەوە بێ ئیرادە هاوارێکی جەرگ بڕ لەسینەم دەرچوو بەڵام دوای ئەوە ئازار لە قوڕگمدا قەتیس بوو.

نزیك بوو گیان بدەم و ئەوەی دەیڵێن گیان دێتە سەر لێو، ئەو رۆژە تێگەشتم و بەچاوی خۆم بینیم و بەجوانی هەستم پێکرد کەلە تاو ئازار گیانم هاتۆتە سەر لێو و تاچەند ساتێکی تر دەردەچێت. لە ئازاری زۆر، دڵۆپە گەورەکانی ئارەق لەسەر ناوچاوم دەرکەوت و بۆ ئەوەی لەئازارم کەم بکەمەوە، زەختم لەخۆم کرد تا بەری پێم بەرز بکەمەوە.

ئازار زیاتر بوو دووبارە قیژاندم. ئەم جارە یوری بەو هەموو نیگەرانیەی سەیری کردم و کەمنی لەوحاڵەدا بینی وتی:

کەم پەلەقاژێ بکە..... مەگەر نابینی قاچت شکاوە؟

چی....؟ قاچم شکاوە؟ لەکوێ؟ بۆچی؟ بۆ......؟ چی روویداوە......؟

ئەمانە هەمووی پرسیاربوون کە لەخۆمم دەکرد وەڵامم دەست نەدەکەوت. ئەگەر ئازار نەدەبوو لەیوریم دەپرسی و ئەویش وەڵامی دەدایەوە بەڵام ئەوەندە پەرێشان و شڵەژابووم کەوەك مار لەخۆم دەئاڵام و دەمناڵاند. لەم کاتەی من دەمناڵاند لەناکاو دەنگی کرپە کرپی تەپڵەکان بێدەنگ و دەنگە دەنگ و قەرباڵغیش کەم بوویەوە.

هیچ کات لە رۆژێکی قەرباڵغدا لەشەقامەکان بوون.... بۆنمونە یەکێك لە شەقامە قەرباڵغەکان لەکاتی کەرنەڤاڵێکدا بێنە بەرچاو... لەم کاتەدا کە دەنگە دەنگ و هەرا گەشتۆتە ترۆپك و گوێی ئاسمان کەڕ دەکات لەناکاو کەسێك گوێتان بگرێت و ببێتە

لەمپەڕ لەگەشتنی دەنگ بەئێوە......؟

گوومان کردنی ئەم حاڵەتە وەك ئەم حاڵەتەی من وابوو... لەوکاتەدا لەناکاو دەنگ کەم بوویەوە بەشێوەیەك هەستم کرد کەسێك گوێی گرتم.

بەو حاڵە زارو پەڕێشانە، بەو هەمو ئازارو ناڕەحەتیە وەك مار لەخۆم دەئالاّم و ئارەقم کردبوویەوە، سەرم بەرز کردەوەو سەیری دەرەوەم کرد.

وەحشیەکان لە ژن و پیاو، ڕێگەیان دەکردەوەو دەڕۆشتنە دواوە، سەرنجی ئەوان بۆلای یەکێکیتر راکێشرا و بەگشتی سەیری ئەویان دەکرد.

هێشتا تێنەگەشتبووم چی بووە بەڵام کە جوان ووردبوومەوە، بەو پەڕی سەرسوڕمانەوە لئۆنام بینی کە لەناوچەند کچێکی ئامازۆنی دێتە پێش.

لئۆنا بەرەو لای ئێمە دێت.....؟ بەڵێ ئەو بوو....... خۆی..... چەند جوان و دڵرفێن ببوو.

بەداخەوە منیان لەشوێنێکدا بەستبوویەوە کە مووناك پشت بەپشتی من کەمێك دواتر و نەمدەتوانی روخساری ئەو ببینم.

دەمویست کاریگەری دیداری ئەو رکەبەرە مەترسیدارە لەچاوی مووناکدا ببینم.

لئۆنا بەهەنگاوی هێواش بەرەو لای من هات و هەرچەندە نزیکتر دەبوویەوە لەخێرایی هەنگاوەکانی کەم دە بوویەوە.

بەقاچی شکاو، جەستەیەکی بریندار، بەو هەمو خوێنەی لەبرینی تازەی بازووم دەڕۆشت و لەئەنجامدا بەو هەموو لاوازی و ناتەوانیەی هەمبوو دەمویست زووتر لئۆنا لەبەرانبەرم دابنیشێت تا هەم جارێکیتر ئەو سینە بە سینەی خۆم ببینم و هەم ئەوەی بۆ رزگارکردنی خۆم و کەسانیتر قسەی لەگەڵدا بکەم.

ئایا لئۆنا بڕیار بەکوشتنی ئێمە گرتبوو، هەرچوارمانی دەکوشت...؟ لە لئۆنا بەو دڵە رەقەو ئەخلاقە تووڕە هیچ شتێك دوورنەبوو.

ساتەکان بەهێواشی تێدەپەڕی.

هەرچی لئۆنا و کچەکانی هاوڕێی لەمن نزیکتر دەبوونەوە، لێدانی دڵم توووند تر و بەپێچەوانە بێدەنگی و ئارامی زیاتر باڵی بەسەر ئەو ناوچە پڕ دەنگە دەنگەدا دەکێشا.

ئەوان ئاگاداربوون لەنێوان من و مووناك و لئۆنا چی گوزەراوە. هەموو دانیشتوان لە پەیوەندیەکانی پێشتری من و مووناك ئاگادار بوون.

ئەگەر لەنێوان خۆی و لئۆنا و من سەرۆکایەتی هۆزی دابەش کرد سەرۆکایەتی دا بە

لئۆنا تا چاو لەمن بپۆشێت.

راستیکەشی ئەوەبوو بەڵام لئۆنا تەماحی زۆری بوو و ئێستا کە دەسەلاتی بەدەست هێنابوو دەیویست منش لە مووناك بستێنێت. من رازی نەبووم رامان کرد. مەبەستی کوشتن و لەناو بردنی هەموومانی هەبوو تا ئازادیمان پێ نەبرێت.

دانیشتوان کە ئەم بابەتەیان دەزانی دەیانویست لەروداوەکانی داهاتوو ئاگادار بن.

دووری من و ئەو کۆتایی پێهات. سەرئەنجام لئۆنا بەرانبەر دارێك کەمنیان پێوە بەستبوو وەستاو لەگەڵ وەستان زەق لەچاوەکانی منی ڕوانی و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

لەوەی لێوەکانی و هێڵەکانی ناوچاوی و لێدانی ماسوولکەکانی روخساری نیشانی دەدا زۆر ناڕەحەت و خەمبارە.

بەئەخلاق و ڕۆحی ئەو باش ئاشنابووم، بەبینینی ئەم حاڵەتە، لەناخدا شادمانبووم بەڵام بەرووی خۆمدا نەهێنا، بەرواڵەت برۆکانم هێنایە یەك و چاوم لەسەر هەڵگرت. وام نیشان دا ئامەوێت بیبینم.... لئۆنا چەند ساتێکی زۆر کورت لەچاوەکانی منی ڕوانی. کاتێك چاوی خۆم لەسەر هەڵگرت بەدەست ئیشارەیەکی کردو ئەوانەی لەگەڵیدابوون ڕۆشتنە دواوە.

یەك دوو چرکە دواتر دەورووبەری من و ئەو بەجۆرێك چۆڵ بوو کە جگە لەیوری کەس دەنگی ئێمەی نەیدەبیست.... لئۆنا بەدەنگێکی لەرزان و بێ پێشەکی وتی:

رات کردو ڕۆشتی.... بیرت نەکردەوە من لەخەفەتا دەمرم... بیرت لەمن نەکردەوە ئەی بێ ویژدان. ئەی بێ رەحم.

قوڵپی گریان قوڕگمی دەگووشی. لەم کاتەدا قسەکی پچڕاند و بۆ ڕێگرتن لە ڕژانی فرمێسك سەری خۆی داخست.

بارودۆخ زۆر گوونجاو بو بۆیە وتم:

راکردنمان لەبەرئەوەبوو جەنایەتمان کردوە و دەبێت بکوژرێین... تۆ جۆرێك هەڵس و کەتم لەگەڵ دەکەی کە مرۆۆ تەنیا لەگەڵ دوژمنانی هۆز و بنەماڵەکەی خۆی دەیکات؟

ئەگەر سەرۆکی هۆزەکانیتر کە لەناو ڕێدا بەدەستووری تۆ بۆ گرتنی ئێمە چالاکیان دەکرد دەیانزانی من و تۆ چەندین شەومان لە ژێر نووری مانگدا ڕۆژ کردۆتەوە، سەریان سوڕدەما، وانیە؟

وتەکانم ئەوی پەرێشان کرد و بەهەمان دەنگ هاواری کرد و وتی:

بیکەنەوە........

چەند لەپیاوانی هۆزی ئەوان کە تا چەند خولەك پێشتر بۆ کوشتنی من خەنجەرەکانیان تیژ دەکرد و سەمایان دەکرد، هاتنە پێش و بەهەمان خەنجەر دەستیان بە پچڕاندنی تەنافەکان دەست و پێم کرد. بەڵام من بە قاچەکەی ترم کە ساغ بوو پاڵم پێوەنان و بەتوڕەیی و توندی وتم:

نا. بڕۆنە دواوە. پێویست ناکات. ئەوان خۆیان کێشایە دواوە و لئۆنا بە نیگایەك پڕ لە بێ هیوایی سەیری کرم و وتی:

بۆچی........

بەهەمان توڕەیی پێم وت:

من ئامادە نیم ئازاد بم بەڵام هاوسەرو هاوڕێکەم دیل بن. یا پێشتر ئەوان ئازاد بکەن یان من بکوژن و دواتر هەرکارێك لەگەڵ ئەوان دەکەن بیکەن تامن نەبم و نەیبینم.

وتنی ئەم رستانە بە بۆچونی لئۆنا ئارەزومەندی من بەرانبەر بە موناك نیشان دەداو دەیسەلماند. لە راستیدا لئۆناش تاوانی نەبوو. ئەو ژنبوو، تایبەتمەندی ژنانەی هەبوو، عاشق بوو و حەسوودی دەبرد و هەموو ئەم کردەوانەی زادەی حەسودی ئەو بوون.

حەسودی ژنان بە مەترسیدارترین جۆری حەسودی دەژمێردرێت و لئۆنا چونکە نیوە وەحشی لە جەنگەڵدا گەورەببوو، ئەم حەسودییەی بەو توڕەییە سەیرە دەردەبڕی.

ئەو کەمێك دواتر بەچاوی پڕ فرمێسك لە روخساری منی ڕوانی بەناچاری وتی:

ئەوان بکەنەوە بەڵام زیندانەکانیان لەیەك جیابێت.

چەند کەس بەرەو لای موناك و یوری رۆشتن و ئەوانیان کردەوە بەڵام موناك بێهۆش بوو بەناچار ئەویان لەسەر دەست بۆ زیندان گواستەوە.

دوای ئەوە تەنافەکانی منیان کردەوە. بەڵام پێش ئەوەی لەناو تەنافەکان بێمە دەر چاوی لئۆنا بە قاچە شکاوەکەی من کەوت. هەناسەیەکی کورتی هەڵکێشا و بە هەردوو دەست منی گرت چونکە دەیزانی ناتوانم لەسەر پێ بوەستم و دەکەوم.

بەدەستوری ئەو منیان لەسەر زەوی حەوانەوە و بەخێرایی دوو تەختەی پانیان ئامادە کرد.

لئۆنا بە حەزەوە کاری دەکرد و لەم کاتەیشدا قیافەی بەتەواوی گۆڕابوو و یەکێك لەدیمەنەکانی رابردوو و بیرکراوەی لە زەینمدا دروست کردەوە.

پیرێژنێك لە ژنە بە ئەزموون و کارامەکانی هۆز هاتە پێش و دوو پارچە تەختەی لە

دولای رانی من دانا. دوای جێبەجێکردنی ئێسقان کە قیژەی منی بردە ئاسمان ، بە پارچەیەك قاچمی بەست. وەك جەڕاحێکی کارامە دەجولایەوە. لەگەڵ ئەوەی ئازار گیانی منی هێنابوە سەر لێو لەئەنجامی کارەکەی رازی بووم و ئێستا دوعای بۆ دەکەم چونکە ئەگەر بەخواری قاچمی بخستایەتە شوێنی خۆی بە هەمان شێوە ئیسقانەکە پەیوەندی دەخوارد و ئەمڕۆ ناچار دەبووم بە قاچی خوار و کورت بە یارمەتی داردەست بە رێگادا بڕۆم.

بەهەر حاڵ کاتێك پیرێژن قاچی منی بەست، لئۆناش کراسەکەی لەبەرکردم و بەدەست خۆڵ و خاشاکی لێکردمەوە.

برینی بازوو شوێنەوارەکانی تری جەستەمیان دەرمان کرد و دوای ئەنجامی ئەم کارانە دەستووردرا بۆ زیندان بگوێزرێمەوە.

وەحشیەکان بێ گوێدان لەسەر دەست منیان برد و هەندێ کات کە هیلاك دەبوون تەکانێکی سەختیان بەتەختەکە دەدا و هەر ئەم تەکانە چاوەڕوان نەکراوانە ئازارێکی وای لە قاچمدا دروست دەکرد کە کاتێك رۆشتمە ناو زیندان بێهۆش بووم و نەمزانی چی رویدا.

چەند کاتژمێر....؟ چەند رۆژ.... چەند شەو لە بێهۆشیدا بووم نازانم. کاتێك کەم کەم دەهاتمە هۆش و چاوم کردەوە نەسیمێکی فێنك هەڵیکردبو و هەوا رووناك ببویەوە.

یەك دوو خولەك لەو حاڵەدا مامەوە تا هەموو رووداوەکانم لە زەینی خۆمدا زیندووکردەوە و بیرم هێنانەوە. ئەوکات سەرم بەرزکردەوە لە دەورووبەرم ڕوانی.

لە ئەرزی ژوورەکەدا لەسەر گژوگیای وشك خەوتبووم ئەم ژوورە ئەو زیندانە نەبوو منیان بۆ بردبوو. هەستم کرد دووبارە بەدەستوری لئۆنا شوێنی ژیانی منیان گۆڕیوە... دەرگای ژوورەکە کراوەبوو. بەجوانیماڵەکانی ترم دەبینی و هەندێ کات وەحشیەکان کە لەوێوە تێدەپەڕین، چاوم پێیان دەکەوت. قاپی خاڵی ئاوەکەم لەدەستابوو کە لەناکاو سێبەرێك لەناو دەرگاکەدا دەرکەوت و کەسەرم بەرزکردەوە لئۆنام لە جل و بەرگێکی رەساسی رەنگ، بەدنیایەك جوانی بینی.

لەم جلانەدا ئەوەندە جوان بوو ڕەنگە نەتوانم جوانی ئەو بەپێنوس کە من بەناتەوانی بەکاری دەبەم، وەسف بکەم.

لئۆنا کەمێك وەستا، دواتر بەبزەوە هاتە ژوور، دەرگاکەی داخست و لای من لەسەر گیاکان دانیشت و وتی:

چەندە خەوتیت.....!؟ زۆر هیلاك بوویت.....؟

سێ رۆژە کە خەوتوویت و من خۆم شیرە گیا بەهێزەکانم دەرژاندە قورگی تۆ.

لە چاوەجوانەکانیدا حاڵەتێکی تایبەتیم دەبینی. نیگای هەزاران زمانی بوو و قسەی لەگەڵ دەکردم. لەگەڵ ئەوەی ئازارم بوو، لەگەڵ ئەوەی ئێسقانی رانم شکابوو و بەوشێوە ناسازگارە بە ستبوویانەوە دەمویست سەیری چاوە جوان و دڵڕفێنەکانی بکەم.

وەك مورتازێك لەگەڵ نەفسی خۆیدا شەڕدەکات و قامچی لە هەوەسەکانی ناخی خۆی دەدات و زاڵ دەبێت، منیش لەگەڵ هەوەسەکانی خۆمدا لەشەڕێکی قورسدابووم و هەوڵم دەدا تەنانەت سەیری چاوەکانی نەکەم.

پاڕانەوەو هیواو ئارەزووم لەنیگایدا دەخوێندەوە و ئەم تێگەشتنە کاتێك بە دەست هات کە بەدزییەوە سەیری روخساریم دەکرد و دووبارە سەرم دادەخستەوە.

بەهەرحاڵ وەڵامی ئەوم نەدایەوە.... کەمێك وەستاو ئەم جارە بەشێوەیەکی تایبەت کە دەنگی دەلەرزا وتی:

وەڵامم نادەیتەوە.... دەڵێی زۆر تووڕەیت......؟

دووبارە وەڵامم نەدایەوە. دەزانن بۆ.....؟

چونکە دەمویست دڵ لە من هەڵگرێت و بەیەکجاری هیوابڕاوبێت و من و مووناك بەجێ بێڵێت بەڵام ئایا ئەگەری بوو؟

ئایا لئۆنا بەو هەموو حەزەوە چاو لەمن دەپۆشێت و لەدوژمنایەتی مووناکی داماو کە ئەو هەموو لێخۆش بوون و جوامێریەی نیشان دابوو، دەست هەلەگرێت؟

وەڵامی ئەم پرسیارانە تەنیا رووداوەکانی داهاتوو دەیداتەوە، داهاتوویەکی تاریك و نادیار، داهاتوویەك کە خوێن و مەرگ و ئاگری لەگەڵدا بوو. داهاتوو !

قاچی لئۆنام لەهەمان کات کەسەری خۆم داخستبو بینیم و کاتێك دوایین پرسیاری ئەو بێ وەڵام مایەوە بە شێوەیەکی دیارو هەست پێکراو بینیم قاچی کە لەسەر چوارچێوەکەدابو، دەلەرزی. ئەم لەرزەی حەسوودی بوو.... لەرزینی عەشق !

ئەو هاتە پێش و لای من دانیشت. وتی:

وەڵامم بدەرەوە..... دەرفەتی زۆرمان بۆ وتوێژنیە.

ئەم جارە زانیم چی بووە سەرم هەڵبڕی و بە تووڕەییەوە وتم:

دەرفەتی زۆرمان نیە.....؟ یانی چی.

بزەیەکی هێنایە سەرلێو چونکە وشەو رستە بو کەدوای راکردن و دەستگیری لەدەمی من دەیبیست.

سەیرێکی چاوە تووڕەکانی منی کردو وتی:

دەرفەتی زۆرمان نیە چونکە بەیانی زۆر زوو، کاتێك هەوا تازە رووناك دەبێتەوە، ئێوە سیانە ئیعدام دەکرێن.

ناڵەیەك لە قوورگم دەرچوو کە لەناڵە ئاساییەکان نەدەچوو. ئەمە دەنگدانەوەی دنیایەك سەرسوڕمان بوو، لێم پرسی:

چیت وت... ئیعداممان دەکەن.....؟

بەڵێ... بەیانی بەدارتان دەبەستینەوەو تیکە تیکەتان دەکەن تۆ.... یوری.... مووناك و دواتر مناڵەکەش دەخەنە بەردەم ئاژەڵە برسیەکان و دەبێتە پاروی ئەوان.

موو لەسەر ئەندامەکانم راست ببوویەوە و ئارەقێکی ساردو خلیسك هەموو جەستەمی داپۆشی بۆ چەند ساتێکی کورت چاوەکانم ڕەش بوو.

دەتوت دنیایان بەو هەموو قورسی و گەورەییە لەسەر مێشکی من داناوە و زەختی لێدەکەن. ئاوی دەمم قوت داو سەرم داخست. لئۆنا کەمێك زیاتر خۆی بەمنەوە لکاند. ئێستا ئەوەندە نزیك ببویەوە کەهەستم بە گەرمی جەستەی دەکرد بەڵام بۆنەوەی قاچە شکاوەکەم زەربەی بەرنەکەوێت، کەمێك خۆم کێشایە دواوە و ئەم کارەم زۆر بەدژواری ئەنجامدا. لئۆنا دووبارە هاتە پێش و ئەم جارەیان دەستی هێناو کردیە ناو قژم و سەری راکێشام بە شێوەیەك هەستم بەئازار کرد.

ئەو بەتەواوی گۆڕابو ئێستا ئەو کچە شەرمنەکە نەبو.

ئێستا لئۆنا بەزۆر دەیویست من تەسلیم بکات و ئەگەر کاتێکی تر جگە لەئێستا بو رەنگە منیش چێژم دەبرد بەڵام لەوبارودۆخە کە بە ئەنقەست روی تاڵم نشان دەدا ئەم کردەوانە زیاتر لە شتێکی بێزارکەر بۆمن نەبوو.

لئۆنا سەری منی کێشایە پێش.

ناڕەحەت بووم. بەراوردی بکەن لەوکاتەدا چۆن دەمتوانی عەشقبازی بکەم.....؟ لە لایەکیتر بەباشم نەدەزانی رووی خۆشی نیشانبدەم. لەبەرئەمە خۆم کێشایە دواوە و بەدەست ئەوم لەخۆم دوورکردەوە.

لئۆنا سەرەتا چەند ساتێك بێدەنگ سەیری کردم و دواتر وتی:

گوێ بگرە.... ئەمڕۆ دەمەوێت حسێبەکانم لەگەڵ تۆدا پاك بکەمەوە...

بە tووندی وتووڕەیی وتم:

هیچ حسێبێکم لەگەڵ تۆدا نیە.

و بۆئەوەی بیترسێنم وتم:

من دانشتووی وڵاتێکی گەورەم و ئەگەر زیانێك بەمن بگات هۆزەکەتان ژێرو ژوو دەکەن ئاگادار بە هەر جۆرە ئیهانە کردنێکی من یانی یاری لەگەڵ ئاگر.

خۆشم نەمزانی بۆ ئەم قسەم کرد. ڕاستیتان بوێت وتنی ئەم بابەتە نە بە لئۆنا کە جگە لەو جەنگەڵەو هۆزەکان دەوروبەر وەحشی و دڕندەکانی نەبینیبو و دنیایەکی جیاواز لەوێ شك نەدەبرد بیستنی ئەم قسانە پێکەنیناوی بوو.

ئەو خۆی بە فەرمانڕەوانی دنیا دەزانی و لەوڵاتە پێش کەوتووەکان و دنیای پشت ئەو جەنگەڵە هیچی نەدەزانی، ئەی من بۆ ئەم قسەم پێوت.

ئەو پێکەنی و وتی:

زۆرباشە..... من تۆو خۆشەویستەکەت مووناك دەکوژم تا هۆزەکەمان ژێروژوو بێت.

لێرەدا قسەی خۆی بڕی و بیری کردەوە. گوومانم کرد لەتووند وەڵامدانەوەی پەشیمان بۆتەوە بەڵام دووبارە لێوی بۆ قسەکردن کردەوە زانیم بەهەڵەدا چووم چونکە وتی:

من ئازار دەبەم.... ئازارێکی بەردەوام و هەمیشەیی و ئەم جۆرە ژیانە بۆمن جگە لەنەنگ و شەڕم هیچی تر نیە..... بێزاربووم..... هەموو دڵخۆشیم بەتۆ بوو..... بۆ تۆ و لەبەر تۆ ژیانم دەکرد و بەداهاتوو هیواداربووم و نەخشەی دوورو درێژم بۆ کێشابوو.

بەڵام تۆ بەڕاکردنی خۆت هەموو ئارەزووەکانی منت وورد کرد و خستە ژێر پێ..... تۆ موناکت هەڵبژارد و ئەم هەڵبژاردنە بۆمن ئەو مانایەی بو تۆ ئەوت زیاتر لەمن خۆش دەوێت و ئەو لەمن جوانترو خۆشەویست ترە....لەگەڵ ئەم شکەستەدا ناتوانم ڕێبکەوم و بووم بە پارچەیەك ئاگر، ئاگرێگ کە ئەگەری ئەوە هەیە ژیانی من و تۆو کۆمەڵێکی تر بسوتێنێت.

قوڕگی گیرابو، دەتوت دەیەوێت بگرێیەت... دووبارە لەسەر زەوی لای من دانیشت بەڵام من پشتم تێکردبو بەجۆرێك دانیشتبووم کە ڕووم لەدیوارەکە بێت و ئەو نەبینم.

لەو ساتە بەدواوە تا ئەوکاتەی سێبەرکەیم لەکاتی ڕۆشتنەدەرەودا بینی، هیچ دەنگێکی لێ نەبیسترا مەگەر هەناسەیەکی بەرزو سووتێنەر و پڕ ئازار.... هەناسەیەك کە لەقووڵایی دڵیەوە هەڵەستاو کاریگەری قووڵیشی لەسەر من بەجێ هێشت و خەمباری کردم.

شەو خواردنیان لە گۆشتی باڵندە بۆ هێنام. لەو ڕەش پێستە خواردنەکەی هێنا پرسیاری مووناکم کرد و هەواڵی یوریم پرسی:

وتی:

ئەوان لە زیندانە جیاوازەکاندا زیندانین....

مناڵەکەیان لە مووناك وەرگرتووە و داویانە بە پەرستارە کۆنەکەی بەڵام....

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم بەڵام چی.....؟ بەڵام ئەو وەڵامی نەدامەوە، خواردنەکەم خوارد و بەناڕەحەتی تەواو خەوم لێکەوت. تا بەیانی چەندین جار لەخەو راچڵەکیم.

بەیانی زۆر زوو تازە هەوا ڕووناك ببویەوە کە لەناکاو دەرگای ژوورەکە کرایەوە و چەندین ڕەشی زل هاتنە ژوور. لەبینینی ئەوان سەرم سوڕماو دڵم داکەوت چونکە زانیم بۆ بردنی من بۆ گۆڕەپانی ئیعدام هاتوون. دەست و پێی منیان گرت و بێ گوێدان بەوەی قاچم شکاوە منیان بۆ گۆڕەپان گواستەوە بەدارێکەوە بەستمیانەوە.

هەموو جەستەمیان بە تەناف پێچابوو بەخۆشحاڵیەوە ئەوەندەیان تەناف لێ بەستم کە قاچی چەپم لەهەوادا مایەوە.

سەما دەستی پێکرد.... تیروکەوان و خەنجەری زۆرم بۆ حەواڵە کرا بەڵام دەتوت هێشتا کاتی مردنم نەهاتووە. ئەولاتر مووناك و یوریان بەستبوویەوە. دوای چەند خولەك سەرو کەلەی لئۆنا دەرکەوت. جل و بەرگێکی جوانی لەبەر کردبوو کە سکە جوانەکەی دەردەخست، تیرو کەوانی بەدەست گرت و منی نیشانە گرت.

سەرەتا نیشانەی لەمن گرت بەڵام دواتر رووی بۆ لای مووناك سووڕاند دەتوت دەیەوێت سەرەتا ئەو بکوژێت تا من ئەشکەنجە بدات و لە بینینی مەرگی ئەو ئازارم بدات.

ڕاستیش وابوو من نەمدەتوانی بەرگەی مەرگی مووناك بگرم بەتایبەت ئەوەی کە ماڵئاوایی ئەو شەوەم بیرکەوتەوە کە دەیوت:

کاتێك من مردم تۆ لەگەڵ لئۆنادا دەژیت ویان بۆ شارودیاری خۆت دەگەڕێیتەوە بەهەرحاڵ ژیانی تۆ لە ژن خاڵی نابێت و ژنێك لای تۆ دەبێت. خۆزگە دەمتوانی ئەو ژنە ببینم..... من بەختەوەری تۆم دەوێت.

ئەو کاتی ماڵئاوایی ئەم قسانەی وت و من لەو ساتانەی کە مەرگ قیافەی مەترسیداری خۆی نیشان دەدا وتەکانی ئەوم بیرکەوتەوە و دەتوت ئاگریان لەدڵمدا هەڵایساندوە کە هەموو ناخم دەسووتێنێت.

ئەشکەنجەیەك کە لئۆنا دیاری کردبوو ئەمەبوو.... بسووتێم و مەرگ بەتاڵترین تام پێی رازی بم. بۆ ئەوەی مەرگی دڵتەزێن و بەئازاری مووناك بەچاوی خۆم نەبینم چاوم لێ هەڵگرت و سەیری شوێنێکی ترم کرد.

لئۆنا چاوی لەسەر جووڵەو کردەوەکانی من بوو. کاتێك ئەمەی بینی بەخێرایی دەستی هێنایە خوارو چەند هەنگاو لەمن نزیك بوویەوە و بەتووندی وەك فەرمان دان وتی:

سەرت بەرزکەرەوەو سەیری بکە....

ئەم فەرمانە زۆر بەهێز بوو بەڵام تا ئەوشوێنەی فەرمانم برد کەسەرم بەرزکردەوە بەڵام سەیری مووناکم نەکرد و تەنیا سەیری چاوەکانی ئەوم کرد کە لەگەڵ هێزو نیشاندانی خوێنخۆری خۆی لەو پەڕی ئاتەوانیدا سەیری منی کرد.

کاتێك چاومان کەوتە سەر یەك هەستم کرد سست و سست تر دەبێت تا شوێنێك زیاتر لەوەی نەیتوانی سەیری چاوەکانی من بکات. سەری داخست و گەمەی بە کەوانەکەی دەکرد.

ئەمە زۆری نەخایاندو دووبارە سەری بەرزکردەوە و ئەم جارە دوو سێ هەنگاو لەمن نزیك بوویەوە وتی:

دەمەوێت بە ئەشکەنجەو ئازارەوە بتکوژم.... تێدەگەیت.... دەبێت سەیری مووناك بکەیت. دەبێت بەچاوی خۆت ببینیت کە چۆن گیان دەدات. سەرت بەرز کەرەوە وە گەرنە بەزۆر ئەم کارە دەکەم.

دواتر بە دەنگێکی ئارامتر وتی:

تۆ منت کوشتووە.... تۆ ئەوەندەت ئازارو ئەشکەنجە داوم کە هەرچەندە ئازارت بدەم برینەکانی من سارێژ نابێت.

هێشتا قسەکەی تەواو نەببوو.... دووبارە دەیویست قسەبکات.... دەتوت شتی گرنگتر و پێویستری هەڵگرتبو کەمنی لێ ئاگادار بکاتەوە.

بەڵام دەرفەتی پێ نەبرا چونکە لەناکاو دەنگە دەنگ لەدەوروبەر نزیك بوویەوە و قەرەباڵغی دروست بوو. هەمو سەرەکان بۆلای دەنگەکە گەڕایەوە..... وەحشیەکان و ئەوانەی بۆ ئیعدام کۆبوونەوە و هەرکام لەوان ئەرکێکی تایبەت وەك سەماکردن و تەپڵ لێدانیان لە ئەستۆدابوو دەستیان لەکار کێشایەوەو سەرنجیان بەدەوروبەر دا چونکە بەرزبوونەوەی ئەم دەنگە دەنگە کەم چاوەڕوان نەکراوبوو.

چی بو.......؟ چیە؟

یەکەم کەس کە ئەم پرسیارانەی کرد لئۆنا بوو.

لئۆنا بە چەند هەنگاو خۆی گەیاندە ناوەڕاستی گۆڕەپان و لەتاقمێك لە وەحشیەکان کە رمیان لە دەستدابوو و راسپێردرابوون بۆ پاراستنی ئارامی، پرسیاری کرد.

ئەوانیش بە نۆرەی خۆیان وەڵامیان دایەوە کە من بەهۆی دووری نەم بیست.

تەنیا شتێك هەستم پێکرد ئەوەبوو کە بابەتەکە زۆر گرنگە و بۆتە هۆی شڵەژان و نیگەرانی لئۆنا چونکە پێشینەیەك لە ئەخلاق و کردەوەکانی ئەوم دەزانی. بینیم دەستەکانی بێ ئیرادە و بەخێرایی تەکان دەدات.

دەنگە دەنگ سات بەسات زیاتر و من لەناو ئەو قیژانەی دەمبیست هەندێ وشەم بەم دژواری جیاکردەوە.

ناوی مووناك لەو وشانەبوو کە زۆر دووبارە دەکرایەوە. تێگەشتم هەرچی هەیە بە مووناك و دواتر بە ئێمە پەیوەندی هەیە.

هێشتا بابەتەکە ئاشکرا نەبوو کە لئۆنا گەڕایەوە و بەو تاقمەی لەدەوری دابوون دەستووریدا مووناك لەتیری ئیعدام بکەنەوەو بیبەن. مەبەستی چی بوو......؟

ئەم خاڵەش ئاشکرابوو و کاتێك وەحشیەکان بەکردنەوەی تەنافەکان سەرقاڵ بوون لئۆنا نزیك بوویەوە و لەکاتێکدا لە تووڕەییدا دەنگی دەلەرزی وتی:

بیخەنە ناو زۆنگاو تا بەیەکجاری بێ هیوابێ. جەستەی ئەم ژنە دەبێت لە قووڵایی زۆنگاوەکاندا بەخاك بسپێردرێت تا دووبارە ئارامی لە هۆزەکەی ئێمە فەرمانڕەوابێت.

ئەوکات سەیری من و یوری کرد و وتی:

بۆ ئەم دوانەش بیرێکی باشتر دەکەم.... ئەم دوو سپی پێستە ئارامی و ئاسوودەییان لە هۆزەکەی ئێمە هەڵگرتووە. ئەمانە منالی شەیتانن و لەو رۆژەوەی قاچیان گەشتە ئەم سەر زەوییە، ئاسوودەیی لەناوماندا رۆشت و تاکاتێك ئەوان نابوود نەکەین خواکانی جەنگەڵ بەزەییان پێماندا نایەتەوە.

ئەو ئەم بابەتانەی بەدەنگی بەرز و بەشێوەیەك وت کە وەحشیەکان و دانیشتوانی هۆز بەتایبەت ژنان کە زیاتر لەوێ کۆببوونەوە، بیبیستن.

کاتێك بێدەنگ بوو ژنەکان سەیری یەکتریان کرد و بەتەکاندانی سەر قسەکانیان پشت راست کردەوە. لەناکاو بارودۆخ گۆڕا. بەهەرحاڵ مەبەستی لئۆنا ئەوەبو مووناك بکوژرێت و و ئەگەر مەرگی ئەو پێویستە بۆ لەوێدا نەیکوشت و دەستووریدا بیخەنە ناو

زۆنگاوەوە بۆ چی....؟

دەنگی هاوارەکان دەبیستراو کاتێك مووناکیان لەدارەکە کردەوە دەنگە دەنگ زیاتر بوو بەشێوەیەك ئەگەر دوو کەس بیانویستایە قسە بکەن بەئاسانی دەنگی یەکیان نەدەبیست.

لئۆنا لەکاتێکدا تیروکەوانەکەی لەدەستدابوو و چەند چەکدارێك بەرم و قەمە لەدەوروبەری دەڕۆشتن لە ئێمە دوورکەوتنەوە و بەرەو تاقمێك کە زیاتر دەیانقیژاند و دەستیان بەرزدەکردەوە رۆشت .دوورکەوتنەوەی ئەو دەرفەتێکی گونجاو بوو، سەیری یوریم کرد و وتم:

یوری چی بووە.....؟

یوری کە دەتوت ئاگای لە هەموو شتێکە وتی:

بارودۆخ لە بەرژەوەندی ئێمەدایە، خەم مەخۆ.

لەوەڵامدا وتم:

خەم ناخۆم. خەم بۆچی؟ مردن خەمی ناوێت تەنیا دەمەوێت لە رووداوەکان ئاگادار ببمەوە. یوری تەکانێکی بە بازووە بەستراوەکانی خۆیدا و کەمێك خۆی جێ بەجێ کرد و وتی:

باسی مەرگ لەگۆڕێدانیە. شادمان بە چونکە تاقمێك بۆ بەرگری کردن لە ئێمە راپەڕیون دڵم داکەوت.... روخسارم گەرم بوو... دەتوت خوێن بەخێرایی و هێز هاتۆتە ناو روخسارم، دەوری پێڵوەکانی چاوم دەسووتا.

هەموو ئەم حاڵەتانە نیشانەی شادمانی بوو. بیرم لەهەموو شتێك دەکردەوە. تەنیا شتێك گوومان لێنەدەکرد ئەوەیە تاقمێك لە ڕەش پێستەکان دژی لئۆناو لەبەرژەوەندی مووناك راپەڕن.

یوری کە بێدەنگی منی بینی وتی:

ئەوان ئازادی مووناکیان دەوێت.

ئێستا کە دەیانقیژاند، هەڕەشەیان لە لئۆنا دەکرد وتیان: (( ئەگەر مووناك ئازاد نەکرێت کوشت وکوشتار رێك دەخەن))

پرسیم:

بەڕاستی ئەم کارە دەکەن؟

ئەو وەڵامی دایەوە:

دوورنیە. بەو شێوەی دەیبینم ژمارەی ئەوان زیاترە لەو کەسانەی لە لێۆناو سەرۆکایەتی ئەو بەرگری دەکەن و ئەگەر شەڕ رووبدات سەرکەوتن بەلایەنگرانی مووناک دەبێت.

پرسیم:

ئێمە چیمان بەسەر دێت.... قاچم شکاوەو توانای هیچ کارێکم نیە.

یوری وتی:

خەم مەخۆ تا ئەمڕۆ لە هەموو رووداوەکان بەسلامەتی گیانمان دەربردوە، جێگەی نیگەرانی نیە. تەنیا شتێك کە بیرم بەخۆیەوە سەرقاڵ دەکات ئەوەیە لێۆنا چەکەکانمان لەناو نەبات. یوری قسەکەی تەواو نەکرد. ناچار بوم ئاوڕبەمەوە تاروخساری ببینم و ئەم دژوارە منی هیلاك دەکرد بۆیە کاتێك ئەو قسەی دەکرد من سەرم لەپێشەوە رادەگرت و تەنیا لەرێگەی گوێچکەوە پەیوەندیم لەگەڵ ئەودا دەپاراست.

ئەو کاتە منیش ئەوم نەدەبینی بەڵام کاتێك ئاوڕم دایەوە و سەرم بۆلای سووڕانەوە لەوپەڕی سەرسوڕماندا بینیم یەکێك لە ژنانی ئامازۆن لەپشتەوە لەداری ئیعدام کەیوری پێوەبەسترابوویەوە، نزیك بۆتەوەو سەرقاڵی کارێکە. دووبارە زەختم لەخۆم کرد و سووڕام.

قاچم بەهۆی زەخت ئازاری گرت و سووتانەوەیەکی قوورس لەبرینەکانی مل وپشتم دروست بوو بەڵام گوێم پێ نەدا و سەرئەنجام بینیم ژنی جوانی ئامازۆن بەخەنجەر سەرقاڵی پچڕاندنی تەنافەکانی دەستی یوریە.

تاقمێك لە وەحشیەکان دەهاتن و دەڕۆشتن بەڵام گوێیان بەئێمە نەدەدا. لەلایەکیتر لێۆنا لەبەرانبەر ئەوانەی یاخی ببوون وەستابوو قسەی لەگەڵ دەکردن و بۆیە سەرنجی لای ئێمە نەبوو. ژنی ئامازۆن بەجوانی تەنافەکەی پچڕاندو بەشێوەیەك ئەم کارەی ئەنجامدا و هەموو تەنافەکانی لەخوارەوە بڕی تا دەرفەت بۆ رزگارکردنی من لەدەست نەڕوات.

دوای ئەم کارە هاتە لای من و بەئارامی تەنافەکانی کردەوە. کاتێك ئەو ئەم کارەی دەکرد چەند ژنێکی تر لە دەوروبەری ئێمە پیاسەیان دەکرد و خۆیان بەقسەو شتی تر سەرقاڵ دەکرد.

هەستم کرد ئەوانیشت لە لایەنگرانی مووناکن... شتێك زیاتر سەرنجی منی راکێشابو ئەوەبو کە دوو سێ کەس لەژنان شتێکی وەك بوخچەیان لەدەستدابوو.

بوخچەکان گەورەو درێژ وبەتەناف بەجوانی دوروبەریان بەستبوو. لەدوورەوە وادەهاتە بەرچاو کە جەستەی مردوی مناڵێکی دەساڵەیان لەپەتوو پێچابێت.

بەخۆمم وت بەمن چی..... هەرچیە بابێت.....

لەم کاتەدا تەنافەکانی دەستم پچڕا و دواتر هەستم کرد خەنجەرێك خرایە دەستم.

شۆڕشیەکان ئەوەندە لەکاری خۆیان بەتوانابوون کە هەمووڵایەنەکیان لەبەرچاو گرتبوو وتەنانەت داردەستیان بۆ من ئامادەکردبوو. ژنی ئامازۆنی بە ئارامی داردەستەکەی لەسەر زەوی هەڵگرت و لای داری ئیعدامەکە داینا و وتی:

ئەم خەنجەرە بگرە.... ئەمەش داردەستێك تا بتوانیت پێی بڕۆیت.

کاتێك ئەوکاری خۆی تەواو کرد بەچەند هەنگاوێکی بەرز بەرەولای ژنانی تر ڕۆشت و لەوانەی بوخچەیان لەدەستدابوو چەندین ئیشارەتی کرد.

ئەوان دەستیان بە کردنەوی بوخچەکان کردو من بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە بینیم کە لەناو بوخچەکان جل و بەرگ و سیلاحەکانی ئێمە هاتنەدەر.

لەمەو بەدوا کار بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەنجام درا. ژنەکان جل و بەرگەکانیان بۆ هاویشتین.

یوری کە بریندار نەبوو بەخێرایی کراسەکەی لەبەرکردو کڵاوێکی حەسیری لەسەر دانا. دواتر تفەنگەکانیان پێدایین و دروست لەوکاتەی تفەنگەکان بەدەستی ئێمە گەشت هەلهەلەی ژنان بەرزبوویەوە.

ئەم هەلهەلەیە نیشانەی تەواوی کاربوو چونکە لەم ناوەدا شۆڕشیەکان هێرشیان کردە سەر لئۆناو بەرگریکەرانی ئەو وگەمارۆیاندان.

لە چاوتروکانێکدا شەڕێکی خوێناوی دەستی پێکرد و دەنگی هاوارو ناڵە بەرزبوویەوە بەدژواری پاڵم بەدارەکەوە دا و خۆم رادەگرت... قاچم شکابوو توانای ڕێگە ڕۆشتنم نەبوو بەڵام لەدوورەوە دەمدی تاقمێك لەسەر سینەی تاقمێکیتر دانیشتوون و سەریان دەبڕن.

خوێن ڕژا. چەند سەری بڕاو کەوتە ناو گۆڕەپان، تاقمێك پەلاماری ئێمەیان دا بەڵام رەکباری یوری پاشە کشەی پێکردن.

یوری وەك کێو لەناوەڕاستی گۆڕەپاندا وەستابوو.

بەرگریکەرانی لئۆنا باش بەرگریان دەکرد و ئەویان لەناوەڕاستدا دانا و لەگەڵ هێرشبەران شەڕیان دەکرد. هەندێ کات شۆڕشیەکان سەردەکەوتن و هەندێ کات

بەرگریکەرانی لئۆنا. بەهەرحاڵ ئەم شەڕو پێکدادانە زۆری نەخایاند و سەرئەنجام لئۆنا دەستگیرکرا.

شتێك کە زیاد لەرادە گرنگ بوو ئەوەبو بەداخەوە من نەمدەتوانی وەك جاران بەڕێگادا بڕۆم.

قاچی راستم شکابوو، بەتەختە بەستبوویانەوە و ئەگەر زەختم لە خۆم دەکرد بەدژواری دەمتوانی بەیارمەتی داردەستەکە بەڕێگادا بڕۆم بەڵام ئازار ئەوەندە زۆربوو لەچەند هەنگاودا دەدرام بەزەویدا.

نەبێت چی بکەم......؟ هەرجۆرێك بو لەوێ لەسەر زەوی دانیشتم و قاچی راستی خۆم درێژ کردو و ئاگام لەچەپ و راست بوو تا هێرشم نەکرێتە سەر.

تەنیا یوری جوان بەڕێگادا دەڕۆشت و بەرگری لەخۆی و من دەکرد و ئەگەر ئەو نەدەبوو لەهەمان خولەکانی یەکەم منیان کوشتبوو.... چەند جار پاڵی بە وەحشیەکانەوە ناو و بوە هۆی رزگاری من.

لئۆنایان گرت و دەستیان بەتەناف بەستەوە... بەرگریکارانی ئەویش بەدیل گیران. تاقمێك پیاو و دەستەیەك لە ژنانی ئامازۆن کەسانێك بوون کە لەحکومەتی لئۆنا کەڵکیان وەرگرتبوو بۆ گەڕانەوەی مووناك هەوڵیان نەدەدا و لەبەرئەمە دەستگیرکران و نێردرانە زیندان.

لەسەر زەوی دانیشتبووم یوریش هاتە لام چونکە لئۆنایان بۆلای من دەهێنا. کاتێك لئۆنا روبەڕوم بویەوە هەوڵی دا سەیری چاوەکانم نەکات، سەری داخستبوو، منیش ئارەزوومەند نەبووم ئازاری بدەم. بۆیە کاتێك داوای دەستووریان لەمن کرد تەنیا وتم:

لئۆنا مووناکیان بۆ کوێ بردووە..... قسە بکە.

وەڵامی نەدایەوە..... بەهەمان شێوە سەری داخستبوو و قسەی نەدەکرد.

بۆ دووەم جارو سێیەم جار پرسیارم کرد بەڵام ئەو وەڵامی نەدامەوە و تەنانەت سەیری چاویشمی نەدەکرد. کەنەکات لە ژێر کاریگەری نیگای من کەخۆی دەیوت توانای بەرگەگرتنی نیە بە وتنی راستیەکان و درکاندنی شوێنی شاردنەوەی مووناك ناچاربێت.

لە ئەنجامدا وتم:

لئۆنا باشترە کەمێك عاقڵانە بیربکەیتەوە، حکومەت مافی سەلمێنراوی مووناکە و لەگەڕانەوەی ئەو نابێت بەداخ بیت... تۆ بەکردەوە تاقی کردنەوەیەکی خراپت پشت

سەرنا و نیشانت دا جوامێری و لیّ خۆش بوونت نیە... ئەو لەنێوان عەشق و سەرۆك بوون یەکیانی هەڵبژارد و عەشقی دیاری کرد و لەبەر ئەمە سەرۆکایەتی هۆزی دا بەتۆ و خۆی بەدوای ئێمەدا بەڕێکەوت بەڵام تۆ لەوێوە کەزۆر تەماحکار بویت دەتویست خاوەنی هەردوکیان یانی عەشق و سەرۆکایەتی بیت و ئەم ناڕاستیە بو کاری گەیاندە ئێرە. بەهەرحاڵ نابێت بەداخ بیت و داوات لێدەکەم مووناك بگەڕێنیتەوە بۆ هۆز. بەڵێنت پیّ دەدەم ڕێگربم لەتووڕەبوونی و وەك کۆن هۆکاری ئازاد بوونی تۆ ئامادە بکەم..... بەڵێن دەدەم.

لئۆنا دووبارە بێدەنگ بوو.... هەرچی زیاتر قسەم دەکرد بێدەنگی ئەو قووڵتر دەبوو و لەکۆتاییدا کە زانیم وەڵام ناداتەوە و بەزرنگی دەیەوێت شوێنی شاردنەوەی مووناك بەنهێنی بهێڵێتەوە، ئیشارەم کرد تا بیبەنە زیندان. بەتایبەتی وتم لئۆنا لەو ژوورەی من تیایدا زیندانی بووم زیندانی بکەن.

ئەویان بیّ ئەوەی خۆراگری بکات برد. تا دوورەیەکی زۆر لئۆنام بینی کەسەری داخستبوو و بیری دەکردەوە.

کاتێك لەگەڵ یوریدا ماینەوە وتم:

دەبێت چی بکەین.....؟ مووناکیان بردووە بۆ کویّ؟ چۆن دەتوانین بیدۆزینەوە؟

یوری وتی:

ئێستا تاقمێك بەدوای ئەودا ڕۆشتوون. چاوەڕیّ بکە تا بگەڕێنەوە، ڕەنگە هەواڵێك بێنن....

ڕەنگە ئەویان دۆزیبێتەوە و بیگەڕێننەوە بۆ هۆز.

دوان لە وەحشیەکان بەرەو لای ئێمە رایان کرد و بۆ هەستانی من یارمەتیان داین، ئەوان ژێر باڵی منیان گرت و ئارام ئارام بەرەو ماڵی مووناك کەدوور بوو، بەڕێکەوتین.

ماڵ وەك کۆن وابوو تەنیا تۆزێك شپرزە دەهاتە بەرچاو بەڵام لەگەڵ گەشتنی من دوان لەژنان دەستیان بەپاك کردنەوەی کرد و شوێنەکەیان چاك کردم.

یوری بەکارزانی سەرۆکایەتی کاتی هۆزی لەئەستۆ گرت و فەرمانیدا تاقمێك بۆ گەڕان بەدوای مووناك خۆیان ئامادە بکەن.

ئەوانەی پێشتر ڕۆشتبوونە جەنگەڵ گەڕانەوە و بەداخەوە هەواڵیان هێنا کەمترین هەواڵیان لەمووناك پیّ نیە.

کەم کەم نیگەرانی و ناڕەحەتی من زیادی کرد. گوومانم کرد ئەوان لەبەر تۆڵەی ئەو

تاقمە بەناشرینترین شێوە مووناك دەکوژن، دوورنەبو بۆیە لە گوومانی دیمەنی مەرگی مووناك پشتم لەرزی و ناوچاوم نوقمی ئارەق بوو.

یوری بەتەنیا جێی هێشتم و دوای چەند خولەك هاوڕێ لەگەڵ پیرێژنێك لەجادوگەرانانی هۆز گەڕایەوە. لەهۆزی ئامازۆن، کاری پزیشکی و برین پێچانی برینداران و چارەسەری جەراحیەکان لەئەستۆی ئەم جادوگەرانانەدایە. زۆربەی ئەوان ژن و تەنیا یەك دوو پیاو لەناویاندا دەبینرێت.

ژنی جادوگەر برێکی زۆر گژوگیای لەگەڵ خۆیدا هێنابوو و لەگەڵ ئەوەی چاوی بەقاچی من کەوت بەیەکێك لەپەرستارانی مووناك دەستووریدا هاوەنە دارییەکە بێنن. هاوەن گوازرایەوە بۆ ناوەڕاستی ژوورەکە. ئەو بەئەنقەست گیاکانی لەبەرچاوی مندا لەهاوەندا دەکوتا نەکا گوومانێکی خراپ لەمێشکمدا دروست ببێت.

دوای ئەوەی گیاکانی کوتا، پڵتەکەی لەسەر پارچەیەك کۆکردەوەو پارەیەکی تری لەسەردانا وهیلکەیەك و برێك گیای دیکەی تێکەڵ کرد و لەقاچی منی بەست.

ئەم کارەی ئەنجامدا و رایسپارد تابەیانی کەمترین جووڵە لەشوێنی خۆمدا نەکەم. منیش بەقسەیم کرد چونکە بەڕاستی باوەڕم بەچارەسەرەکانی ئەوان و کەڵکی زۆرم لێبردبوون. جاری پێشوتریش کە ڕم جەستەمی کوون کرد ئەگەر کاریگەری شەفا بەخشی ئەم گیایانە نەدەبوو بەدڵنیاییەوە دەمردم و هەروەها ئەگەر لەیەکێك لە خەستەخانەکانی نیویۆرك دەیانویست ئەو برینە چارەسەرکەن نزیکەی دوو مانگی پێدەچوو. لەکاتێکدا من زیاتر لەشەش رۆژ نەکەوتم و دوای ئەوە رۆشتمە شەڕ.

پیرێژن رۆشت و ژانی قاچم ئارامی گرت، چاوەکانم قوورس و خەوێکی خۆش منی بردەوە.

کاتێك چاوم کردەوە هەوا تاریك ببوو. هیچ شوێنێکی جەستەم ئازاری نەبوو. دەتوت قاچیشم نەشکاوە. سێ رۆژ بەم شێوە تێپەڕی. رۆژی چوارەم یەکێك لە وەحشیەکان هەواڵێکی ترس نەنگێزی هێنا. ئەو کاتێك یوری لای من دانیشتبوو و سیگاری دەپێچایەوە هاتە ژوور و شڵەژاو وتی:

مووناکم دۆزیەوە...... مووناکم دۆزیەوە.

یوری هەستاو بەشادمانی شانەکانی ئەوی گرت و وتی:

لەکوێ بینیت؟ لەکوێیە؟

وەحشی بەحاڵەتێك کە زمانی دەگیراو دەلەرزی وتی:

ئەویان لەناو قامیشەڵاندا داشاردبو بۆیە نەماندەتوانی بیدۆزینەوە، ئێستا ئەویان بۆ شوێنێکی تر گواستۆتەوە و کاتێك کەڕۆشتن ئەوانم بینی.

یوری پرسی:

بردیان بۆ کوێ؟

وەحشی وتی:

دەترسم بیڵێم..... دەترسم.

بۆ دەترسی..... لەچی دەترسی؟

وەحشی وتی:

لەوەی کە..... ئاخر ئەویان بۆ سەر زەوی جاڵجاڵۆکەکان بردوە.

لە شوێنەکەم هەستام و پرسیم:

سەر زەوی جاڵجاڵۆکەکان کوێیە؟ چۆن شوێنێکە کە من تائێستا هیچم لێ نەبیستووە.

وتی:

ئەوێ زۆر لێرەوە دوورە.... چوار تا شەش ڕۆژ ڕێگایە. ئەگەر خێرا بەرێکەون پێیان دەگەن ڕێگەی قەوبڕی دەزانم و لەگەڵ ئەوەی زۆر مەترسیدارە بەڵام دەبمە ڕێنیشاندەرتان.

لەم کاتەدا بۆ یەکەم جار لەشوێنەکەمدا تەکانم خوارد و هەستم کرد دەتوانم بێ یارمەتی داردەست بەڕێگادا بڕۆم.

یوری هاتە پێش کەڕێگربێت لەڕۆشتنی من بەڵام بەهیچ جۆرێك ڕازی نەبووم دووبارە لە جێگادا بخەوم.

یوری سوڕبوو و منیش پێم داگرت. سەرئەنجام کەبینی بەئاسانی بەڕێگادا دەڕۆم و هەست بەئازار ناکەم ڕەزامەندی نیشاندا و منیش سیلاحەکەم بەدەستەوە گرت و هەنگاو بەهەنگاو زۆر هێواش لەگەڵ یوری بەڕێکەوتم:

تاقمێك لە وەحشیەکانیش لەگەڵماندا هاتن. ئەوان بەرم و تیروکەوان لەپێش و دواوەی من و یوری دەڕۆشتن و ئاگادار بوون نەکا هێرشمان بکرێتە سەر.

دوو ڕۆژ بەم شێوەیە تێپەڕی. لەشوێنێکی زۆر مەترسیدار کە جەنگەڵ دیمەنی ترس ئەنگێزی بوو و دەتوت هیچ کات قاچی مرۆڤی پێنەگەشتووە، یوری وەحشیەکانی بۆ دوو دەستە دابەش کرد. دەستەیەکی لەباکوورەوە بۆ سەر زەوی جاڵجاڵۆکەکان ناردو خۆشی دەستەیەکی هەڵگرت و لەڕۆژئاواوە بەرەو ئەوێ بەڕێکەوت.

هێشتا بەجوانی نەمدەتوانی بەڕێگادا بڕۆم و یوری بەردەوام دەیوت ئەگەر ئەم جارە قاچم بشکێت هیچ کات چارەسەر ناکرێت و دەبێت قاچم ببڕنەوە.

لەکۆتایی رۆژی سێیەم یەکێك لەوەحشیەکان کە پێشڕەوەی ئێمە بوو بەڕاکردن خۆی گەیاندە ئێمەو بەدەم هاوارەوە وتی:

جاڵجاڵۆکە. جاڵجاڵۆکە.

من لەجاڵجاڵۆکە تەنیا چیرۆك و ناوم بیستبوو، باوەڕم نەدەکرد روبەڕوی ئەم دیمەنە ببمەوە. لەچاڵێك کە گیا نمدار و وەحشیەکانی جەنگەڵ روابوون وەك زنجیرە لەیەك ئالأبوون. دوو جاڵجاڵۆکەی گەورە داویان چنیبوو و بە چاوە سپیەکانی خۆیان سەیری ئێمەیان دەکرد.

ئەم دوو جاڵجاڵۆکە منالی زۆریان بوو، کێشی هەرکامیان دەگەشتە پێنج کیلۆ و یەکیان گەورەتر ئەویتریان بچووکتر بوو.

وەحشی ئامارژە پێدراو وتی:

جاڵجاڵۆکەی نێر بچوکترەو مێ گەورەترە. سکی تووکن و ڕەشی جاڵجاڵۆکە لەسەری مرۆڤ گەورەتربوو. وەحشیەکان من و یوریان زۆر بەئارامی لای چاڵەکەوە تێپەڕاند کەنەکا لەناکاو هێرش بکەن. دەیانوت جاڵجاڵۆکە پێنج مەتر دەپەڕێت و بەدیانەکانی خۆی بەئاسانی سکی مرۆڤ هەڵەدرێت.

کەمێك ئەولاتر یەکێك لەوەحشیەکان ڕمەکەی خۆی هاویشت و هاوارێك بەرزبوویەوە. لەناو گیاکان ڕەش پێستێك لەکاتێکدا ڕمەکەی کە لەسکی چەقیبو هەستاو دووبارە کەوتەوە. ئەوکەسەی کوژرا پاسەوانی وەحشیەکان بو. دیاربوو مووناکیش لەو دەوروبەرەدایە. لە هەموو ئەم ناوچەدا جاڵجاڵۆکەکان دەژین و هەندێ کات لەسەرلقی دارەکان بەرانبەرمان بەرز دەبوونەوەو دەپەڕین.

کاتژمێرێك دواتر قیژەی ژنێك بیسترا. ئەمە دەنگی مووناك بوو. بەجوانی دەمناسی تێگەشتم تازە مووناکیان خستۆتە ناو چاڵی جاڵجاڵۆکەکان و ئەگەر زووتر بگەین رەنگە بتوانین رزگاری بکەین. بەڕاکردن بەرەو دەنگەکە رۆشتم. لەدوورەوە مووناکم بینی کە دەستەیەك جاڵجاڵۆکەی گەورەو بچووك پەلاماریان داوەو خوێن لەسەرو روخساری دەچۆڕێت.

کاتێك چاوم بەخوێن کەوت بەتەواوی کۆنترۆڵی خۆم لەدەستدا. مرۆڤ هەندێ کات بێ ئیرادە دەبێت و زۆربەکەمی ئەمە لەژیانی مرۆڤەکاندا روودەدات و ئەو رۆژە ترس

ئەنگێزە من ئیرادە و دەسەڵاتی خۆمم نەبوو.

هۆکەشی ئەوەبوو جەستەی مووناکم خەڵتانی خوێن بینی. چەند جاڵجاڵۆکەیەکی گەورەو بچووک پەلاماریان دا و جەستەیان خوێناوی کردبوو.

وەك شێت رامدەکردو لەکاتی راکردن چاوم لێ هەڵنەدەگرت، لای خۆم بیرم دەکردەوە ئایا جاڵجاڵۆکەکان دەیکوژن و یان زیندوو دەمێنێت؟

ئایا گازی جاڵجاڵۆکەکان ژاراوی و کوشندەیە و یان ئەوەی ئازاری پێ ناگات؟

جاڵجاڵۆکەکان بەچاوە سپی و سوورەکانی خۆیان سەیریان دەکردم و وەك تەنافبازەکان لەسەر دەست و پێی خۆیان بەرزبوونەوەو لەنگەریان دەگرت تاپەڕنە سەر منیش و بەچارەنووسی مووناك گیرۆدەم کەن.

لەبەرئەمە، مێشکی من کە بەڕێکەوت باش کاری نەدەکرد و هێشتا باش نەببوویەوە لەقاچەکەی ترم گیربوو بەسەرەوە درام بەزەویدا و چەند تلێکم لێدا.

چاوم ڕەشکەو پێشکەی کردو ژانێکی توند لە قولاپەی پێم دروست بوو کە هاوارێکی کورت و پڕ ئازارم کێشا.

دەردو ترس لەوەی نەکا دووبارە قاچم بشکێت و لەکارو چالاکی دووربکەومەوە ئەوەندە بەسەرمدا زاڵ بوو، ئەوەندە پەرێشان بووم کە ئاگام لەدەوروبەری خۆم نەما.

تەکانێکم بەخۆمدا تا لەشوێنەکەم هەستم. پێش هەرشتێك قاچی راستم بەرزکردەوە تابزانم شکاوە یان نە. ئازارم زۆر بوو بەڵام بەخۆشحاڵیەوە دەمتوانی پەنجەی قاچم بجووڵێنم.

بۆ بەرز بوونەوە لەسەر زەوی هەستام بەڵام هێشتا بەئەندازەی پەنجا سانتیمەتر جەستەم لە خاك دوور نەکردبوویەوە کە دەنگی فیشکە فیشکی زۆرم بیست....

دەتوت دەنگی مارە. بەبیستنی ترسام و بەرەولای دەنگەکە سەرنجم راکێشرا و بەوپەڕی سەرسوڕمان بینیم نزیکەی بیست جاڵجاڵۆکە بەچاوی سپی و ئەو قیافە ترس ئەنگێزەیان ئارام ئارام نزیك دەبنەوە و شاخەکانی خۆیان تەکان دەدەن.

بەبینینی جاڵجاڵۆکەکان دەستم بۆ سیلاحەکەم بردو دووبارە لەسەر زەوی راکشامەوە. یەکەم گوولەم بەرەولای جاڵجاڵۆکەیەك کە تەنیا دوو مەتر لەمنەوە دووربوو تەقاند. تیکە تیکە بوو بەدەوروبەریدا بڵاو بویەوە. ئەوانیتر شاخەکانی خۆیان کۆکردەوە..... ئەمە نیشانەی ترس بوو لەمن. لەم دەرفەتە کەڵکم وەرگرت و بەخێرایی لەبەرانبەر یانی لەو شوێنەی جاڵجاڵۆکەکە کوژرابوو و رێگا کرابوویەوە رامکرد. یەك لە

جاڵجاڵۆکەکان لەگەڵ بەڕێکەوتنی من، لەنگەری گرت و چەند جارێك هەڵبەزو دابەزی کرد و لەناکاو بەرەو لای من پەڕی.

هەر پەڕینێکی ئەو دەگەشتە مەترێك بەم شێوەیە بەچوار بازدان بەمن گەشت و لەدواوە پەلاماری دام و خۆی خستە سەر ملم.

هەر ئەوەندە قورسایی جاڵجاڵۆکەم لەسەر ملمی خۆم هەست پێ کرد، ئەژنۆکانم کەوتە لەرزین و سست بووم ئیتر نەمتوانی هەنگاو بۆ پێشەوە هەڵگرم.

ئەژنۆکانم چەمانەوەو لەم ناوەدا سووتانەوەو کزانەوەیەکی توند لەپشتە ملم دەستی پێکرد. قیژاندم و تەکانێکی سەختم بەخۆم دا. ئەم تەکانە بووە هۆی ئەوەی جاڵجاڵۆکەکە لەسەر پشتەملم بکەوێتە خوارەوە.... بەبینینی جاڵجاڵۆکەکە بەدەم و قاچی خوێناوی ئازارم لەبیرکردبوو و بەدوو گوولەی یەك لەدوای یەك کوشتم و دووبارە رامکرد چونکە مەترسی جاڵجاڵۆکەکانی تر ئاشکرابوو.

مووناك دەنگی نەمابوو، ئاگام لێی نەبوو، نەمدەزانی مردوە یان زیندووە.

راستیەکەی ئەوەیە مووناك بەدەستی یوری رزگاری ببوو و لەمردن دوورکەوتبوویەوە بەڵام هێشتا کەس لە زیندووبوونی دڵنیانەبوو و یوری نەیدەتوانی رێگە لەخوێنبەربوونی بگرێت.

یوری کاتێك منی لەوێدا بینی بەرەو مووناك رایکرد چونکە دڵنیابوو دەتوانم بەرگری لە گیانی خۆم بکەم.... رزگارکردنی مووناك بەگوولە ئەگەری نەبوو چونکە بێچوە جاڵجاڵۆکەکان لەسەر جەستەی مووناك بوون و گەورەکان چاوەڕێی ئەنجامی کارەکەیان دەکرد کە لەکوشتنی نێچیرەکەیان کەڵك وەربگرن. یوری قەمەکەی دەرهێناو بەپانایيەکەی جاڵجاڵۆکە بچووکەکانی کوشت و فڕێیدان. گەورەکان بۆ پەلاماردان خۆیان ئامادە کرد بەڵام چەند تەقەی لەدوای یەك ئەوانیشی لەناوبرد و سەرئەنجام مووناك لەداوی تاڵی جاڵجاڵۆکە کە وەك تەنافێکی ئەستووری هاوریشمی بو هاتەدەرو بۆ شوێنێکی تر گواسترایەوە.

سەرقاڵی کاری خۆم بووم لەگەڵ جاڵجاڵۆکەکاندا شەڕم دەکرد و لەترسی ئەوان هەنگاو بەهەنگاو دەڕۆشتمە دواوە و ئەوانیش دەهاتنە پێش....

چەند هەنگاو ئەولاتر لەوپەڕی سەرسوڕماندا بینیم جاڵجاڵۆکەکان لەناکاو وەستان و لەهەمان رێگا کەهاتبوون گەڕانەوە.

سەرم سوڕما..... وەستام..... چی بو جاڵجاڵۆکەکان رۆشتن. لەهەمان کات شادمان

بووم کە لەژیانی جاڵجاڵۆکەکان پارێزراو دەبم.

لەم کاتەدە شتێك وەك گاز و دەندە دەندە کە دوو شاخی پێوەبو قوولاپەی قاچی گرتم و سیخە تیژەکانی خۆی لە گۆشتی قاچم چەقاند، قیژاندم و لەتاو ئازار لەسەر زەوی دانیشتم. تفەنگەکەم لەدەستداو و هەناسە لەسینەمدا قەتیس ما.

هێشتا خوێنی پشتەمل و سووتانەوەکەی بەردەوام بوو کە دووبارە خوێنی تازە لەقاچم هاتەدەر. پێش ئەوەی هۆی بەربوونی خوێنم بدۆزمەوە، سووڕیەکەیم بینی.

بەهەرحاڵ دانیشتم و کە سەیری ئەوێم کرد شتێکی سەیرتر لە هەموو ئەو ئاژەڵانەی تا ئەو رۆژە لە جەنگەڵی وەحشی ئامازۆندا روبەڕوویان ببوومەوە، بینیم. لەبەشەکانی پێشوودا لەگەڵ ئەورانگوتان و گووریلە زلەکاندا روبەڕوببوومەوە بەلام ئەوەی لەوێ دەمبینی لەهەموو شتێك تەنانەت لە جاڵجاڵۆکە دە کیلۆیەکانیش سەرسوڕهێنەرتربوو. قرژاڵێکی رەنگاورەنگ کە کاسەی پشتی بەئەندازەی سینیەکی خری گەورە بوو بەچنگاڵەکانی خۆی قاچی منی گرت و بەهۆی زەختی خوێن بەربوو.

بۆ هەڵگرتنی تفەنگەکەم لەدوروبەرم ڕوانی، بەداخەوە سیلاحەکەم لەترسا لەدەست کەوتبو، نەمتوانی هەڵیبگرم. ناچار دارێکم هەڵگرت وبە توندی کێشام بەپشتی قرژاڵەکەدا. لەم زەربە دەنگێکی وشك بەرز بوویەوە بەلام قرژاڵ هیچی لێ نەهات سەر قاڵی کارەکەی خۆی بوو و قاچمی دەگووشی و خوێنی دەخوارد.

هێشتا لەدەست ئەمە رزگارم نەببوو کە قرژاڵەکانی تر لەپشتەوە هاتن پەلاماریان دام. نێچیرێکی باش کەوتبوە تۆڕیان و بەخێرایی بۆ بردنی بەشەکەیان دەهاتن و هەرکام بەشێکی جەستەمی گرت و بریندارى کرد.

بەدار لەسەرو پشتیانم دەدا بەلام دەتوت ئەو ئاژەڵە ناحەزانەیان لە ئاسن وپۆلا دروست کردوە کە کەمترین گۆرانکاریان تیادروست نەدەبوو و لەهەمووی خراپتر ئەوەی ژمارەیان سات بەسات زیاتر و مەترسیدارتر دەبوون.

مەرگم لەبەرچاوی خۆمدا دەبینی و نەمدەزانی لەگەڵ ئەو قرژاڵانەدا دەبێت چی بکەم.

یەك لە قرژاڵەکان بە قاچمدا هەڵگەرا تا پەلاماری روخسارم بدات.... دواتر یوری وتی مەبەستی ئەو قرژاڵە کوێر کردنی چاوی تۆبوو چونکە تاکاتێك نێچیرەکەیان چاوی هەیە ئەوان ئاسوودە نین و پێش هەرشتێك نێچیرەکەیان کوێر دەکەن تارێگەی هەڵاتنی لێبگرن. ئەوکات زانیم بۆچی جاڵجاڵۆکەکان نەهاتنە پێش و رۆشتن.

قاچی یەکیانم گرت و بەتووندی لەگۆشتی جەستەی خۆم جیاکردەوە. لەم کاتەشدا ئەو ئاژەڵەم لەپشتەوە کێشا بەیەکیَ تریاندا. دەنگێك بەرزبوویەوە و کاسەی پشتی هەردوکیان شکا و شلەمەنیەکی زەرد رەنگ لەکەلێنی پشتیانەوە هاتەدەر و هەردوکیان مردن.

تێگەشتم کە پشتی قرژاڵەکان رەق و بەهێزە و لەوێوە کە هەرشتێکی رەق شکێنەرێکی هەیە، شکێنەری کاسەی پشتی قرژاڵەکان خۆیانن. لەو ساتە بەدواوە دەست بەکاربووم. یەکم هەلەگرت و بە هەردوو دەست دەمکێشا بەویتردا، دەمکوشت و فرێمدەدا. لەشلەمەنی زەرد رەنگ کە لەپشتی قرژاڵەکانەوە دەهاتە دەر، بۆنێکی زۆر ناخۆش بلاّو بوویەوە.

بۆگەنێك کە لە بۆگەنی لاشە و جەستەی هیچ ئاژەڵێك نەدەچوو. ئەوەندە نارەحەتکەربوو کەم کەم هەناسەم دەکێشا تا کەمتر ئازار ببەم.

لەچەند خولەکێکدا ژمارەیەك لە قرژاڵەکانم کوشت بەلاّم ژمارەیان ئەوەندە زۆربوو ئەگەر لە هەر خولەکێکدا دە دانەم بکوشتایە نەمدەتوانی بەئاسانی لەدەستیان رزگارم بێت.

لەم کاتەدا بیرێك بەمێشکمدا هات. گوومانم کرد باشترە بەهەر جۆرێك بووە خۆم بە سیلاحەکەم بگەیەنم. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە لەناکاو لە شوێنەکەم هەستام. چەند قرژاڵێك کە لەسەر جەستەم بوون کەوتن و توانیم چوار هەنگاو برۆم بەلاّم هێشتا لە تفەنگەکەم دوور بووم کەلەتاو ئازار کەوتم.

ئەم جارەیان چنگاڵی یەکێك لە قرژاڵەکان لەپشتەوە قورگی گرتم و فشاریدا. شلەمەنیەکی گەرم لە ژێر چنگاڵیەوە دەرچوو. هەستم کرد خوێن لەملم دێتەدەر. هەناسە لەسینەمدا تەنگ ببوو. چاوەکانم لەبەر توندی زەختی ئەوان نوورو رووناکیان لەدەستدا. دەتوت هەموو شوێنێکی دنیا تاریکە و لەتاریکیدا رۆدەچم.

لەسەر ئەو رەشاییە پەردەیەکی سور رەنگ دەهاتە بەرچاو کەخوێن بوو.....

بۆ لابردنی قرژاڵەکەی پشتەملم هەوڵم دا. هەوڵم داو سەرنەکەوتم. ئیتر بازووەکانم توانای جووڵەیان نەبوو و چاوم هیچ شوێنێکی نەدەبینی.

نەمزانی چ ماوەیەك بەم حاڵە تێپەڕی.... دڵنیابووم لە مەرگی خۆم وەلەهەمان کاتدا بەخۆمم وت:

گریمان یوری بگات و من لەم گێژاوە مەرگ هێنەرە رزگاربکات. برینەکانم ئەوەندە

زۆرن هیوایەك بەباش بوونەوەم نیە وە بەدڵنیاییەوە گیان دەسپێرم.

لە دنیا و جوانیەکانی ماڵئاواییم کرد و وە بەحەیفم زانی دوای ٦ ساڵ ژیان لەناو جەنگەڵ و رزگاربون لەو هەموو مەترسیە ببمە پاروی قرژاڵەکان و جەستەم ببەنە ناو ئاو.

دەمویست لانی کەم کاتی شەڕ لەگەڵ شێرێك بکوژرامایەو ناوم لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بلاْوبکرایاتەوە وەهەموان دەست خۆشی لە بوێری و چاونەترسی من بکەن.

لەم ئەندێشەدا نقووم ببوم تا قرژاڵەکان هەرکارێکیان دەوێت بابیکەن چونکە باوەڕم وابوو هەوڵی بێ هۆ و هێزو ووزەی من لەناو دەبات و مەرگم تاڵتردەکات.

لەم کاتە مەترسیدارەدا کە لەهەموو کەسێك و شوێنێك هیوابڕاو ببووم لەناکاو دەنگی چەند تەقەیەکی یەك لەدوای یەکم بیست و دواتر دەنگی پیێ/ لەنزیك گوێی خۆمدا هەست پیێ کرد کە بەخێرایی بەدەوری مندا دەڕوات رەنگە هەڵبەزو دابەز دەکات. نەمدەتوانی چاو بکەمەوە و خاوەنی دەنگەکە ببیستم....

توانای تەکاندانی سەری خۆشم نەبوو لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیابووم هیچ کەس جگە لەیوری نیە.

لەهەمان کاتدا دەموت:

رەنگە بەهەڵەدا چووم.... گوومان و خەیاڵە چونکە مرۆڤ لەکاتی مردنیدا لەم گوومان و وەهمە پوچانەی زۆرە.....

تەنانەت بۆنی باروتیشم کرد لەگەڵ ئەوەشدا هەموویم بەزادەی بیرو خەیاڵ و وەهم گوومانەکانی پێش مردن لەقەڵەم دا و گرنگیم پێ نەدان. چەند چرکە تێپەڕی، دەرکەوت بەڕاستی کەسێك بەپێڵاوە قورسەکانی لەدەوروبەری مندا دەڕوات و هەوڵ دەدات.

ئەوەندەم توانایی نەوبو چاوی خۆم بکەمەوە، گوومانم دەکرد بێهۆش بم. رەنگە بەڕاستی بێهۆش بم بەلاْم بەهەرحاڵ ئەم دەنگانەم دەبیست وبە هەمان شێوە کە وتم بۆنی باروتیشم کرد.

چەند جارێکی تر دەنگی گرپ گرپ و تەرق تەرقم لە دەوروبەری خۆمدا بیست و سەرئەنجام دەنگەکە نەماو دەستێك بازووی گرتم و منی تلاند.

لەم کاتەشدا زۆرم هەوڵدا چاوەکانی خۆم بکەمەوە بەلاْم نەکرا.....

دەتوت پێڵوی چاوەکانمیان دووریوەتەوە وە توانای قسەکردنیشیان لیێ سەندووم بەلاْم لەجیاتی هێزی تێگەشتن و وەرگرتن هەستەکانی ترم زیاد بوو.

کاتێك بازووی گرتم و تلام دڵنیابووم یوری بۆ سەدەمین جار گەشتووە و منی لەمردن رزگار کردووە.

بەهەرحاڵ یوری منی تلاندو پێش هەرکارێك گوێی بەدڵمەوە ناو و، بە وەحشیە چەکدارەکان کە لەگەڵیدابوون وتی:

خێراکەن...... هەڵیگرن و بەڕێکەون..... من رێگا لە جاڵجاڵۆکەکان پاك دەکەمەوە.

دەنگی یوری هێزی پێ بەخشیم. دەتوت تا ئەم ساتە دەترسام بێ هۆش ببم. ئەگەر دەسەلاتی بێهۆش بوون و هاتنەهۆش بەدەست مرۆڤ خۆی بێت، دەتوانین بڵێین من لەترسی مەرگ هاوسەنگی خۆم دەپاراست و کاتێك یورم لای خۆم بینی دڵنیابووم و لەهۆش خۆ چووم.

دوو سێ لە وەحشیەکان منیان لەسەر دەست گرت و بەڕێ کەوتن. ئیتر نەمزانی چی بوو چی روویدا ! ئەمجارەیان بەڕاستی و بەتەواوی بێ هۆش بووم.

کاتێك هاتمە هۆش نەسیمێکی فێنك هەڵێ کردبوو و دەنگی بەریەك کەوتنی لق و گەلاَی دارەکان لەپەنجەرەی ژوورەکە دەبیسترا.

چاوم کردەوە و سەیری دوروبەرم کرد، لەیەکێك لەماڵەکانی هۆزی ئامازۆندابووم. گوومانم بو لەماڵەکەی خۆم بم چونکە نیشانەی خوای جەنگەڵ لەسەر قەڵغانێك کە بە دیواری ژوورەکەوە هەڵواسرابوو دەبینرا. ئەمەنیشانەی تایبەتی ئامازۆنەکان بوو. ئەوەی دەیڵێم لەحاڵەکەی خۆم دابووم فشەم نەکردبوو. لە ٦ ساڵ پێش کە من لەهۆزی ئامازۆنم لەناو دانیشتوانەکەیدا دەژیام، لەم ماوە دوورودرێژەدا ئەخلاق و داب و نەریت و عادەتەکانی ئەوان فێرببوم وە بەشوێنی هۆزو ژوورەکانی عادەتم گرتبوو بەجۆرێك کاتێك سەرم بەرزکردەوە لەپەنجەرەوە سەیری ئاسمان ولقی دارەکانم کرد. هەوا روون ببویەوەو نیشانی دەدام تازە بەیانی بۆتەوەو هێشتا هەتاو هەڵنەهاتووە.

دووبارە سەرم خستە سەر کۆڵە پشتی کە وەك سەرین خستبوویانە ژێر سەرم وەهەوڵم دا رووداوەکانی رابردوو بیر بێنمەوە.

بەبیرهێنانەوەی رابردووەکان کارێکی دژوار نەبوو بەئاسانی ئەنجامی گرت. بە پێچەوانەی جارەکانی پێشوو یەك یەکی دیمەنەکان و رووداوکانم بیرکەوتەوە تا ئەوەی گەشتمە جاڵجاڵۆکەو قرژاڵەکان.

لە وێنەکردنی قیافەی ئەو دوو ئاژەڵە کەوتمە لەرزین. جەستەی تووکن و چاوی سپی و دەست و پێی پۆشراو لە مووی زەرد رەنگی جاڵجاڵۆکەکان و لە ئەنجامدا

چنگاڵی دەستی قرژاڵە خوێنخۆرەکان هەرکام بەس بوو ماوەیەك زەینم بەخۆیانەوە سەرقاڵ بکەن و بم لەرزێنن.

دڵنیام هەرمرۆڤێکی ئازا توانای بینینی پەلاماری جاڵجاڵۆکەکانی بۆ سەر مووناك نەبوو. خوێندنەوەی داستانێك کارێکی ئاسانە چونکە ئێوە هەر کەسێکن ئێستا لەسەر کورسیەك راحەت پاڵتان داوەتەوە و سەرقاڵی خوێندنەوەی ئەم سەربوردەن و شوێنەکەتان ئەمن و ئاسوودەیە. بۆ بەراورد کردنی حاڵی ئێمە و وێنەکردنی کێشە و دژواریەکان ئەوەندە بەسە بەهێزی گوومان و بیرکردنەوەی خۆتان لانی کەم یەك خولەك خۆتان بخەنە شوێنی من و یوری تا تێبگەن مانای ترس چیە.

بێنە بەرچاو کە یەکێك لە قرژاڵەکان پەڕیوەتە سەر پشتی ئێوە جاڵجاڵۆکەیەکی ١٥ کیلۆیی لەسەر شانی ئێوەیەو دیانەکانی خۆی کردۆتە ئاشنای گۆشتی جەستەتان وەخوێن دەرژێت.

لێرەدا موو لەسەر ئەندامی مرۆڤ راست دەبێت و ئارەقێکی سارد دەکەوێتە ناوچاو. دواتر بیرم کردەوە جەستەم بریندارو خوێناوی بوو. بەئارامی هەستام و دەستی راستم بۆ پشتم برد. لە سووتانەوەو ئازار خەبەرێك نەبوو بەڵام کاتێك دەستم بەپشتم گەشت چەوری رۆنم هەست پێ کردو بۆنە ناخۆشەکەیم بەلووت گەشت. زانیم دەرمانیان لەبرینەکانم داوە.

دەمویست لەچارەنووسی مووناك ئاگادار بم، تەکانێکم بەخۆم دا تا لەشوێنەکەم بەرزبیمەوە و لە ژوورەکە بڕۆمەدەر بەڵام هێشتا نەکەوتبوومە سەر پێ کە دەستێکی ناسك بازوومی گرت بە دەنگێك کە وەك ئاوازی مۆسیقا رۆح پەڕوەربوو وتی:

بخەون.... ئێوە تا دوو رۆژی تر نابێت بجووڵێن. هێشتا برینەکەتان باش نەبووە.

بەخێرایی ئاوڕم بۆ لای دەنگەکە دایەوە کچێکی ئامازۆنی وەك کچەکانی تر لەپشتە سەرم دانیشتبوو. دیار بوو لەسەرتای بەهۆش هاتنەوەم لەوێ بوو.

لەرووناکی زیو رەنگی بەرەبەیان، بەو نەسیمە رۆح پەروەرەی هەڵیکردبوو، ئەوەندە جوان بوو تەنانەت وێنەی ئەو لەناو جوانترین ئەستێرەکانی هۆلیوود و ئەو کچانەی وەك شاژنی جوانی هەموو ساڵێك هەڵەبژێردرێن دەست نەدەکەوت.

گوومان ناکەم لەدنیادا ژنێکی تر بەوجوانیە بێت.

ئەمە باوەڕی ئەو کاتژمێرەو ئەو رۆژانەی من بوو، ئێستاش باوەڕم بەرانبەر بەوە هەیە.

مووناك جوان بوو لئۆنا لەوجوانتر بەڵام ئەمەیان جوانتر لەوان دەهاتە بەرچاو.

دەمیشم کراوەبو وە تازە تاتێك ورەم بەخۆم داو پرسیم:

تۆ...... تۆ کێیت.....؟ لێرە........ چی دەکەیت.............؟

تێگەشتم کە لەو چەند خولەك بێدەنگیەدا دەمم بە شێوەیەکی ناشرین کراوەتەوەو نیشانی دەدا بێ ئەندازە لەبینینی ئەو سەرسوڕماو رەنگە شادمان بم.

کاتێك ئەم حاڵەتەی منی بینی، بزەیەکی گرت و سەری داخست و دواتر لەکاتێك بەگیای حەسیرەکە یاری دەکرد وتی:

من پەرستاری ئێوەم.

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم:

پەرستاری من......؟

دووبارە بزەیەکی هێنایە سەر لێو و وتی:

بەڵێ پەرستاری ئێوە...... منیان بۆ ئێرە ناردوە تا لەکاتی بێهۆشیدا ئاگام لەئێوە بێت.

پرسیم:

تا کامەیە....... مەگەر من تام لەگەڵدابو؟

چوار رۆژە ئێوە بێهۆشن... ئەمڕۆ بەیانی رۆژی پێنجەمە. لەم چوار رۆژەدا تاییەکی زۆر بەهێزتان بوو و جادوگەرانانی هۆز بەردەوام دەرمانیان دەڕژاندە قوڕگی ئێوە و برینەکانتانیان چەور دەکرد.

کاتێك ئەو قسەی دەکرد دەتوت دڵم دەگوشن.

ئەوەندە شادمان بووم کە ئاوی دەمم بەدژواری و دەنگێکی تایبەت قووتدا. کاتێك قسەکەی تەواوبوو داخم خوارد بۆ ئەو چوار شەوەی لەسەر سەری من بەسەربردوە و من لەوبەختەوەریە بێ ئاگابووم.

وتم:

یوری و مووناك چی دەکەن.

لەوەڵامدا وتی:

یوری ئێستا دێتە ئێرە. بەڵام مووناك نەخۆشە و هێشتا نەهاتۆتەوە هۆش. گازی جاڵجاڵۆکەکان ژەهرێکی تایبەتی هەیە کە بڕواتە ناو جەستەی هەرکەسێك بێهۆش دەبێت و ئەگەر ژمارەیەکی زۆر جاڵجاڵۆکە بە کەسێکەوە بدات ئەو لە خەودا دەمرێت و

هیچ کات ئاگای نابێتەوە.

ئەو راستی دەوت بێهۆشی من و مووناك بەهۆی ئاوی دەمی جاڵجاڵۆکەکان بوو. دواتر زانیم لە دەمیاندا بڕێکی کەم ئەسیدفۆرمێك بە شێوەیەکی کیمیای تایبەت هەیە کەمرۆڤ تووشی خەو و بێهۆشی دەکات.

بەشادمانیەوە لەمەترسی رزگارم ببوو بەڵام هێشتا مووناك لەخەودابوو. دوای ئەم قسانە چەند خولەکێك بەبێدەنگی تێپەڕی. لە ژێر چاوەوە سەیرم دەکرد.

قژی وەك هاوریشم و رەنگی پێستی لە میوەی داری بەڕو دەچوو. پێستی جەستەی وەك پێستی ژنانی ئامازۆن بەڵام لەناسکی دا کەم وێنەبوو.

بێدەنگی چەند خولەکیم شکاند و بەدەنگێك کە زیاتر پارانەوەی پێوە دیاربو وتم:

ناوی تۆ چیە......؟

زەق لەچاوەکانی منی ڕوانی و وتی:

پێویستە هەرکەس ناوی پەرستارو خرمەتکارەکەی خۆی بزانێت.......؟

ئەم وەڵامە وەك پیکێکی بەهێز بەر مێشکم کەوت و بەسەختی تەکانیدام.....

وەڵامێکی سەیرو دەم شکێن بوو؟ دەتوت لەگەڵ مندا لەشەڕدایە و نەیدەویست ڕێگای عەشق و خۆشەویستی بکاتەوە.

هەناسەم خولەکێك زیاتر یان کەمتر لەسینەمدا زیندانی کرد و دواتر هەناسەیەکم کە لەگەڵ خۆیدا هەموو ئازارەکانی ناخمی هێنایەدەر، هەڵکێشاو وتم:

پێویست ناکات کەس ناوی پەرستارەکەی بزانێت بەڵام من لەتۆ وەك پەرستارێك ناڕوانم.....

ئەو بزەیەکی گرت و وتی:

پێویست ناکات ناوی من بزانیت بەڵام خۆم ئارەزوومەندم ناوی خۆم بڵێم و ئەگەر نەشتپرسیایە من دەمەوت چونکە دەمەوێت ئێوە ناوم بزانن.....

ئەگەر لەو کاتەدا خاوەنداریەتی دنیایان بەو هەموو سامانەکانیەوە بەمن دەبەخشی، ئەوەندە شادمان نەدەبووم کە بە بیستنی ئەو رستانە لەزمانی ئەو شادمان بووم.

وتی:

ناوم (( ئەمانۆ ))و دایە گەورەم لەگەڵ دایە گەورەی مووناکدا خوشك بوون.....

کەمێك خۆم لێ نزیك کردەوە بەڵام ئەمانۆ بەتووڕەیی خۆی کێشایە دواوەو لە شوێنەکەی هەستا. رەنگی پەڕی و تووڕە دەهاتە بەرچاو لەم کاتەدا یوری هات و

دیمەنەکە خۆبەخۆ گۆڕا.

یوری تانزیك نیوەڕۆ لە ژوورەکەی مندابوو و ئەمانۆ خزمەتی دەکردین، خواردنی ئامادەکرد و میوەی هێنا بەبێ ئەوەی سەیرم بکات و تەنانەت یەك وشە بڵێت...

دەمویست من و ئەمانۆ بەتەنیا جێ بێڵن و بڕۆن. بەڵام بەداخەوە ئەگەری نەبوو لەوەش خراپتر ئەمانۆ خۆی بەدەستەوە نەدەداو بەئەنقەست سەرسەختی و خۆراگری لەبەرانبەر من زیاتر دەکرد و منی کردە شێتێکی زینجیرەیی.

یوری تا ئەو سات هەستی پێنەکرد، ڕەنگە هەستی کردو قسەی نەکرد. چەند کاتژمێر دوای نیوەڕۆ ئەمانۆ ڕۆشت. دەتوت ماوەی خزمەتکردنی تەواو بووە و بۆ ئەنجامدانی کارەکانی خۆی دەڕوات و منی بەتەنیا بەجێهێشت. بەهەرحاڵ هەر ئەوەندەی ئەو ڕۆشت من وەك شێت لە شوێنەکەم هەستام و لە دەوروبەری ژوورەکە و لێرەو لەوێ بەدوایدا گەڕام.

یوری پێکەنی و دەستی گرتم و وتی:

ها........ چی بوو.......؟ بۆ ڕەنگت پەڕا...... بۆ لێوەکانت دەلەرزن..... چیت بینیوە.......؟

دەمویست لەوەڵامدا بڵێم هیچ ڕووینەداوە بەڵام نەمتوانی چونکە دەست بەجێ یوری درێژەی بەقسەکەی داو وتی:

ئەمانۆ کچێکی جوانە بەڵام ئەوە بزانە ئەو لەگەڵ لئۆنادا زۆر جیاوازە.

بەسەرسوڕمانەوە دانیشتم و سەیری دەمی یوریم کرد کەلەبارەی دڵگیرترین بابەتەکان یانی لەبارەی ئەمانۆ قسەی دەکرد ...... دەتوت دەمەوێت وشەو ڕستەکان لەدەمی بگرم و بیخۆم.

ئەو وتی:

هەمو گەنجەکان عاشقی ئەون... پیاوێك نیە یەکجار بیبینێت و دڵی لەدەست نەدات ئەو بەڕاستی خۆشەویست و دڵڕفێنە بەڵام بەداخەوە گوێ بەکەس نادات، گوومان دەکەم عاشق بێت چونکە تا عاشق نەبێت تا ئەم ڕادە خوێنساردی و بێ سەرنج نابێت.

بەسەرسوڕمانەوە لێم پرسی:

تۆ ئەم زانیاریانەت لە کوێوە بەدەست هێناوە.....؟ پێم وابێ تۆش....

قسەکەی منی بڕی و وتی:

نە من عاشقی ئەو نیم چونکە دەمزانی ئەگەر ئێوە ببینن عاشقی دەبن. پێش

هەرشتێك ئەم زانیاریانەم لەسەر ئەخلاق و هەڵس و کەوت و ژیانی گشتی ئەو کۆکردەوە رەنگە بۆ بەدەست هێنانی دڵی بەکەڵك بێت. کارێکی خراپم نەکردوە...... وانیە......؟

بەدوای ئەم قسانە هەردووکمان پێکەنیین، هەم من و هەم یوری ماوەیك ئەم پێکەنینە لە ژوورەکەدا دەنگی دەدایەوە....

راستت بوێت یوری لە دڵەوە پێدەکەنی بەڵام من پێکەنینەکەم دەستکرد و هەموو هەست و سەرنجم لای ئەمانۆ بوو و لەخەیاڵمدا بەدوای دەگەڕام.

دوای نیوەڕۆ یوری بۆ هەندێ کاری پێویست لە ژوورەکە رۆشتەدەر و منیش لەم دەرفەتە کەڵکم وەرگرت و رۆشتمە دەر.

( ١٣ )

ڕۆشتنەدەری من بۆ زۆربەی وەحشیەکان بەشتێکی گرنگ دەژمێردراو بەسەرسوڕمانەوە وەستان و سەیری منیان کرد و ڕوانینی ئەوان هاوشێوەی ڕوانینی کەسێك بوو کە لە مردوویەکی دووبارە زیندوو دەڕوانن. ئەوانیش منیان بەمردو دەزانی چونکە باوەڕیان نەدەکرد کەس لەسەر زەمینی جاڵجاڵۆکەکان و لەناو قرژاڵەکان بەزیندوویی بگەڕێتەوە، بەسەرسوڕمانەوە سەیری منیان دەکرد و بەدڵنیاییەوە بەخۆیان دەوت ئەمە چ ئاژەڵێکە پێستی ئەوەندە ئەستوورە و لەهەموو مەترسیەکان گیان بەدەردەبات و لەیەکەم هەنگاو سەرنج و سەرسوڕمانی ژنان وپیاوی ئامازۆنیم لەگەڵدابوو و چەند خولەك دواتر لەناکاو خۆم لە بەرانبەر ژوورێکدا بینی کە لئۆنایان تیا زیندانی کردبوو.

ڕاستتان بوێت نەمدەویست بڕۆمە ناو زیندانەکە چونکە دەترسام حەزو بیرەوەریە کۆنەکان ئەندامەکانم سست بکات و ببێتە هۆی کردنەوەی دەست و پێی ئەو. لەمن دووربوو ئازادی کەم و هۆکارەکانی ڕاکردنی ئامادە بکەم. بۆیە دەمویست بە گوێنەدان بەدوای کاری خۆمدا بڕۆم و ئەمانۆ بدۆزمەوە بەڵام دەنگە دەنگێك کە لەناو ژوورەکەوە هات منی کێشایە ئەوێ و ناچار ڕۆشتمە ژوور.

لەدەرەوە دەنگی گرپە گرپی زۆر بەگوێ دەگەشت. دەتوت چەند کەس پێکەوە شەڕیانە بە مشت و لەقەو دار لەیەك دەدەن.

سەرم سوڕماو بەخۆمم وت:

ئەگەر لئۆنا لێرەدا زیندانیە، ئەم دەنگە دەنگە بۆچیە....؟

ئارام ئارام بەرەو ژوورەکە ڕۆشتم، دەرگاکە نیوە کراوەبو کردمەوەو ڕۆشتمە ناو. لە ژوورەوە شەڕێکی گەورە لەئارادابو کە ئەگەر باسی بکەم ڕەنگە کەس باوەڕنەکات.

لئۆنا دارێکی دەست کەوتبوو وەك مێچکە گورگێکی بریندار لەناوەڕاستی ژوورەکە هەڵبەزو دابەزی دەکرد. بەهەر لایەکدا دەڕۆشت لەدانەیەکی دەداو دەیخست. چەند کەس لەپیاوە ئامازۆنیەکان کە لەبەهێزترین پیاوانی جەنگەڵی باران دەژمێردرێن توانای گرتنی دارەکەیان لەدەست لئۆنا نەبوو و لەگەڵ ئەوەی لێی نزیك دەبوونەوە بە

بەركەوتنی دارێك دەگەڕانەوە و بەدەم ناڵاندنەوە لەگۆڕەپانەكە دەڕۆشتنە دەر.

خوێن بەرچاوی لئۆنای گرتبوو بەشێوەیەك كاتێك منیش ڕۆشتمە ژوور بۆ ئارام كردنەوەی ئەو دەستم بردەپێش منی نەبینی و بەدارەكەوە پەلاماری دام.

ئەگەر خۆم نەكێشایەتە دواوە لێی دەدام و بریندارى دەكردم.

ڕەش پێستەكان كاتێك منیان بینی، دەتوت لەنەتوانینی خۆیان شەرمەزاربوون وەستان وسەریان داخست.

دوانیان بەڕادەیەك بریندار ببوون توانای ڕاگرتنی خۆیان نەبو، ڕۆشتنی من بۆ ژوورەكە لئۆنای نەترساند بەڵكو كاتێك ڕەشەكان وەستان، لئۆناش لەهێرش كردن دەستی هەڵگرت. دەترسام بڕۆمە پێش چونكە دەمزانی لئۆنا لەمن دڵڕە و دوورنیە بەدارێك سەرم بشكێنێت یان ئێسقانەكانی سینەو پشتم وردكات، لەگەڵ ئەوەشدا هەنگاوێك ڕۆشتمە پێش و بەدەنگێك كە هەوڵم دەدا بەهێزبێت بیترسێنێت وتم:

لئۆنا چی دەكەیت......؟ مەگەر شێت بوویت......؟

وەڵامی نەدامەوە...... بەپشتی دەست ئارەقی ناوچاوی سڕی و دواتر قژەپەڕێشانەكانی لەسەر چاوی لابردو ڕۆشتە دواوە تاپاڵی بەدیوارەكەوەدا.

دیاربو زۆرهیلاك بووە چونكە هەناسكە بڕكێی بوو. سینەی بەهۆی هەناسە كێشان بەرزو نزم دەبوویەوە.

دووبارە پرسیارم لێ كرد وەڵامی نەدامەوە.

ئەم جارە یەكێك لە ڕەشەكان وتی:

سەرۆك، كاتێك من هاتمە ژوور ئەو تەنافی دەست و پێی كردبوویەوە و دەیویست رابكات ئەگەر خولەكێكی درەنگتر دەگەشتم ئەو رایدەكرد و ئیتر دەستی كەسی پێنەدەگەشت.

پرسیم:

ئەمە راستە ! بۆ شەڕتان دەكرد.....؟

ڕەش وتی:

بۆچی ناوێت. ئەو دەیویست رابكات و منیش ڕێگر بووم.... دارێكی دەست كەوت و پەلاماری دام بەهۆی دەنگە دەنگی من ئەوانیتریش هاتنە ئێرە بەڵام پەلاماری ئەوانیشی داو كاری گەیاندە ئێرە كە دەیبینن.

ورەم بەخۆم داو بەئیشارەی دەست ڕەشەكانم لەژوورەكە كردەدەر. ئەوان

بریندارەکانیان هەڵگرت و ڕۆشتن. بەڵام هەستم کرد چەند کەسێك لەپشت ژوورەکە وەستاون و ئاگادارن نەکا هێرشم بکاتە سەرو بریندارم بکات.

شادمان بووم بەدڵنیایەکی زیاترەوە لێی نزیك بوومەوە وتم:

بۆ دەتویست رابکەیت؟

چاوە ڕەش و گیراکانی خۆی بڕیە چاوی من و ئاوی دەمی قوت دا و وتی:

ئەم جارە دەمویست دەزگیرانە تازەکەت بکوژم تێدەگەیت؟ تۆ ناکوژم بەڵکو ئەو دەکوژم. خوشت دەوێت تا ڕەنج ببەیت و خەفەت بخۆیت. من حەزم لەرنج بردن و ئەشکەنجەدانی تۆیە و چێژی لێدەبەم.

بەخوێنساردی و بێ گوێدان پرسیم:

دەزگیرانە تازەکەم کێیە؟

سەری وەك هەڕەشەکردن تەکان دا و وتی:

ئەمانۆ..... ئەمانۆی جوان..... من دڵی لەسینەی دەهێنمەدەر.

دواتر کەمێك وەستاو درێژەی دا.

ئەو ڕۆژە لە کوشتنی موناك درەنگم کرد چونکە خوێنی سەرۆکی هۆز شوومە و ئەگەر کەسێك بیانکوژێت و خوێنیان بڕژێت، گیرۆدەی تووڕەیی خواکانی جەنگەڵ دەبێت بەڵام ئەو کچە وشك و بێ بزە بەزیندوویی ناهێڵمەوە.

مەبەستی ئەو لە کچی وشکی بێ بزە، ئەمانۆ بوو.... چونکە بەڕاستی ئەمانۆ بزەی لێ نەدەداو بەو هەمو جوانیە وشك و مۆن دەهاتە بەرچاو.

یەکەم ئەوەی من و ئەمانۆ هیچ پەیوەندیەکمان نیە دووەمیش لەنێوان من و تۆدا هەرچی بو تەواو بوو. تۆ مافی ئەوەت نیە خۆت لەکارەکانی من هەڵقورتێنیت بەتایبەت کە ئێستا کەوتوویتە بەر تووڕەیی دانیشتوان و درەنگ یان زوو بۆ کوشتنی تۆ کاردەکەن.

هێشتا قسەکەم تەواو نەکردبوو کە روخساری لئۆنا وەك خوێن سوڕبوویەوە. ماسوولکەکانی روخساری لێیان دەداو لێوی خوارەوەی لەناو دوو ریزی دیانە سەدەف ڕەنگەکانی گەست و وەك شێرێکی تووڕە پەلاماری دام.

خۆم کێشایە دواوە، پەلامار دانی ئەو گرنگ نەبوو بەڵکو بەدوای ئەودا داردەستەکەشی بەرزبوویەوە و حەواڵەی سەرم کرا. ئەگەر دارەکە بەو بەهێزیە بەر سەرم دەکەوت مێشکم دەپرژاو دەکوژرام.

بەخۆشحاڵیەوە لەسەر زەوی تلام و لئۆنا نەیتوانی لەمن بدات. دواتر وەك ئەوەی لە کردەوەی خۆی پەشیمان بوبێتەوە، گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی وەستا.

لە شوێنەکەم هەستام و بەڕەنگێکی پەڕاو و دڵێك کە بەتووندی لێی دەدا، گەڕامەوە لای و بەنەرمی وتم:

لئۆنا شێت بویت؟ ئەم کارانە نە تەنیا قورسایی گووناحەکانی تۆ کەم ناکاتەوە بەڵکو سەد بەرابەر لێپرسراوی تۆ لەبەرانبەر هۆز و یاساکانی زیاد دەکات. عاقڵ بەو لەجیاتی ئەو، من دەستوور دەدەم لەمەودوا دەست و پێی تۆ بەتەناف نەبەستنەوە تا لە ژوورەکەدا ئازاد بیت.

ئەمەم وت و لە ژوورەکە رۆشتمە دەر. چونکە قسەکردنی زیاتر لەگەڵ لئۆنا بێ ئەنجام و ئەوی زیاتر تووڕە دەکرد. سێ لە ڕەش پێستەکان لە دەرگای ژوورەکەدا وەستابوون. ئەو سیانە پاسەوانی ژوورەکە بوون و بەنۆرە پاسەوانیان دەدا.

پێم وتن:

دەست و پێی مەبەستنەوە.

یەك لەوان ترساو وتی:

سەرۆك ئەم کارە مەکەن. ئەو رادەکات. ئەگەر دەست و پێی نەبەستینەوە ئەو رادەکات و لەم شێوەدا هیچ لێپرسراویەك لەسەر شانی ئێمە نیە.

پێم وت:

ئەم ژوورە زیاتر لەیەك دەرگای نیە، ئێوە ئاگاتان لەژوورەکە بێت و ئەگەر ویستی رابکات بەڕم یان تیر بریندراری بکەن بەڵام نە بەوشێوەی بمرێت.... لەقاچی بدەن کە لەرێگە رۆشتن بکەوێت.

ئەم دەستوورەم دا و چونکە بۆ دۆزینەوەی ئەمانۆ و بینینی ئەو پەلەم بوو دەست بەجێ لەوێ دوور کەوتمەوەو رۆشتم.

گەڕانی من زۆری خایاند.

نزیکەی نیو کاتژمێر هەمو هۆز گەڕام و ئەمانۆم نەدۆزیەوە. نەمدەزانی رۆشتووە بۆ کوێ تەنانەت هەنبارو کارگەکانی چنینیش گەڕام بەڵام ئەوم نەدی. خەمبار بەرەو ماڵی مووناك کە یەکەم ماڵی ریزی یەکەم بوو بەڕێکەوتم.

هێشتا لەماڵی مووناك دووربوم کە دەنگی قیژەی ژنێکم بیست و زانیم لئۆنایان بریندار کردوە.

دەنگ لەوێوە دەهات کە زیندانی لئۆنا لێ بوو. بەڕاکردن بەرەو ئەوێ ڕۆشتم. لەناوەڕاست یەك لەو سێ پاسەوانەم بینی کە بەدوای مندا دەگەڕا. کە گەشتە بەرانبەر بەمن وتی:

سەرۆك بینیتان ئێمە درۆناکەین؟

بەناڕەحەتی و ترسەوە پرسیم

چی بووە؟

وتی:

هیچ..... دەیویست رابکات و منیش تیرم لەدواوە راکێشاو بوومە ڕێگر لەبەردەم راکردنی.

دیاربو بەخۆشحاڵیەوە ئەویان بریندار نەکردوە. کاتێك گەشتمە دوو ڕەش پێست دا بوویان بە ئەرزداو دەست و پێیان بەستەوە.

بۆ ئەوەی ترساندبێتم دەستوورم دا لئۆنا لەناو یەکێك لەقەفەسەگەورەکان کە بۆ ئاژەڵە دڕندەکان بەکار دەبرێت. زیندانی کەن.

چەند خولەك دواتر ئەویان لەقەفەسی شێردا زیندانی کرد و دەرگاکەیان داخست.

لئۆنا لەناو قەفەس قیافەیەکی تایبەتی بەخۆی گرتبوو و بەشێوەیەکی سەیر، سەیری دەکردم روانینی زمانی بوو قسەی دەکرد. دەتوت سەرکۆنەم دەکات و باسی رابردوو و ئەوکاتژمێر لە بیرنەکراوەکان دەکات کە پێکەوە بەسەرمان بردبوو.

توانای بینینی نیگای ئەوم نەبوو و چەند سات کە زەق لێم ڕوانی هەستم بەپەشیمان کردو بڕیارمدا دەستووری ئازادی ئەو دەرکەم بەڵام لەناکاو دیمەنی ئەو رۆژەم بیرکەوتەوە کە ئێمەیان بەدار بەستبوویەوە و بۆ کوشتنی ئێمە جەژنێکی گشتیان سازدابوو.

ئەو دیمەنەم کەوتە بەرچاو کەخۆی چۆن تیروکەوانەکەی بەدەست گرتبوو و بۆ ئازاردانی رۆحی من دەیویست دڵی مووناك کە جگە لە خۆشەویستی و عەشق گوناحێکی تری نەبوو، کون بکات. روخساری تۆڵەستێنی ئەو کەوتە بەرچاوم و بەخێرایی لەوبیرەی لەمێشکمدا هاتبوو پاشگەز بوومەوەو بەخۆمم وت:

باشتر کە رووداوەکان مرۆڤەکان بەیەك دەناسێنێت.

دەمویست لئۆنا لەجیاتی مووناك لەگەڵ خۆمدابیەم و ئەگەر یوری پێداگری نەکردایە ئەم کارە سەری دەگرت. باشتر کە ئەم مارە خۆش رەنگەم ناسی و لەنهێنیەکانی دڵ و

ڕۆحی گلاوی ئاگاداربووم.

کاتێك لەم بیرانەدا بووم، لئۆنا لەژێر چاوەوە سەیری دەکردم. دەتوت گوومان و بیرەکانی من دەخوێنێتەوە و لەوەی لەئەندێشەمدایە، بەئاگایە.

لەم کاتەدا وەك پشیلەیەك کەخۆی بۆ خاوەنەکەی لووس بکات، کەمێك ڕۆشتەدواوە خۆی کۆکردەوە و دەستی لەنەردەکانی قەفەسەکە بەردا، لە سوچێکدا کزۆڵەی کردو سەری خستنە سەر ئەژنۆ.

باش دەمزانی بەم کارانە دەیەوێت هەستی بەزەیی من ببزوێنێت. فشارم لەخۆم کردو هەوڵم دا هەستەکانم لەدڵی خۆمدا بێدەنگ بکەم و بخنکێنم. بەهەرحاڵ ڕووداو و چارەنووس منی لەوێ دانەنابوو، گریمان ئەگەر بۆ ڕۆشتنیش ئیرادەم بکردایە چونکە پێی چارەنووس لەئارادابوو، توانای ڕۆشتن لەمن سەندرایەوە. لەم کاتەدا کەڕوبەڕوی قەفەس لای دارێك وەستابووم و لەناو دەریای خەیاڵدا نوقم بووم، لئۆنا سەری هەڵبڕی و دووبارە سەیری منی کردەوە. هاتە پێش و نەردەی قەفەسەکەی گرت و وەك بڵێی شتێکی گرنگی بیرکەوتبێتەوە وتی:

مووناك ئەم ئارەزووە بۆ گۆر دەبات کەدوای کوشتنی من پاڵ بەکورسی سەرۆکایەتیەوە بدات و تۆش لەئامێز بگرێت.

من ئەم قسەیم وەك قسەکانیتر بەپوچ و بێ ناوەرۆك لەقەڵەمدا و بەگاڵتەو بێزاریەوە شانەکانم بەرز کردەوە و هیچم نەوت.

لئۆنا ساتێك بێدەنگ بو و درێژەی دا.

هۆزی ئێمە یاسای هەمیشەیی و لەناو نەچوونی هەیە... کەس ناتوانێت بەپێچەوانەی یاسا هەڵس و کەوت بکات.

کەباسی یاسا هاتە پێش گوێچکەم زرنگایەوە و دڵم بێ ئیرادە و بێ ئەوەی هۆکارەکەی دیار بێت دەستی بەلێدان کرد. هەنگاوێك لەقەفەسەکە نزیك بوومەوەو پرسیم:

لئۆنا تۆ شێت بویت یان دەتەوێت بەم کردەوە قێزەونانەت دەستی من بەخوێنی خۆت سوورکەیت..... مەبەستت چیە.....؟

لەگەڵ ئەوەی ئەم قسانە لەدەمم هاتەدەر، چاوی لئۆنا بێ جووڵە کەوتە سەرو روخسارم دوای چەند ساتێك دەستی بەگریان کرد.....

قور قور دەگریا و من لەدووری دەهەنگاوەوە جوان دەمبینی شانەکانی دەلەرێنەوە.

روخساری خۆی لەناو بەری دەستەکانیدا شاردەوەو بەدەنگی بەرز دەستی بەگریان کرد. دیاربوو ئەم گریانە بە پێچەوانەی کردەوەکانی ئەو کەمەبەستی جگە لەبزواندنی هەستەکانی من نەبوو، ئاسایی بوو بۆیە چەند هەنگاوێك رۆشتمە پێش و وتم:

بۆ دەگریت.....؟ ئایا جگە لەمە مەبەستێکت هەیە....؟ سەری هەڵبڕی و کەمنی لە نزیکی قەفەسەکەدا بینی روخسارە فرمێسکاوی و خەمبارەکەی کرایەوەو بەدەنگێکی هێواش و لەرزان وتی:

ئەگەر بەدەستی خۆت بمکوژیت و لاشەکەم بمخەیتە بەردەم ئاژەڵە درندەکانی جەنگەڵ شادمان و سەرفرازدەبم. مەرگم لە ژێر پەنجەکانی تۆ وەك ژیانی هەمیشەیی خۆش دەویت بەڵام ئامادەنیم بەسووکایەتی رازی بم. مووناك بەپێدانی سەرۆکایەتی هۆز لەراستیدا منی هەڵخەڵەتاند و تۆی لەمن فڕاند و رۆشت. هەموو ژنانی هۆز دەزانن من تۆم خۆش دەوێت. کاتێك تۆو مووناك رۆشتن ئەوان بە نیگای تایبەت کە هەزاران مانای هەبوو سەیریان دەکردم و سەرکۆنە. ئایا شیاو نەبووم بەئاسوودەیی تۆ لە ماڵەکەی خۆمدا رابگرم؟ ئایا نەمدەتوانی بۆ تۆ خواردنی باش دروست بکەم؟ ئایا من راو و تیر هاویشتن نازانم؟ جوان نیم؟ ئەی بۆ منت بەجێ هێشت و مووناکت هەڵگرت و رۆشتیت.

لێرەدا لئۆنا کەمێك وەستا و وتی:

باسی مەرگ نیە چونکە هیچ روداوێك خێراتر لەمەرگ مرۆڤ لەئازارو بەدبەختیەکان رزگار ناکات و بەم شێوە ئاگری بەردایە گیانم مەرگ نەبوو بەڵکو ئەوەبوو نەمدەتوانی بەرگەی سووك بوون و شکەست لە عەشقدا بگرم. تێگەشتیت؟

بزەیەکم لێداو وتم:

کاتێك دەڵێم شێتیت، دەگریت و دڵت دەشکێت. لەکاتێکدا قسەکانی مرۆڤ تەنیا لەزمانی شێتێکەوە دەتوانێت ببیستێت نەزمانی ژنێکی عاقڵ و تێگەشتوو..! مووناك هاوسەری منە. کچێکی جوانم لێی هەیە و ئەگەر کاتی رۆشتنی ئەوم لەگەڵ خۆم نەبردایە جێگەی گلەیی بوو.... من لەبردنی ئەو کارێکی نایاسایم نەکردوە و ئێستاش کە گەڕاوینەتەوە تۆ دەبێت تەسلیم بیت... ئەم کارانە جگە لە بەدبەختی هیچی تر دروست ناکات.

لئۆنا سەری تەکان داو قسەکانی منی بەگاڵتەو بێ ناوەرۆك وەرگرت. کاتێك بێدەنگ بووم ئەو لێوی خوارەوەی خۆی بەدیان گەست و بەدەنگێکی هەڕەشە ئامێز وتی:

تەسلیم بم.... گریمان من تەسلیمیش بووم. ژمارەیەکی زۆر بوون و هەن کە بە گەڕانەوەی تۆو مووناك بەئاسانی رازی نابن و تەسلیم نابن. ئەوان بەیاساکانی هۆز پشت گەرم و دڵخۆشن و بەم زوانە دەبینی چۆن لەیاساکان بەرگری دەکەن.

کاتێك ئەم قسانەی هێنایە سەرزمان، لەپشتی منی دەڕوانی و بەشادمانیەکی مناڵانە وتی:

سەیرکە.... ئەوە ببینە. ئەو (( شالای )) منە. مووناکیش دەبێت بەیانی (( شالای )) خۆی دیاری بکات.

پێش هەرشتێك وامدەزانی لئۆنا بیری لەفێڵێك کردۆتەوە و دەیەوێت سەرنجی من بۆ دواوە راکێشێت و لەبەینی نەردەکانی قەفەس بەخەنجەرێك کە ئەگەری هەیە پێی بێت بریندارم بکات.

بۆ پووچەڵ کردنی فێڵەکەی هەنگاوێك رۆشتمە دواوە، ئەوکات ئاوڕم دایەوە سەیری دواوەم کرد. ڕەشێکی زل و چوارشانەو بەهێز کە جەستەی وەك شەو تاریك ماسوولکەکانی پۆڵایین بوو، دەهاتە پێش.

سەیرم بۆ ئەم ڕەش پێستە کە لئۆنا بەشالای خۆی ناوی برد کەمترین سەرنجی پێ نەدابن و سەرقاڵی کۆکردنەوەی چیلکەو لقی شکاوی دارەکان بوو.

کۆڵی چیلکەی لێرەو لەوێ دادەناو کەمێکی تر چیلکەو داری پێی زیاد دەکرد و دووبارە دەیخستە سەرشان.

ئەم رستانە لەگوێمدا دەزرنگایەوە و لەبەرئەوەی هیچم نەدەزانی بڕیارمدا لەبارەی شالای و یاساکانی هۆز لە لئۆنا بپرسم:

لئۆناش چاوەڕێی ئەم پرسیارانە بو بەڵام نە من دەرفەتی پرسینم دەست کەوت نە ئەویش وەڵامدانەوە.

لەم کاتەدا دەنگێکم لەپشت سەری خۆم بیست و کە گەڕامەوە ژنێك لەژنانی ئامازۆنم بینی کە بەڕاکردن بەرەو لای ئێمە دێت.

مووناك هاتۆتە هۆش و بەدوای ئێوەدا دەگەڕێت..... خێرا وەرن....

ئەمەی وت و رۆشت. منیش لە لئۆنا کە بەبیستنی ناوی مووناك رویکردبوو ئەولا بە ئیشارەی دەست ماڵئاواییم کرد و ئەوم لە قەفەسەکەدا بەتەنیا جێ هێشت و رۆشتم.

هێشتا نەگەشتبوومە ماڵی مووناك کە رووبەڕوی یوری بوومەوە. ئەوییشیان بانگ کردبو تا لای مووناك ئامادەبێت.

تا یوریم بینی، روداوی ئەمڕۆی لئۆناو زیندانی کردنی لەناوقەفەسی شێرەکانم بۆ باس کردو وتم:

ئێمە لەم ماوە دوور و درێژەدا هێشتا لەیاساکانی هۆز بەتەواوی ئاشنانین.... باشتر لەمبارەوە لێکۆڵینەوە بکەین و زانیاری بەدەست بێنین.

یوری پێکەنی و بەگاڵتەوە وتی:

کەواتە بۆ خوێندنەوەی یاساکانی ئامازۆن سەردانی کتێبخانەکانەی گشتی بکە و کۆی یاساکان وەربگرەو بخوێنەوە.

بەتووڕەییەوە وتم:

گاڵتەم پێدەکەیت.....؟ بۆ پێدەکەنیت......؟

ئەو دووبارە بە پێکەنین و خوێنساردی وتی:

قسەکانت بۆ پێکەنین باشە..... یاساکانی ئەم هۆزە کە نزیکەی هەزار ساڵ پێشینەی مێژووی هەیە ئەوەندە زۆرە کە بەئاسانی ئاگاداربوون لەوان ئەگەری نیە جیاواز لەوەش وەك وڵاتە پێش کەتووەکان لە شوێنێکدا نەنوسراوەو کۆنەکراوەتەوە کە هەرکەس بتوانێت کەڵکیان لێ وەربگرێت. جادوگەران و پیرێژنان کە کاری پزیشکی و چارەسەرکردنیشیان لە ئەستۆدایە کۆی یاسا بزوێنەرەکانی هۆزن و ئەوان سینە بەسینە زانیاریەکانی خۆیان بەجێگرەکانیان دەسپێرن و دەمرن و دەڕۆن. تەنیا ئەوان مافی خۆیانە لەبارەی چۆنیەتی جێ بەجێ کردنی یاساکان بۆ چوونی خۆیان دەربڕن.

پرسیم:

زۆر باشە.... ئەمە راستە بەڵام ئایا تۆ لەبارەی شالای هیچ دەزانی؟

یوری وەستاو سەری تەکاندا و وتی:

ئاه، راستت وت. منیش لەبارەی شالای هیچ نازانم بەڵام هاوسەرەکەم ئەمڕۆ دەیوت کە مووناك و لئۆنا دەبێت هەرچی زووتر شالای خۆیان دیاری بکەن تا هەمو شتێك کۆتایی پێ بێت و نابێت هۆز زیاتر لەمە سەرگەردان بێت.

من و یوری وەستاین و سەیری یەکتریمان کرد. لێم پرسی:

روونکردنەوەت لەهاوسەرەکەت نەویست؟

وتی:

بۆ نا، ئەو وتی: رەسم وایە کاتێك سەرۆك وازی لەدەسەڵات هێنا و دووبارە پەشیمان بوویەوە و ویستی سەرۆکایەتی بەدەست بێنێتەوە دەبێت لەگەڵ داواکاری سەرۆکایەتی

شەڕبکات. هەرکەس ئەویتری کوشت سەرۆکایەتی بەو دەبڕێت بەڵام چونکە ڕژانی خوێنی ژنانی ئامازۆن گوناحە و حەرام کراوە ئەوان پیاوێك لەجیاتی خۆیان دەست نیشان دەکەن. بەوپیاوە دەڵێن شالای و شالای هەرکەسێك سەرکەوت سەرۆکایەتی بۆ ئەو دەبێت دەتوانێت ئەو بخنکێنێت چونکە نابێت خوێنی ژن بڕژێت.

ئەو ڕستانەی لەزمانی یوری دەهاتە دەر ببووە سیخێکی گرداری سوتێنەر و لەدڵی من ڕۆدەچوو. سەرم گێژ و دەمم لەناڕەحەتیدا وشك ببوو.

سەرم داخست و بیرمەند و حاڵگیراو لای یوریەوە دەڕۆشتم و دوای چەند خولەك کە گەشتینەماڵی موناك، بیٚ ئەوەی زیاتر لەمبارەوە قسەبکەین، ڕۆشتینە ناو. موناك بەهۆش هاتبوو، کەچاوی بەمن کەوت لەشادمانیدا دەستی لەیەك داو بەبزەوە وتی:

ئاخ.... لەکویٚ بویت... من زیندووم ! کاتێك بەهۆش هاتم وام دەزانی لەدنیایەك کە خۆیان بەرەنگی سەیرو ئێسقانی مردوەکان و سەدەفە ڕەنگینەکان ڕازاندبوویەوە لەدەوری جێگاکەی موناکدا دانیشتوون و بێدەنگن.

ژنی یەکەم کەدیاربو لەجادوگەرانانی هۆز وتی:

کەواتە خێراتر شالای خۆت دیاری بکە. بۆ بەیانی هەموو دانیشتوانی هۆز بانگ کراوە ئەوانەیشی ڕایان کردوەو دێن.

موناك بەچاوانی خەمبارو بیٚ هیوا سەیری منی کردو بێدەنگیەکی قورس لە ژوورەکەدا فەرمانڕەوا بوو بەڵام یوری ئەم بێدەنگیەی شکاند و وتی:

من شالای ئەوم. بەیانی ئامادە دەبم.

جادوگەر بەشادمانیەوە پێکەنی و بەخێرایی ئاڵقەیەکی ئێسقانی لە گەردنبەندی خۆی کردەوە کردیە دەستی یوری و ڕۆشت.

کار لەکار ترازابوو. یوری نەیدەتوانی پاشگەز ببێتەوە. ئامۆژگاریەکانی من و پاڕانەوەی موناکیش بیٚ سوود بوو چونکە پاشگەز بونەوە لە بەڵێن ئەگەری نەبوو.

وەسف کردنی ئەو ڕۆژو شەوەی بەسەرمن و موناك گوزەرا، بیٚ ئەنجامە.

موناك دەیوت:

ئەگەر شالای لئۆنا سەرکەوێت ئەو من دەکوژێت و ڕەحم بەمناڵەکەشم ناکات. سەری تۆش جیا دەکاتەوە. دەبێت چارەیەك بدۆزینەوە چونکە من دڵنیام یوری ناتوانێت لەگەڵ ڕەش پێستەکان کە لە شەڕی دەستەو یەخەدا بەتوانان، دەرگیربێت وە گیان بەدەرکات. موناك قور قور دەگریا. هەمووی ئەو شەوە نەخەوت و ڕێگربوو لەخەوتنی

منیش.

ئەو منی ڕووبەڕووی خۆی دادەنیشاند و دەیوت:

ڕابکە. منداڵەکە هەڵبگرە، و ڕابکە. بەیانی من بەتاوانی خیانەت دەکوژن. بەڵام دەستیان بەتۆو منداڵەکەو یوری ناگات.

من ئارامم کردەوە و بۆ ئەوەی ئاسوودە بێت وتم:

دڵنیابە. یوری پیاوێکی بەهێزە بەڵام کاتێك لەدڵی خۆمدا بەراوردی هێزی یوری و ئەو ڕەش پێستەم دەکرد، دەلەرزیم.

سەرئەنجام ئەو شەوە بەدژواری تێپەڕی و وبەیانی زوو دەنگی تەپڵەکان بەرزبوویەوە.

پێش هەر کەسێك قەفەسی لئۆنایان هێنا. شالای ئەو یانی ئەو ڕەش پێستە زلە لای قەفەسەکە وەستابو و بەخوێنساردی سەیری هات و چۆی کەسەکانی دەکرد.

یوری رووت ببوویەوەو تەنیا شۆرتێکی کورتی لەپێدابوو، ئەو بەم شێوە هاتە ناو گۆڕەپان تا باشتر بتوانێت چالاکی بکات. کاتێك هاتە پێش زانیم ڕۆنی لەجەستەی خۆیداوە تا چەوربێت.

من و مووناکیش ڕۆشتینە لای گۆڕەپان. جادوگەرانانیش هاتبوون و دوای ئەنجامدانی ڕێورەسمی مەزهەبی شەڕی ترس ئەنگێزی یوری و ڕەش پێست دەستی پێکرد. یوری خەنجەرێکی باریکی پێ بوو بەڵام خەنجەری ئەو ڕەش پێستە هەرکەسێکی دەیترساند. دڵم لەسینەدا جۆرێك لێی دەدا دەتوت دەیانەوێت دەریکێشن..... وەك کەسێك بووم کە دوای چەند خولەکیتر دەیانبردە بەردەم داری ئیعدام.

ئەوەندە ئازایەتی و چاو نەترسی یوریم بینیبوو دڵنیابووم لەم شەڕەشدا سەردەکەوێت. بەڵام دوای چەند سات لەدەست پێکردنی شەڕەکە بینیم شالای لئۆنا ئەوەندە بەهێزە کە چەند پیاوی بەهێزیش لە ئۆدەی کوشتنی بەرنایەن چ بگات بەیوری کە بەهۆی بەڵاو ناسازگاریەکان و نەخواردنی دڵگیرو گونجاو لاواز و توانای سەرەتایی خۆی لەدەستدابوو.

ڕاستیتان بوێت ئەگەر فرۆکەم هەبوایە لەوێ ڕامدەکرد و تەنانەت یوری و مووناك و منداڵەکەشم بەجێ دەهێشت.

رەنگە ئێوە بەخوێندنەوەی ئەم چەند دێڕەی دوایی من بەکەسێکی ترسەنۆك، ناجوامێرو بێ هەست بزانن..... راستیش دەکەن چونکە لەبەرانبەر ئەو هەموو خۆشەویستی و گیانبازیەی یوری بۆ منی کردبو راست نیەو نەبو گوومانی لەم جۆرەم هەبێت و بۆ رزگارکردنی گیانی خۆم تەنانەت لەدنیای خەیاڵیشدا بەتەنیا جێیان بێڵم. بەلام خاڵێك گرنگە کە هەمووتان لێی بێ ئاگان... ئەو خاڵە گرنگەش ئەوەیە کە گیانم گەشتبووە سەر لێو..... ئەوەندە دیمەن و رووداوی ترسناکم بینیبو ... چاوەڕوانی روداوی خوێناوی و کارەساتبار دەمارەکانی لەکارخستبووم... هیلاك ببووم و دەمویست زەوی دەم بکاتەوە و بەیەکجاری من راکێشێت و لەناوم ببات.

بەهەرحاڵ بەسەیرکردن مەحکوم بووم و هەرکات دەستی شالای لئۆنا بەجەستەی یوری دەگەشت هەناسە لەسینەمدا گیری دەکرد و نەدەهاتەدەر، ماسوولکەکانی وەك ئاسن و پۆڵا وابوو. لەگەڵ ئەوەی ئەندامێك لە ئەندامەکانی یوری دەگرت بەڕادەیەك زەختی دەکرد کە ئەگەر بێدەنگی جێگیر ببوایە مرۆڤ دیتوانی دەنگی ورد بوونی ئێسقانەکانی ببیستێت.

یوری خۆشی لەهەمان ساتی یەکەمەوە تێگەشت لەگەڵ چ دێوێکی بێ شاخ و کلکدا روبەڕو بۆتەوە. ئاگاداری کاروکردەوەکان و چۆنیەتی جووڵەکانی بووم و چونکە بەقیافەی ئاشنابووم تێدەگەشتم تا چ رادەیەك سەرنج بەکاری خۆی دەدات کەنەکا دەست یان گەردنی بکاتە دەستی شالای لئۆنا.

یەکجار لەکاتی دەرگیری بن بازووی یوری کەوتە ناو پەنجەکانی ئەو، ئەو فشارێکی وای لەدەست و بازووی یوری کرد کەلای خۆم وتم ئێستا دەستی یوری وەك باڵی مریشکی کولاو هەڵدەکەنێت. رەنگی یوری وەك ئاگر سور دواتر شین بوویەوە و ئەگەر خێرایی ئەو نەبوایە بەدڵنیاییەوە دەکوژرا.

یوری بەلەقە کێشای بەناوەڕاستی هەردوقاچی. ڕەش پێست دەستی یوری بەردا و چەند هەنگاوێك رۆشتە دواوە و لەتاو ئازار لەسەر زەوی دانیشت و چەند ساتێك لەو حاڵەدا مایەوە.

جارێکیتر پاشقوولی لەیوری گرت و لەگەڵ ئەوەی کەوت خۆی خستە سەر یوری و لەکاتی هاتنە خواری خەنجەرەکەی رێك لەسەر دڵی یوری نیشانە گرتبو.

ئەم جارەشیان یوری سووڕی خواردو لەسەر زەوی تلاو شالای بەدەمەوە درا بەئەرزدا، چەناگەی برینداو و خوێناوی بوو.

شەڕ بەتووندیەکی سەرسوڕهێنەر بەردەوام بوو. هەندێ کات بەیەك دەگەشتن و مەچەکی دەستی یەکیان دەگرت. ئەم فشاری دەدا ئەو خۆراگری دەکرد، جارێکیتر یوری فشاری دەدا و ڕەشی وەحشی خۆی دەکێشایە دواوە و چونکە هیچیان بۆ نەدەکرا جیابوونەوە. چەند جارێك ئەم ڕووداوە ڕویدا و ئەوان مەچەکی دەستی یەکیان گرت و فشاریان دا لەدوایین جار کەم کەم دەستی یوری ڕۆشتە دواوە. لەتاو ئازارو ناڕەحەتی روخسارە ڕەش و سووتاوەکەی یوری رشتر و و شینتر دەبوویەوە دەتوت چاوەکانی دەیەوێت دەرپەڕێت.

دەمارەکانی ملی یوری ئاوسابوون و بەشێوەیەك دیانەکانی لەیەك گیرکرد بو کە ئەگەر پۆلایان دەخستە بەینی، دەیقرتاند.

یوری لەمەرگ چەن چرکەیەك دوور بو، ئەوانەی راسپێردڕابوون بۆ هەڵگرتنی جەستەی کوژراوەکە، بینیم بەڕێکەوتوون و خۆیان گەیاندە یەکەم ریز و ئامادە بوون.

دڵنیابوون تا چەند چرکەی تر سینەی یوری کون دەکرێت و دەبێت جەستەکەی هەڵگرن. یوریش مەرگی بەچاوی خۆی دەدی و هەوڵی دەدا... نووکی خەنجەرە پان و بریقەدار و دوو سەرەکەی شالای لئۆنا تەنیا چەند سانتیمەتر لەسینەی یوریەوە دوور بو کەکتوپڕ شالای قیژاندی و دەستی بردە دواوە.

لەو ساتە هەستیارو مەترسیدارەدا یوری بەئەژنۆی خۆی بەشێوەیەکی واکێشای بەژێر سکی ئەو ڕەشەدا کە بەناکاو قیژەیەکی جەرگ بڕی کردو ڕۆشتە دواوە.

یوری لەگەڵ ئەوەی دەستی ئازاد بو پەلاماری داو پێش ئەوەی دەرفەتی بەرگری یان کۆنترۆڵ کردنی خۆی پێ بدات خەنجەرەکەی تا دەسکەکەی لە کەلەکەی چەپی رۆکرد. شالای بۆ گرتنی کەلەکەی خەنجەرەکەی خۆی فڕێدا و بەرەو لای چەپی خوار بوویەوە. یوری خەنجەرەکەی دەرهێناو کردیە ژێر قوڕگی و بەجێی هێشت.

دەمی شالای لئۆنا کرایەوە، زمانی هاتە دەر و خوێن فیچقەی کرد.

ئەو بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی خۆی زۆر هەوڵی دا بەڵام سەر نەکەوت. کەم کەم ئەژنۆکانی سست بو، چەمایەوە و سەری کەوتە خوار.

خوێن وەك جۆگەلەیەك لەجەستەی دەرژاو لەسەر خاك کۆ دەبوویەوە. دەتوت دەیەوێت بقیژێنێت و یان شتێك بڵێت چونکە دوو سێ جار دەمی کردەوە دووبارە بەستیەوە چونکە قوڕگی دڕابو ڕێگەی هەناسەدانی پچڕا، مرخەمرخی دەکرد.

سەرئەنجام سوڕا و کەوت.

ئەو بەپشتا کەوت و دوو دەست و دوو قاچی کراوەبو.

بەمەرگی ئەو دەنگە دەنگ بەرزبوویەوەو بەم شێوە سەرۆکایەتی دووبارە بەمووناك پەسەندکرایەوە.

هەندێك شادمان بوون و هەندێك خەمبار.

چەند کەس بۆ هەڵگرتنی جەستەی خوێناوی شالای هاتنە پێش. تاقمێك رژانە ناو گۆڕەپان و ژمارەیەك ژن و پیاویان کە لەدەستەی نەیاران و دوژمنانی مووناك بوون دەستگیر کران و دەستیان بەستنەوە.

چەند شوێنێکی یوری بریندار ببوو. ئێمە لەبارەی برین و رادەی توووندی خوێن بەربوون قسەمان دەکرد کە لەناکاو ئەمانۆ ئەو کچە جوانە بەقاپێك لە سرکەو رۆنی تێکەڵاو هاتە پێش و لەکاتێکدا بزەی لێ دەدا وتی:

بڕۆ ئەو لاوە.

سرکەو رۆن باشترین دەرمانێك بو ئامازۆنیەکان بۆ شۆردنی برین و وەستانی خوێن کەڵکیان لێوەردەگرت و ئەو رۆژە ئەمانۆ بەقاپێك لەم دەرمانە هاتە پێش وبەمن وبێ گوێدان پێی وتم:

بڕۆ ئەولاوە.

مەستی نیگای ئەو بووم.....

بەهەرحاڵ رۆشتمە ئەولاوە و ئەو یوری لەسەر زەوی دانیشاند و بەوردی و میهرەبانی کەڕاستی بۆ من رەنجیهێنەر و بزوێنەری هەستی حەسوودی بو، دەستی بە شۆردنی برینەکانی کرد. ئەمانۆ بە ئەنقەست پشتی کردبوە من بەڵام شوێنەکەم گۆڕی و لای یوری وەستام تا روخساری جوانی ببینم.

هێشتا لە شوێنە تازەکەمدا جێگیر نەببووم کە لەناکاو چاوم بە قەفەسەکەی لئۆنا کەوت و لەترسا هەناسەیەکی کورتم هەڵکێشا.

دەرگا قەفەسەکە کراوەبوو. لئۆنای تیانەبو هێشتا تاقمێکی زۆر لەوێدا بوون و هات وچۆیان دەکرد. دەستگیرکراوەکانیان بەدارەوە بەستبوو چاوەڕێی فەرمانی مووناکیان دەکرد تا داهاتوویان دیاری کات.

قەفەسی لئۆنا لەپشت قەربالغیەکەبو بەجوانی دەمبینی کەدەرگاکەی کراوەتەوەو لئۆنای تیانیە.

یوری وتی:

چی بووە؟ بۆ قیافەت گۆڕاوە؟

سەیرکە...... لئۆنا لێ نیە..... ئەویان رزگارکردوە و بردویانە.

یوری وتی:

بێ هۆ مەترسە... رەنگە ئەویشیان لەگەڵ دەستگیرکراوەکان بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمان بەدارەوە بەستبێت. بڕۆ بگەرێ.

بۆ چوونەکەیم بەدڵ بوو رامکرد. هەموو دەستگیر کراوەکان لەناو گۆڕەپاندا بوون بەڵام بێ لئۆنا. نەمدۆزیەوە لەهەرکەس پرسیارم دەکرد وەك نەزانین شانی خۆیان بەرزدەکردەوەو یان دەیانوت:

نازانم. خەبەرم نیە..... نەمدیوە.

دەبوا چیم بکردایە؟ نەمدەزانی.

سەرئەنجام یەك لە ژنە پیرەکانی هۆز وتی:

کاتێك شالای ئەو کوژرا من لە قەفەسەکەیدا بینیم کەسەری بەنەردەکانەوە دابو بەڵام چەند خولەك کە دووبارە لای قەفەسەوە تێپەڕیم بینیم لەوێ نیە و ئەو گوومانەم بۆ دروست بو کە ئێوە خۆتان....

قسەی ناتەواو بەجێم هێشت و بەخێرایی بەرەوماڵی مووناك رامکرد... رووداوەکەم بۆ باس کرد و وتم:

لئۆنا رایکردوە. بەدڵنیاییەوە تۆڵە لەتۆ دەستێنێت. رەنگە بۆ کوشتنی تۆ شەوانە بێت و هێرش بکات.

مووناك بێ ترس وتی:

گرنگ نیە پاسەوان دادەنێین.

پرسیم:

ئەو رایکردوە بەڵام دەتوانێت بۆ کوێ رۆشتبێت. تۆ لەمبارەوە زانیاریت هەیە.... بەهەرجۆرێك بووە دەبێت بیگرم چونکە ئەم ژنە بەدەستیاری ئەو کەسانەی لەگەڵیدان، تۆڵە لە تۆ دەستێنێتەوەو رەنگە منالەکەیشمان بکوژن تادڵی من و تۆ بسووتێت.

راستیەکەیم وتبێت کاتێك ئەم قسانەم دەکرد هەموو سەرنجم لای ئەمانە بو بۆ ئەو نیگەران بووم. لئۆنا پێشتر وتبووی: ئەم کچە لاوازو ئەخلاق ناشرینە دەکوژم....

بیستوومە ئەو ئاگاداری و میوانداری لە تۆ دەکات. ئارەزووی ئەو دەبێ ببرێتە ژێر گڵ. ئەم کارە لە لئۆنا دوور نەبو. ئەو بەهەمان ئەندازەی لەسەر عەشق پێبەندو جێگیر بو

لە تۆڵە سەندنەوەشدا وێنەی نەبو.

بەخێرایی چەند کەسێکم راسپارد خۆڵی نەرم لە دەوروبەری ماڵەکە برێژن تا ئەگەر شەوانە کەسێك هات شوێن پێکەی ببینرێت و بمێنێتەوە. و لەگەڵ ئەوەشدا دوو کەسم راسپار پاسەوانی ماڵەکەی مووناك بکەن و شەو تابەیانی نەخەون.

دوای ئەنجامدانی ئەم کارە بەرەو ئەو شوێنەی یوری و ئەمانۆی لێ بو رۆشتم. یوری هێشتا لەسەر زەوی دانیشتبوو دەستی بەقاچی خۆیدا دەهێنا بەڵام ئەمانۆی لێ نەبو.

لەیوریم پرسی.

وتی: رۆی بۆ ماڵەکەی خۆی....

بەڕاکردن بەرەو ماڵی ئەمانۆ رۆشتم. دەمویست بۆ چاودێری کردنی ئەویش دەستوو بدەم بەڵام ئەوم نەدۆزیەوە. تا ئێواریٚ هەرچی گەڕام بیٚ ئەنجام بوو و سەرئەنجام شەو تووڕە رۆشتمە ماڵ و سیلاحم بەدەستەوە گرت تا ئەگەر لئۆنا یان کەسێکی تر هات بیٚ درەنگ بیکوژم. شەو بێدەنگیەکی قورس بەسەر هۆزدا فەرمانڕەوا بوو. یەك لە پاسەوانەکان لەپشت ماڵەکە دانیشتبوو پاسەوانی دەدا کەلەناکاو دەنگی هاوار بیستراو بێدەنگی شکاند.

ئەم دەنگە، لەو کاتەی شەو، لەو بێدەنگیە قورسەدا ئەوەندە ترس ئەنگێز بو مووی لەسەر ئەندامی هەر بیسەرێك راست دەکردەوە. کەسێك بەهەموو هێزو توانای خۆی قیژاندی و دەست بەجیٚ بێدەنگ بو..... ئەگەر لەخەودا بووم.... تەنانەت ئەگەر لەجێگاشدا بومایە گوومانم دەکرد مۆتەکەیەی ترسناکم بینیوە و گوێم پیٚ نەدەدا بەڵام لەوکاتەدا هێشتا بەئاگا بووم و نەشمدەویست بخەوم.

لەگەڵ بەرزبوونەوەی ئەم دەنگە مووناك بەشەلە شەل لە ژوورەکەی ئەولا کە شوێن خەوی بو خۆی بەمن گەیاند و بەروخسارێکی ترساو کە ترسی لێ دەرژا خۆی بەمن گەیاندو وتی:

چی بوو.........؟ ئەم دەنگە چیە.......؟ کیٚ قیژاندی..؟

دواتر خۆی خستە ئامێزم و سەری خستە سەر سینەم و وتی:

تۆ لێرەیت.... تۆ زیندوویت؟ ئەم قیژە تۆ نەبویت...؟

دەتوت دڵی ئارامی گرت و کەم کەم لەوەی منی بەساغی لەوێدا دەبینی ئارامی سەرەتای بۆ گەڕایەوە.

مووناك لەخەودا بو دەنگی قیژەکەی بیست و پەرێشان هەستا و دەرگای ژوورەکەی

کردەوەو بەشادمانی منی لەوێدا بینی. ئەو دوای چەند سات وتی:

ئەم دەنگە لەکوێوە بو.....؟ دەبێت بزانین... لئۆنا ژنێکی رقاوی و مەترسیدارە من ئەوم تا ئەم بەیانیە ئەو جۆرەی کە دەبێت نەناسیوە. لەمڕۆ بەدواوە دەبێت خۆی لێ بەدوور بگرین. هەم خۆی مەترسی دروست دەکات هەم ئەو تاقمە ژن و پیاوەی لەدەوریدان. ئەوان ئاخرەکەی تۆڵە لە من و تۆ دەستێنن.

مووناك قسەی دەکرد. گوێم لەقسەکانی دەگرت بەڵام لەراستیدا هەمو سەرنج و هۆشم لەدەرەوە بو بەم شێوە تێپەڕی تا دەنگی قەربالغی بەرزبوویەوە. تاقمێك بەدەم قسەکردنەوە بەرەو لای ماڵەکەی ئێمە دەهاتن.

هێشتا دەنگی قەربالغی جوان نزیك نەبوویەوە کە بەمشت لەدەرگای ژوورەکەیان دا من و مووناك بەرزبووینەوە بەڵام هیچ کام نەماندەوێرا دەرگاکە بکەینەوە تەنانەت هەنگاو هەڵگرین.

ئێستا ئێوە کە ئەم دێڕانە دەخوێننەوە دان بەوەدا دەنێم لەو ساتەدا ئەوندە ترسابووم کە دڵ لەدەستمەوە دەیویست دەرچێت. لێدانی دڵم ئەوەندە تووند بو ئەگەر کەسێك بەجوانی گوێی دەگرت بێ زێدە رۆیی لە دوو هەنگاوییەوە دەنگی دڵی دەبیستم.

مووناك بەهەمان شێوە بەحاڵی زارو پەرێشان و رەنگی پەڕا کە ئەنجامی نەخۆشی بەهۆی گەستنی جاڵجاڵۆکەکان بو بەشەلە شەل رۆشتە پێش و لەپشت دەرگاکەوە پرسی:

کێیە؟ بۆ نیوە شەو ناهێڵن ئاسوودەبم......؟ چی بووە؟

دەنگێك لەودیو دەبیسترا کە وتی:

مووناك دەرگاکە بکەرەوە، سەرۆك بەئاگایە؟

ئەمە دەنگی یوری بو، بە بیستنی دەنگی یوری هەردوکمان دڵمان حەسایەوە. بوونی یوری بۆ من بەهادار بو جیاواز لەهەموو یارمەتی و هاوکاریەکانی تا ئەو رۆژە بۆمن، وەك برای خۆم خۆشم دەویست چونکە ئازایەتی و چاونەترسی ئەو کەم وکوڕی منی قەرەبو دەکردەوە.

ئەو باوەڕەی من بەوم بو، هێزی بەمن و ئەو دەدا و ئەنجامەکەی دەبوە هۆی ئەوەی کاتێك لەگەڵ ئەودا بووم لە هیچ شتێك و هیچ کەسێك نەدەترسام.

مووناك لەپشت دەرگاکەوە بو بەڵام من ئەوەندە پەلەم کرد و بەشادمانیەوە رام کرد

کەپێش ئەو کێلۆنی داری دەرگاکەم کێشاو کردمەوە.

لەپشت دەرگا قیافەی میهرەبان و ئاشنای یوری دەرکەوت.

ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی هۆز، ژن و پیاو گەنج و پیرو ڕەش و سپی لەگەڵیا بوون. هەموویان مەشخەڵ و هەندێکیان مۆمی گەورەیان لەدەستدا بو کە لەڕووناکی ئەو قەرباڵغی دەبینرا.

یوری بەوانەی بەدوایەوە بوون بەدەست ئیشارەیەکی کرد. بەم ئیشارە ئەوان ئارام بوون. یوری هاتە ژوور و پشت سەری خۆی دەرگاکەی داخست.

ئەویش بریندارو هیلاك بو، ڕۆژ لەگەڵ ئەو دێو بێ شاخ و کلکەدا شەڕی کردبو، لە چەند شوێنێکەوە بریندا بوو هێشتا لاواز و ناتەوان بو بۆیە کاتێك هات ژوور لەسەر چوار پایەك دانیشت و ناڵەیەکی کورتی کرد وتی:

ئێوە خەوتبوون؟

ویستم بڵێم نا بەڵام مووناك پێش من وەڵامی دایەوە وتی:

بەڵێ من خەوتبووم و بەدەنگی قیژە لەخەو راچەنیم. زۆر ترسام. گوومانم کرد شتێکتان بەسەر هاتووە.

هەڵبەتە روداوی خراپ رویداوە نە بۆ من و سەرۆك بەڵکو بۆ چەند کەسێکی ترە رەنگە رۆحە پیسەکان لەمن و سەرۆك دەترسن و بۆیە قەرەی ئێمە ناکەون.

ئەو ئەم رستەی ئاخری بەگاڵتەوە وت بەڵام ئەم رستە گاڵتە ئامێزە لە مووناك کە جیاواز لەهەموو شتێك، ئامازۆنیەکی دەمارگیرو خورافە پەڕست بوون کاریگەری سەیری بەجێ هێشت.

مووناك رەنگ پەڕاوتر لە خولەکەکانی پێشو لای چوار پایەکی یوری کەوتە سەر چۆك و وتی:

چیت وت.....؟ رۆحە پیسەکان.... تۆ هەندێك شت دەزانی کە من بێ ئاگام، چی بووە؟ یوری کەمێك قایشەکەی خۆی شل کردەوەو دوای ئەوەی دەستێکی لە برینی شانی دا و ناڵەیەکی کورتی کرد وتی:

نارەحەت بووم.... تازە دەمویست بخەوم کە لەناکاو دەنگی قیژە قیژ بەرز بوویەوە...

وتم:

منیش لەم دەنگە....

قسەکی بڕی و وتی:

بەڵێ پاسەوانەکەی ئێوەشیان کوشتووە.

و درێژەی بە قسەکەی خۆیدا.

دەنگە دەنگ بەرز بوویەوە، ناچار سیلاحم هەڵگرت و هاتمە دەر. هەندێك ڕژابونە بەر دەرگاکەی من و دەیانویست پێکەوە بێنە ئێرە و مووناك لە خەو هەستێنن.

مووناك پرسی:

چی بوە.... هۆکاری چیە.... مردم زووکە بیڵێ...

یوری بەخوێنساردی وەك بڵێی بابەتەکە لای زۆر گرنگ نیە وتی:

چوزانم چی بو، ئەم خەڵکە ئەحمەقە دەڵێن ڕۆحە پیسەکانی جەنگەڵ هاتوونەتە ناو هۆزکەی ئەوان. لەوانم پرسی چ بەڵگەیەکیان بۆ ئەم قسەیە هەیە؟ لەوەلامدا وتیان دوعای جادوگەرانان ئیتر کارناکات و ڕۆحە پیسەکان لەهەمان کات کە هاوارەکان بیسترا، چەند کەسێکی تریان بەشێوەیەکی دڵتەزێن کوشتووە.

مووناك لەناو نارەحەتی دەستەکانی لەیەك دەسو، دەتوت بەچاوی خۆی هێرشی ڕۆحە پیسەکانی بۆ هۆزەکانی خۆی دەدی و دەنگی ناڵەو هاوارەکانی دەبیست و ترس زیاد لەڕادە بەروخساریەوە دیاربو و لەرزینی جەستەی ئاشکرا.

پێش ئەوەی مووناك قسەبکات و بۆچوونی خۆی لەمبارەوە دەربڕێت یوری لەمنی پرسی:

نەت بینیوە...؟ نەت بینیوە چۆن پاسەوانەکەی ئێوەیان کوشتووە... سەیرە...! هەناسە لەسینەمدا تووند ببو ئەگەر بڵێم دەنگم بۆ وەلامدانەوە نەدەهاتەدەر و تەنیا بەسەرتێمگەیاند ئاگام لەهیچ شتێك نیە. یوری لە شوێنەکەی هەستاو وتی:

کەواتە دەبێت بیبینن.

یوری لەپێش و من بەدوای و سەرئەنجام مووناك بەدوای ئێمە دووانەدا بەڕێکەوت. دەرگا کرایەوە و لەبەرانبەر قەربالغی دانیشتوان کەلەوێ کۆ ببوونەوە، ڕۆشتینەدەر.

پاسەوان لەبەردەم دەرگای ماڵەکە بەدیوارەکەوە لکێنرابو و رمێکی کورت لەقوڕگی چەقیبو. مووناك پاڵی بەمن و یوریەوە نا، ڕۆشتە پێش و بەوردی دەستی بە پشکنینی کوژراو و رمە کورتەکە کرد. چەند سات لە رمەکەی ڕوانی و دواتر بەپەنجە کونە زۆرەکان کە لەجەستەی پاسەوانەکان دروست ببو نیشانی داو بەدەنگێکی لەرزان وتی:

سەیرکەن.... ئەم کوونانە دەبینن.... هەموو ئەمانە بە چەقۆ کوون کراون.... ئەم

رمەش لە رمەکانی جەنگەڵی ئامازۆن نیە و پەیوەندی بەرۆحە پیسەکانەوە هەیە.

یوری بە بیستنی ئەم قسە پێکەنی و وتی:

رۆحەکان کە رم و خەنجەریان نیە. جیاواز لەمە ئەمە چیە؟

مووناك رووی کردە ئەو ژن و پیاوانەی لەوێدا وەستابوون و بەسەرسوڕمانەوە چاوەڕێی ئێمەیان دەکرد و یەکێك لە پیاوەکانی بەناوبانگ کرد تا بێتە پێش. کاتێك ئەو بەڕاکردن هاتە پێش مووناك پێی وت:

یەك لەچەقۆکان بەنووکی خەنجەرەکەت دەرکە تا ئەم دووانە بیبینن و ئەوەی من دەیڵێم باوەڕ بکەن.

ئەو پیاوە خەنجەرە نووك تیژەکەی خۆی دەرهێنا و گۆشتی جەستەی کوژراوەکەی کە بەهۆی رمێکی کورتەوە بەدەرگاکە دوورابوو، کون کردو دوای چەند خولەك گەڕان و هەڵدڕینی جەستە پارچە کانزایەکی کورتی دەرهێنا و بەدەستە خوێناوی و پیسەکانی خۆی پاکی کردەوەو دای بە مووناك.

مووناك دەستی خۆی لەبەر رووناکی مەشخەڵێك لەبەردەم من و یوریدا کردەوە. لەسەرسوڕماندا لەم شوێنەکەی خۆمان وشك ببوین و نزیکەی دوو سێ خولەك بێدەنگ.

یوری سەیری منی دەکردو من سەیری ئەو. بەڕاستی سەیر بو.

دەزانن لەدەستی مووناکدا چیمان بینی؟ رەنگە ئێوەش ئەگەر ببیستن باوەڕ نەکەن ! بەڵام ئەوەی دەیڵێم راستیە.

لەدەستی مووناك میلەیەکی باریك و نوك تیژبو کەلەکانزایەکی بەهێز و نووك تیژ دروستیان کرابوو. دیار نەبو لە چیەو چ جۆرە کانزیەك لە دروست کردنیدا بەکار هاتووە.

درێژی ئەو میلە لە قەڵەمێك کورت تر بەڵام ئەستوورەیەکەی لە قەڵەمێکی ئاسایی زیاتر بو.

نوکێکی زۆر تیژی بو کەتەنانەت لەقەدی داریشەوە تێدەپەڕی.

یوری لە مووناکی پرسی:

چانۆ ئەمەیە؟

مووناك وتی:

بەڵێ ئەمە چانۆیە و دیارە رۆحە پیسەکانی جەنگەڵ لێمان تووڕەن !

کاتێك دایکی من سەرۆکی هۆز بو جارێکیتر رۆحەکان لێمان تووڕە بوو و ژمارەیکی

زۆریان لێ کوشتین. پەنجا کەس لەجوانترین و لاوترین کچانی ئامازۆنیش بێ سەرو شوێن بوون و هەرچی گەڕاین کەمترین نیشانەیەکمان لێ بەدەست نەهێنان. لەو ساڵەوە تائێستا ئاسوودە بووین بەڵام وادیارە ڕۆحەکان دووبارە بۆ ئازاردانی ئێمە نزیک بوونەتەوە.

یوری شانەکانی بەرزکردەوە وەك بڵێی گوێی لەقسەکانی مووناك نەگرتووە، چانۆکەی لەسەر دەستی مووناك هەڵگرت و رووی کردە من و وتی:

ئەمە ئامرازێکی کوشتنی مەترسیدارە. لەناو هۆزە وەحشیەکانی ئەفریقادا زۆر باوە بەڵام تا ئەمرۆ لە ئامازۆندا نەم دیوە دەزانی چۆنی و بەچی دەیهاون.

من چەند ساتێك بیرم کردەوە وتم:

رەنگە بە کەوانی تایبەت.

وتی:

نە...... ئەمە بەبا دەیهاون و نیشانەگیری زۆر ئاسان و کارەکەشی دڵنیاییەو نەوەدو حەوت دەرسەد مەبەست دەپێکێت و لەدارەکۆنەکانیش دەتوانێت تێپەڕبکات. دوای ئەم وتوێژە یوری دەستی من و مووناکی گرت و وتی:

وەرن با شتێکی گرنگتان نیشان بدەم.

یوری بەرەو دەرگای ژوورەکە رۆشت بەڵام مووناك دەستی راکێشاو وتی:

بوەستن...... بوەستن.

و دەست بەجێ رۆشتە ژوور و دوای یەك خولەك بەدوو تیکە شتی پان کە وەك سینی دەهاتە بەرچاو گەڕایەوە.

یەکیانی دا بەیوری و یەکیانی دا بەمن و وتی:

ئەمانە لەژێر کراسەکانتانەوە بخەنە ژێر سینەتان... ئەمانە یادگاری دایکی منە دەزانی لەچی دروست کراوە.

من نەمزانی چیەو بۆ چ مەبەستێك دەبێت بیخەینە ژێر کراسەکەمان بەڵام یوری بەخێرایی وتی:

دەبێت لە پێستی کەرگەدەن دروست کرابێت.

مووناك وتی:

راستە ئەمە پێستی کەرگەدەنە و تەنیا شتێکە چانۆ لێی تێپەڕ نابێت و رەنگە چانۆ لەبەرد تێپەڕ بکات بەڵام لەمە نا.

من و یوری پێستی کەڕگەدەنمان خستە ژێر کراسەکەمان، سیلاحمان هەڵگرت و لە ژوورەکە رۆشتینەدەر.

یوری لەبەر رووناکی مەشخەڵ لەسەر خاکی نەرم کە لەدەوری ماڵەکە رشتبوومان شوێن پێیەی سەیری نیشاندام.

دەتوت سمی ئاژەڵە بەڵام مووناك وتی: ئەمە شوێن پێی رۆحە پیسەکانە. ئەوان سمیان هەیە وردە وردە بابەتەکە ئاڵۆزدەبو.

یوری خەڵکی بلأوە پێکردو بەڵێنی پێدان بەیانی لەمبارەوە لەلایەن مووناکەوە بڕیار دەگیرێت. ئەوان رۆشتنە ماڵەکانی خۆیان و ئێمەش بەڕێنیشاندانی یوری بەرەو کۆتایی هۆز کە ماڵی جادوگەرانانی لێ بو رۆشتین.

لەرێگادا یوری باسی روداوی ئەو شەوەی دەکرد و مووناك دەیوت:

هەرچی هەیە بە لئۆنا کە ژنێکی زۆر مەترسیدارە پەیوەندی هەیە.

لەوکاتەی کەپاسەوانەکەی ئێوەشیان کوشت لەم ماڵانەش چەندین کەس کوژراون دیارنیە بەچی و چۆن لەوکاتەدا چەندین کەس کوژراون و دواتروتی:

لەهەمووی گرنگتر لەهەموو شوێنەکان ئەم شوێن پێیە دەبینرێت و بۆیە دەڵێن رۆحە پیسەکان هێرشیان هێناوە. هێشتا قسەکەی یوری تەواو نەببو کە گیاکانی بەردەممان تەکانی خواردو دەنگی بەرکەوتنی دوو دەست بەگوێ گەشت.

مووناك لەشوێنەکەی خۆی هەڵبەزیەوەو خۆی خستە پشتی من و وتی:

ئەوانت بینی.... بینیت چۆن لەناوگیاکانەوە سەیرمان دەکەن.

یوریش بەپێکەنینەوە سینەی نیشاندا و وتی:

سەیرکەن..... چانۆ بەمن بڕاوە.

ئەگەر سەیرمان کرد چانۆمان لەسەر دڵی بینی کە نووکەکەی بەئەندازەی نیوسانتیمەتر لەپێستی کەڕگەدەنەکە چەقیبو. ئەگەر زرێی پێستی کەڕگەدەن لەژێر کراسەکەی یوریدا نەبو، دڵی کون دەکرد و چانۆکەی لێوە تێپەڕدەبو.

بەدەمانچەکەم چەند گوولەیەکم بەرەو گیاکان تەقاند. هاوسێکان بەدەنگی گوولە هاتنەدەر و مەشخەڵیان هێنا و لەپشت کۆپەڵە گیاکان شوێنی چەند سمێك دەبینرا.

هێشتا سەرقاڵی گەڕان بووین کەلەناکاو دەنگی قاوەقیژ لەماڵەکانی لای راست بەرزبوویەوە مووناك مایەوەو من و یوری کەزرێ و سیلاحمان پێ بو بەڕاکردن رۆشتین.

چەند کەسێك لەبەرانبەر ماڵی یەکێك لەجادوگەرانان کۆببوونەوە ودەگریان.

لەوەڵامی ئێمە کە پرسیارمان کرد چی بو؟ ئەوان بەپەنجە تەنیاماڵەکەیان نیشاندابن و هیچیان نەوت چونکە لەبەرگریان و ترس توانای قسەکردنیان نەبو. من و یوری رۆشتینە ژوور.

ئەویٚ ماڵی یەکێك لە جادوگەرانان بو. مۆمێك لەسەر مێزەکە دەسووتا و لەرووناکی ئەم مۆمە دیمەنێکی سەیر کەوتە بەرچاومان. سەرێکی خوێن بڕاو خەڵتانی خوێن لەسەر مێزەکە لای مۆمەکە بو. دیار بو تازە سەریان بڕیبو چونکە هێشتا خوێنی گەرمی لێ دەهاتە دەرو لەدرزی تەختەکانەوە دەتکا. ئەم سەرە بڕاوە یەکێك لە جادوگەرانانی ئامازۆن بو کەیەکێك لەشیاوترین و بەکەڵك هاتووترینیان بوەو بۆ دانیشتوان پزیشکی و جەڕاحی و ئێسقانی شکاویشکی بۆ چاك دەکردنەوە.

بینینی ئەم دیمەنە بێزارکەرو پەرێشانکەرە بەرادەیەك من و یوری شڵەژان و پەرێشان کرد کە وەسف ناکرێت.

خاڵێك کە پێش هەرشتێك ئێمەی بەخۆیەوە سەرقاڵ کرد ئەوەبو بابەتەکە وردە وردە دەبو بەراست و کار دەگەشتە شوێنە باریك و مەترسیدارەکان و دوورنەبو بەوخێراییەی لەکوشتنی جادوگەرو پاسەوان و ئەو چەند کەسی تر دابینرا بێنە سەر وەختی ئێمە و کاری ئێمەش تەواو بکەن.

رەنگی روخسارم بەجۆرێك پەڕابو کە بوەهۆی نیگەرانی یوری. بازووی منی گرت و لە ژوورەکە بردمیەدەر.

دڵم توند لێی دەدا، هەستم دەکرد کوڵمەکانم ساردبوونەتەوە و هەناسەم لەسینەمدا تەنگ دەبو.

بەم حاڵەوە گەڕاینەوە لای مووناك. تاقمێك دەوریان گرتبوو قسەیان لەگەڵ دەکرد.

بەگەشتنی ئێمە قسەکانیان گۆڕی. مووناك هەوڵی دەدا بەوتەکانی خۆی دڵ گەرمیان بکات و بە داهاتوو هیواداریان بکات بەڵام بەکردەوە دەبینرا کەمتر لە قسەکانی خۆی ئەنجامی دەگرت. زۆربەی ئەو کەسانەی دەوری مووناك کۆببونەوەو گوێیان لە قسەکانی دەگرت، ژنان بوون چونکە ژنان بەگشتی ترسنۆك بوون کەمتر قسەکانی کارێگەری دادەنا و رەنگی پەڕاو و لەرزینی ئەژنۆکانیان نیشانی دەدا کە هێشتا لەحاڵی خۆیاندان.

لەم کاتەدا سەرنجم بۆ لای ئەمانۆ راکێشرا. دەبێت دان بەوەدا بنێم بەردەوام لەبیریدابووم و نەمدەتوانی ئۆقرە بگرم.

لەوکاتەوە کە ئەو بەقاپی پڕ لەسرکەو هەنگوین بۆ شۆردنی برینی یوری دەهات

بەتوندی پاڵی بەمنەوە نا ئیتر نەمبینی.

لەم بگرەو بێنە قەرەباڵغیە کەژمارەیەك کوژراو و تاقمێکیش بریندار بوون و من لەپشت پەردەی ئەم رووداوانە دەستی لئۆنام دەبینی، نەمتوانی ئەمانۆ ببینم و یان هەواڵێکی لێ بەدەست بێنم. دیار نەبو چی بەسەرهاتووە.... چی بووە؟ بۆ کوێ رۆشتووە....؟ ئایا لئۆنا بەهەمان شێوە کەوتبووی ئەوی کوشتووە.

ئەگەر لەبەر مووناك نەبوایە، بەدوایدا دەگەڕام و هەمو شوێنێکی هۆزەکەم دەپشکنی و تا ئەمانۆی جوانم نەدۆزیایەتەوە ئاسوودە نەدەبووم و نەدەگەڕامەوە بەڵام بەداخەوە کە مووناك رێگر بو. لەبەرئەوەی نەکا دووبارە هەستی حەسوودی ئەو ببزوێنرێت و کێشەی تازە دروست ببێت بەرواڵەت خۆم ئارام نیشان دەدا.

بەخێرایی بیرۆکەیەك وەك بروسکە لەتاریکیەکانی مێشکم تێپەڕی و بۆ ئەوەی لەئەمانۆ هەوڵێکم بەدەست هێنابێت وتم:

باشترە لەیەك یەکی دانیشتوانی هۆز لێکۆڵینەوە بکەین. ئەمە کارێکی دژوارنیە ئەگەر لەهەر ماڵێك کەسێك کوژراو یان ون بوبێت، ئاگادارمان بکەنەوە بەخێرایی دەردەکەوێت کە چەند کەس بوونەتە قوربانی رووداوەکانی ئەمشەو....

مەبەستم ئەوەبو ئەگەر ئەمانۆ کوژراوە...........

زۆر گرنگ نیە. دەبێت چارەیەك بدۆزینەوە تا مەترسی نەمێنێت. بەو پێشینەی هەمانە رۆحەکان تا چەند مانگیتر نایەڵن ئاسوودە بین.

هێشتا قسەکەی تەواو نەببو کە یەکێك لە ژنە بەتەمەنەکان وتی:

جیاواز لەهەموو ئەم قسانە کاتی هێرشی رۆحە پیسەکان، ئاژەڵەوەحشی و دڕندەکانی جەنگەڵیش دەبنە ئەرك بۆمان..... جاری پێشو من منداڵ بووم بەڵام جوان بیرمە بە هۆی هێرشی رۆحەکان ئاژەڵەکان تا چەند مانگ لەدەوری هۆز کۆببونەوە و کەس نەیدەوێرا بڕواتە راو. دانیشتوان ئاگادار بکەنەوە بۆ چەند رۆژێك ئازوخە ئامادە بکەن چونکە لەبەیانی یان ئەمشەو هۆز لەلایەن ئاژەڵەکانەوە گەمارۆ دەدرێت.

مووناك بەم پێشنیارە رازی بو و بەخێرایی بەهۆی چەند کەس لەپاسەوانەکان کە بۆ چاودێری کرانی هۆز خۆیان ئامادەکردبو بەهەموو دانیشتوان راگەیاند کە بۆ چەند رۆژ ئازوخە لەماڵەکانیاندا رابگرن.

من و یوری نەماندەتوانی بەم بیرە پوچ و خورافیانە راز بین. یەکەم ئەوەی بە رۆحەپیسەکان و هێرشیان بۆ سەر هۆز باوەڕمان نەبو و بۆ ئەم رووداوە بەدوای

هۆکاریتردا دەگەڕاین. دووم ئەوەی چۆن ئەگەری بو هەمو ئاژەڵەکانی جەنگەڵ لەرۆژو ساتی دیاریکراودا شوێن و بنکەی ژیانی خۆیان بەجێ بێڵن و بەرەو هۆزی ئامازۆن بەرێ بکەون.

من و یوری لەمبارەوە قسەمان دەکرد و بەمێشکی و پووچ و گوومانەکانی ئەوان پێ دەکەنین. مووناك چەند دەستوورێکی تری دەرکرد و دواتر سێ کەسی بەرەومالی یەکێکیتر لە جادوگەرە ناودارەکان بەڕێکەوتین.

هەرکام لەم جادوگەرانانەن لەکارێکی تایبەتدا کارامەبوون. بۆ نمونە یەك لەوان تایبەتمەندی روەکەکانی باش دەزانی. یەکیتر مارە ژاراویەکانی دەگرت و لەژاری ئەوان دەرمانی سەیری دروست دەکرد، سێیەمی بۆ چارەسەری نەخۆشیەکان و چوارەمی و پێنجەمی هەرکام لەکارێکی تردا کارامە بوون.

جادوگەرێك کە کوژرابو جیاواز لەوکارە سەیرانەی دەیکرد، چاك کردنەوەی ئێسقانەکانی شکاو جەڕاحی و پزیشکی دەزانی و نەخۆشەکانی چارەسەر دەکرد. لەبەشەکانی پێشو کە من بریندار دەبووم و بەرەو مەرگ دەڕۆشتم، ئەگەر داروی ئەم جادوگەرانانە نەبوایە، بەدڵنیاییەوە چاك نەدەبوومەوە. برینێکی قووڵ کە لە رمی ژاراوی لەپشتی من دروست بو بەهۆی یەکێك لەم جادوگەرانانە بەشێوەیەکی موعجیزە ئاسا باش بویەوە.

کاتێك من و مووناك و یوری رۆشتینە ماڵی جادوگەر، ئەو سەرقاڵی داتاشینی کاسەی سەری مردویەك بو.

وێردی دەخوێند و دواتر کاسە سەرەکەی لەسەر ئاگر داناو ئەوکات بەپارچەیەك کانزا دایدەتاشی وردەئێسقانەکانی دەکردە ناو ئاگر.

ناو ژوورەکە بۆگەن بو بەشێوەیەك کە لووتی ئازاردەدا و هەناسەی لەسینەدا توند دەکرد. جادوگەر بەچوونی ئێمە دەستی لەکار نەکێشایەوە وەك بڵێی کەس نەچۆتە ژوور، سەرقاڵی کاری خۆی بوو لەژێر لێوەوە شتی دەوت:

مووناکیش کاری خۆی دەزانی. لەناو دەرگای ژوورەکەدا وەستاو بەدەنگی بەرز وتی:

چاوەڕێی چین.... سەمای تایبەت دەست پێ بکەن. لەم شەوەوە و بێ ئەوەی چاوەڕێی وەلام بێت ئاوڕی دایەوەو ئیشارە لە ئێمەکرد بەدوایدا بڕۆین. دانیشتوانی هۆز هێشتا خەبەر نەبوون و بەم لاولادا رایان دەکرد و هەواڵیان دەدا.

لەرێگا یوری وتی:

ئەم قسانە هەمووی پووچ و بێ مانایە. من و تۆ نابێت بەکارەکانی ئەوان دڵگەرم و هیوادارببین. لەبەیانیەوە دەبێت بگەرێین و هۆکارەێکی ئەساسی بدۆزینەوە.

پرسیم:

بۆ چوونی تۆ لەم بارەوە چیە؟

یوری وەك بڵێی هەستی بە مەبەستەکەم کردبو یان پێشتر دەیزانی وتی:

دەتەوێت بۆ چوونم لەبارەی لئۆنا بزانیت؟ وانیە؟

وتم:

وایە...... هەرچی هەیە ئەم ژنە لەم رووداوەدا بەشدارە و رەنگە خۆیەتی دەوری رۆحەکان دەگێرێت.

یوری شانەکانی بەرزکردەوەو وتی:

هەڵبەت ئەو لەم رووداوانە بێ تاوان نیە بەڵام راستی شتێکی ترە و بەم سادەییانە نیە. ژنێك ئەویش لئۆنا کە خۆشی لە دانیشتوانی ئەم هۆزەیە بتوانێت تاقمێك و لەناویشیاندا جادوگەرەکان بەو هەموو گەورەیی و دەسەڵاتەوە بکوژێت.

بەهەرحاڵ بەیانی کە هەوا رووناك بویەوە تارادەیەکی زۆر راستیەکان دەدۆزینەوە.

گەشتینە چەند هەنگاوی ماڵەکەمان کە لەناکاو دەنگە دەنگی سەیروسەمەرە بیسترا. دەتوت تاقمێك تەپڵ لێدەدەن و ئاواز دەخوێنن.

مووناك کە ئێمەی سەرسوڕماو بینی وتی:

هیچ نیە، سەمای جادوگەرانان دەستی پێکردوە.

یوری پرسی:

ئەم سەمایە بۆچیە؟

مووناك وتی:

ئەوان رۆحە گلاوەکان لە هۆز دوور دەکەنەوە و ئەوەندە تەپڵ لێدەدەن تا مەترسی نەمێنێت. تاقمێك لە دانیشتوانیش یارمەتیان دەدەن.

ئێمە کە بەسەماو کاریگەریەکانی باوەڕمان نەبو رۆشتینە ژوور و بەشێوەیەکی کاتی لە ژوورێك خزاین و خەوتین. یوریش لای ئێمە مایەوە بەڵام لەترسی هێرشی کتوپڕ درێژترین ماوەی خەوی ئێمە چەند خولەك بو. لەگەڵ ئەوەی چاوم گەرم بو، رادەچڵەکیم و بەرز دەبوومەوە و میلم دەهێنایەوە. یوریش بێ زێدە رۆیی بەچاوی کراوە وەك

کەڕوێشك خەوتبو.

ئەو شەوە بەهەموو ناڕەحەتی و دژواریەکانی تێپەڕی. کاتێك لە دەلاقەی دیواری ماڵەکە رووناکی زیو رەنگی ئاسۆم بینی تاڕادەیەك ورەم گرت و دەست وپێی خۆم کە تا ئەوسات کۆم کردبوویەوە، درێژ کرد تا کاتژمێرێك بەڕەحەتی بخەوم.

نەمزانی چەند خولەك تێپەڕی.... ئەوەندە هیلاك و کوتراوبووم حسێبی تێپەڕبوونی کاتیشم لەدەست دابو.

لەناکاو بەدەنگی پێ لەخەو هەستام و پەرێشان تفەنگەکەم خستە سەر دەست بەڵام بەو پێڵوانەی بە دژواری دەکرایەوە مووناکم ناسیەوە و دەنگیشم بیست کە دەیوت:

خەوتوون؟ هەستن ئاژەڵە وەحشیەکان هێرشیان هێناوە.....

پێشتر وتم یوری وەك کەڕوێشك خەوتبو. من زووتر لەخەو هەستام و دەنگی مووناکم بیست بەڵام یوری پێش من خۆی ئامادە کرد.

ئەو وەك بورسکە لە شوێنەکەی هەستاو بەخێرایی بەرەو شوێنێك کە سیلاحەکانمان لێ دانابو رۆشت. ڕەشاشێك و برێك فیشەکی هەڵگرت.

منیش دەمانچەکەم و برێکی تر فیشەکم بۆ تفەنگەکەم هەڵگرت و بەدوای یوری و مووناك رۆشتمەدەر.

ئەوان ئەوەندە بەخێرایی رایان دەکرد کاتێك لە ژوورەکە هاتمەدەر بینیم نزیکەی ٥٠٠ مەتر لەمن دوور کەوتوونەتەوە.

خێرایی هەنگاوەکانی خۆم زیاد کرد و سەرئەنجام پێیان گەشتمەوە. مووناك رێگەی نیشاندا. بارودۆخی هۆز شێواو شڵەژاوبو. دەنگە دەنگێکی کەم وێنە دەبیسترا. دەنگی نەڕەی پڵنگ و شێر لە دوورەوە بەگوێ دەگەشت.

مەیموونە بچووکەکان لەسەر لقی دارەکان دەیانقیژاند و هەڵبەزودابەزیان دەکرد. بە ئەزموون بۆم دەرکەوتبو هەرکاتێك مەیموونەکان دەیانقیژاند ئاژەڵە گەورەکانیان بینیوە. بۆیە لەکاتی رۆشتن ئاگام لە پێش وپاشی خۆم بو نەکا لەناکاو پڵنگێك پەلامارم بدات. لەناو دارەکانەوە تێدەپەڕین هەرچی زیاتر دەڕۆشتینە پێش لەگەڵ دانیشتوانی هۆز روبەڕو دەبوینەوە. دەتوت هەموویان بۆ روبەڕوبوونەوە لەگەڵ ئاژەڵەکان هاتوونەتە ئەوێ. لەوێ دەنگە دەنگ بەرزببوویەوە و ژمارەیەك لە دانیشتوان کۆ ببوونەوە. مووناك بەدەست ئەوانی لادەبرد وروشتنە پێش و کاتێك گەشتنە ریزی یەکەم ئاوڕی دایەوەو بەمن و یوری وت:

سەیرکەن..... ئێوە باوەڕتان نەدەکرد ئاژەڵەکان هێرشمان دەکەن سەر و هەڕەشە لەماڵەکانمان دەکەن.

چەند تیرو رمێك لەبەردەم قاچی ئاژەڵەکان لەسەر گیاکان دەبینرا و دیاربو هیچ کام مەبەستیان نەپێکاوە. تفەنگم خستە سەر دەست تا گووریل بکوژم بەڵام مووناك دەستی گرتم و وتی:

ئەمە تەنیا نیە.... سەیرکە ئەگەر تۆ بیکوژیت ئەوانیتر تووڕە دەبن و پەلامارمان دەدەن. دەنگە دەنگ بەرز بوویەوەو وەحشیانی ئامازۆن کە لەوێدا بوون، رژانە مل یەك و رایان کرد. ژنەکان دەیانقیژاند و لەم ناوەدا دەنگی گووریلەکانیش دەبیسترا.

راکردنی ئەوان پاڵی بە ئێمەیشەوە نا و من لەپشتەوە درام بەزەویدا کە بربڕەی پشتم ئازاری گەشت. بەخێرایی هەستام و رام کردە پێش. وادیار بو یەکێك لە گووریلەکان هێرشی کردوەو لەهەمان ساتی یەکەم یەکێك لەڕەش پێستەکانی گرتوە.

ڕەش پێستی داماو کەوتبوە ژێر دەست و قاچی گووریل و زیاتر لەترسا نزیك بو گیانی دەرچێت.

یوری پێش من خۆی گەیاندە لەچەند هەنگاوییەوە تەقەی کرد. گوولەیەك بەر شانی کەوت و خوێنێکی ڕەش رەنگ لە شوێنی گوولەکە هاتەدەر بەڵام گووریلی دڕندە نەکەوت و بەپێچەوانەوە تووڕەتر بو. ڕەش پێستە داماوەکەی لەسەر دەست بەرز کردەوەو کێشای بەزەویدا.

لەوکاتەی ڕەش پێس لەسەر دەستی گووریل پەلەقاژەی دەکرد من ویوری تەقەمان دەکرد و سکی گووریلمان کردە بێژنگ.

مەرگی گووریل بوە هۆی دوورکەوتنەوەی ئەوان و بەشێوەیەکی کاتی دەستەی دەدانەیی گووریلەکان لەپشت دارەکان ون بوون بەڵام ئاشکرا بو بە زووی دەگەڕێنەوە و پەلامارمان دەدەن.

دانیشتوان لەبەرانبەر ماڵەکانی خۆیان سەنگەریان گرت و چەکی بەرگریان ئامادە کرد. هێشتا لەبەرانبەر گووریلەکاندا بوون کە هەواڵی هێرشی مارە گەورەکانیان دا.

یەك لە ژنان وتی:

ئەژدیها....... ئەژدیها........ هەزاران ماری گەورە هێرشیان کردۆتە سەر باکووری هۆز.

مووناك وتی:

ئاگر... ئاگر داگیرسێنن. مارەکان تەنیا بەئاگر دەڕۆنە دواوە....

مووناك ئەزموونی بو، دانیشتوانیش بەجوانی کاری خۆیان دەزانی و لەگەڵ ئەوەی فەرمانی ئاگر دەرکرا بۆ ئامادەکردنی رایان کرد.

لەسەر یەك قەرباڵغیەکی سەیر دروست ببو کە تا ئەو رۆژە وێنەی نەبو تەنانەت کاتێك ئەو کوشتارە خوێناویە رویدا هۆزە خوێنخۆرەکانی دەورووبەر ژمارەیکی زۆر لەژنان و پیاوانیان کوشت بەم شێوەیە ترس رەخنەی نەکردبوویە ناودڵی دانیشتوان.

لەم ناوەدا شتێك کە سەرنجی من و یوری زیاتر لە هەر بابەتێکی تر رادەکێشا ئەوەبو کە هێرشی رۆح و شەیتانەکان چ پەیوەندیەکی بەهێرشی ئاژەڵەکانەوە هەیە.

یانی چی؟ ئایا بەڕاستی رۆحە راکردوەکان ئاژەڵەکانیان بۆ دەوروبەری هۆز کۆچ پێداوە؟ راستی لەکوێدا شاردراوەتەوە؟

بەهەرحاڵ چارەیك نەبو جگە لەوەی بۆ نەهێشتنی مەترسی بەردەوام هەوڵ بدەین. من لەلایەك و یوری لەلایەك بەسیلاحەکانی خۆمان ببوینە هۆی دڵگەرمی و هیواداری دانیشتوان و ئەوان لەوەی دەیانبینی ئەو ئاسنانەی لەدەستماندایە لەدوورەوە ئاژەڵەکان لە پێ دەخات شادمان بوون.

هەرکاتژمێر هەواڵێکی مەترسیدار و ناڕەحەتکەر دەگەشت. کاتێك سەرقاڵی بەرپەرچدانەوەی هێرشی مارەکانی بۆئا و ئاناکندا بووین، شێرە برسی و وەحشیەکان هێرشیان کردە سەر ژمارەیەك و منداڵێك و دوو پیاویان هەڵدڕی و خواردیان. لەهەموویان گرنگتر هێرش و پەلاماری مێرووله سوڕەکان بو.

کاتێك هەواڵیان هێنا چەندین ملیۆن مێروولەی سوڕ لەهۆز نزیك دەبنەوە و لەسەر رێگای خۆیان هەموو شتێك لەناو دەبەن، مووناك دەستی لەیەك داو ئەژنۆکانی سست بوو لەسەر زەوی دانیشت.

جارێکیتر لەسەرەتای ئەم کتێبەدا لەبارەی مێرووله سوڕەکان قسەم کردوە. مێروولەکانی جەنگەڵی ئامازۆن لە قیافەدا بیست بەرانبەری مێرووله ئاساییەکانن باڵای ئەم دەعبا مەترسیدارو خوێنخۆرە دەگاتە ئینجێك (( دوو سانیترمەتر و نیو )) و بەشەویلاکی بەهێزی خۆی هەرشتێك ورد دەکات و دەیخوات. بەتامترین شت بۆ مێروولەی سوڕ گۆشتی مرۆڤە و لەهەر شوێنێك مرۆڤێك گیرۆدەی ئەم مێروولانە ببێت لەسی چرکەدا لەناو دەچێت و تەنیا شتێك لێی دەمێنێتەوە قژە سەریەتی چونکە مێرووله تەنیا حەزی لە قژنیە و نایخوات.

مووناك دەیزانی نەهێشتنی مەترسی مێرووله سوورەکان زیاد لەرادە دژوارە و ئەگەر بگەنە هۆز، کاری هەموویان تەواوە. بۆیە پشتی بەمن بەست و لەکاتێکدا دەلەرزی وتی:

کارێك بکە.... مێرووله سوورەکان لەناومان دەبەن. تەنانەت ماڵەکانیش دەخۆن. تائێرە باسی مەترسی مێروولەکان کرا بەڵام بەباشی ئەم دەعبایە ئاماژە نەدرا.

باشە بزانن کە هەموو ئاژەڵە زیندووکانی جەنگەڵ لەمێرووله دەترسن. تەنیا ئاژەڵێك لێی ناترسێت (( بانگۆلنە )) بانگۆلن یان مێرووله خۆر ئاژەڵێکە وەك بزنەمژە زمانی درێژی هەیە. زمانی ئەم ئاژەڵە درێژییەکەی پەنجا سانتیمەتر و دوو سانتیمەتر پانیەتی کاتێك دەچێتە بەردەم هێلانەی مێروولەی سوور زمانی خۆی دەکاتە ناو هێلانە و لەماوەی چەند چرکەدا لەکاتێکدا هەزاران مێروولەی پێوەلکاوە، دەکێشێتە دەر و دەیباتە ناو قورگی خۆی و بەتامێکی سەیرەوە دەیخوات و ئەم کارە بەرادەیەك دووبارە دەکاتەوە تا تێر دەخوات.

هێرشی مێرووله سوورەکان بەهەمان ئەندازە کە بووە هۆی ترس دواتر بووە هۆی شادمانی چونکە لەگەڵ ئەوەی مێروولەکان لەهۆز نزیك بوونەوە، ئاژەڵەکانیتر لەکاتێکدا دەیان نەڕاند، رایان کردو رۆشتن.

لاشەی گووریل و چەند مارێکی نیوە سووتاو لەخێرایی مێروولەکانی کەم کردەوە و دەرفەتی بەپیاوانی هۆز دا تاگژوگیا کۆبکەنەوەو ئاگر بکەنەوە.

مێرووله تەنیا لە دوو لەمپەڕ ناتوانێت تێپەڕبێت، ئاو و ئاگر. بۆ رێگرتن لەم ئاژەڵە خوێنخۆرە دانیشتوان جۆگەکانیان پرکرد لەئاو و لەگەڵ ئەوەشدا ئاگریان داگیرساند.

پێش ئەوەی دەوراندەوری هۆز ئاگر داگیرسێت چەند سەد هەزار مێرووله کە هەڵبەتە بەشێکی بچووك دەژمێردران، هێرشیان کردەسەر ریزێکی ماڵەکان و دەستیان بەخواردنی کرد.

بۆ لەناو بردنی ئەوان چەند ماڵێکیان کردە پاروی ئاگر. گەرمای ئاگر ئەوەندە زۆربو کە لە دوورەوە شۆرتەکەی منی دەسووتاند.

لەتاو گەرما رووت بوومەوە. لە ناوەڕاست جۆگەیەك کە ئێستا لەناو هۆزەوە تێدەپەڕی وەستام ئاگام لە یوری و مووناك نەبو و نەمدەزانی لەکوێن و چی دەکەن.

لەم کاتەدا لەناکاو دەنگێکم لەپشت سەری خۆم بیست کە ئاوڕم دایەوە یەکێك لەژنانی گەنج و جوانی ئامازۆنم بینی. بەبزەوە لام وەستابو سەیری دەکردم.

لێم پرسی:

کارت پێمە؟

بەنیگەرانی و ترس وەك بڵێی لەکەسێك یان شتێك دەترسێت سەیری دەوروبەری کرد وئەوسات هەنگاوێکی تر نزیك بوویەوەو وتی:

بەڵێ کارم پێتانە. راستیتان بوێت پەیامێکم بۆ هێناون....

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم:

پەیام؟ بۆمن.....؟ لەکوێ؟

ئەو بەنەرمی و چاوی ترساو وەڵامی دایەوە:

لە ئەمانۆ....

دەست بەجێ دەنگی خۆی گۆڕی و وتی:

ئاگادار بن ناکرێت باوەڕ بەکەس بکەین.

بەبیستنی ناوی ئەمانۆ شۆڕش و پەرێشاینەکی سووتێنەر لەناخمدا دروست بو. چەند کاتژمێرێك لەبیرم کردبو و لەم ساتەدات کتوپڕ کەوتە بیرم و روخساری دڵرفێنیم کەوتە بەرچاو.

دڵم گوشراو ئارەقێکی سارد لەسەر ناوچاوم دانیشت و بەناڕەحەتی لێم پرسی:

لەکوێیە؟

هۆش و هەستی مرۆڤ هەندێ کات بەتەواوەتی لەکار دەکەوێت ولەناو دەچێت. ئەو رۆژە منیش لەبەرانبەر ئەو ژنە کە دەوری خۆی لێهاتوانە دەگێرا وەك منالێکی نەزان و گێژبووم کە هەرچی وت بێ چەن و چوون پێی رازی بووم.

هیچ لەبیری ئەوەدا نەبووم رەنگە ئەو درۆبکات.

ئەم بیرە بەمێشکمدا نەهات لەوانەیە لئۆنا بۆسەیەکی نابێتەوە. و ئەو ژنەی بەو روخسارە هەڵخەڵەتێنە بۆ هەڵخەڵەتاندی من ناردبێت.

سەرنجم بەم بابەتە نەدا و تەنیا شتێك کەمنی بەخۆیەوە سەرقاڵ دەکرد ئەوەبو کە ئەمانۆ لەبارودۆخێکی خراپدا گیری کردوە و پێویستی بەیارمەتی من هەیە.

چەند حاڵەتێکی دژ بەیەکەم بوو. شادمان بوم لەوەبیرم دەکردەوە ئەمانۆ منی خۆش دەوێت و بۆیە داوای یارمەتی لێکردووم. خەمبار بووم نەکا پێش گەشتنی من لئۆنا بگات و ئەو کچە جوان و بێ گووناحە بکوژێت.

دەتوت پیاوێکی بەهێز پەنجەی ناوەتە بینە قاقام و بەو پەڕی هێز زەختی لێدەکات. ژنی جوانی ئامازۆنی کە دیار بو لەرێگایەکی دوورەوە هاتووە و خۆڵاوی و هیلاك

دەهاتە بەرچاو وتی:

زۆر نیگەران مەبن... ئەگەر زووتر کارێك بکەن دەتوانن رزگاری بکەن. وەگەرنە دەبێت چاوی لێ بپۆشن و لەبیری بکەن چونکە ئەو لەم نزیکانەیەو بەچارەکە کاتژمێرێك بەرێ پێوان دەگەنە ئەو شوێنەی ئەویان تیا داشاردوە.

بەخێرایی بەرەو جلەکانم رامکرد و دەستم بە پۆشینیان کرد. دانیشتوانی هۆز کە لەنەهێشتنی هێرشی مێرووله سوورەکان سەرکەوتوبوون بۆ کوژانەوەی ئاگرەکە هەلەسوڕان هێشتا دەنگە دەنگ و قەرەباڵغی بەردەوام و هەرکەس سەرقاڵی کارێك بو لەبەرئەمە من و ئەو ژنەیان لەکاتی وتویژدا نەبینی. رەنگە بینیانین و گرنگیان پێ نەدا.

کاتێك جلەکانم لەبەرکرد سیلاحم هەڵگرت. ژنی جوانی ئامازۆنی بەدەنگێکی تایبەت وتی:

ئێستا دەتانەوێت چی بکەن؟

لە وەڵامدا وتم:

شوێنەکەیم پێ بڵێ ئێستا بۆ رزگارکردنی دەڕۆین.

وتی: نا نا.... ئەم کارە عاقلأنە نیە. بۆ رزگارکردنی ئەمانۆ دەبێت بە تەنیا برۆن چونکە لەو کوێستانەدا ئەسیرە و ئەگەر کەسێك هاوڕێتان بێت پاسەوانەکانی ئەو کە لە کەلێنی تاشەبەردەکان پاسەوانی دەدەن دەتانبینن و رادەکەن. بەڵام ئەگەر بەتەنیا بن بەئاسانی دەتوانن خۆتان داشارن و خۆتان بگەینە ئەوێ.

هەرکەسێکی تر لەجیاتی من بو بەبیستنی ئەم قسانە وشیاری لەدەست چووی بۆ دەگەڕایەوە و گوومانی دەکرد کە بەدڵنیاییەوە داوو تەڵەیەك نراوەتەوە بەڵام من لەوێوە کە هەمیشە و هەمو کات لەبەرانبەر ژناندا سست بووم و هەم، ئەوەندە بۆ گەشتن بەئەمانۆ پەلەم بو ئەم پێشنیارەشم لە بەرژەوندیدا بینی و پێی رازی بووم.

بەسەر وتەکانی ئەوم پشت راست کردەوە و وتم:

ئەو لەکوێیە و چەند کەسی لەدەوروبەرە.....؟

ئەم جارەش سەیری دەوروبەری خۆی کردو کاتێك دڵنیابو کەس ئاگای لە وتویژی ئێمە نیە و دەنگی نابیستن وتی:

ئەمانۆیان بەدەست و پێی بەستراو لەشوێنێکی بەرز لەکوێستان داناوە کە دواتر لە تاڤگەکانەوە هەڵیدەنە خوار و بیکەنە قوربانی ئاوی ئامازۆن.

دواتر بەپەنجە رۆژهەڵاتی نیشاندا و وتی:

لەم ڕێگاوە بڕۆن و لەکوێستان بەرەو دەنگی ڕژانی ئاوی تاڤگەکان کە بەگوێ دەگات، بڕۆن. ئەو شوێنە جگە لەیەك ڕێگەی باریك ڕێگەی تری نیە بۆیە بێ دژواری ئەمانۆ دەدۆزنەوە.

ئەوسا کەمێك وەستاو وتی:

گوێ بگرە سەرۆك، ئەگەر کەسێکی تر لەگەڵ خۆتان ببەن و یان ئەم بابەتە لەگەڵ کەسێکیتردا باس بکەن نە تەنیا ناتوانن ئەمانۆ ڕزگار بکەن بەڵکو گیانی خۆتان لەدەست دەدەن.

بەسەرسوڕمانەوە لە شوێنەکەم هەستام و پرسیم:

لەگەڵ کەسدا قسە نەکەم بۆ.... بۆ....؟

ئەو لەکاتێکدا برۆکانی کۆکردەوەو پەنجەی خستە سەر لووتی خۆی وتی:

بێدەنگ.... ئارام زۆر وشیارانە ئەم کارە ئەنجام بدەن چونکە لەدانیشتواندا تاقمێکی زۆر هەن سیخوری بۆ لئۆنا دەکەن و هەر ڕووداوێك بەخێرایی بۆ ئەو دەگوازنەوە.

جۆرێك قسەی دەکرد کەس نەیدەتوانی گوومان بکات دەنگیشی بەگەرمی و دڵگیریەکی تایبەت لە دڵی بیسەر کە تەنیا من بووم دادەنێت و نازانم چی بوو، چۆن بوو کە بێ چەند و چوون بە قسەکانی ڕازی بووم و کاتێك بەخێرایی لە جۆگەی ئاوەکە هاتمەدەر و بەڕاکردن لەوێ دوورکەوتەوە و بڕیارمدا ئەم بابەتە بەکەس و تەنانەت بەیووریش نەڵێم.

لەماوەی ئەم گەشتەدا کە بەخۆشحاڵیەوە لەکۆتاییەکانی نزیك دەبووینەوە چەندین جار تووشی هەڵەی مەترسیدار بووم و چەندین جار بەهۆی ئەم هەڵانەوە گیانی یووریشم خستە مەترسیەوە بەڵام ئەمە ئەحمەقانە ترین کاری من بو کەبێ بیرکردنەوە و بێ ئەوەی یووری ئاگادار بکەمەوە ملی ڕێگام گرت و ڕۆشتم.

هەموو شتێك دواتر ڕوون و ئاشکرابو و بۆئەوەی گرنگی بابەت و وردی پلانەکە دەرکەوێت خراپ نیە بەشێوەیەکی کورت لە فێڵی لئۆنا ئاگادار ببنەوە.

لئۆنا کاتێك هەموان سەرقاڵ بوون بەیارمەتی لایەنگرانی خۆی ڕایکرد. هەمان ڕۆژ خۆیان گەیاندە کوێستان و بەسیلاحێکی مەترسیدار کە پێشتر ئامادەیان کردبوو چانۆ ناودەبرا گەڕانەوە جەنگەڵ. دەتوانن گوومانی ئەوەبکەن کە ڕۆحەپیسەکان جگە لە لایەنگرانی لئۆنا کە بە دەمامکی تایبەت ڕوخساریان دادەپۆشی، کەسیتر نەبوون. لئۆنا کە لەم کارانەی ئەنجامێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا بۆ گرتنی تۆڵە ئەمانۆی دزی و

بردیە کوێستان و دواتر بۆ گیرۆدە کردنی من پلانێکی داڕشت و ئەو ژنەی نارد.

منیش بێ بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوە ملی ڕێگام گرتەبەر و ڕۆشتم. دووری نێوان هۆزی ئامازۆن تاکوێستانی ناودار کە لەکۆتاییەکانی رووباردابو زۆر نەبوو و من دوای نیو کاتژمێر کەوتمە سەرو لێژیەك و بەهەناسکە برکێ سەرکەوتم.

نیوکاتژمێر دواتر جەنگەڵ کە لەناو پەڕدەیەکی ڕەشدا نوقم ببو لەژێرقاچی من دەبینراو بێجگە لەم تاریکیە چڕە هیچی تر لەدەوروبەری من نەبو.

دەنگی تاڤگە لە دووریەکی زۆرەوە بەگوێ دەگەشت و گوومان دەکەم بۆ گەشتن بەوناوچە لەکوێستان کاتی زۆری پێویستە و شەوانە تێپەڕین لە گوزەرگا مەترسیدارە کورتەکان، دوور لە عەقڵ بێت.

بۆ گەشتن بەتاڤگەکان دەبوا لەو دۆڵە پڕدارە تێپەڕم و چونکە پێشتر جارێك لێی تێپەڕ ببووم و لەگەڵ مووناك بۆ ڕاو هاتبووم، تاڕادەیەك شارەزابووم.

بەدەستی چەپ گەڵا ولق و دارەکانم لەسەر ڕێگای خۆم دوور دەکردەوە و دەڕۆشتمە پێش کە لەناکاو دەنگێك بەرزبوویەوە و شتێك وەك ئاڵقە لەقولاپەی قاچی راستم ئالاّ و هەیکەلی قورسی منی سەرەو خوار لەسەر زەوی بەرزکردەوە.

کار لەکارترازا بو. کاتێك هەستم بەهەموو شتێك کرد کە کەتبوومە ناوتەڵەوە وسەرەوخوار لە لقی داریك کە نزیك حەوت مەتر لەزەویەوە دووربو هەڵواسرابووم. لە ئامازۆن ئەم جۆرە تەڵانە بۆ راوی پڵنگ بەکاردەبەن بەڵام من لەروی بەرزایەك کەتەنافی تەڵەکەیان بەستبو زانیم کە بۆ گرتنی من دایان ناوە هەرچەندە پەلەقاژەم دەکرد تەنافەکە بەهێزتر و منی بەباروذۆخێکی خراپتر رادەکێشرایەسەر. خوێن هاتبووە ناوچاوم نزیك بو بخنکێم. خولەکەکان بەهێواشی تێدەپەڕین و هەناسە لەسینەمدا بەند ببو.

دەتوت زەخت لەقوڕگم دەکەن و بەهۆی ئەم زەختەوە چاوەکانم لەکاسە دێنەدەر.

راستیەکەی ئەوەبو چونکە سەرو خواربووم خوێن دەڕژایە ڕوخسارو بەشەکانی سەرەوەی جەستەم کە ئێستا لەخوارەوەبو و ئەمەش ببوەهۆی فشارێکی مەترسیدار.

بەهۆی تاریکی شەو چاوەکانم بەجوانی هیچ شوێنێکی نەدەدی. تەنیا شتێك کە دەمتوانی گوومانی بۆ ببەم کە تەڵەی پڵنگ تەنیا بۆ گیرکردن و دیل کردنی من لەو شوێنەدا دانراوەو ئێستا یان نیو کاتژمێر یان کاتژمێرێکی ترهاوڕێکانی لئۆنا دێن و لەناوم دەبەن.

لەم کاتەدا بو کەدەنگی بەرکەوتنی لقی دارەکان بەگوێ گەشت. دەتوت ئاژەڵێك ئارام ئارام نزیك دەبێتەوە. لەوەی کە ئاژەڵێك لەوێ نزیك دەبێتەوە گوومانم نەبو چونکە دەنگی خشە خشی گەلاّو گیا لەسەر ئەزموونێك لەم چەند ساڵەی دواییدا کۆم کردبوویەوە ئەمەی دەسەلماند بەلاّم نەمدەزانی چ جۆرە ئاژەڵێك نزیك دەبێتەوە.

لەکاتێکدا دەستەکانم هەڵواسرابو و قایشی تفەنگەکەم لەمەچەکی خۆم بەستبو ئەو ئاژەڵە نزیك و نزیکتر دەبوویەوە تائەوەی گەشتە ژێر جەستەی من.

خاڵێکی تریناندیارم بو روون بوویەوە یانی زانیم ئاژەڵی ناوبراو پڵنگێکی مێچکەی خوێنخۆرە کە بۆ راو لە حەشارگەکەی هاتۆتەدەر و بەدەبەختانە یان خۆشبەختانە نێچیرێکی دەست و پێ بەستراوی لەسەر رێگای خۆیدا بینیوە.

بۆنی مرۆڤ سەرنجی راکێشاو دەنگی نەڕەی پڵنگ بەرزبوویەوە و ئەوانەی پڵنگیان بینیوە دەزانن نەڕەی هیچ ئاژەڵێك بەئەندازەی نەڕەی پڵنگ ترس ئەنگێز نیە و لەبەرئەمە ترسی پڵنگ تەنانەت لەشێر کە پێی دەڵێن سوڵتانی جەنگەڵ زیاترە.

چارەیەکم جگە لەرازی بوون بەچارە نووسێکی شووم و دڵتەزێن کەچاوەڕوانی دەکردم نەبو. دەبوا بکوژرێم جیاوازی چیە. پڵنگ منی بخواردایە یان دەعباکان ناوسکمیان بێنایەتەدەر یان وەحشیەکان بەدەستووری لئۆنا تیکەتیکەیان بکردمایە. بەهەرحاڵ کۆتایی کار یەك شتە و بریتیە لەمەرگ.

بۆنی مرۆڤ یانی بۆنی من سەرنجی پڵنگی راکێشا و ئارام ئارام خۆی گەیاندە شوێنێك کە من بە تەنافەوە هەڵواسرابووم و بەچێژ و شادمانیەکی زیاد لەرادە سەیرێکی قیافەی ئاوەژووی منی کردو چەند جارێك لەسەرخۆ نەڕاندی. لەترسا هەموو گیانم ببوە ئارەق.

دڵۆپەی ئارەق لەسەر روخسارم دەباری و نەمدەزانی دەبێت چی بکەم.

پڵنگ بە لەخۆرازی بوون و غرور لەکاتێکدا دەستی دەکێشاو فەخری بەزەوی جەنگەڵ دەفرۆشت. چەند جار بەدەورمدا سووڕاو دواتر چەند هەنگاو دوورتر وەستا.

مەترسی زیاتر بو چونکە دەمزانی پڵنگ لەمەودای نزیکەوە ناپەڕێتە سەر نێچیرەکەی و کاتی پەڕلاماردان چەند هەنگاوێك دوور دەکەوێتەوە. بۆیە کاتێك دوورکەوتەوەو دەستەکانی چەسپاندو جەستەی خۆی کێشا زانیم ئێستا یان چەند چرکەیەکی تر دەپەڕێت.

دوری سەرم لەزەوی تەنیا دوومەتر بو. دوو یان سێ مەتر زیاتر یان کەمتر...

بەهەرحاڵ ئەم مەودایە بۆ پڵنگ کە هەندێ کات و لەکاتی تووڕەییدا نزیکەی بیست مەتر دەپەڕێت شتێکی گرنگ نەبوو و دڵنیایی بەمن نەدەبەخشی.

لەم کاتەدا کە چاوەڕێی بەرگەگرتنی جەستەی قورسی و فشاری چنگ و نینۆکی پڵنگم دەکرد لەناکاو چاوم بەتفەنگەکەم کەوت و بیرم کەوتەوە کە دەتوانم کەڵکی لێوەربگرم.

ئەوەندە ترسابووم تەنانەت بوونی تفەنگ و دەمانچەشم بیرنەدەکەوتەوە. دەستەکانم ئازاد و هەردوو سیلاحەکەشم فیشەکی تیابو و ئامادەی تەقەکردن بووم.

خێرا تفەنگەکەم بەرزکردەوەو تا ئاستی چاوم هێنامە سەر بەڵام لەکارەکەی خۆم دڵنیا نەبووم چونکە تا ئەوسات بەسەروخواری تەقەم نەکردبو و نەمدەزانی گوولەکەم پڵنگ دەپێکێت و یان بە هەوانتە دەڕوات و کارەکەم زیاتر مەترسیدار دەکات.

کاتێك قامکم لەسەر پەلەپتکە داناو بەرەو پڵنگ کەئامادەی پەڕین بو نیشانەم گرت لەناکاو بیرێکی تر بەزەینمدا هات و خاڵێکی تر سەرنجی راکێشام.

بەخۆمم وت گریمان پڵنگم کوشت. کاتژمێرێکی تر کەوەحشیەکان بێن و بمدۆزنەوە و پڵنگەکە بەکوژراوببینن دەزانن کە تفەنگم پێیەو ئەمەش لە بەرژەوەندی مندا نیە. راستی بۆ تا ئەوسات سیلاحەکەم دانەشاردبو.

لەم بەینەدا چاوم بەدارەکەی ئەولام کەوت و بێ ئیرادە تەکانێکم بەخۆمدا. دەنگی نەڕەی پڵنگ بەردەوام دەبیسترا و سەرتاپامی دەلەرزاند.

ئەوانەی داوی پڵنگیان بینیوە دەزانن من چی دەڵێم.

لەگەڵ ئەوەی تەکانم خوارد تەنافەکە بەخێرایی کێشرایە سەرو جەستەی من دوومەتری تر بەرزبوویەوە ئەم کارەی من بوەهۆی تووڕەبوونی پڵنگ و لەشوێنەکەی خۆی پەڕی بەڵام رێك یەك مەتر لەخوار من و چوار مەتر ئەولاتر کەوتە سەر زەوی.

لەشادیدا لەپێستەکەم جێگەم نەدەبوویەوە ناتوانم خۆشحاڵی خۆم وەسف بکەم. نهێنیەکی گەورەم بۆ ئاشکرابو و بەخێرایی سەرقاڵی کارەکەم بووم و تەکانێکی ترم بەخۆمدا. دووبارە تەنافەکە کێشرایە سەر و من یەك دوو مەتری تر بەرز بوومەوە.

ئێستا لەزەویەوە حەوت هەشت مەتر دووربووم و پڵنگ نەیدەتوانی خۆی بەمن بگەیەنێت. وەك وتم پڵنگ بیست مەتر دەپەڕێت بەڵام لەدرێژایی و پەڕینی ئەو لەبەرزایی لەپێنج شەش مەتر تێپەڕ ناکات.

مەترسی نەما، پڵنگ بوو دەینەڕاند. بەردەوام بەرز دەبوویەوەو هەوڵی دەدا خۆی

بەمن بگەیەنێت بەڵام سەر نەدەکەوت ولە لایەکیتر دەکەوتە خوارو دەینەڕاند.

بەدڵنیایی و ئاسوودەیی بەکاری خۆم یانی داشاردنی سیلاحەکەی خۆم سەرقاڵ بووم، لای خۆم دامنابوو، دەموت: ئەگەر زیندوومام لەگەڕانەوەدا تفەنگەکانم هەلەگرم و ئەگەر مردم رەنگە بۆ ئەو کەسانەی لێرەوە تێپەڕ دەبن بەکەڵك بێت.

هەڵبەت دڵنیابووم سیلاحەکان لەکاتی روبەڕوبوونەوە لەگەڵ وەحشیەکان کێشەکەم چارەسەر ناکات بەڵکو دەبێتە هۆی خراپتربوونی بارودۆخ.

تەنافەکەم تەکاندا، یانی بۆ پێشەوەو دواوە خۆم تەکاندا و ئەوەندە ئەم کارە ئەنجامدا تا ئەوەی تەنافەکە کەوتە سووڕ خواردن و بۆ پێش و دواوە دەڕۆشت.

مەبەستی من دارێکی کۆن و پڕ لق و گەڵا بو کە لەپێنج مەتریدا بو. هەرجارێك تەکانم دەخوارد تەنافەکەم کەمێك دەکێشرایە سەر بەڵام زیاتر لەدارەکە نزیك دەبوومەوە. جاری شەشەم یان حەوتەم دەستم بەیەکێك لە لقەکان گەشت و بەزەحمەت و دژواری خۆم بردە پێش و تفەنگ و دەمانچەکەم لەناو گەڵاو لقەکاندا داشارد.

دواتر دەستم رەهاکرد و گەڕامەوە شوێنی خۆم. تەناف نزیکەی یەك کاتژمێر دەسووڕایەوە و سەرئەنجام بەهۆی قورسی جەستەم لەجووڵە کەوت و وەستا. ئەگەر پڵنگ نەیدەنەڕاند وەحشیەکان بەم زووانە لەگرفتاربوونی من ئاگادار نەدەبوون و هیوایەکی کەم بۆ رزگاری دەست دەکەوت بەڵام بەداخەوە دەنگی ئەو ئاژەڵە ئەوانی هێنایە ئەوێ.

سەرەتا لەناو لقی دارەکانەوە رووناکی مەشخەڵم بینی و زانیم دووژمنە سەرەکیەکانم نزیك دەبنەوە. یەك خولەك دواتر دەنگی هەراوهوریای وەحشیەکان و تەپڵی بچووك کەبەدەست لێیان دەدا ئەوەی سەلماند کە گەشتی کاتژمێری مردنی منیان راگەیاند.

پڵنگ بەبیستنی دەنگە دەنگ کە لای رۆژئاوا بەرزدەبوویەوە، وازی لەمن هێنا....

ئاژەڵ بەپێی هەستی سروشتی خۆی زانی تاقمێکی زۆر لێی نزیك دەبنەوە، بۆیە شوێنێکی بەرزی لەبەرچاو گرت و بە قەڵەمبازێك خۆی گەیاندە سەر لقێکی دارو لەوێدا جێگەی گرت. وەحشیەکان نزیك بوونەوە و پێش قەراوڵەکان بەمەشخەڵ تاژێر تەڵەکە هاتن. وایان دەزانی پڵنگ کەوتۆتە داوەوە و بەبینینی من کەسەروخوار بەدارەکەوە هەڵواسرابووم لەشادیدا قیژاندیان و بەڕاکردن گەڕانەوە لای ئەوانیتر.

یەك لەوان قیژاندی و بەدەنگی بەرز وتی:

ئەو کەوتۆتە تەڵەوە.

ئەو بەزمانی ئامازۆنی قسەی نەدەکرد و دیار بو لەهۆزێکی ترە، بەڵام چونکە زۆربەی زمانەکانی ئامازۆن ریشەیان یەکێکە بەجوانی لەقسەکانی تێگەشتم.

وەحشیەکان خێرایی خۆیان زیاد کردو دەوراندەوری دارەکەیان گرت و دەستیان بەشادی کرد. لەم کاتەدا پڵنگ نەڕاندی و دەنگی نەڕەی چاوەڕوان نەکراوی ئەو ئاژەڵە ترسی تیادروست کردن. پڵنگ لەناکاو هێرشی کردە سەر نزیکترین وەحشیەکان و بەدەستی ڕاست پێستی سکی و ڕوخساری هەڵدڕی. بەڵام ئەوانی تر کە هەموویان بە ڕم و تیروکەوان چەکدار بوون دەرفەتی زیاتریا پێنەدا و لەناویان برد.

پڵنگ لەسەر جەستەی نیوەگیانی وەحشیەکە بەرزبوویەوەو پەلاماری ئەوانیتری دا، بەڵام درەنگ بو. یەکێك لە ڕمەکان هەوای بڕی و بە ویزە ویز لە سنگی پڵنگەکە چەقی و لەولایتر دەرچوو. وەحشیەکان دوای ئاسوودە بوون لە پڵنگەکە دووبارە لەدەوری من کۆبوونەوەو دەستیان بە شادی کرد. خێرا تەنافەکەیان کردەوە و منیان هێنایە خوار.

لەگەڵ ئەوەی پشتم کەوتە سەرخاك، بارانی مشت و لەقە بەر سەرپشت و سکم و سەرمدا داباری. نەمزانی و تێنەگەشتم بۆ لێم دەدەن.

بەهەرحاڵ بە جەستەیەکی کوتراو و سەری شکاو و دەستی و پێی بەستراو منیان خستە سەرشان و بردیانم. لەڕێگادا تەپڵیان لێ دەداو بە کۆرس گۆرانیان دەخوێند. دوای نیوکاتژمێر بەشوێنێکی پان و بێ دار گەشتن کە لە دەڕوازەی دەرەوەی دۆڵەکە دا بوو و ئەولاتر جەنگەڵی چڕ و دەست لێنەدراو درێژەی بوو. لێرە منیان لەسەر زەوی داناو دەستیان بە کردنەوەی ئاگر کرد. هەرکات وەحشیەکان ئاگر دەکەنەوە نیشانەی ئەوەیە جەژن و شادمانیان لەبەردەمدایە و دەست بەجێ تێگەشتم کە ئەوان دەیانەوێت بمکوژن.

چەند خولەك دواتر چوار داریان لە زەوی چەقاند.

ئەم چوار دارە کە هەرکام نیو مەتر لە زەوییەوە دوور بوو بەشێوەیەکی چوار گۆشە داناو و دواتر دارێکی نووك تیژیان بە سەرەوخواری لەسەر زەوییەکە دانا.

ئەو دارە کە وەك سەری ڕم دەهاتە بەرچاو بەجۆرێك لە ناوەڕاستی دوو دارەکەی سەرەوە جێگیر بوو کە لە هەرلاوە دوورییەکی دیاری کراوی بوو.

هەمووی ئەم کارانە ئەنجامدران و دەست و پێی منیان بەستەوە و بە هەلهەلە کێشان و سەماکردن بردمیانە ئەوێ و بە دارەکانیان بەستمەوە. ئەوکات دەستیان بە شادی و سەما کرد. سینەم لەبەرانبەر نووکی دارەکە کە وەك ڕم دەهاتە بەرچاو جێگیر ببوو و

تەنیا کارێك دەمتوانی بیکەم ئەوەبوو خۆم لەناو چوار دارەکە بەبێ جووڵە ڕابگرم.

بەڵام بەداخەوە ئەم خۆڕاگرتنە ئەگەری نەبوو و یەك خولەك دواتر هێواش هێواش سینەم ڕۆشتە خوار و نووکی دارەکە پێستی سینەمی هەڵدڕی.

سووتانەوەیەکی توندم لە سینەمدا هەست پێکرد. دەتووت دارە نوك تیژەکە بەزەخت لە گۆشت و ئێسقانی جەستەم دەچەقێت. سەرم خوارکردەوە تا بەڵکو شوێنی برینەکە ببینم بەڵام نەمتوانی. نەمزانی چ حاڵێکم هەیە و لە چ بارودۆخێکدام.

ئەگەر سینەم زیاتر دەڕۆشتە خوار داری سەر ڕمەکەم چۆن لە دڵ و سیەکانم جێگەی دەگرت؟ هیچ کام لەم بابەتانەم بە تەواوی نەدەزانی و تەنیا شتێك بۆم ئاشکرا ببوو ئەوەبوو دەمزانی دەبێت خۆڕاگرم بم.

لەوکاتەدا فکری سەیروسەمەرە هێرشیان دەکردە سەر مێشکم و بەخۆمم دەوت:

ئەگەر لەم قەیرانە ڕزگارم بوو و بە سەلامەتی گەڕامەوە بۆ هۆز بێ درەنگ یوری هەلەگرم و بێ درەنگ بەرەو بەرازیل بەڕێ دەکەوم...... بەسە. چەند ساڵ لەناو جەنگەڵدا ژیان و هاودەم بوون لەگەڵ وەحشیەکان بەسە.... بێزاربووم.... ئەم هەموو ناڕەحەتی و نیگەرانیە گیانیان لێ سەندم.

بەڵێنم بەخۆمدا و بە ئامادەبوونی عەقڵ و هۆشی خۆم بڕیارمدا ئەگەر لەم قەیرانە ڕزگارم بێت دەست بەجێ بەرەو دنیای شارستانیەت بەڕێکەوم....

من، وەك خوێنەران هەستیان پێکردوە، لە ئامازۆن دوو جۆر دڵبەستن و ئارەزووم بوو. یەکیان حەزو ئارەزوویەك کە بەرانبەر بە منداڵەکەم لە دڵ و ڕۆحمدا هەستم پێدەکرد و ئەویتریان سەرنجێك کە بە ژنە جوان و خۆشەویست و سادە دڵەکانی ئامازۆن هەمبوو کە زیاتر لە ژنە جوانەکانی ئەمریکا و کەنەدا دڵیان دەڕفاند و منیان پێبەندو ئەسیر دەکرد. بۆیە منیش گرفتار ببوم و بەئاسانی نەمدەتوانی لەو هەموو چێژ و جوانیە چاو بپۆشم و بگەڕێمەوە بۆ دنیای شارستانیەت. دوای ئەوەی بەڵێنم بەخۆمدا بڕیارمدا دەست بەجێ هۆزی ئامازۆن بەجێبێڵم، گوزەشت و لێبوردنم دەردەبڕی و کەمتر کەسێك توانای ئەم کارەی بوو.

بەهەرحاڵ لەو بارودۆخە مەترسیدارە کە دارە نوك تیژو ڕمەکە لەژێر سینەمدا بوو، ئەم بەڵێنەم دا. کەم کەم خۆڕاگری من کەمتر دەبوو و سووتانەوەی برینی سینەم زیادی دەکرد، بەشی خوارەوەی دارەکەم دەدی کە لە خوێن سوور ببوو. ئەم ڕەنگە سورە زیاتر منی ناڕەحەت دەکرد و لە خۆڕاگری منی کەم دەکردەوە.

خوێنێکی زۆرم لێ ڕۆشتبوو، چاوەکانم ڕەش و دەتوت پەردەیەکی تاریکیان لەبەرچاومدا کێشاوە و هەموو ڕووناکیەکانی سروشتیان لەپشت ئەودا شاردوەتەوە. دڵم بەتووندی لێی دەدا و زەختم لە بازووەکانی خۆم دەکرد کە ڕەنگە جەستەم بۆ ماوەیەکی کەمتر لەسەرەوە بگرم و خۆڕاگری بکەم. بەڵام هەوڵی بێهوّم دەدا.

کەمێك دواتر هۆش و کۆنترۆڵی هەستەکانم لەدەستدا بەڵام لەدوایین ساتی وشیاری دەنگێك هاوشێوەی دەنگی دارەکە بە گوێم گەشت. ئیتر لە هیچ حاڵی نەبووم و هیچم نەدی.

کاتێك چاوم کردەوە هەتاو هەموو شوێنێکی گرتبوویەوە. تیشکی هەتاو پێستی دەسووتاندم. سەرەتا بەگوومانی ئەوەی مردوم تامەزرۆی جووڵاندنی خۆم نەبووم بەڵام دواتر کە وردبوومەوە خۆم بەزیندوو بینی دەستم بە لێکۆڵینەوە لەبارودۆخی خۆم کرد.

ڕووداوێکی سەیر ڕوی دابوو.

دەتوانن گوومانی بکەن چ ڕووداوێك ڕوویدابوو کە ببوە هۆی زیندوو بوونم... نە داری نووك تیژ لە جیاتی ئەوەی لە دڵم بچەقێت لەلای کوڵمی چەپی ڕوخسارمدا بوو و نارێکیەکەی پێستی گوێچکەمی هەڵدڕی و برینداری کردبوو.

چی بووە......؟ سەیر ئەوەبوو دارێکی سەر تیژیان لەژێر سینەم دانابوو بەڵام بە هیچ شتێك نەگەری نەبوو شوێنەکەی بگۆڕم.

ئەی چی بووە و چی ڕوویداوە کە دار لای کوڵمم تێپەڕیوەو نزیکەی نیومەتر شوێنەکەی گۆڕیوە. تەنیا یەك موعجیزەی چاوەڕوان نەکراو دەیتوانی ئەو دارە مەترسیدارە بە ئەندازەی نیو مەتر بباتە دواوە.

سەرەتا دەست و دواتر قاچەکانم جووڵاند.

دەستەکانم بەسترابوو بەڵام کاتێك قاچی ڕاستی خۆم جووڵاند بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە بینیم لە دارەکە کراوەتەوە.

بە شادمانیەکی زیاد لەڕادە سەیری دارەکەم کرد و بینیم دارێکی کورت کە قاچی ڕاستی منیان پێوە بەستبوو شکاوە و لەبەرئەمە قاچم کەوتووە و جەستەم بۆ دواوە کێشراوە.

دەست بەجێ بیرم کەوتەوە دەنگی شکاندنی دارم کە لەدوایین ساتی وشیاریدا بیستم پەیوەندی بەوەوە بووە و منی لە مردن ڕزگارکردوە.

دوای ئاگاداری لەم ڕووداوە سەیری دەوروبەرم کرد. ئاگری کوژاوە هێشتا لەوێدا

بوو و تائێستا دووکەڵی لێ بەرزدەبووەیەوە. شەوی پێشو ئەم ئاگرەیان بۆ سەماو شادی کردنی من داگیرساند بوو بەڵام چی بوو کە پەشیمان بوونەتەوە و کارەکەیان درەنگ خستووە؟

وەحشیەکانیش لەوێ نەبوون. تەنانەت یەك کەس لە ڕەش پێستەکان لەوێ نەبوو، ئەمە بابەتێکی ئاڵۆز و نادیار بوو. چی بوو، چی ڕوویداوە کە ئەوان کوشتنی منیان درەنگ خستووە و لێرە ڕۆشتوون؟

بەهەرحاڵ جێگەی درەنگ کردن نەبوو. بۆ دڵنیایی دووبارە سەیری دەورووبەرم کرد لای دار و گیاکانش بە جوانی گەڕام، هیچ کام لەوەحشیەکانم نەبینی.

لەگەڵ ئەوەی نەمدەتوانی ڕێگریم لە سەرسوڕمانی خۆم، شادمان بووم کە دەمتوانی دوور لە چاوی دوژمنان بۆ ڕزگاری خۆم هەوڵ بدەم.

قاچی ڕاستم لەژێر سکمەوە هێنایە پێش و ئەوەندە ڕامکێشا تا لە شوێنێکی بەهێزدا جێگیرم کرد و ئەوسات جەستەم بۆ سەرەوە کێشا.

لەگەڵ ئەمەشدا مەچەکی دەستم دەسووڕاند و بەهۆی سووڕانی دەست تەنافەکان سست بوون. کاتێك زەختی جەستەشمی پێ زیاد بوو، کارەکە لەگەڵ سەرکەوتنی زیاتر هاوڕێ و دوای چەند خولەك تەنافەکانی دەستێکم پچڕاندو کرایەوە.

دەستی چەپم ئازاد بوو. بە شادمانی تەواو بەیارمەتی ئەو دەستەی کە بەهۆی دەردو فشار جوان کاری نەدەکرد بەکردنەوەی دەستی ڕاستم سەرقاڵ بووم و سەرئەنجام خۆم ڕزگار کرد و لەشوێنەکەم هەستام.

کاتێك هەستام و لە شوێنەکەم ڕووانی و زانیم چ کەڕەستەیەکیان بۆ ئەشکەنجەدان و کوشتنی من ئامادە کردوە.

بەڕاستی ئەگەر داری قاچی ڕاستم بەهۆی موعجیزە یان ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو نەدەشکا بەدڵنیاییەوە دارەکە دڵمی کون دەکرد و لەولاوە دەهاتەدەر.

هەناسەیەکم بە ئاسوودەیی هەڵکێشا و بەپەلە بۆ هەڵگرتنی جلەکانم کەچەند مەتر ئەولاتر بوون ڕۆشتم. ئەوەندەیان شەق لە کراسەکە هەڵدابوو لەکاتی سەماکردندا خستبویانە ژێر پێ کە ڕەنگی خۆڵی گرتبوو. کاتێك جلەکانم راوەشاند دەتووت سەتڵێك لە خۆڵی نەرمیان لە هەوادا بڵاو کردۆتەوە.

بەڕاکردن بەرەو ئەولایەی منیان هێنابوو، ڕۆشتم. لەکاتی ڕاکردن هەندێ کات دەگەڕامەوە و سەیری دواوەم دەکرد. سەیر ئەوەی نە کەسم لەپشتە سەرو نەکەسم

لەروبەڕوی خۆم لەسەر ڕێگادا نەبینی.

ئەوان بۆ کویێ ڕۆشتوون ! چی بووە منیان بەرەڵا کردوە و ڕۆشتوون؟ چ شتێك زیاتر لە کوشتنی من بۆ لئۆنا گرنگ بوو؟

یەك خولەکی دواتر لەوشوێنە چۆڵ لە دارە ڕۆشتمە دەر و گەشتمە ناو جەنگەڵی چڕ و پڕ دار و تاریك و دۆڵی مەترسیدار و دەست لێ نەدراو.

هەوا گەرم و سوتێنەر بوو، بۆیە سێبەری دارەکان و هەوای نمداری جەنگەڵ لەگەڵ ئەوەی گەرم بو ئاسوودەییەکی پێ دەبەخشیم. دەتوت لە جەهەنەمەوە ڕۆشتۆمەتە بەهەشت.

برسیەتی و تینویەتی گیانیان هێنابوومە سەر لێو و جەستەم بەهۆی گەرماو ڕاکردن لە ئارەقدا خوسابو و دڵۆپەکانی ئارەق دەڕۆشتنە ناو برینەکانی سینە و پشتم و کزانەوەی دروست دەکرد. وەحشیەکان شەوی پێشتر بەشێوەیەکی زۆر ناخۆش منیان لێرە دانابوو. لە تاریکی و لە ئازاری مشت و شەقەکان نەمدتوانی جوان ڕێگاکە بەبیر بسپێرم.

لەکاتی ڕاکردن سەرەتا سەرگەردان بووم و چەند جار ڕێگاکە بە هەڵە رۆشتم و سەر ئەنجام لەسەر ئەو بەراوردەی کە من لەکۆتایی دۆڵەکە دا کەوتبوومە ناو تەڵەکەوە، ڕێگەی ڕاستم دۆزییەوە و درێژەم بە پێشڕەوەی دا.

لەژێر هەر دارێکەوە تێدەپەڕیم بۆ دۆزینەوەی میوە و ئاو سەیری دەورو‌بەرم دەکرد بەڵام بەدبەختانە نەمیوەم دەست نەکەوت و نە ئاو بۆ نەهێشتنی تینویەتی.

بەم شێوە دوو کاتژمێر تێپەڕی و لەناکاو دارێکی گەورەی ((شلویێ))م دۆزییەوە.

شلویێ میوەیەکە هاوشێوەی هەرمێ بەم جیاوازیەکە شلویێ تامی ترش و شیرینە و لەوێوە کە پان و گەورەترە بەدارەوە دەلکێت نە لەبەشی باریك... پانی بەپێچەوانەی هەرمێ بەلقی دارەکەوە دەڕوێت و ڕەنگێکی خۆڵەمێشی تێری هەیە.

چەند دانە شلویێ لە برسیەتی و تینویەتی منی کەم کردەوە. چەند دانەیەکیشم خستە گیرفانم بۆ داهاتوو... هێشتا تامی ترش و شیرینی شلویێ لەناو دەممدا بوو کە لەناکاو دەنگی قیژەی ژنێك، دەنگی مەلەکان و قیژەی مەیموونە بچووکەکانی ئامازۆن و دەنگی خشە خشی رۆشتنی سمۆرەی خستە ژێر کاریگەری خۆیەوە و منی لە شوێنەکەمدا چەقاند.

بەخێرایی بیری ئەمانۆم کەوتەوە و لەگەڵ ئەوەی لەگەڵ شوێنی داشاردنی

سیلاحەکانم زۆر دوور نەبووم و بە بەکاربردنی دە خولەك دەمتوانی بەو دارە بگەم بەڵام ڕێگەم خوار کرد و بەرەو ئەو شوێنەی دەنگەکەی لێ دەبیستڕا ڕۆشتم.

لەناوەڕاستی دۆڵدا بووم یانی جەنگەڵ لەدوولاوە دەکەوتە سەرەولێژایی. دەنگی قیژەی ئەو ژنە لەلای ڕاست دەبیستڕا و دیاربوو لە شوێنێکی بەرزەوە هەستاوە.

بەخێرایی سەرکەوتم بەڵام خوێن بەربوون و لاوازی و هیلاکی خێرایی هەنگاوەکانی کەم کردمەوە و ناچار هەر چەندخولەك جارێك دەوەستام و دەچەمامەوە.

هەرچی زیاتر دەڕۆشتمە پێش، جەنگەڵ چڕتر دەبوویەوە بەشێوەیەك نیو کاتژمێر دواتر دەنگی قیژەیەکی ترم بیست، ئیتر تیشکی هەتاوم لەسەر سەری خۆم نەدەدی.

قیژەی دووەم تێکەڵ بە دەنگەکانی تر بوو، یانی کاتێك قیژەکە بڕا، دەنگەکانی تر بەردەوام بوون. بۆلای چەپ سووڕام و بەرەو بەرزترین شوێنی جەنگەڵ ڕۆشتم. چارەکە کاتژمێرێك دواتر هەرچی زیاتر دەڕۆشتمە پێش دەنگی قەرەباڵغی و دەنگە دەنگ زیاتر دەبوو.

یەك جار کەدەنگە دەنگم لەگەڵ قیژەی دووەمدا بیست وامزانی تاقمێك لە وەحشیەکانن کە دەنگە دەنگیان ڕێخستووە بەڵام کاتێك گەشتمە بەرزترین شوێنی جەنگەڵ و لووتکەی کوێستان تێگەشتم کە دەنگ لە ڕژانی تاڤگەیە.

دۆزینەوەی تاڤگە کارێکی دژوار نەبوو چونکە دەنگی ئاو ڕێگای نیشان دەدام. بەخێرایی بەرەو تاڤگەکە رۆشتم و کاتێك گەشتم شوێنەواری مرۆڤم نەبینی. سەرگەردان و سەرسوڕماو مامەوە. نەمدەزانی دەبێت چی بکەم و بەکام لادا بڕۆم. لەم کاتەدا کە دەنگی سێیەم قیژە بەئاشکرا لەسەروی تاڤگەوە بیستڕا و من بێ لە دەست دانی کات لە بەردە تیژەکانی کێو سەرکەوتم.

( ١٤ )

چەند جارێك دەست و پێم هەڵخلیسكا بەڵام بەرێكەوت و یان لەخۆش شانسیمدا دەستم بە بەردێكی تر گیری دەكرد و لە كەوتنەخوارو مردن رزگارم دەبوو.

بەهەناسكە هەناسك و ماندوو لەكاتێكدا برینی سەر سینەم دووبارە خوێنی لێ دەهات خۆم گەیاندە دوایین بەردی لای تاڤگە و بەهێزی بازو و جەستەم كێشایە سەر و سەیری ئەوێم كرد.

سەری خۆم ئەوەندە بەرزكردەوە تا بتوانم ببینم و بەیەك نیگا هەموو شتێكم بینی و بارودۆخم هەڵسەنگاند. ئاوی ڕووبارێكی گەورە كە لای دارە كۆن و چڕەكان تێدەپەڕی و لە نزیك هەڵدێر حەوزێكیان دروست كردبوو و ئاوی ناو ئەو حەوزە كە ڕووبەرەكەی حەفتا مەتری چوارگۆشە دەبوو بە فشارەوە لە كێوەكە دەڕژا و تاڤگەكەی دروست دەكرد. لە قەراغ ئەم حەوزە كوێستانیە بوو كە ئەمانۆم بەدەست و پێی بەستراو بینی و ئێوە بەباشی دەتوانن شادی من لەبینینی ئەمانۆ بێننە بەرچاوی خۆتان.

ئەمە ئەمانۆ بوو كە دەیقیژاند. ئایا دەیزانی كە من لە جەنگەڵدام و داوای یارمەتیم لێ دەكات؟ ئەوەندە شادمان و لە شادمانیدا ئەوەندە سست ببووم نزیك بوو لەسەر بەردەكە بكەومە خوار و هەپرون هەپرون ببم.

لەم كاتەشدا ئەمانۆ دووبارە قیژاندی و من بەدەنگی ئەو بەرزبوومەوە و خۆم گەیاندە شوێنە بەرزەكە. كاتێك ئەمانۆم بەدەست و پێی بەستراو لەلای حەوزەكە بینی ئەوەندە پەرێشان بووم كە سەیری هیچ شوێنێكی ترم نەدەكرد و لەئەنجامدا ڕەش پێستی چوارشانەم نەبینی كە چەند هەنگاو ئەولاتر بەخوێنساردی پاڵی بەدارێكەوە دابو دانیشتبوو، ئەو دەیقیژاند و ڕەش پێستی وەحشی لەسەر ئەو باوەڕەی كەدەیزانی لەوێوە دەنگی بەگوێی كەس ناگات و گریمان ئەگەر كەسیش ببیبیستێت ناتوانێت یارمەتی بدات، گوێی بە قیژەكانی ئەو نەدەدا و سەرقاڵی خواردنی شلوێ بوو. من ئەوم نەبینی بە ڕاكردن بەرەو لای ئەمانۆ ڕۆشتم و لەچەند هەنگاویەوە بەدەنگی بەرز ووتم:

ئەمانۆ مەترسە، مەترسە هاتم.

ئەمانۆ كە چاوەڕوانی بیستنی ناوی خۆی لە زمانی كەس نەبوو، سەری هەڵبڕی و

سەیری منی کردو کە چاوی بە من کەوت پەرێشان و ترساو قیژاندی...

لێیدای...... لێیدای، لەدواوە لێیدای...... ئاگادار بە.

ئەو قسەکەی بەقیژەیەکی تر بەناتەواوی بەجێهێشت و لەترسا ڕوویکرد بەولاوە. ڕاستیەکەی ئەوەبوو کە پیاوی ڕەش پێست لەشوێنەکەی خۆی هەستابو. بە قەمە پان و درێژەکەی خۆی لەدواوە بەرەو ڕووی من دەهات و لەوکاتەی دەیویست قەمەکە بێنێتە خوار ئەمانۆ قیژاندی.... ئەگەر ئەم ڕووداوە بەسەر یوریدا بهاتایە ئێوە دەتانتوانی باوەڕبکەن ئەو بە لێهاتوویی و چاونەترسی خۆی گەڕایەوەو لەمەترسی ڕزگاری بو بەڵام بۆ من بەدژواری دەتوانن باوەڕ بکەن. چونکە لە ڕاستیدا من ئەوەندە چالاك و گورج و گۆڵ نیم.

خۆم بەلای ڕاستدا فڕێداو سوورام. قەمەی پیاوی ڕەش پێست درا بە بەردا و خۆیشی تا ئەژنۆ کەوتە ناو ئاو. دەمزانی ئەگەر هەستێت دەمکوژێت. بەردێکم هەڵگرت و پەلامارم دا. شەڕ و پێکدادان لەناو ئاو دەستی پێکرد. هەندێ کات ئەو لە منی دەداو دەیکردم بە ژێر ئاودا و هەندێ کات من لەسەر سینەی دادەنیشتم بەڵام چونکە هیچمان شتێکی تیژمان پێ نەبوو. قەمەکەی ئەویش شکابو. لە کوشتنی یەك سەر نەکەوتین تا ئەوەی کە یەکێك لەم جارانە پیاوی ڕەش پێست بەهێزی سەیری بازوەکانی خۆی منی لەشوێنەکەم بەرزکردەوەو خستمیە سەر دوو دەست. دەتوت کەسێك بەڕمیلێکی خاڵی دەخاتە سەر سەر و بۆ سوچێکی تری دەهاوێت.

ئەو بەهەمان سادەیی و ئاسانی بەدەستێك یەخەو بەدەستەکەی تر کەمەری منی گرت و بەشێوەیەك بەرزی کردمەوە کە نەمتوانی بەرگری و خۆڕاگری بکەم و خۆم ڕابگرم.

کاتێك هەستم کرد لەسەر هەوا بووم و نەمدەتوانی دەست و پێی خۆم لە هیچ شوێنێك بەند بکەم. چەند خولەکێك پەلەقاژەم کردو هەوڵمدا ڕەنگە بتوانم مەچەکی دەست و بازوو یان سەری بگرم ئەم کارەش نەکرا و لەسەر دەستی مامەوە.

لای خۆم بەراوردم کرد ئەگەر بمکێشێت بە بەردەکەی بەرانبەردا هەموو ئێسقانەکانم وورد دەبێت و گریمان دەست بەجێ گیان نەدەم و بەجۆرێك لەپێ دەکەوم بە ئەشکەنجە و ئازارەوە گیانم دەربچێت. هەمووی ئەم بیرانە بەخێرایی بە مێشکمدا هات. ڕەنگە تەنیا یەك دوو چرکە لەسەر دەستی ئەو بووم کە لەناکاو بیرم بۆ شتێك چوو کە بەخێرایی دەست بەکاربووم.

بیرم کەوتەوە لەکاتی ڕۆشتن خەنجەرێکم لە دەرلنگی شەرواڵەکەمدا داشاردووە....
دڵنیا بووم خەنجەرەکەم پێماوە، بەخێرایی دەستم بردە خوارو خەنجەرەکەم دەرکێشا.

وەك ووتم دوو سێ چرکە زیاتر لەسەر دەستی ڕەش پێستەکە نەبووم بەڵام نازانم چۆن وەسفی بکەم کە مەبەستەکەم گەشتبێت.

بەهەرحاڵ پیاوی ڕەش پێست لەوە دڵنیابوو کەسیلاحم پێ نیە و لەبەرئەمە چاودێری خۆی نەدەکرد. تەنیا ئاگای لەوەبوو نەکا بە مشت و لەقە و بەرد لەپێی بخەم بۆیە کاتێك خەنجەرە بچووکەکە کەوتە دەستم، ئاگای لێ نەبوو و نەشیزانی.

ڕەش پێست چەند هەنگاوێك ڕۆشتە پێش تا بمکێشێت بەو تاشە بەردەی لەوێدا بوو بەڵام بەوێ نەگەشت و من خەنجەرەکەم بەدەستی چەپ بە بەهێزی لە ملی چەقاند کە تا دەسکەکەی ڕۆشتە ناو ئێسقانی پشتە ملی.

لەژێر تیغی خەنجەر وورد بوونی ئێسقانەکانیم هەست پێکرد و دەتوت خەنجەرەکەیان کردۆتە ناو کیسەیەکی پڕ ئێسقان. تیغی خەنجەر سەرەتا لەمپەڕی بچووکی ڕوبەڕوبوویەوە و دواتر بەئاسانی ڕۆشتە خوار.

ڕەش پێستی وەحشی قیژاندی. دوو دەستەکەی وەك دوو ئیسپرینگ لەژێر جەستەی دا خەوت و کۆبوویەوە. ئاگام لەخۆم بوو بە قاچەوە خۆم فڕێدا ناو ئاوەکە و پێش ئەوەی بکەوێت لەقەیەکم لە سکی دا.

حاڵەتێکی سەیر بوو. دەلەرزی تیغەی خەنجەرەکە لەژێر چەناگەیەوە ڕەد ببوو. لە دەوروبەری برینەکە بەفیچقە خوێن دەهاتە دەر.

لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا نەکەوتبوو، لەقەکەی من کاری تەواوکرد. سوڕێکی خواردو بەدەمەوە کەوتە ناو ئاوەکە و ئارام ئارام ڕۆشتە ژێر.

فشاری ئاو سەرو خواری کوێستان ئەوەندە زۆرە بەئاسانی دەیتوانی لاشەکەی ببات.

ئێمە خۆمان دواتر ئەمەمان تاقی کردەوە.

دوای ئەم کارە بەرەو ئەمانۆ ڕامکرد و دەست و پێی ئەوم کردەوە و ڕوخساری ئەمانۆ خوێنساردی و تووڕەیی هەمیشەیی پێوە دیار بوو.

ئەم حاڵەتە کە لە ڕوخساری جوانی ئەودا هەبوو منی دەکوشت.

ئەمانۆ تەنیا ژنێك بوو لەبەرانبەر مندا خۆڕاگری نیشان دەداو ئەم کارەی بەجۆرێك دەکرد وەك شێت منی گەیاندە ئەوێ و گیرۆدەی ئەو چارەنووسە مەترسیدارەی کردم.

کاتێك تەنافەکانی دەست و پێی ئەوم کردەوە، لەژێر چاوەوە سەیری ڕوخساریم دەکرد. قیافەی سارد بوو.... بۆ کردنەوەی دەست و قاچی هەوڵی دەدا. لەبەرانبەر خزمەتەکەی من بۆ کردنەوەی دەست و قاچی ڕەزامەندی نیشان دەدا، ئەم ڕەزامەندییەم لە ڕوخساریەوە هەست پێکرد وەك بڵێی ئەنجامی ئەم کارە گرنگە لە ئەرکەکانی سەر شانم بێت.

دەتوت یەکێك لە خزمەتکارانی بۆ کردنەوەی دەست و قاچی هاتووە.... دڵم ئاگری گرت، دەسووتا. ئەگەر تواناو بوێری تەواوم هەبوایە دەمتوانی دواتر بەسەر ئازاری ویژداندا زاڵ بم و ئەو بەهەمان شێوە بەدەست و قاچی بەستراو لەوێ بەجێ بێڵم و بەدوای کاری خۆم بڕۆشتمایە.

سەیر بوو لەگەڵ ئەم هەموو گوێ نەدانە کاتێك سەیری ڕوخساری دڵڕفێنیم دەکرد، ئەو کاتەی دەنگی هەناسەی گەرم و بۆنداری ئەوم دەبیست و لەنزیکی ڕوخساری خۆمدا هەستم پێ دەکرد، دان بەوەدا دەنێم زیاد لەڕادە و زیاتر لەسنووری گوومان ئەوم خۆش دەوێت.

ڕاستم وتبێت..... تا ئەو ڕۆژە هیچ ژنێك بەئەندازەی ئەمانۆ سەرنجی ڕانەکێشابووم. شێت و عاشق ببووم و خۆم نەدەناسیەوە.

لەناو ئەم بیرۆکەو خەیاڵانەدا دەست و پێی ئەمانۆم کردەوە.

ئەو لەشوێنەکەی خۆی هەستاو زۆر بەخوێنساردی جلە خۆڵاویەکانی ڕێك کردو ئەوکات سەیری منی کردو ووتی:

ئێوە لێرە چیتان دەکرد.....؟

وەڵامی ئەم پرسیارەم نەدایەوە.... زۆر سادەیە..... نەمدەویست پێی بڵێم لەبەرئەو لەهۆز هاتوومەدەر و هاتوومە ئێرە. لەلایەکیش نەمدەویست وا هەست بکات بەڕێکەوت ئەوم بینیوە و بۆ ڕزگارکردنی خۆم خستۆتە مەترسیەوە.

لەسەر ئەم خەیاڵ و گوومانانە لەجیاتی ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەی بدەمەوە دەستیم گرت و لەکاتێکدا لە شادمانی و خۆشحاڵیدا دەلەرزیم ووتم:

کاتی ئەم قسانە نیە خێراکە..... دەبێت هەرچی زووتر خۆمان بگەیەنینە جەنگەڵی خوار کوێستان تا سیلاحەکانم هەڵگرم.

ئەو دەستی لەدەستم دەرهێناو دواتر سەیری کردم و ووتی:

نیگەران مەبە.... جگە لە ئێمە کەسیتری لێ نیە. هەموویان ڕۆشتوون بۆ شەڕ.

بەبیستنی ئەم ڕستە تەکانم خوارد. ڕەنگە ئەو گوومانی دەکرد من ترسنۆکم کە ئەم قسەی دەکرد.

هێشتا لەبیر نەهاتبوومە دەر کە ووتی:

زۆرباشە ئێوە بۆ کوێ دەڕۆن....؟

دەتوت نایەوێت ڕێگای هۆز تا ئەوێ لەگەڵ مندا ببڕێت کە ئەم پرسیارەی کرد....

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم:

مەگەر تۆ جگە لە گەڕانەوە بۆ هۆز کارێکی ترت هەیە.....؟

لەوەڵامدا ووتی:

هەڵبەتە نا.

و ئیتر هیچی نەوت و بەڕێکەوت.

لە تووڕەییدا دەلەرزیم.... دەردو ئازارو سووتانەوەی برینەکان و هەموو نیگەرانیەکانی خۆم لەبیرکردبوو دەمویست لەپێناو برینداربوونی هەست و نەفسی خۆم غروری هەمیشەی لەناو ئەودا بکوژم. ئایا شەرم نیە پیاوێکی خوێنەوار و شارنیشین بەم شێوە سووك و زەلیلی عەشقی کچێکی نیوە وەحشی ببێت و لەهەمووی گرنگتر گوێشی پێ نەدرێت. چ شەرمێك لەمە گەورەترە....؟ ددانم گیر کردو دەڕۆشتمە پێش بەڵام لەڕێگادا قسەم لەگەڵ نەکرد. ئەویش بۆ قسەکردن لەگەڵ من تامەزرۆیی نیشان نەدەدا.

بەدەست لقەکانی لادەبرد و دەڕۆشت و سەیری دواوەی نەدەکرد و لە منی نەدەپرسی. دەتوت هەر لەگەڵیانیم.

بەهەرحاڵ لە کێو رۆشتینە خوار و دووبارە گەشتینە شوێنێك کە لەدارەکە زۆر دوور نەبووین. لەوێ بوو کە من لێی جیابوومەوەو بێ ئاگاداری و پرسیار و وەڵام ڕێگام خوارکردو بەرەو دارێك کە سیلاحەکانم تیا داشاردبو، رۆشتم. لە تووڕەیی و بێزاریدا دەلەرزیم.

ناوچاو و پشتم تەڕ و برینەکانم دەسووتایەوە. چەند خولەك دواتر گەشتمە دارەکە. لەسەر ئەو نیشانانەی دیاریم کردبو دۆزیمەوە و لەخوارەوە سەیری شوێنی سیلاحەکانم کرد.

لولەی تفەنگەکە لەناو لق و گەڵای دارەکانەوە دەبینرا.

بەخۆشحاڵی و بەدژواری لە دارەکە سەرکەوتم و توانیم تفەنگەکانم هەڵبگرم.

هەر لەوێدا تاقیم کردنەوە......

تفەنگ و دەمانچەکەم و فیشەکەکان دەستیان لێ نەدڕابوو. دەمانچەکەم کرد بەلاقەدمەوە تفەنگەکەم کردە شانم، لەهەمان ڕێگا کە ڕۆشتبوومە سەر هاتمە خوار.

چەند خولەك ڕۆشتمە پێش بەڵام لەناکاو بیرێك بە مێشکمدا هات و لەشوێنەکەی خۆم چەقیم. بیرەکەم ئەوەبو نەکات لەرێگا روبەڕوی وەحشیەکان ببمەوە ! پاڵم بە دارێکەوەدا و بیرم کردەوە. دەمزانی لە ڕووباریشەوە دەتوانم بڕۆمە ناو هۆز، بۆیە ڕێگام گۆڕی و بەرەو باشوور ڕۆشتم.

خۆشم نازانم کەچی بوو بەخێرایی ئەم بڕیارەم گرت. ڕەنگە چارەنووس منی بۆ ئەولابرد... بەهەرحاڵ رۆشتم.

ئەم بەشەی جەنگەڵ زیاد لەڕادە چڕ و مەترسیدار بوو و لەگەڵ ئەوەی هەتاو دەدرەوشایەوە بەڵام لەبەر دار سەر بەئاسمان کێشراوەکان و لقە چڕو پڕ گەڵاکان ڕووناکی نەدەبینرا.

زۆر لەسەرخۆ دەڕۆشتمە پێش لەترسی ئەوەی نەکا ماری بوئا و ئاناکندا پەلامارم بدەن کە لە ناکاو قیژەی ژنێك بێدەنگی جەنگەڵی شکاندو دووبارە سەرنجی منی بۆ رۆژهەڵات ڕاکێشا. گوومانم نەبوو دەنگی ئەمانۆیە. لەگەڵ ئەوەی نەمدەویست یارمەتی بدەم، بێ ئیرادە بەرەولای ڕام کرد. ئێستا بیرم لەگیانی خۆم نەدەکردەوە چونکە باسی گیانی قیبلە و خۆشەویستەکەم لەئارادا بوو.... بیرم لەوە نەدەکردەوە ڕەنگە مارێکی بۆئا لەناو گیاکاندا پەلامارم بدات و بە زەربەیەك گیانم بگرێت. هیچ شتێك جگە لە رزگارکردنی ئەمانۆ لە مێشکمدا نەبوو.

بەڕاکردن ئارەق ڕشتن بەرەو شوێنی دەنگەکە رۆشتم هەرچەندە زۆریش لێوەی دوورنەبووم.

شوێنێك کە شەوی پێش تیای کەوتبوومە تەڵەوە لە نزیکی پێنج سەد مەتر لە سەروی رێگاکەی من بوو. دەمزانی لەوێش تەڵە هەیە بەڵام بێ ترس دەڕۆشتمە پێش. سەرئەنجام گەشتمە ناوچەیەك کە داری شلوێی زۆری لێیە. لەوێدا هەناسە لە سنگمدا گیری کرد و ئەوەندە هیلاك بووم دەمویست دانیشم و بحەسێمەوە و کتوپڕ لە پێنج مەتری خۆم ئەمانۆم بینی لە ژێر دارێك دانیشتووە و شلوێ دەخوات.

بە بینینی هەناسەیەکم بە ئاسوودەیی هەڵکێشاو بەڵام بە تووڕەیی ووتم:

بۆ دەقیژێنی......؟ ئەم کردەوە ناشرینە چیە.....

شانەکانی بەرزکردەوە و بەخوێنساردی هەمیشەیی ووتی:

کێ قیژاندی......؟

بەتووندی ووتم:

تۆ قیژاندت........ دەنگتم ناسیەوە...

بزیەکی گرت و ووتی:

بەهەڵەدا چوویت..... من نەبووم.... بڕۆرە پێش.... ڕەنگە ژنێکی تر لەم ناوچەدا گرفتار بوبێت.... بڕۆن کات بەفیڕۆ مەدەن.

دواتر وەك بڵێی لەگەڵ ڕێبوارێکی نەناسراو قسەدەکات سەری داخست و دەستی بەخواردنی شلوێ کرد. خوێن لە دەمارەکانم دا قوڵپی دەداو بێ ئیرادە دەستم بۆ تفەنگەکەم برد و هێنامە خوار بەڵام خێرا بەسەر خۆمدا زاڵ بووم. ئەو کە منی بێدەنگ بینی دووبارە سەری هەڵبڕی ووتی:

ئەی بۆ ناڕۆن......؟ ڕەنگە کەسێك کە قیژاندی پێویستی بەیارمەتی بێت.

دڵنیابووم کە ئەو قیژاندویەتی و درۆ دەکات بۆیە پاڵم بە دارێکەوە داو ڕاوەستام.

بۆ سێیەم جار بزەیەکی هێنایە سەر لێوو ووتی:

کەواتە تۆ تەنیا بۆ ڕزگارکردنی من ڕادەکەیت و خۆت ماندوو دەکەیت؟ سەیرە؟

دواتر لەشوێنەکەی خۆیدا تەکانی خوارد و ووتی:

شلوێ دەخۆیت......؟ ئەم میوە بۆ نەهێشتنی تینوویەتی زۆر باشە....

دەست بەجێ یەکێك لە شلوێ کانی بۆ هاویشتم. گرتمەوە و لەبەرانبەریا دانیشتم، وادیاربو ئەمانۆ کەمێك ڕام بووە بەڵام هێشتا دڵنیا نەبووم. بە خۆمم ووت:

ڕەنگە دەترسێت بەتەنیایی بڕوات و بەم فیکە منی کێشایە ئێرە کە لەگەڵیدابم.

چونکە نەمدەویست هیوا بەتەواوەتی دڵم چۆڵ کات بەخۆمم ووت:

ئەگەر پێویستی بەیارمەتی نەبێت قیژەکەی نیشانی ئەوەیە لەدڵیدا کەمێك ئارەزوی منی هەیە. شلوێی یەکەمم خوارد و یەکێتری بۆ هاویشتم و دووبارە هەمان پرسیاری یەکەمم کە وەڵامم نەدابوویەوە دووبارەی کردەوە ووتی:

ئێوە چۆن هاتنە ئێرە....؟ ڕێکەوت ئێوەی لەهۆزەوە کێشایە ئەو شوێنەی من لێی گرفتار بووم یان ئەوەی.....

هەستم کرد بەزانینی ئەم بابەتە زۆر ئارەزوومەندەو دەیەوێت دانپیانانی عەشق لە من بگرێت و ناچار ووتم:

خۆشم گرفتار بووم. سەیرکەن.... ئەم برینی سینەی منە و چۆنیەتی کەوتنە تەڵەکەی خۆم بۆ باس کرد و لەکۆتاییدا ووتم:

بەیانی کاتێك هاتمە هۆش، دەوروبەری خۆم چۆڵ بینی. هەموو وەحشیەکان رۆشتبوون منیش رامکرد. لەکاتی راکردن دەنگی تۆم بیست لە کێو هاتمە سەر و ئەو رووداوانە روویدا. بەجوانی گوێی لە قسەکانم گرت بەڵام کەمتر سەیری چاوی کردم. نەیدەویست چاومان بکەوێتە سەر یەك. نارەحەت دەبوو ئەوسات هۆی ئەم خۆ گرتنەییم نەدەزانی. کاتێك قسەکەم تەواو بوو ووتی: (( چی بو لەم بارودۆخە هەستیارەدا هۆز و مووناکت بەتەنیا جێ هێشت و هاتیتە جەنگەڵ؟)) وەك پشکنەرێکی کارزان پرسیاری دەکرد و بەم پرسیارانە جۆرێك رێگای لێ دەبەستم کە ناچار دان بەوەدا بنێم و بڵێم لەبەر عەشقی تۆ هاتووم. بەڵام دووبارە خۆم گرت و ووتم:

تۆ چی بوو کە گرفتار بوویت؟

بەخوێنساردی ووتی:

ماوەیەکە لئۆنا بۆتە نەیارم. ئەو پێشتر لە هاورێکانی من بوو. تەنانەت کاتێك لەگەڵ ئێوە بوو من پارێزەری نهێنیەکانی بووم. بەم حاڵەش ئێستا بۆتە دوژمنم و دوو رۆژ پێش لەسەر بنچینەی هاورێیەتی منی بۆ جەنگەڵ بانگ کرد. کەسێك کەلای ئەو پەیامی بۆ هێنابووم لەجەنگەڵدا دەست وپێی بەستمەوەو بردمیە سەرچاوە. بەدەستووری لئۆنا منیان لەوێ راگرت تا بمکوژن. ئەمرۆ بەیانی زوو وەحشیەکان بە سیلاحەوە بەرەولای یەك رۆشتن و من چاوەرێی گەرانەوەی ئەوان و مەرگی خۆم دەکرد کە ئێوە گەشتن.

بەلێزانی قسەی دەکرد بە شێوەیەك لەناو وتەکانی هیچم دەست نەکەوت. جۆرێك نیشانی دەدا کە ئاگای لە حەزو خۆشەویستی من بەرانبەر بەخۆی نیە و حەزیش بەزانینی ئەم بابەتە ناکات دواتر ووتی:

لئۆنا هێشتا ئێوەی خۆش دەوێت. ئەو داماوە نازانێت کە ئێوە زۆر زوو لەبیرتان کردوە ! پیاوانی هۆزەکەی ئێمە وانین.

وتوێژی ئێمە سەبارەت بە لئۆنا درێژەی کێشاو کاتێك سەرم هەڵبری بینیم ئاوابونی هەتاو نزیکەو گەرانەوە بۆ هۆز لەو کات و شەوەدا ئەگەری نیە.

بە ئەمانۆم ووت. وتی:

گرنگ نیە ! من لەم نزیکانەماڵێکم هەیە. لە دووری دوو کاتژمێر یانی قەراغ رووبار باوکم پێشتر ماڵێکی دروست کردبو. چەند ماڵێکی تریشی لێیە، بەڵام ئێستا چۆڵن و

کەسی تیا نیە. ئەم ماڵانە لە کۆندا هی ماسیگرەکان بوون و ئێستا وێران بوون، تەنیا یەك لەوان کە هی منە بۆ ژیان هەندێ کەل و پەلی تیایە.

منیش بەخێرایی و بە زیرەکی ووتم:

زۆرباشە منیش لەسەر یەکێك لەم دارانە دەخەوم.

ئەم ڕستەم ووت و لەژێر چاوەوە سەیری ئەمانۆم کرد. ئەو چاوەڕێی ئەم وەڵامە ساردەی نەبوو. بۆیە بیری کردەوە ووتی:

ئێرە مەترسیدارە.... تۆش لەگەڵما وەرە بەڵام لە ژوورێکی تردا بخەوە. ئەمەی ووت لەشوێنەکەی هەستا. هەوا هێشتا ڕووناك بوو. منیش لە ڕووناکی کاتی ئاوابوونی خۆر بێچووە کەڵەکێویەکم ڕاوکرد.

دوای ماوەیەکی زۆر یەکەم جار بوو کەڵەکیوی لە جەنگەڵدا ببینم. بێچووی یەك ساڵەم خستە سەر شان و هاوڕێ لەگەڵ ئەمانۆ بەرەو قەراغ ڕووبار ڕۆشتین و گەشتینە قەراغ ماڵەکان.

وەك وتبووی چەند ماڵێکی لێبو. یەك لەوان کەرەستەی بۆ ژیان تیابوو. هەستم بەوەکرد ئەو کاتانەی ئەمانۆ لە هۆزدا دیار نەدەما دەهاتە ئێرە. ئەو منی بردە ناو یەکێك لە ماڵەکان. ڕاخەرێکی لەسەر تەختەیەکی دار داخست و دەرگاکەی لە دەرەوە داخست و ڕۆشت.

ئەوەندە هیلاك بووم کە زۆر خێرا خەوم لێکەوت و تا بەیانی کە دەرگا کرایەوە و ڕووناکی هەتاو هاتە ژوور ئاگام نەبوویەوە.

دەرگا کرایەوە... ئەمانۆ لە جل و بەرگێکی زەرد ڕەنگ و دڵرفێن لەکاتێکدا سینی داری ناشتایی منی لەسەر دەست بوو هاتە ژوور.

دوێنێ شەو باش خەوتن؟

نەمزانی شەو چۆن تێپەڕی....

سینیەکەی لەبەرانبەرم داناو دەستی کرد بە پاك کردنی جۆرێك ئاناناس کە تایبەتە بە ئامازۆن. لە ژێر چاوەوە نوقمی جوانیەکەی ئەو بووم و بیرم لەوە دەکردەوە چارەنووس نەخشێکی تری بۆ ژیانم داڕشتووە و منی گرفتاری ئەمانۆ کردوە.

لەم بیرانەدا دەتلامەوە، دەتووت لە گێژاوێکدام و ڕێگەی ڕزگار بوونم نیە.

ئەمانۆ تەواو بوو لەبەرئەوەی منی بێ جووڵەو بێدەنگ بینی، بزیەکی گرت و ووتی:

بۆ قسە ناکەیت؟

هەناسەیەکم هەڵکێشاو بەڕاشکاوی و بێ پەردە ووتم: هەرچی زیاتر قسەت لەگەڵ بکەم، هەرچی زیاتر لای تۆ بم بەدبەخت تر دەبم. کەواتە باشترە ئەم چەند خولەکەش بێدەنگ بم و بڕۆم.

پێکەنی و زەق زەق سەیری چاوەکانی کردم و ووتی:

بۆ حاڵەتی چاوەکانت گۆڕاوە...... مەبەستم ئەوەیە هۆی گۆڕانی چاوەکانت و هۆی بەدبەختیت پێکەوە بڵێ.... من تێنەگەشتم مەبەستت لە بەدبەختی چیە؟

کچێکی وشیارو زیرەك بوو. بەوەی ووتم ڕازی نەدەبوو، دەیویست ڕاشکاوتر قسەبکەم و من کە بەڕاستی ئەوم خۆش دەویست و لەهەمان کات نەمدەویست وەك کچەکانی تر چێژی لێوەربگرم و بڕۆم، بڕیارمدا و هەستام....

دەزانن بڕیارەکەی من چی بوو؟ دەمویست لێی دوور بکەومەوە، ڕەنگە عەشقەکەی لەبیر بکەم... بە نەرمیەکی تایبەت ووتی: (( برسیتە ! شتێك بخۆ ! ))

بەڕاستی برسیم بوو، ئاوی میوەکەم هەڵقوراند و قاشێك ئاناناسم خستە دەمم. زەختم لەخۆم کرد.... فشارم بۆ خۆم دەهێنا تا نەگریم.

سەرقاڵی لەبەرکردنی جلەکانم بووم، پشتم تێکرد تا فرمێسکەکانم نەبینێت.

بە دژواری لەهاتنەخواری فرمێسکەکانم ڕێگریم دەکرد و بەخێرایی قۆپچەی شەڕواڵەکەم بەست و کە خێراتر لێی ڕابکەم و بڕۆم.

لەم کاتەدا هەستم بەوەکرد دڕاوییەکانی کراس و شەڕواڵەکەم دووراونەتەوە....

سەیرە ! کێ جلەکانی منی کە دوو ڕۆژ پێش لەو شەڕەدا دڕابوو، دوورویوەتەوە؟

بەسەرسوڕمان و بەوحاڵە پەرێشانەوە، چاوە پڕ فرمێسکەکانم تێبڕی و بە پرسیارەوە لێم ڕووانی ! ئەمانۆی زیرەك مەبەستەکەمی وەرگرت، لەشوێنەکەی هەستاو ووتی:

جلەکانی تۆم دوێ شەو دوورییەوە. تۆ خەوتبوویت بەهێواشی هاتمە ژوور، جلەکانم بردە ژوورەکەی خۆم و دووریمەوە، بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر ووتی:

ئاخر من دەتوانم لەدەرەوە دەرگای هەموو ئەم ماڵانە بکەمەوە و بیبەستم. من چەند جار هاتمە ئێرە و ڕۆشتم. یەك دوو جاریش ژێر سەرتم چاك کرد تا ئاسوودە بخەویت... ڕازی نەدەبووم سەرت لەسەر دارەکە بێت.

کراس و شەڕواڵەکەتم دەرهێنا و خستمە ژێر سەرت، زۆر کارم کرد بەڵام ئاگات نەبوویەوە چەند خەوت قورسە؟ نازانم دوێ شەو لە هیلاکیدا خەوت لێکەوت یان هەروا خەوت قورسە. بەبیستنی ئەم قسانە دڵم داکەوت. دەمم کردەوە شتێك بڵێم بەڵام

نەمتوانی... ئەو هاتە پێش و دەستی گرتم و ووتی:

بۆ جلەکانت لەبەردەکەیت....؟ دەمویست دەرمان لە برینەکانت بدەم. بوەستە.

زەختم لەخۆم کرد و بە پاڕانەوەو دەنگێکی پڕ ئازار ووتم:

با بڕۆم.....

ئیتر نەمتوانی قسە بکەم، بێ ئیرادە بووم و فرمێسك هاتە چاوم کە ڕێگرتن لەهاتنەخواری ئەگەری نەبوو بەڵام بۆ ئەوەی بینەری گریان و بارودۆخم نەبێت پشتم تێکردو سەرم خستە سەر دەرگای ژوورەکە.

ئەمانۆ هاتە پێش. ئەوەندە لەپشتەوە لێم نزیك بوویەوە کە گەرمی جەستەییم هەست پێکرد. گەرمیەك کە گیانێکی تازەی بە رۆحم دا و رۆحمی ساف کردەوە.

ئەمانۆ سەری خستە سەر پشتم، بەدەنگێك کە لەرزینەکەی ئاشکراتر لە دەنگی بوو ووتی:

ئەمەم دەویست..... بەدوای ئەم دوو دڵۆپە فرمێسکەدا دەگەڕام.... سوێند بە خوای جەنگەڵ کە زیاد لەڕادە تۆم خۆش دەوێت بەڵام دەترسام بەچارەنووسی کچانی تر گیرۆدەم کەیت، لەسەر ئەم ترسە بوو لە تۆ ڕامدەکرد و خۆم دوور دەکردەوە.

ئەوکات کەمێك وەستا و ووتی:

بەڵام بێ ئیرادە بووم....

دەنگی گریانی بەرزبوویەوە و من گەرمی فرمێسکەکانیم لەسەر بڕبڕەی پشتم هەست پێکرد. فرمێسکی من و ئەو سەرەتا دەسپێکی عەشقێکی سووتێنەر بوو کە لەمەودوا زیاتر خوێنەران بە خۆیەوە سەرقاڵ دەکات. عەشقێك کە ڕووداوی مەترسیدار و ترسناکی بەدواوە بوو. بناغەی ئەو عەشقە ئەو رۆژە لەو ژوورە یەکەم بەردی دانراو بۆ هەمیشەش وەك یادگاری دەمێنێتەوە.

هەردووك دەگریاین بەڵام چ گریانێکی گەرم و سووتێنەر ! گریانی شادمانی ! گریانی حەسرەت گریانی ترس... گریانی پێکەنین و خۆشحاڵی....؟ نازانم و ناتوانم ناوی ئەو گریانە بڵێم.

بەهەرحاڵ لەپانای روخساری خۆم فرمێسکم دەڕژاند و دڵۆپی فرمێسکی ئێمە دوانە تێکەڵ و مل و بناگوێمانی تەڕکرد.

نەمزانی چەند کاتژمێر بەو شێوە بووین و خوولەك و کاتژمێرەکانی رۆژ چۆن تێپەڕین. دنیا و ئەوەی تیایدایە، هەردوکمان لەبیرمان کردبوو.

چەندین کاتژمێر بەڕازو نیاز گریان و پێکەنین گوزەرا. بەڵام من کە ئەمانۆم بەڕاستی خۆش دەویست و لەدڵەوە عاشقی بووم دەستم بۆ درێژ نەکردو هەرگیز قاچم لەبازنەی پاکی نەخستە دەر. نزیکەی ئێواریٚ ئەمانۆ هەستاو رۆشتە ژوورەکەی تر و بەباوەشێك میوە گەڕایەوە ئەو شەوەش میوەمان خوارد.

بەرەبەیان کەچاوم کردەوە سەرم لەسەر رانی ئەمانۆ بو، کەسەیری چاویم کرد بینیم دەگریت. بەبزەوە دەستیم گرت و ماچم کرد و لەهۆکاری گریانەکەیم پرسی وتی:

هەمووی ئەم شەو لەم بیرەدابووم کە سەرئەنجام ئەو رۆژە دەگات کە تۆ لەجەنگەڵ و ئەم شوێنە تێر ببیت و بڕۆیت. ئەوکات من چی بکەم؟

لەشوێنەکەم دانیشتم و سەری جوانی ئەمانۆم خستە سەر سینەم و وتم:

تۆ هی منیت.... سەیرکە.... گوێبگرە. هێشتا هیچ پەیوەندیەك لەنێوانماندا دروست نەبو کە بۆ دڵخۆشی تۆ بمەوێت درۆبکەم. بۆ سەلماندنی عەشقی خۆم تا ئەو رۆژەی بەرەسمی دەبیتە هاوسەرم دەستت بۆ نابەم.

روخساری کرایەوە وەك منالێك بەڵێنی بووکەڵەیان پێدابێت دەستەکانی لەیەك داو سەری خستە ناو دەستی و وتی:

منی هی تۆم.....؟ راست دەکەیت؟ چەندە هەست بەبەختەوەری دەکەم.

هێشتا سەرقاڵی قسەکردن بو کە دەنگی خشە خش بیسترا. دەتوت یەکێك لەسەر گەڵاو گیا وشکەکاندا دەڕوات و شتێك بەدوای خۆیدا رادەکێشێت.

هەناسە لەسینەماندا وەستا. دەنگەکە بەئاشکراتر دەگەشتە گوێ و نزیکتر دەبو.

ئەمانۆ پێڵاوە چەرمیەکانی خۆی داکەند و لەسەر نووکی پەنجە بەرەو دەرگاکە رۆشت. لە کەلێنی تەختەکانەوە سەیری دەرەوەی کرد، دواتر بەئارامی سەری بردە دەرو خولەکێك لەو حاڵەدا مایەوە.

وەستانی ئەو سەرنجی منیشی راکێشا و لەسەر نووکی پیٚ بەرەو لای رۆشتم. ئەمانۆ زیاتر دەرگاکەی کردەوەو وتی:

بڕاوانە ئەو پیاوە بریندارە لە دانیشتوانی هۆزەکەی خۆمانە. سەیرکە. زۆر سەیرە دواتر بە پەلە وتی:

دەیناسم.

دەتوت دەنگی ئەمانۆ سەرنجی پیاوە بریندارەکەی راکێشا و بەرەولای ئێمە هات.

دەرگاکەم کردەوە، کاتێك زانیم تواناى رێگە رۆشتنی نیەو بەدەست و سەر داوای

یارمەتیمان لێ دەکات، بەرەولای رامکرد. باوەشم کردو بەخێرایی بۆ ناو ژوورەکەم گواستەوە.

بریندار کە ئێمەی بینی و ناسینیەوە. لەهۆش چوو.

شوێنی درەنگ کردن نەبو. برینی مەترسیدار بو. من و ئەمانۆ برینەکانیمان بەست. ئەمانۆ کەمێك گیای کۆکردەوە و گوشراوەکەی کردە ناودەمی، نزیك ئێواریێ وەحشی هاتە هۆش بەڵام لەگەڵ ئەوەی چاوی کردەوە و ئێمەی بینی و ناسینیەوە، کاتێك سەری بەرزکردەوە بەترسەوە وتی:

دەرگاکان داخەن.... ئاگر مەکەنەوە.... دێن.... دێن .... تەنیا من زیندوومـاوم.

بەبیستنی ئەم رستە دڵم داکەوت.... لەکوێ تەنیا ئەو زیندووماوە.....؟

مەبەستی چیە؟

پرسیم:

چیت وت؟ چی رویداوە؟

هیچ، دەتویست چی ببێت، هۆزەکەیان کوشتارکردین و ژن و پیاو پیرو گەنج و منالیان بەبێ جیاوازی کوشت.... تەنانەت سەگ و پشیلەکانیش بەزیندوویی نەهێشت. لئۆنا ئەوانی هێنابوو.

ئەوێ.... لئۆنا.

وەحشی ئەمەی وت و دووبارە بێهۆش بو. من و ئەمانۆ لەناڕەحەتی و نیگەرانیدا دەلەرزین.

لەو کاتەدا هەموو سەرنجم لای مووناك و یوری و منالەکەم بو. بەپلەی یەکەم یوری و دواتر بیرم لەمنالەکەم دەکردەوە و داخم دەخوارد ئەو دووانە کوژرابێتن. یوری داماو ! خەریك بو دەخنکام. دەرفەتم لەدەست نەداو بەخێرایی جلم پۆشی و سیلاحم هەڵگرت و بەرەو دەرگای ژوورەکە رامکرد.

ئەمانۆ دەیویست لەگەڵ من بێت. بەڵام رێگر بووم. بەهەزار زمان داوام لێکرد لەوێ بمێنێتەوە و پەرستاری لەوپیاوە وەحشیەبکات. ئەمانۆ کە منی لەڕۆشتن سوور بینی، قەمەیەکی پانی هەڵگرت و خستیە سەر دڵی و هەڕەشەی لێکردم ئەگەر بڕۆم خۆی دەکوژێت. ناچار تەسلیم بووم و مامەوە. ئەو رۆژە بەم شێوە تێپەڕی و سەرئەنجام رۆژی سێیەم کە (( شائکی )) باش ببویەوە و دەیتوانی بەباشی جوانی بەرێگادا بڕوات ئەمانۆ رازی بو کە هاوڕێ لەگەڵ شائکی بڕۆمە هۆز بەڵێنیشی دا خۆی لەوێ بمێنێت و خۆی

داشارێت.

من وشائکی کە بەڕاستی پیاوێکی بەهێزو وشیاربو، سوار بەلمێکی شکاو بووین و لەرێگای رووبارەوە بەرێکەوتین.

ئەو رۆژە بەهێواشی تێپەری و بەلەم وردە وردە لەسنوری هۆزی ئامازۆن نزیك دەبوویەوە شائکی ئارام و خوێنسارد بو وەك پەیکەرێکی لەپۆلا کەرەنگی قاوەییان کرد بێت. بیرم دەکردەوە و سەیری شەپۆلەکانم دەکرد کەلەناکاو شائکی وتی:

سەرۆك هاتن.... ئاگادارین.

بەخێرایی دارە درێژەکەی خستە ناو بەلەمەکە و قەمەکەی کێشا. من سەیری بەرانبەری خۆم کردو تفەنگەکەم ئامادە کرد.

بەڵام درەنگ ببو چونکە لەچەند خولەکێکدا لەناو ژمارەیەك بەلەم کەلەهەرکامیاندا دووپیاوی چەکدار دانیشتبوو و گەمارۆ دراین...

دیمەنێکی ترس ئەنگێز و ترسناك بو کە هەربینەرێکی دڵ رەقی دەلەرزاند. لەبەردەم هەرکام لە بەلەمەکان دارێکیان هەڵواسی بو و لەسەر هەردارێك سەرێکی براویان دانابو. چاوی سەرە براوەکان کراوەبو، دەتوت سەیرمان دەکەن و بۆ سەندنی تۆڵەی خۆیان و منالیان هانمان دەدەن. بەدڵنیاییەوە تائێستا لەم خاڵە ئاگادار بوونەتەوە کە هۆزە جیاوازەکانی ئامازۆن هەرکام نیشانی تایبەتی خۆیان هەیە. هەندێك لەهۆزەکان بەکێشانی هێڵی رەنگین لەسەر روخساری جەستەی خۆیان خۆیان لە هێزەکانی تر جیادەکەنەوە و هەرکام بەشێوەیەك.

بەم شێوەش هەرکە چاوم بەسەرە براوەکان کەوت و نەخشەکانی روخساریانم بینی. دەمم لەسەرسوڕماندا و لەهەمان کات لەترس و نیگەرانیدا کرایەوە و چونکە لەیەکەم نیگا زانیم سەرە براو و خوێناویەکان پەیوەندیان بەئازاو شەرکەرەو پاڵەوانەکانی ئامازۆنەوە هەیە.

کەواتە ئەوەی شائکی دەیوت راستە.

ئەوەی تائێستا منی دەترساند سەرە براوو چاوە بێ سۆماکان بوون کە بەزمانی بێ زمان قسەیان لەگەڵ دەکردم بەڵام لەم ساتە بەدواوە چاوی پڕ رق بێزاری و خوێنخۆرو تاوانباری وەحشیەکانی ناو بەلەمەکان بو منی دەترساند.

سەیری هەرکامیانم دەکرد، بڵێسەی ئاگرێکی سووتێنەر کەلەچاوەکانیەوە هەلەستا لەرۆح و گیان و دەروونی من بەردەبو و لەسەر رێگای خۆی هەموو شتێکی دەسووتاندو

ورەو بوێریشی لەناو دەبرد.

ئەوان رم و تیروکەوان و خەنجەر و قەمەیان پێبو.

لەدەستیان خوێن دەچۆڕا و قاچ و ران و سینەی ئەوانیش خەڵتانی خوێن بو.

بەیەك روانین لەدەوروبەری خۆم هەستم بەم خاڵانە کرد و بارودۆخی خۆم هەڵسەنگاند. شائکی لەپشتەسەرم دانشتبوو و دەلەرزی.

شائکی نەدەبوا لەهاوڕەگەزەکانی خۆی بترسێت. بەڵام ئەوەی بەچاو دیبووی و ئەم دیمەنانەی لەبیّ بەزەیی ودڵرەقی ئەوان بەرچاوی کەوتبو، دەیترساند. مافی خۆی بو بترسێت و لەزۆری ترس شەق شەقەی دیانی رۆژە رێیەك بڕوات.

ئەمەشم باش نەدەزانی و ناتوانم بە بەڵگەوە بینووسم. نەمدەزانی ئەوان من دەناسن یان نە. ئایا دەیانزانی من پیاوی جێگەی سەرنجی لئۆنام کە شەوی پێش دەستم و پێمیان بەست و لەچوار مێخەیان دابووم یان نە؟

ئەوەی لەهەمووان لەمن نزیکتربو لەناکاو قیژاندی و رەمەکەی خۆی بۆ سینەی من رەهاکرد.

وەحشیەکان لەهاویشتنی رم زۆر شارەزان.

کەمتر رێدەکەوێت وەحشیەکی ئامازۆنی رمێك بۆ کەسێك یان نیشانەیەك یان ئاژەڵێك رەهابکات و راستەوخۆ نەچەقێتە ئەو شوێنەی دەیەوێت.

ئەو سەرەتا رمەکەی رەهاکرد بەڵام کاتێك دەیویست دوایین بەشەکەی لەناو پەنجە نیوە داخراوەکانی دەربچێت دەستی بەست و کلکی رمەکەی گرت.

ئەم کارەی بۆ ئەوە کرد هەم من بکوژرێم و هەم رمەکەی لەدەست نەدات. نوکی ئاسنینی رمەکە بەرەو دڵم دەهات بەڵام شائکی کە لەپشتی سەری من دانیشتبو لەهەمان سات کەدەبوا بکوژرێم و دڵم کون بێت ملی منی گرت و بەخێراییەکی شیاوی دەستخۆشی کردن بەرەولای راست فشاریداو خواری کردەوە.

ئەم کارە بوەهۆی رزگاری من و رمەکە لەجیاتی ئەوەی سینەی من کوون کات لەبەلەمەکە چەقی و وەحشی بۆ دەرکێشانی هەوڵیدەدا.

نووکی رم لەتەختەی بەلەمەکەدا جێگەی گرتبوو. راکێشانی لانی کەم چەند چرکەیەکی کات دەویست.

چەند چرکە بۆ ئێمە دەرفەتێکی زۆر باش بو. دەمزانی بەهەرحاڵ ئەوان دەمانکوژن تفەنگەکەم خستە سەر دەست و بەخێرایی مێشکیم نیشانە گرت و تەقەم کرد. گوولە

تەقا و وەحشی لە شوێنەکەی بەرز بوویەوە، قیژەیەکی کورتی کرد، کەوتە ناو ئاوی رووبار و رۆشتەخوار دووەم کەسیش کە لەناو بەلەمەکەدا بەگوولەیەکی تر کەوت و لەناو ئاودا ون بو، بەکوشتنی ئەو دووانە هەموو وەحشیەکان رمەکانیان بۆ بەلەمەکەی ئێمە هاویشت، هەراو هوریا و هەلهەلەیان دەستی پێکرد و هێرشیان هێنا.

ئەم جارەشیان شائکی بووەهۆی رزگاری من و بەلەمەکەی بەسەوڵ بردە پێش. جێ گۆڕینی بەلەم لەئاوی رووبار بووەهۆی ئەوەی هیچ کام لەرمەکان بەر ئێمە نەکەوێت. تەنیا یەکیان بەر بەلەمەکە کەوت و زیانی بەئێمە نەگەیاند.

بەخۆشحاڵیەوە ئەوان ئیتر رمیان نەبو تەنیا چەند کەسیان کە تیروکەوانیان پێ بو شوێنمان کەوتن.

شائکی جێگای خۆی لەگەڵ مندا گۆڕیەوە. یانی من هاتمەدوای بەلەمەکە و لەچاڵی بەلەمەکەدا خۆم داشاردو دەستم بەتەقەکردن کرد.

شائکی ناچار بو سەوڵ لێبدات بۆیە نەیتوانی خۆی داشارێت و لەهەمان خولەکەکانی سەرەتا تیرێکی بەرکەوت و قیژاندی و سەوڵی دەستی چەپی فڕێدا.

تیر بەرشانی چەپی کەوت و تێی چەقی. لەشوێنەکەی خوێن فیچقەی دەکردو دەهاتەدەر.

ڕەش پێستێك کە تیرەکەی هاویشتبو بەر گوولەی من کەوت و کوژرا. خێرایی کاری ئەوان زیاتر بو و لەهەرچرکەیەکدا چەند تیرێك لەلایەن وەحشیەکانەوە بەرەو ئێمە دەهات چونکە من تەنیا بووم و ژمارەی ئەوان زۆربو.

لەگەڵ ئەوەشدا تیرەکانیان بێجگە لەو دووانەی بەرشانی شائکی کەوت، بەفیڕۆ چوون بەڵام من بەهەر سێ گوولە دوانم کوشت.

ژمارەی کوژراوەکان گەشتە دە کەس و لەکاتێك نیگەرانی من بۆ تەواوبوونی فیشەك رولەزیاد بوون بو، ئەوان دەستیان لە بەدواداچوون هەڵگرت و گەڕانەوە.

چەند خولەك دواتر بەلەمەکەی ئێمە پێچای و ئەوان لەبەر چاو ون بوون. شائکی تا ئەم کاتە بەیەك دەست سەوڵی لێ دەدا بەڵام لەوێدا لەبەرخوێن رێژی و ئازار دەستی لەسەر سینەی داناو ناچار من جێگای ئەوم گرتەوە.

کەمێك کە دوورکەوتینەوە، رۆشتمە لای شائکی. سەرەتا تیرەکەم لەشانی دەرکێشاو دواتر بەپارچەیەك لە کراسەکەی خۆم بەستم.

خوێن وەستایەوە بەڵام سووتانەوە و ئازار، ئازاریدەدا. بەهەرجۆرێك بو نزیکەی نیو

کاتژمێری تر لەئاودا ڕۆشتینە پێش.

بەردەوام و هەرچەند خولەك جارێك لەشائکیم دەپرسی، گەشتینە کویَ. لەدوایین جار ئەو پێڵوەکانی خۆی کردەوەو وتی:

گەشتین، بەلەمەکە بەرنە بەستێنی ڕاست و دابەزن. ئێوە بڕۆن من لەناو دارەکاندا دەمێنمەوە.

بەدژواری و بەفشارێك کە لەرەوتی ئاوم دەکرد بەلەمەکەم بۆ قەراغی ڕاست برد و تەنافەکەم بەدارێك بەستەوەو دابەزیم. بەشائکیم وت:

تۆ بمێنەرەوە. من دەڕۆمە هۆز و ژمارەیەك بۆ هێنانی تۆ دەنێرم.

شائکی بەدژواری بزەیەکی تاڵی هێنایە سەر لێو و وتی:

ژماریەك بۆ ناردنی من دەنێرن ! ئێوە بیَ ئاگان. نازانن چ کوشت وکوشتارێکی وەحشیانەیان دروست کرد بیَ ئاگان لەوەی ڕەنگە لە هۆزی ئامازۆن پێنج پیاوی زیندو نادۆزنەوە. ئەمەی وت و هەناسەیەکی هەڵکێشا. بە بیستنی ئەم چەند خەبەرە وتم:

کەواتە خۆم دەتبەم.

دەستبەجیَ دەستی ڕاستم لەکەمەری ئالاًند و بەدژواری و بەیارمەتی خۆی لەبەلەمەکە هێنامە دەر. پاڵی بەمنەوە دابو بەڕێگادا دەڕۆشت بەڵام نەیدەتوانی هەنگاو هەڵگرێت.

بردنی ئەو بۆ هۆز پێویست نەبو جگە لەبەفیڕۆدانی کات و بەدیهێنانی ڕوداوی مەترسیدار ئەنجامێکی نەبو. بەخۆشحاڵیەوە خۆی هاتە قسە و پێش ئەوەی من شتێك بڵێم وتی:

بەسە من لێرەدا دابنێن و بڕۆن. ئەگەر تیرێك کە بەرشانم کەوتووە ژاراوی بێت بە دڵنیاییەوە دەمکوژێت و کەس ناتوانێت ڕزگارم بکات چونکە تائێستا ژەهرەکە کاری خۆی کردوە بەڵام ئەگەر تیرێکی ئاسایی بیَ ژەهربێت لەبەرئەوەی خوێن وەستاوە لەچەند کاتژمێرێکدا باشتر دەبم و بەتەنیایی دەتوانم بەڕێگادا بڕۆم. ئەوکات دێم بۆلاتان و ئەگەر پێویست بکات ڕێنونیتان دەکەم. ئێوە من دابنێن و بڕۆن بەدوای کاری خۆتان. ئەگەر تا گەشتنی شەو نەهاتم و کاتتان بو بگەڕێنەوە بۆ ئێرە و لاشەکەم بەخاك بسپێرن تا ئاژەڵەکانی جەنگەڵ لەت لەتم نەکەن.

شائکی ئەمەی وت و لەسەر زەوی دانیشت ڕەنگی ڕووخساری سەوز ببو، دڵنیابووم تیری ژاراوی مەرگی ئەوی نزیك کردۆتەوە و تاکاتژمێرێکی تر دەمرێت.

ماڵئاوایم لێ کردو رۆشتم. کاتێك لەوێ دوورکەوتمەوە بیری قسەکانی شائکی کەوتمەوە کەباسی کوشتاری دانیشتوانی دەکرد.

بەدەم ئەم بیرانەوە گەشتمە سنوورەکانی هۆز. ئەم رێگە بەرانبەر بەو رێگابو کە چەند رۆژ پێش هۆزم لێوەی بەجێهێشت. یانی رێگەی پێشو بۆ کوێستان و ئەم رێگایە بە رووبار کۆتایی پێدەهات و لەبەرئەوەی رووبار پێچی نیە، رێگاکان بەرانبەر یەك جێگیربوون.

یەکەم دیمەنی ترس هێنەر کاتێك بینیم کە ماڵەکانی هۆز لەدوورەوە بینرا و کەمێك سەرووتر لە لق و گەڵای دارەکان ریزی ماڵە داری و حەسیریەکانی هۆز دەبینرا.

لێرەدا چەندین لاشە کەوتبو، پیاوێکی بێ سەرو ژنێکی سك هەڵدڕاو و منداڵێك...

سکی ئەو ژنەیان بەجۆرێك هەڵدڕیبو کە تاقوولایی قورگی هەڵدڕابو و هەمو ناوسکیان دەرهێنابو. منداڵەکەشیان بەڕمێك بەدارێکەوە داکوتیبو و کەمێك سەروتر جەستەی دوپیاوی سەر بڕاو دەبینرا. دیاربو هەموویان کەسانی یەك خێزانن کە لەکاتی راکردن گیرۆدەی وەحشیەکان بوون و بەم شێوەیە کوژراون.

ئەم دیمەنە ئەوەندە بێزارکەڕ بو توانام نەبوو سەیری بکەم ناچار خێرایی هەنگاوەکانی خۆم زیاد کردو رۆشتم.

باسکردنی دیمەنەکانی دواتریش بەبێ سوود دەزانم چونك جگە لەدروست کردنی ناڕەحەتی و خەم ئەنجامێکی نیە تەنیا ئەوەندە بزانن کە هەموویان کوشتبوون.

ژماردنی کوژراوەکان ئەگەری نەبو. لە هەرلایەکەوە تێدەپەڕیم لاشەی چەند کەسێکم لەسەر رێگای خۆمدا دەدی و لەدڵدا بۆ لئۆنا کە ببوە هۆی ئاوا کوشتارێکی بێ بەزییانە، لەعنەتم دەنارد.

هەرلەوێدا بەچاوی پڕ فرمێسك و قورگی گیراو بەڵێنم دا تاتۆڵەی ئەم هەموو بێ تاوانە لە لئۆنا و تاوانباران نەگرم جەنگەڵی ئامازۆن بەجێ نەهێڵم و لەداهاتوودا ببینن تا چەندە لەکاری خۆمدا سەرکەوتم تا چ رادەیەك بەبەڵێنەکەی خۆم وەفاداربووم. بابەتێك کە گرنگ دەهاتە بەرچاو، دۆزینەوەی یوری و منداڵەکەو مووناك بوو. سەیری هەرشوێنێکم کرد ئەوانم لەناو کوژراوەکاندا نەبینی. ژمارەیەك بەگوولە کوژرابوون زانیم یوری ئەوانەی کوشتووە بەڵام خۆی لەکوێیە؟ نەمدەزانی....؟

ماڵی ئێمەو ژماریەك لەماڵەکان لەئاگردا سووتابوون و شوێنەواریان نەمابو. فیشەکەکانی منیش لەناو چبو بەڵام شوینی داشاردنی سیلاح و فیشەکەکانم دەزانی و

بۆ بەدەست هێنانی فیشەك و ڕەشاشێك ڕۆشتمە ئەوێ.

لەو کاتەدا هەستی تۆڵە سەندنەوە خوێنی گەرم کردبووم و دەمویست بەهەر جۆرێك بۆ لئۆنا و تاوانبارانی ئەو کوشتارە بەسزای کردەوەکانی خۆیان بگەیەنم. کە لەکوژراوەکانی هۆز دوورکەوتمەوە، دەنگی خشە خشی مارێکم بیست و بەخێرایی خۆم فرێدایە لایەك. لەم کاتەدا قاچم لەجەستەی ژنێك گیراو کەوتم. مارێکی گەورەی ئاناکندا پەلاماری دام و دووبارە خۆی کۆکردەوەو وەك قامچی کەوتە ڕێ. سەیری ئەو ژنەم کردو بینیم ئەو ژنە بەهۆی گەستنی مار کوژراوە. شوێنی دوو دیانی مار لەسەر شانی چەپی بەجوانی دەبینرا. ماری ئاناکندا ئەوی کوشتبو.

سەرەتا بەگوولە سکی مارەکەم کوون کرد بەڵام مار بە گوولە نەدەکوژرا. ناچار دەستم بە قەمەکەم برد و پەلامارم دا. مار بەهۆی گوولە کەبەر سکی کەوتبو نەیدەتوانی بەجوانی ڕێبکات و من لەم دەرفەتە کەڵکم وەرگرت و بەقەمە چەند زەربەیەکم لەجەستەی هەشت مەتری ماردا و کلکیم بڕی.

کلکی مار لەدەستمدا بو وهێشتا هەردوو بەشی هەڵبەزو دابەزی دەکرد. وەك پێشتریش جارێك نووسیومە مار لەو ئاژەڵانەیە تاسەری نەقرتێنیت مەترسی پەلاماردانی هەیە و بەکلکی بڕاویش دەتوانێت خۆی بەنێچیرەکەی بگەیەنێت و بەچەقاندنی دیانە ژاراویەکانی لەپێی بخات.

بۆیە منیش ئاگاداری خۆم بووم. کلکی مارم فڕێداو دووبارە پەلامارم دا.... ئەم جارە ئاناکندا بەباشی نەیدەتوانی خۆی بجوڵێنێت.

ئەو خێرایی و چالاکی ئاسایی خۆی نەبو و لە لایەکیتر سکی کون کرابو.

مار سەری خۆی سووڕاندو پەلاماری دام بەڵام ئەم جووڵەی زۆر هێواش بو توانیم لەسەر زەوی و هەوا زەربەیەك لەئاناکندا بدەم. بەهۆی ئەم زەربانەوە بەهۆی تیژبوونی نووکی قەمە سەری ئاناکندا قرتاو لە دوو مەتریدا کەوتە سەر خاك.

جەستەی کە ئێستا مەترسی نەمابو هەڵبەزو دابەزی دەکرد. کاتێك لەم کارە ئاسوودە بووم بەرەوکچەکە دەڕۆشتم و لەگەڵ ئەوەی دڵنیابووم کەمردوە نەمزانی چی بو کەڕێگام بۆ لای ئەو خوارکردەوە.

کچەکە کەوتبو و ڕەنگی ڕوخساری گۆڕابو. بەئارامی لای دانیشتم و دەستم لەسەر دڵی دانا.

لەژێر دەستمدا جووڵەیەکی کەم هەست پێکرا. دەتوت دڵی هێشتا لێدەدات. سەیری

برینەکەم کردو بەشادمانیەوە بینیم شوێنی گەستنی مارە خوێنی لێ دێت و ژار خوێنەکەی مەیاندووە.

دەست بەجێ شوێنی برینەکەم گووشی و بەنووکی قەمە دەوروبەرەکەیم هەڵدڕی و ئەوەندە بەپەنجە فشارمدا کە کەمێك خوێنی مەیبو هاتەدەر.

ئاوێکی زەرد رەنگیش لەگەڵ خوێنە مەییوەکە هاتەدەر. ئەم ئاوە ژەهری ماری ئاناکندابو. هیچ هیوایەکم بۆ رزگاری کچەکە نەبو بەڵام بۆ دڵنیایی زیاتر دەستم لەسەر دڵی داناو بینیم لێدانی دڵی خێراتر بووە.

جارێکیتر برینەکە سەرنجی راکێشام و کەچاوم پێیکەوت و هەناسەیەکم بەئاسوودەیی هەڵکێشا و بەرزگارکردنی کچە ئامازۆنیەکە کە نەمدەناسی، زیاتر هیوادار بووم دەزانن چی بو.....؟

خوێن لەشوێنی برینەکەوە دەهاتە دەر و ئەمەش نیشانی دەدا ژەهری مارەکە هێشتا لەخوێندا کاریگەری دانەناوە. ئەگەر ژەهر بەخوێن دەگەشت خوێن دەمەیی و بەستنی خوێن دەبووە هۆی مەرگی ئەو.

خوێنەکە هواداری کردم و بۆئەوەی خوێنێکی زیاتری لێ بێت ژەهری مارەکە بشواتەوە دوو دەستیم بەرزکردەوەو چەند جارێك بۆ چەپ و راست تەکانمدا.

چەند خولەك دواتر کە دڵنیابووم ئیتر ژەهر لەشوێنی برینەکە دانەماوە. بەپارچەیەك لەکراسەکەم شانیم بەست و خستمە سەر شان و درێژەم بەرێ پێوان دا. رێگە لەناو جەنگەڵەوە درێژەی هەبو بەڵام هێشتا لەسنووری هۆز دەرنەچبو.

بارودۆخ شڵەژابو. دوور لەرێگا ئاساییەکان کە دانیشتوانی ئامازۆن بەکاریان دەهێنا، شوێنەوارێکی تر دەبینرا.

منیش خوار دەڕۆشتم و هەندێ کات لەرێ دەردەچووم. قورسی کچەکە هیلاکی کردبووم بەڵام لەوەی گەرمیەکم لەجەستەی نەرمی کچەکە هەست پێدەکرد شادمان دەبووم کەلانی کەم کەسێکم لەمردن رزگارکردوە. نزیکەی سی میل بەم شێوە لەجەنگەڵدا رۆشتینە پێش و کەم کەم لەشوێنی شاردنەوەی سیلاحەکان نزیك دەبوومەوە. نیشانەکانی جاری پێشو هێشتا بوون و دەبوونە هۆی دڵگەرمی من.

لەم کاتەدا لەناکاو دەنگی گریانی منالێك بەگوێم گەشت.... هەناسەم لەسینەمدا راگرت و وەستام..... جوان گوێم گرت...... بەهەڵەدا نەچبووم...... دەتوت منالێك بەئارامی دەگری. کچەکەم لەسەر زەوی داناو بەنووکی پێ بەرەو دەنگەکە رۆشتم.

چەند هەنگاو ئەولاتر دەنگەکە نەما، سەرگەردان مامەوە و نەمدەزانی بەکام ڕێدا بڕۆم. بۆ ئەوەی ورە بەو منداڵە بدەم و بەدەنگی بەرزو بەزمانی ئامازۆنی وتم:

تۆ لەکوێیت.....؟ دەنگی من دەبیستی؟ بگری تا بتوانم بێم بۆلات.

دەنگی گریان زیادی کردو بەرزبوویەوەو بەلاّم تەنیا گریان نەبو بەڵکو نەڕەی ترس ئەنگێزی پڵنگیش دەبیسترا.

تفەنگەکەم ئامادەکردو چونکە دەنگی خشە خشی گەلاّو گیا نیشانی دەدا پڵنگ بەرەولای من دێت. یەك خولەك دواتر خۆم روبەڕوی مێچکە پڵنگێك بینی کەنزیکەی دوو مەتر درێژی و ئەگەر پەلاماری دەدام بەیەك زەربە ئێسقانەکانی ورد دەکردم و دەیشکاند.

سەیر بو دەنگی نەڕەی پڵنگ بەگوێ دەگەشت بەلاّم پڵنگی روبەڕوی من دەنگی لێوە نەدەهات دەبوا زۆر ئاگام لەخۆم بوایە، پاڵم بەدارێکەوە دا و بەیەك گوولە مێشکی پڵنگم پرژاند. پڵنگ نەڕاندی، بەرزبوویەوەو وەك کێوێك لە گۆشت کەوتە سەر زەوی.

دەنگی نەڕەی پڵنگ و بۆنی باروت پڵنگەکەی تریشی بۆلای من راکێشا. پڵنگی نێر کە یەك بەرانبەرو نیوی ئەویتر درێژ بوو، بێ دەنگ پەلاماریدام ئەویشم نیشانەگرت و لەهەوادا سینەیم کون کرد.

هەردوو پڵنگەکە کوژران بەلاّم دووبارە دەنگی خشە خش بەرز بوویەوە. بۆ سێیەم جار تفەنگەکەم ئامادە کرد بەلاّم ئەمجارە لەناوگیاکان قیافەی ترساو و فرمێسکاوی مێرد منداڵێکی دوانزە ساڵە دەرکەوت. کە بەحاڵەتێکی تایبەت لەمنی دەڕوانی. منالّ وەك ئەوەی فریشتەی رزگاری خۆی دۆزیبێتەوە بەرەو لای من رایکرد، خۆی بەقاچی منەوە دەنووساند و بەدڵنیاییەوە پاڵی پێوەدا.

دەستم بەسەریدا هێناو پرسیم:

تۆ لێرەدا چی دەکەیت....؟ ناوت چیە؟

وتی:

ناوم شوومایە و دوێنێ کە هێرشیان کردە سەر هۆز، رامکردو هاتمە ئێرە. ئەم دووپڵنگە لە دوێ شەو تا ئێستا بۆ خواردنی من کەمینیان کردوە بەلاّم من لەسەر لقی دارەکە بووم و ئەوان دەستیان پێم نەدەگەشت تەنیا دەیاننەڕاند و لەدەوروبەری دارەکە دەسووڕانەوە.

پرسیم:

دایك و باوکت چییان لێهات؟

شووما وتی:

ئەوان بەدەستی یووچیەکان کوژران.... من کەسم نیە.

دڵم بۆی سووتاو چونکە لەچاوەکانیدا بریقەی هۆش و زیرەکیم بینی. دەستیم گرت و بەرەولای کچەکە رۆشتین.

کاتژمێرێك دواتر کچەکەو شوومام بۆ سەر دارەکە گواستەوە و شوێنێکم بۆ ئامادەکردن کە بتوانن دانیشن و بخەون. چەند لقێکم لای یەك دانا و بەگیا دامپۆشی و بەشوومام وت:

تۆ لێرە دانیشە و ئاگات لەم ژنە بێت. دەڕۆم و کاتژمێرێکی تر دەگەڕێمەوە. ئەگەر بەڕێکەوت شەو گەشت و من نەگەڕامەوە مەترسە چونکە بەیانی زوو دەگەڕێمەوە.

شووما وەڵامی نەدامەوە تەنیا بزەیەکی گرت و سەری خۆی بەوشیاری تەکاندا و منیش دەست بەجێ هاتمە خوار و بەڕێکەوتم.

لەوێوە تاشوێنی شاردنەوەی سیلاحەکان زۆر دوور نەبو و نزیکەی کاتژمێرێك دواتر گەشتم و بەرزبوونەوەی خاکم دۆزییەوە.

زۆربە بەئارامی و دژواری سندوقەکەم لابردو سندوقەکەم دەرکێشا. ئەم سندوقە تایبەت بەفیشەك بوو من لەوکاتەدا زیاتر لە هەرشتێك پێویستم بەفیشەك بو. دەرگای سندوقەکەم کردەوەو بەخۆشحاڵیەوە نیوەبو لەفیشەکی تفەنگ و فیشەکی دەمانچەکەم.

لەسەر ریزی فیشەکەکان پارچە کاغەزێك دانرابو کەجاری پێشتر لێی نەبو. لەناو یەکێك لەجانتاکان کاغەزو یاداشتی تیابو بەڵام لەناو سندوقی فیشەکەکە هیچی تیانەبو.

کاغەزەکەم هەڵگرت و کردمەوە. خەتێکی خوارو خێچ و ناڕێکی لەسەر دەبینرا. کەمێك وردبوومەوە زانیم ئەو یاداشتە یوری بۆی داناوم و ئێوەش دەتوانن گوومان بکەن لە شادمانیدا چ حاڵێکم پێ برا. ئەوەندە شادمان ببوم کە چاوم دێرەکانی نەدەبینی و جوانی وشەکانم بۆ نەدەخوێندرایەوە. (( تۆ ون بوویت ئەگەر ئەم یاداشتە بەدەستت بگات دیارە زیندوویت ! جیاواز لەم شێوە یاداشت وسیلاحەکان لەژێر خاکدا دەمێننەوە.

بەهەرحاڵ دەبێت بزانن دوای کوشتاری هۆز بۆ دۆزینەوەی تۆ بەڕێکەوتم، تا تۆ نەدۆزمەوە لە جەنگەڵ ناڕۆمە دەر. بۆ پەیوەست بوون بەمن بەرەو باکووری رۆژهەڵات

وەرە.... دەبێت بەوپەڕی داخەوە پێت رابگەیەنم کە مووناك و کچەکەی کوژران و من جەستەی ئەوانم لەبەردەم ئەو ماڵەی لەگەڵ مووناکدا تیای دەژیایت بەخاك سپارد. سەرە خۆشیت لێ دەکەم و هیوادارم چاومان بەیەکتر بکەوێتەوە ))

کاتێك نامەکە تەواو بو، جەستەم لەئارەقدا خووسابو. ئەندامەکانم لەتووڕەیی و خەمباریدا دەلەرزین. دەتوت دەستێکی بەهێز قوڕگم دەگوشێت تا بمخنکێنێت. هێنامە بەرچاوی خۆم کاتی مەرگ مووناك و کچەکەم چ حاڵێکیان بوەو چەندەیان ئازار بردوە...

لەگوومانی ئەم دیمەنە بەڕادەیەك تووڕەببووم کە ئەگەر یەکێك لەیوچیەکانم دەست دەکەوت بەدیان گۆشتی جەستەیم تیکەتیکە دەکرد و لێ دەکردەوە...

ئەو رۆژە نەگریام بەلاّم لەتاو ئازارو خەم نزیك بو شێت ببم. مووناك ژنێکی جوان بوو، خۆشم دەویست. شەوو رۆژی خۆشم لەگەڵدا بەسەر بردبو. لەوەش بەئازارتر مەرگی کچە بێ تاوانەکەم بو... ئەو منالە چ تاوانێکی بو کەوا بێ بەزەییانە کوشتبوویان.

کاغەزەکەم هەڵگرت و دوای هەڵگرتنی فیشەك و ڕەشاش و تاقی کردنەوەی، سیلاحەکانم داپۆشی و بەڕێکەوتم. ئێستا ڕەشاش، تفەنگ و دەمانچەیەك و بڕێکی زۆر فیشەکم پێ بو و لەمبارەوە خیاڵم ئاسوودەبو. کاتژمێرو نیوێك دواتر گەشتمە ئەو شوێنەی شووماو ژنەکەم لێ بەجێ هێشتبوو. هەوا تاریك ببو و بڕێك میوەی جەنگەڵیم لەرێگادا بۆ چنین و بۆم بردن.

شووما بەبینینی من شادمان بو، لەدارەکە هاتە خوارو بۆ پێشوازیم هات. منالێکی زیرەك و وشیار بوو بەشێوەیەك دواتری باسی دەکەم، زیاد لەرادە خزمەتی بەمن کرد. پێش هەرشتێك لە شووما حاڵی کچەکەم پرسی و ئەو وتی:

هاتۆتە هۆش بەلاّم هێشتا ناتوانێت بەڕێگادا بڕوات و خەوتووە.

لەدارەکە رۆشتمە سەر و لەسەر سەری دانیشتم. ئەو چونکە دەیزانی من لەمردن رزگارم کردوە، بزەیەکی گرت و سوپاسی کردم. من لەبارەی ماری ئاناکندا و ئەوەی چۆن لەبەرنبەر ژاری مار خۆڕاگری بوە پرسیم، لەوەلاّمدا وتی: لەمنالیەوە لەبەرانبەر ژەهری مار ئامادەمان دەکەن. خوێن و جەستەی ئێمە پارێزراوە و لەبەرئەوەبو من نەمردم و ئێوە توانیتان رزگارم بکەن.

لەگەڵ شوومادا میوەیان خوارد، منیش برسی بووم بەچەند ئاناناسێك سکی خۆم تێرکردو خەوتم... هیلاکی زۆر بوەهۆی ئەوەی تا بەیانی لەخەو هەڵنەستم. کاتێك هەوا

تازە رووناك ببوویەوە چاووم کردەوە. شووما روبەڕووی من دانیشتبوو سەیری دەکردم. ئەو لەترسی ئەوەی نەکا بڕۆم و بەجێیان بهێڵم زۆر زوو هەستابو و بەرانبەر بەمن دانشتبو.

دەمزانی ژمارەیەك لە ئامازۆنیەکان زیندوون درەنگ یان زوو دەگەڕێنەوە بۆ هۆز. بۆیە بڕیارمدا ئەوان بەجێبێڵم و بەدوای یوریدا بگەڕێم.

لەسەر ئەم بڕیارە لەسەر دارەکە هاتمە خوار بێ ئەوەی قسەیان لەگەڵدا بکەم بەڕێکەوتم. رێگا بەرەو هۆز دەڕۆشت دەمویست سەرەتا گۆڕی مووناك ببینم و دواتر بڕۆمە لای شائکی و هاوڕێ لەگەڵ ئەو بەدوای یوریدا بگەڕێم. نزیکەی نیو کاتژمێر رێگام بڕی. نزیك هۆز ببومەوە کە پشت سەری خۆم دەنگی خشە خشم بیست و بەگوومانی ئەوەی ئاژەڵێك دەیەوێت پەلامارم بدات، تفەنگم خستەر سەردەست و ئاوڕم دایەوە.

لق و گەلاٚی دارەکان دەلەرانەوە بەلاٚم هیچ شتێك دەرنەکەوت. دووبارە بەڕێکەوتم بەلاٚم هەست و سەرنجم لەدواوە بو کەلەناکاو ئەو دەنگە بیسترایەوە. ئەم جارەش هیچم نەبینی.

ئەم کارە چەند جارێك دووبارە بوویەوە. دوایین جار سێبەری مرۆڤێکی بچووکم بینی و بەدەنگی بەرز فەرمانی وەستانم پێدا.

ئەو وەستا.کەڕۆشتمە پێش شوومام بینی کە بەحاڵەتێکی پاڕانەوە لەوێ وەستاوە. بەتوندی وتم:

تۆ لێرە چی دەکەیت..... بۆ بەدوامدا هاتوویت؟

بێ درەنگ وتی:

ئاخر من کەسم نیە.... ئێوە کەستان بۆ هەڵگرتنی بارەکەی خۆتان پێویست نیە؟

راشکاوی قسە کردنەکەی دڵمی سووتاند. بزەیەکم لێداو بێ بیرکردنەوە لە ئەنجام وتم:

وەرە، لەگەڵ مندا وەرە.

شووما تفەنگەکەی منی خستە سەر شان و بەشادمانیەکی زیاد لەڕادە دەستی بەڕاکردن کرد. ئەو منالە لەشادیدا لەسەر قاچی خۆی نەدەوەستا و هەڵبەزو دابەزی دەکرد. هێشتا باوەڕی نەدەکرد بەبردنی ئەو رازی ببووم لەبیری ئەمانۆدا نەبووم و نەمدەزانی چی بەسەر هاتووە، نەشمدەویست بڕۆمە لای.

دەتوت بەبیستنی هەواڵی مەرگی مووناك و کچەکەم هەموو حەزو ئارەزووەکان کەمنی بەو جەنگەڵە تاریکەوە پەیوەست دەکرد لەناوچوو. هەموو پەیوەندیەکان پچڕان و من تەنیا و بیٚ کەس مامەوە.

دیار نەبوو یوریش دوای نوسینی ئەو یاداشتانە زیندوو بێت. کیٚ دەزانێت، ئەی چی بکەم.....؟ ئەگەر یوری مردبێت کیٚ لەمەترسیەکانی داهاتوو رزگارم دەکات؟

هەستێکی پێزانین لەناخمدا دروست ببو. بەرانبەر بە یوری خۆشەویستیەکی زیاد لەرادەم هەست پێکرد یوری مافی ژیانی لەملمدا بو زیاتر لەدە جار منی لەمردن رزگارکردبو. گیانی خۆم قەرزاری ئەوم و چونکە ئەوم لای خۆم نەدەدی و دەنگی گەرم ئارامبەخشیم لای خۆم نەدەبیست هەستم بەتەنیایی و بیٚ کەسی دەکرد. بەخۆمم دەوت:

مووناك مرد.... هەموو شتێك بۆ من تەواو بو. ئەگەر یوری بەزیندوویی بدۆزمەوە، چ بەختەوەریەکە ئەگەر یوری زیندوو بێت..... ئەگەر یوری زیندووبێت بیٚ درەنگ لەجەنگەڵ دەڕۆمە دەر و دەچمەوە بۆ ئەمریکا..... هیلاك بووم.... بەسە. بەسە ! تۆڵە سەندنەوەش لە لئۆنا لەبیردەکەم.... ئەمانەم لەژێر لێو بەخۆم دەوت و سەیری هەڵبەزو دابەزی شوومام دەکرد. شووما چەند هەنگاوێك لەپێش منەوە دەڕۆشت. شادی و هەلبەزو دابەزی ئەو بیرو ئەندێشەی لای دروست دەکردم. بیرم کردەوە ئەم منالە زۆرخێرا لەمندا بەرانبەر بەخۆی خۆشەویستی دروست دەکات لەراستیدا شووما منالێك بو بەوشیاری و تێگەشتن و قسە منالانەکانی خۆی خۆشەویستی لە هەرکەسیکدا دروست دەکرد و من کە دلێکی ناسك و میهرەبانم بو بەدلنیاییەوە خێرا عادەتم پێی دەگرت. لەژێر لێوەوە وتم:

ئەم منالە بیٚ تاوانە سیٚ جار لەمردن رزگاری بووە. چونکە لە ئامازۆن لەدایك بووە، دەبوا بکوژرایە، مەگەر نە ئەوەی ئامازۆنیەکان منالی کوڕ دەکوژن؟ دووەم ئەوەی لەم کوشتارە رزگاری بووە و سەرئەنجام سێیەم جار گیرۆدەی دو پلنگی نێرو مێی بو ومن ئەوم رزگار کرد ! دەستی چارەنوس ئەوەی بۆ ئەنجامدانی چ کارێك راگرتووە......؟

وەلامی ئەم پرسیارە تەنیا رووداوەکانی داهاتوو دەتوانێت بیداتەوە. لەناو ئەم ئەندێشانەدا نوقم بووم کە شووما وەستاو وەك بێچووە پشیلەیەك کە لەئاژەلێکی تر ترسا بێت، خۆی لەپشت دارێك داشارد.

منیش وەستام. چونکە وەستانی شووما نیشانی دەدا مەترسیەك لەرێگادایە. چەند

چرکەیەك بەم شێوە تێپەڕی. شووما سووڕی خواردو بەئیشارەی دەست تێیگەیاندم دەبێت سەرنجم لای چەپ بێت.

خۆی لەسەر زەوی دانیشت و لەناو گیا بەرزەکان کە لەبەردەم دارەکاندا روابوون خۆی داشارد. بەخێرایی میلی ڕەشاشەکەم هێنایەوە و ئامادە بووم بەڵام هێشتا شتێك کە شووما بینیبووی نەمدەدی. چەند چرکەیەکی تریش تێپەڕی و لەناکاو دەنگی بەریەك کەوتنی گەڵاو گیا بیسترا. لەهەمان شوێن کەشووما نیشانی دابو سەرو کەلەی دووان لە وەحشیەکانی یوچی دەرکەوت کە بە ڕمە درێژو چاوە خوێناویەکانی خۆیان سەیری دەوروبەریان دەکرد. ئەوانم لەرووی هێڵەکانی سینەو روخساریان ناسیەوە و دەتوت ئەو دووانەش دەنگی پێی من و شوومایان بیستووە و بۆ کوشتنی ئێمە ئامادەبوون.

بەهەرحاڵ هەر ئەوەندە چاوی یەکیان بەمن کەوت قیژاندی و بێ ترس بەرەو لام هات و رمەکەی سەر دەستی بەرزکردەوەو هاویشتی. رم بەویزە ویز هات بەڵام بەر من نەکەوت چونکە سەرم دانەواند و لەئەنجامدا لەدارەکە چەقی. دەست بەجێ دوای رم خەنجەری لەکەمەر کێشاو پەلاماری دام.

هێشتا لەسەر سووڕمان دەرنەچبووم کە ئەو گەشتە دوو هەنگاوی من و دەستی بۆ هێنانە خواری خەنجەرەکەی سەر سەری ئامادەکرد. لەم کاتەدا تەنیا کارێك دەمتوانی ئەنجامی بدەم ئەوەبو شوێنەکەم بگۆڕم چونکە لەو دوورییەدا تەقەکردن کارێکی بێ ئەنجام بو.

بەخێرایی بەرەو لای چەپ رۆشتم و ئەو کە رایدەکرد و خێرایی زۆر بو نەیتوانی خۆی رابگرێت. بەردارەکە کەوت. لەم دەرفەتەدابو پەنجەم لەسەر پەلەپتکەی ڕەشاشەکە داناو بەچەند گوولە بەدارەکەوە دووریم.

وەحشی یەکەم قیژاندی و بەجەستەی کوون کوون کەوتە سەر زەوی بەڵام وەحشی دووەم بێ ترس لەکاتێکدا رمەکەی خستبوە ژێر باخەڵی بەرەو لای من رایکرد.

لەمنەوە دوور بو و تا ویستی بەمن بگات لەپێ کەوت و بەگوولەیەك مێشکی پرژا.

مرۆڤ کاتێك بەکەس پشت ئەستوور نەبێت بەرگری لەخۆی دەکات. ئەگەر یوری لەگەڵمدا بوو بەپشتیوانی و بەرگریە چاونەترسانەکانی ئەو پشت ئەستووربووم رەنگە نەمدەتوانی بەم جوانیە بەرگری لەخۆم بکەم و ئەوان لەناوبەرم. لەبابەتە هاوشێوەکانی پێشو دەست و پێی خۆم ون دەکرد و گێژدەبووم بەڵام ئەم جارە چونکە تەنیابووم و

حسێبی مەرگ و ژیان لەبەردەمدا بو، بە خێراییەوە بۆ رزگاری خۆم هەوڵم دەدا.

بەهەرحاڵ ئەوان کوژران و کار کۆتایی پێهات. کاتێك دووەم کەس کەوتە سەر زەوی، گیاکان لەرانەوەو شووما کە دەلەرزی و تفەنگ لەسەر دەستی دەلەرایەوە هەستاو بە بزەوە بەرەو لای من هات.

شووما لەسەر رێگای خۆی سەیری جەستەی کوژراوی ئەو دوو وەحشیەی کرد و بەپەنجە شوێن کوونی گوولەکانی سەیرکرد. دواتر لەکاتێك لەدەمی تفەنگەکەی من زەق ببوویەوەو دنیایەك سەرسوڕمان لەچاوەکانی دەباری، هاتە پێش.

مەرگی ئەو دووانە بەخێرایی و بەئاسانی سەرسوڕمانی لای ئەو دروست کرد.... ئەو تا ئەوسات نەیدەزانی ئەو کەرەستەی کانزاییەی من لەدەستمدایە و یەکیتریان بەکەمێك جیاوازی لەدەستی خۆیدایە، چ کەڵکێکی لێ دەبرێت.

رەنگە دەیزانی سیلاحە بەڵام چۆنیەتی کارکردنی ئەو سیلاحە بۆ ئەو سەرسوڕهێنەربو. شووما کاتێك گەشتە روبەڕوی من زۆر بەوردی دەستی بەرزدکردەوەو نووکی لوولەکەی گرت و بەڵام کتوپڕ دەستی کێشایەوە هەنگاوێك دوورکەوتەوە.

گەرمی لوولەی ڕەشاش دەستی ئەوی سووتاند و ترسا. لەترس و قیافەی پێکەنیناوی و ترساوی ئەو کەوتمە پێکەنین و وتم:

ئاگاداربە شووما، ئەوەی لەدەستی تۆدایە ئەویش مرۆڤ دەکوژێت. ئەم سیلاحانە کە زادەی شەیتانن دۆست و بێگانە ناناسن، لوولەکەی روبەڕوی هەرکەسێك ببێتەوە و ئەو زمانە بچووکە بکێشرێت، ئەو کەسە دەکوژێت ! تێدەگەیت؟ کەواتە ئاگادار بە دەست لەو زمانە نەدەی.

شووما وەك بڵێی جوان لەمەبەستەکەی من گەشتبێت، لوولەی تفەنگەکەی بەرەو سەرەوە دەگرت بەڵام لێی نەترسا و بەپێچەوانەی ئەوەی من گوومانم دەکرد فڕێی نەدا.

چاوەکانی لێوانلێو لەهۆش و وشیاری بو و من کەئەم ئامادەییەم لەودابینی زیاتر لەجاران ئارەزوومەندی بووم و هەستم بەخۆشەویستی و هاوڕێیەتی دەکرد لەگەڵیدا.

ئەو بەوشیاری تایبەت پرسیاری دەکرد و منیش وەڵامم دەدایەوە.

لەچۆنیەتی نیشانە گرتنی پرسی، لەچۆنیەتی تەقەکردن و سەرئەنجام داوای لێکرد فیشەك بکەمە ناو تفەنگەکەو بیدەم بەدەستی. وەڵامی هەموو پرسیارەکانیم دایەوە. ئەوەندە وشیاربو هەر شتێکی یەکجار دەپرسی یەکجار بۆم دەوت و ئەمە بەس بوو بۆ ئەوەی فێربێت. سەیر بو کاتێك فیشەکم کردە ناو تفەنگەکە، ئەو بەهەمان شێوە کە

وتبووم میلی هێنایەوەو یەك یەکی فیشەکەکانی دەرهێناو دووبارە خستیەوە شوێنی خۆی.

ئەوەندە بەتوانابوو نەمتوانی دژایەتی داواکاریەکەی بکەم و لەو ساتە بەدواوە تفەنگی پر فیشەکم دا بەدەستی بەڵام زامنی تفەنگەکەم لێداو چۆنیەتی کارکردنیم پێ نەوت.

شووما شادان وسەر بزێو خەنجەری کوژراوەکانی هەڵگرت و بەدوای مندا بەڕێکەوت. لەهۆز زۆر دوور نەبووین و بەخێرایی گەشتینە ئەوێ.

هێشتا هۆز کپ و بێدەنگ بو، هیچ دەنگێك نەدەبیسترا. ماڵەکەی مووناکیان سووتاندبو بەڵام من شوێنەکەیم دۆزیەوەو لە بەرزبوونەوەی خاکەکەی، گۆڕی مووناکم دۆزیەوە. لەسەر گۆڕی مووناك قوڵپی گریان قورگمی دەگووشی. دەمویست بگریم. دەتوت دەنگی مووناك لەژێر گڵەوە دەبیستم و قسەم لەگەڵ دەکات. چاوە درەوشاوە و سەرنج راکێشەکانیم دەبینی کەسەیری دەکرد. دەم شیرین و لێوە سوورەکانی کە بەڕومدا پێدەکەنی.

رەنگە رۆحی مووناك لەو دەوروبەرەدا هەلەفری و قسەی لەگەڵ رۆحی من دەکرد. کەس لەپەیوەندی کە لەنێوان رۆحەکان هەیە ئاگادار نیە، لەو شێوەشدا ئەگەر بڵێم دەنگی مووناکم لەقووڵایی رۆحی خۆم دەبیست سەرتان سوڕنەمێنێت ! راستیەکەی ئەوەیە دەنگی مووناکم دەبیست..... دەمبیست کە پێم دەڵێت:

لئۆنا منی کوشت....... منی لەتۆ دوورکرد. کچەکەمانی بێ بەزەییانە کوشت ! ئایا بێ تۆڵە سەندنەوە دەگەڕێیتەوە بۆ ولاتەکەی خۆت......؟ تۆڵە. تۆڵەی من لەبیرمەکە. ئەو وشە لەگوێمدا دەزرنگایەوە. لەهەمووی ئەم ماوەدا شووما وەك پەیکەرێك روبەڕوی من وەستابو و لەژێر چاوەوە سەیری دەوروبەری دەکرد.

سەرئەنجام ئیشارەیەکم لە شووما کردو بەڕێکەوتم. دووبارە ئەو مناڵە ڕەش پێستە لەپێش منەوە دەڕۆشت و هەرچەند هەنگاو جارێك بەتفەنگێك کە لەباڵای بەرزتربو، دەگەڕایەوە سەیری دەکردم و بزەی دەگرت.

دوو کاتژمێر دواتر گەشتینە شوێنێك کە شائکیم بەجێهێشتبوو. لەسەدا سەد دڵنیابووم کەئەو مردوە بەڵام کاتێك گەشتمە لای دارەکە بەسەرسوڕمانەوە بینیم جەستەی شائکی لەوێ نیە.

گوومانم کرد رەنگە مردوەو ئاژەڵە برسیەکان جەستەی ئەویان بردوەو خواردویانە.

لەسەر ئەم گوومانە دووبارە بەڕێکەوتم کە بڕۆم بەڵام لەم ناوەدا دەنگی شائکیم بیست کە دەیوت:

بوەستن سەرۆك هاتم.

دەست بەجێ لەدارەکە هاتەخوارو بەبزەوە بەرەو لای من هات. شووما شائکی دەناسی و لەوەی یەکێك لەپیاوانی هۆزی بەزیندوویی دەبینی شادمان بو. شائکی ساغ و لێوانلێو لەهێزبو و دەیوت برینی تیر باش بوویەوە، بەشادمانیەوە تیرەکە ژاراوی نەبو و من زیندوو مامەوە.

دواتر سێ کەس بەرەو رووبارو شوێنێك ماڵەکانی ئەمانۆی لێ بو بەڕێکەوتین. راستیەکەی بڵێم دووبارە بیری تۆڵە سەندنەوە لەلئۆنا لەمندا بەهێز ببو. دەمویست لە لئۆناو وەحشیەکانی یوچی تۆڵە بسێنمەوە بەڵام ئەم کارە مەترسیدارە بەبێ یارمەتی یوری ئەنجامدانی دژوار بو کەواتە سەرەتا دەبێت بەدوای یوریدا بگەڕێم.

بەلەمە شکاوەکە هێشتا لەقەراغی رووباردابو بەڵام ئەم جارە کارمان زیاد لەرادە دژوار دەهاتە بەرچاو چونکە دەبوا بە پێچەوانەی رەوتی رووبار بڕۆینە پێش و ئاشکرایە بەرەو پێش بردنی بەلەم بەبێ بوونی سەوڵ ئەگەری نەبو.

شائکی چەند دارێکی بەرزی شکاندو لەناو بەلەمەکەدا دانیشتین و بەدژواری خۆمان گەیاندە بەستێنی روباڕو و دووری ئەوشوێنە تاماڵەکانی ئەمانۆمان بەپێ بڕی. ئەمانۆ کەئێمەی لەدوورەوە بینیبو، هاتە پێشوازیمان و بەشادمانیەوە خۆی فڕێدایە باوەشی من. شائکی ئەو رۆژە کەڵەکیوی راوکردو کەبابێکی بەتامماڵ خوارد. کاتی خواردن من روداوەکان و ئەوەی بینیبووم، گێڕامەوە.

هەواڵی مەرگی مووناك کاریگەری لەسەر ئەمانۆ بەجێهێشت و بەتەواوی خەمباریکرد و بینیم چاوەکانی پڕ فرمێسك بوون. دوای نان خواردن ئەمانۆ دەرمانی لەقاچە برینداڕەکانی شووماداو بە پەڕۆ بەستی و دوای کاتژمێرێك وتی:

ئەمڕۆ بەیانی من زۆر ترسام.

لەجیاتی من شائکی پرسیاری کردو وتی:

بۆ ترسایت؟

ئەمانۆ ساتێك بێدەنگ بو و دواتر وتی:

من لەبەردەرگا وەستابووم سەیری رێگام دەکرد کە لەناکاو دەنگی هەلهەلەی زۆرم بیست. سەرەتا شادمان بووم و بەگوومانی ئەوەی دانیشتوانی ئامازۆن بەرەو ئێرە دێن،

چەند هەنگاوێك ڕۆشتمە پێش بەڵام کۆمەڵێك لە وەحشیەکانی یوچیم بینی کە بەرەو ئێرە دێن.

ئەوان وایاندەزانی ئەمماڵانە کەسی تیادەژی و بۆ کوشتنی ئەوان هاتبوون.

بەترسەوە پرسیم:

تۆ چیت کرد....؟ ئەوان تۆیان بینی؟

ئەگەر منیان بینیبو بەدڵنیاییەوە دەیانکوشتم و یان وەك ژنە داماوەکانیتر دەیانبردم.

شائکی بەبیستنی ئەم قسەیە لە شوێنەکەی قنج بویەوەو لەکاتێکدا سەیری دەمی ئەمانۆی دەکرد وتی:

ژنانیتر، مەبەستت چیە؟

ئەمانۆ بەدوای قسەکەی خۆیدا ڕۆشت و وتی:

رام کردو لەسەر دارێك خۆم داشارد. ئەوان ماڵەکان گەڕان چونکە کەسیان نەبینی ڕۆشتن. کاتێك لەژێر ئەودارەی خۆم تیا حەشاردابو تێدەپەڕین بینیم ژمارەیەك نزیکەی سەدو پەنجا کچ و ژنی جوانی ئامازۆنیان لەگەڵدایە وەك دیلەکان بەتەناف بەستوویاننەوە و لەگەڵ خۆیان دەیانبەن. نیگایەك لەنێوان من و شائکیدا ئاڵو گۆڕکرا. دەتوت هەردووکمان بیر لەشتێك دەکەینەوە بەڵێ هەردووکمان بیرمان لەوە دەکردەوە کە دەبێت ئەو تاقمە بێ تاوانە رزگار بکەین. ئەمانۆ وتی:

بۆ بێدەنگ بوون؟ وادەزانن بەبڕیارەکەی ئێوارازی نابم؟ بەهەڵەدا چوون ! منیش رازیم و بۆ یارمەتیدانی ئێوە دێم.

ئەمانۆ کچێکی وشیارو جوان هەستی بەگوومانەکەی ئێمە کرد. بەم شێوە بیری تۆڵە سەندنەوەو رزگارکردنی ئەو ژنانە ڕۆشتە قۆناغی جێ بە جێ کردنەوە. بەڵام کێشەکەمان لەوەدابو نەماندەتوانی شووما لەگەڵ خۆماندا ببەین. بەیانی ئەو رۆژە بۆ چەند رۆژێك خواردنمان بۆ شووما ئامادە کرد و بەرێکەوتین. کاتێك دووركەوتینەوە شووما بەچاوی پڕ فرمێسك و روخسارێکی خەمبار سەیری دەکردین. بەهیچ جۆرێك گوومانی نەدەکرد بەتەنیا رۆژێك جێی بێڵم و بڕۆم.

بەهەرحاڵ چونکە بوونی دەبوە ئەرك ناچار تەنیا جێمان هێشت. رێگامان لەناو زۆنگاوە مەترسیدارەکان دەگوزەرا.

ئەمە ئەو رێگایەبو بە باکوری رۆژئاوای جەنگەڵ کۆتایی پێدەهات و بەکەمێك لادان بەرەو هۆزی یوچیەکان و رێگەیەك کە یوری دەست نیشانی کردبو، دەڕۆشت.

تێپەڕین لە زۆنگاوەکان زۆر دژواربو و من و شائکی ئەمانۆمان بەدژواری تێپەڕاند. لەو ئەستێلکانە زیاتر لەهەرشتێك ماری ئاناکندا و (( کرۆکۆدیلەکان )) هەڕەشەیان لەگیانی ئێمە دەکرد. هەرسات چاوڕێی ڕوبەڕوبوونەوە لەگەڵ یەکێك لەو درندانە بووین بۆیە زۆر لەسەر خۆ دەڕۆشتینە پێش. قووڵایی ئاو زۆر نەبو، هەندێ کات تا ئەژنۆمان لەناو ئاودا بو و هەندێ کات تا کەمەر و بەرزتر. دەمانچەکەم بەدەستەوە گرتبوو لەگەڵ ئەوەی کرۆکۆدیلێك نزیك دەبوویەوە و دەمە گەورەکەی خۆی ڕوبەڕوی من دەکردەوە، بەچەند گوولەیەك مێشکیم پرژاند.

لەرێگادا چەند کرۆکۆدیلێك کوژران. ئەگەر بارودۆخ بەم شێوە بڕۆشتایەتە پێش جێگەی نیگەرانی نەبو بەڵام بەدبەختانە ئەمانۆ قیژەیەکی کورتی کرد و لەکاتێکدا بەپەنجەی سەری ئاوەکەی نشاندەداو وتی:

سەیرکە.... هاتن.

هێرشی بەکۆی کرۆکۆدیلەکان دەستی پێکردو مەرگ نزیکتر بویەوە. سەیرم کردو بەوپەڕی سەرسوڕمان ژمارەیەکی زۆر تمساحم بینی کەبەرەولای ئێمە دەهاتن.

هەر چەند سات و یەکیان سەری لەئاوەکە دەردەهێناو دەمە درێژەکەی خۆی دەکردەوە.

لەبەرزاییەکانی پشتمان هەستمان بەژمارەکانیان کرد. نزیکەی سەد کرۆکۆدیل بەرەو لای ئێمە دەهات. ئەگەر بەئێمە دەگەشتن جگە لەخوێن شوێنەوارێك لە ئێمە لەناو زۆنگاوەکە نەدەمایەوە.

شائکی دەتوت کاری خۆی دەزانێت و لەگەڵ ئەوەی بۆنی مەترسی کردبو بەخێرایی دەست بەکاربو. هیچ گوێی بەبۆچوونی من نەدا تەنانەت نەیدەپرسی دەبێت چی بکات. ڕەشاشەکەم دابو بەدەستی ئەو تا ڕایبگرێت، ئەو چونکە نەیدەویست یان نەیدەتوانی بەکاری بێنێت پێی دامەوەو خۆی لەناو ئاوەکەدا تەقلەیەکی لێداو بەلەمە شکاوەکەی ئاوەژۆکردو پێی وتین:

سوار بن سوار بن.

ئەمانۆی گرت و لەگەڵ ئەوەی شانی بریندار و بەباشی نەیدەتوانی دەستی بجووڵێنێت وەك چۆلەکەیەك لەئاو دەریهێنا و خستیە ناو بەلەمەکە، دواتر سیلاحەکانی لەمن وەرگرت و منیشی کێشایە سەر. کرۆکۆدیلەکان بەخێرایی دەهاتنە پێش و لەوکاتەی قاچم لەئاوەکە دەکێشایە سەر یەك لەوان کەلەپێش ئەوانیترەوە بو دەمی

کردەوەو تاقاچی راستم قووت بدات، شائکی بەلەقە بەشێوەیەك کێشای بەپۆزی درێژی تمساح کە ئەو ئاژەڵە بەدەوری خۆیدا سووڕاو لە بەلەمەکە دوورکەوتەوە.

بەشێوەیەکی کاتی رزگارمان ببو بەڵام ئەمە بەسندەی نەدەکرد چونکە دەیان تمساح بەلەمەکەیان گەمارۆ دابو و هەرسات خۆیان دەکێشا بە بەلەمەکەدا و ترسی ئەوەبو ئاوەژوی بکەنەوە. کرۆکۆدیلەکان لەنوقم کردنی بەلەمدا شارەزان.

ئەم شەڕو پێکدادانە ماوەیەکی خایاند. لاشەی کرۆکۆدیلەکان کەلەئاوەکەدا هەڵگەڕابوونەوە و سکی زەرد رەنگیان دیار بو، بۆ ئەوانیتر خواردنێکی گونجاو دەهاتە بەرچاو. لەناو ئاژەڵەکان تەنیا کرۆکۆدیل لاشەی یەك دەخۆن.

کاتێك ئەوان سەرقاڵی خواردن بوون ئێمە رامان کردو رۆشتین.

سەرئەنجام بەلەم گەشتە ئەوپەڕی زۆنگاو لەکاتێکدا زەوی سفت ورەق ببو دابەزیین و هەناسەیەکمان بەئاسوودەیی هەڵکێشا. شائکی دەستەکانی لەیەك داو وتی:

کەمتر رویداوە تاقمێك لەم زۆنگاوە بەسلامەتی تێپەڕن. لەدەکەس تەنیا چوار کەسی دەگەنە بەستێنی ئەوبەر. من ئەم خاڵەم دەزانی بەڵام بەئێوەم نەوت بۆئەوەی نەترسن.

شائکی لەکاتی ئەم قسانە چاوی لەڕەشاش و دەمانچەکەی من هەڵنەدەگرت و من کەحەزو ئارەزوی ئەوم بینی و هەستم پێکرد، چۆنیەتی کارپێکردنیم فێرکرد و دامە دەستی.

دەتوت دنیایان پێداوە. لەخۆشحاڵیدا لە پێستەکەی جێگای نەدەبوویەوەو بەردەوام سەیری سیلاحەکەی دەکرد.

رێگەیەك کە شائکی هەڵیبژاردبو مەترسیدارترین رێگابو.

رۆژی یەکەم بێ هیچ روداوێك تێپەڕی. لەرێگادا کەڵەکێویەکمان راوکردو لەگۆشتی ئەو ئاژەڵە خۆمان تێرکرد. شائکی دەیوت:

من دەبوا ببمە سەرۆکی هەموو هۆزەکانی جەنگەڵ.

ئەو گوومانی دەکرد هەموو شوێنێکی دنیا جەنگەڵە و هۆزەجیاوازەکانی تیا دەژین. شەو شائکی شوێنێکی گونجاوی بۆ ئێمە ئامادەکرد. ئەمانۆش دڕاوی جلەکانی لێکردەوەو فرێیدا.

کاتی ئاوابوونی خۆر شائکی سەرقاڵی دروست کردنی شوێنی حەوانەوەو ئەمانۆش بەدڕاندنی جلەکانی سەرقاڵ بو.... چەند جوان و خۆشەویست بو.

بەپەنجە قژەکەی خۆی شانەکردو بەرانبەر بەمن دانیشت.

لەرووناکی کەم رەنگی هەتاوی زەرد لەو هەموو جوانیە مەست ببوم. دڵم دەلەرزی، هەناسە بەشێوەیەك لەسینەمدا توونب ببو وێنەی نەدەبینرا.

ئەمانۆم خۆش دەویست بەڵام خۆش ویستنەکەی لەجۆرێکی تر بو. ئەگەر بڵێم عاشقی ئەمانۆ بووم رەنگە باوەڕ نەکەن کەمن ئەوم خۆش دەویست.

ئەوشەوە رۆشتمە سەر دارەکەو خەوتم.

ئەمانۆ لقێك لەسەروتری من بو و جێگاکەی ناڕەحەت تربو. دەمویست لای خۆم بیخەوێنم بەڵام پەشیمان بوومەوە و چاوەکانم بەست بەڵام هێشتا چەند خولەك تێنەپەڕیبو کەدەنگی لقی دارەکە بیسترا و دەست بەجێ ئەمانۆ بەئارامی خزایە لای من.

نیوە شەو لەبرسانا خەومان لێکەوت و بەیانی بەدەنگی شائکی کە لەخواردارەکەوە بەناو بانگی دەکردم لەخەو هەستام. ئەو دووبارە کەبابی کەڵەکیوی ئامادەکردبو. خواردن و میوەمان خوارد و بەڕێکەوتین. لەرێگادا بەئەمانۆم وت:

ئەگەر هاوڕێکەم یوری بدۆزینەوەو بمانەوێت بگەڕێینەوە تۆ چی دەکەیت.....؟

زۆر بەخوێنساردی وەك بڵێی باسی بابەتێکی ناگرنگ دەکات وتی:

مەبەستت ئەوەیە لەهۆزەکەی ئێمە بڕۆن و بەتەنیا جێم بێڵیت؟ لەم شێوەدا منیش هەردووکتان دەکوژم و دواتریش خۆم دەکوژم. من لەدووکاتدا تۆ دەکوژم. یەکیان ئەوەی بتەوێت بڕۆیت و ئەویتر ئەگەر عاشقی ژنێك ببیت. جیاواز لەم دوو حاڵە وەك چاوی خۆم دەتپارێزم.

وتم:

ئاخر ئازیز من ناتوانم لە جەنگەڵدا بژیم و دەبێت رۆژێك بگەڕێمەوە.

ئەو بزەیەکی لێداو وتی:

ئەمە گرنگ نیە منیش لەگەڵ تۆدا دێم.

ئەم رستە منی خستە ناو دەریای بیرو بەخۆمم وت چ کێشەیەکی هەیە لەجیاتی مووناك ئەمانۆ دەبەم. بەهەرحاڵ مەبەستمان ئەوەیە ژنێکی ئامازۆنیمان لەگەڵدا بێت.

چەند کاتژمێر دواتر گەشتینە شوێنێك کە شوێنەواری بوونی مرۆڤ دەبینرا.

شائکی وتی:

لەهۆزی یوچیەکان نزیك دەبینەوە. بەڵام سەرم سوڕماوە نابێت رێگا ئەوەندە نزیك بێت رەنگە هۆزێکی تربێت.

شتێك کە نزیك بوونەوەی ئێمەی لەهۆزێکی تر نیشان دەدا.ماڵێکی وێران و بێ

سەقف بو کەلەوێدا دەبینرا. ماڵێکی تەنیا و چۆڵ بیٚ دەرگاو دیوار و سەقف. ئەو ماڵە تەنیا دوو دیواری حەسیری و قامیشی بو. ئەویتری رووخاو وێران بو.

دەتوت چەندین ساڵە کەس نەچۆتە ئەویٚ. لەناو ژوورەکاندا ئێسقان و کاسە سەر دەبینرا.

شائکی وتی:

وەحشیەکان دوژمنانی خۆیان لێرەدا دەکوژن و....

ئەو قسەکەی تەواو نەکرد بەخێرایی پرسیم:

وتت چی؟

ئەم جارە ئەمانۆ وتی:

رەنگە گۆشتەکەی لێرەدا دەخۆن !

بەبیستنی ئەم رستەیە پشتم لەرزی و ئارەقێکی سارد کەوتە ناوچاوم و بەسەرسوڕمانەوە پرسیم:

مرۆڤ خۆر؟ مەگەر لەجەنگەڵەکانی ئامازۆن هۆزی مرۆڤ خۆری لێیە؟

وەڵامی ئەم پرسیارەم شائکی دایەوە وتی:

یەك دوو هۆز لەئامازۆندا هەیە کەتەنیا چەند رۆژ لەساڵ گۆشتی مرۆڤ دەخۆن و باوەڕیان وایە خواردنی گۆشتی دوژمن، مرۆڤ بەهێزو دژی نەخۆشی و رۆحە پیسەکان نەیاری دەکات. من بۆئەوەی خۆم بوێرو چاونەترس نیشان بدەم پێشنیارم کرد کاتژمێرێك لەوێدا بحەسێینەوە. دڵنیابووم کەئەوان بەتایبەت ئەمانۆ دژایەتی دەکات. بەوپەڕی سەرسوڕمان هەردوکیان بە پێشنیارەکەم رازی بوون و لەویٚ دانیشتین.

هەڵبەت کاتی حەوانەوەمان گەشتبو بەڵام ئەویٚ شوێنی حەوانەوە و درەنگ کردن نەبو. بۆنی مەرگی لێدەهات. جۆرێك دانشتبووم پشتم لەئێسقانی مردوەکان بێت بەڵام ئەم گویٚ نەدانە بەسندەی نەدەکرد و کاتێك ئەمانۆ عاشقانە سەیری دەکردم هەستم کرد شەبەح و رۆحی مردوەکان لەناوماندا هاتوچۆدەکەن و لەبەرانبەر چاوی من تێپەڕدەبن.

ئەمانۆ وەك وتم کچێکی وشیاربو، گوومان دەکەم هەستی بەترسی من کرد. بۆیە دوای چەند خولەك وتی:

هەستن بابڕۆین، خێراتر بڕۆین.

من کە لەخوا ئاوا پێشنیارێکم ئارەزوو دەکرد هەستام و بەڕێکەوتم. روداوە خوێناویەکان لێرەوە دەستی پێکرد. چەند میل ئەولاتر، کاتێك ئەمانۆ بۆ ئەنجامدانی

کارێك لە ئێمە دووركەوتبوویەوە لەناكاو دەنگی هەلهەلەو قەربالْغی وەحشیەكان بەرزبوویەوەو پەلاماریان داین.

وەحشیەكان عادەتیانە تا چەند هەنگاوی بەئارامی و بێدەنگ دێنە پێش، ئەوكات هەلهەلە لێدەدەن و هێرش دەكەن. بە دەمانچەكەم تەقەم كرد و چەند كەسێكم لیٚ كوشتن، شائكیش بیٚ ئەوەی نیشانە بگرێت پەنجەی لەسەر پەلەپتكەی ڕەشاشەكە دانابو و تەقەی دەكرد. بەخۆشحاڵیەوە كات و ناكات یەك دوانێكی دەكوشت.

هێرشی ئەوان لەچوار لاوە درێژەی بو. ئێمە تەنیا ئاگامان لە دوولاوە بو ناچار تەسلیم بووین. لەدوایین دەرفەت بەشائكیم وت:

ڕەشاشەكە بخەرەناو گیاكان و خۆشم بەخێرایی دەمانچەكەم هەڵدا.

شائكی بەلێهاتوویی ڕەشاشەكەی فڕدایە نا وقامیشەكان ولەچاو دووری خستەوە.

وەحشیەكان دەستگیریان كردین و دەستیان لەدواوە بەستین.

چەند خولەكێكی پڕ ترسمان بەسەربرد و ترسی من زیاتر لەئەمانۆ بو. ئەو بەرچاونەدەكەوت و دیارنەبو وەحشیەكان گرتوویانە یان خۆی داشاردوە.

وەحشیەكان بیٚ درەنگ ئێمەیان بردەپێش و لەویٚ دووریان كردینەوە. ئەمانۆ نەبو ئەو خۆی داشاردبو، چ بەختەوەریەك.

ئەگەر ئەو ڕۆژە ئەمانۆ دەگیراو گیرۆدەی وەحشیەكان دەبو، ئیتر شوێنەوارێك لەونەدەما و لەخەفەتا دیقم دەكرد.

هەربۆیە كاتێك ئەوم لەمەترسی بەدوور بینی، ئەوندە شادمان بووم تەنانەت گرفتاربوون و مەترسیەك كە هەڕەشەی لێدەكردم لەبیرم كرد.

بەهەرحاڵ وەحشیەكان من و شائكیان بەدەست وپیٚی بەستراو بەرەوپێش بردو لەوێوە بەرەو هۆزیان بردین. لەگەڵ ئەوەشدا هەرلەوێوە بەتەپڵ گرفتار بوونی ئێمەیان بەسەرۆكەكەی خۆیان ڕاگەیاند. شائكی بەجوانی لەزمانی تەپڵی وەحشیەكان تێدەگەشت. لەچەند ساڵی مانەوەشم منیش تاڕادەیەك ئاشناببوم و ریتمە جیاوازەكانم دەناسیەوە.

چەند جارێك شائكی هەوڵیدا خۆی بگەیەنێتە نزیكی من و شتێك بڵێت بەڵام وەحشیەكان بەمشت و لەقە ئەویان دوور دەكردەوەو منیشیان بۆ لایەكیتر كێش دەكرد.

بەم حاڵەش شائكی لەوبڕیارەی دابووی پەشیمان نەدەبوویەوە و لەهەر دەرفەتێك دەستی بكەوتایە خۆی دەگەیاندە نزیكی من یەكێك لەم جارانە وتی:

ئێمە لەمردن نزیك بوینەتەوە..... ئەگەر ئەوان نەیانەوێت بمانخۆن بەدڵنیاییەوە دەمانکوژن و ئەم کارە ئەمشەو یان بەیانی ئەنجام دەدرێت.

شائکی راستی دەکردو وەحشیەکان لە تۆڵەی ئەو تاقمەی بەدەستی ئێمە کوژرابوون خۆیان بۆ ئەنجامدانی رێورەسمی سزادان ئامادە دەکرد و لەناوەڕاستی گۆرەپانی بچووکی هۆز چەند دارێکیان لەزەوی چەقاند و بۆهەڵکرنی ئاگر دارو لقی وشکیان کۆکردەوە.

تا ئێستا چەند جارێك یوری منی لەمردن رزگار کردبو و لەم بارودۆخە ترسناکانەدا بەچاو نەترسی زیاد لەرادەی خۆی ببوە هۆی رزگاری من بەڵام ئەم جارە یوری لێ نەبوو دیارنەبو کێ فریامان دەکەوێت.

لە ئێمە سیانە ئەمانۆ رزگاری ببو. خۆی گەیاندە بووە سەردارێك و خۆی داشاردبو. بەڵام ئەو هیچ کارێکی پێ نەدەکرا و ئەو کچە جوان وناسك ئەندامە توانای هێرش کردنەسەر هۆزو رزگارکردنی ئێمەی نەبو.

تەواوی ئەو شەوو رۆژە بیرم لەم بابەتەکردەوە. لای خۆم حسێبم دەکرد و دەموت:

رۆحی مووناك و کچەکەم ئەم شەو شادمانن و کەرەستەکانی میوانداری لەو دنیا ئامادە دەکەن... بەڕاستی دەمرم؟ ئاخ مردن کەترس ئەنگێزو تاڵە.

لەکەلێنی حەسیری ئەو ژوورەی تیای زیندانی بووم لەهاتوچۆو جم و جوڵی وەحشیەکان کە ئامادەکاریان بۆ جەژن دەکرد، دەمڕوانی و لەدڵەوە لەعنەتم لەچارە رەشی خۆم دەکرد. ئەم جارە بابەتەکە زۆر گرنگ دەهاتە بەرچاو و دەتوت بەڕاستی بۆنی بێزارکەری مردن هەڵدەمژم. کەم کەم هیوای رزگاریم لەدڵ دەرکردو خۆم بۆ بەرگەگرتنی ئازاری مەرگ و دڵ هەڵگرتن لەژیان ئامادە دەکرد. هەوڵم دەدا بە تەڵقین کردنی مەرگ لەسەر خۆم ئاسان بکەم بەڵام ئایا ئەم کارە ئەگەری بو.....؟ رۆژ کەم کەم تەواو دەبو بەهەمان رادە کە ئاوابوونی هەتاو نزیك دەبو، کەرەستەکانی جەژنی وەحشیەکان ئامادەیی زیاتری بەخۆوە دەبینی و ترس و شۆڕشی ناخی من زیاتر زیاد لەرادە پەرێشانس دەکردم.

شائکی بەرانبەرم دانیشتبوو و باوێشکی دەدا. دەتوت چارەنوسێکی تری هەیە و لەم رێگادا نایەوێت لەگەڵم دابێت. بیری لەمردن نەدەکردەوە و جگە لەوڕستەی لەڕێگادا بەمنی وت ئیتر باسی مردنی نەکرد.

خەم و خەفەتی زۆر، هیلاکی رێگا، ئازار بەهۆی لێدانی وەحشیەکان و لەهەمووی

گرنگتر چاو و باوێشکە یەك لەدوای یەکەکانی شائکی خەوی خستە چاوانمەوە ولەگەڵ ئەو خۆڕاگرییەی لەبەرانبەر خەودا دەمکرد نەمزانی چی بو پێڵوی چاوەکانم کەوتە سەریەك و خەوێکی قووڵ بردمیەوە.

ژیان بەپێچەوانەی ئەوەی بیری لێ دەکەینەوە وەك هاوکێشەیەکی بیرکاری، حسێبێکی وردی هەیە. لایەنەکانی هاوکێشە بەردەوام یەکسانە و کۆی یەکێك لەگەڵ کۆکانیتردا هاوسەنگە.

ئێوە ڕۆژێك خۆشەویستی بەرانبەر کەسێك لەسووچێکی ئەم دنیایە دەردەبڕن. گوومانی ناکرێت پاداشتی ئەم چاکە و خۆشەویستی لەدەست ڕۆژگار دەربچێت. هەرگیز.

باش و خراپی ئێوە وەك دەنگێکە کە لەکوێستان لەقوڕگی ئێوە دێتەدەر و درەنگ یان زوو دەنگدانەوەی ئەو دەنگە دەگەڕێتەوە بۆلای خۆتان. بەدڵنیایەوە لەخۆتان دەپرسن ئەم قسانە چ پەیوەندیەکی بە ئێرەوە هەیە ! ڕاست دەکەن بەڵام زۆریش نابەجێ نیە ! چاوەڕێ بن. ئێستا من و شائکی لەو ژوورەو لە چاوەڕوانی مردندا بەجێ بێڵن و بڕۆن بەدوای شوومادا.

لەم ڕێگایەدا یارمەتیتان دەدەم.

( ١٥ )

شووما لەڕۆشتنی ئێمە بێ ئەندازە خەمبار ببوو. ئەو کەلەدنیا هیچ کەسێکی نەبو خۆی بەمن دڵخۆش کرد و نەیدەویست یەك ساتیش لەمن دووربێت و تەنیا بمێنێتەوە. لەئەمانۆ تورەبو کە بۆ منی بۆ بەجێهێشتنی ئەو هانداوە. لەکاتێکدا ئەمانۆ تاوانی نەبو و خۆم بردنی ئەوم بەباش نەدەزانی بەهەرحاڵ کاتێك ئێمە دوور کەوتینەوە، شووما هەستاو لەماڵەکە هاتەدەر. روخساری گرژو تاڵ دەهاتە بەرچاو. ئەو مناڵە لەدووری من هەستی بەخەمباری دەکرد و بەهەرجۆرێك بو دەیویست بەدوامدا بێت. ڕێگەیەك کەئێمە لەزۆنگاوەکانەوە بڕیبوومان زۆر مەترسیداربو. لەگەڵ ئەوەی سیلاحی گەرممان بو لە هێرشی کرۆکۆدیلەکان لەئەماندا نەبووین و هەرسات هەزاران مەترسی روی تێدەکردین. شووما ئەمەی بەباشی دەزانی بۆیە ڕێگایەکی تری هەڵبژاردو، خۆی خستە سەردارێك و لەزۆنگاوی پر کرۆکۆدیل و ئاناکندا تێپەڕی و گەشتە بەستێنی بەرانبەر.

شووما رایدەکرد، هەناسکە هەناسکی پێکەوتبوو... قاچی بریندار وخوێن لەبرینەکانی دەچۆڕا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەك ساتیش درەنگ کردنی بەرەوا نەدەزانی و بەڕاکردن بە دواماندا دەهات. نازانم بەجوانی شووما چ کاتێك ئێمەی دۆزیەوە. خۆی لەمبارەوە هیچی نەوت و دواتر لەوەڵامی پرسیارەکەی مندا وتی:

ئێوەم بینی بەڵام لەترسی ئەوەی نەکا تووڕەبن و لێم بدەن نەهاتمە پێش و لەدووریەوە وەك سێبەرێك بەدواتانا دەهاتم.

لەم شێوەشدا کاتێك ئەمانۆ لەئێوە دوورکەوتەوە، وەحشیەکان ئێمەیان دەستگیرکرد، شووما لەدوورەوە ئاگادار بو و هەمو شتێکی بینیبو.

کاتێك وەحشیەکان شائکی ومنیان بردو لەوێ دوورکەوتینەوە، شووما لەحەشارگەی خۆی هاتەدەرو یەکەم کاری هەڵگرتنی سیلاحەکان بوو وەسیلاح و فیشەکەکانی لەناو گیاکاندا دۆزیەوە و لەدەستی گرت. ئەوکات رۆشتە لای ئەمانۆ کە هێشتا لە سەردارەکە بو و لەترسا دەلەرزی و خۆی نیشاندا. ئەمانۆ کە بەهیچ جۆرێك چاوەڕوانی بینینی شووما نەبو، بێ ئەندازە شادمان و بەدڵگەرمیەوە هاتە خوارو پەیوەستی بو.

شووما و ئەمانۆ کاتژمێرێك لەوشوێنەدا مانەوەو دواتر میوە دەچنن، دەیخۆن و دەحەوێنەوە. ئەمانۆ بەسەرسوڕمانەوە بەسروشتی ژنانەی خۆی پێشنیار بەشووما دەکات لەهەمان رێگاوە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکەو چاوەڕوانی پەیدابوونی یوری بکەن. بەو هیوایەی رەنگە یوری بگاتە ئەویٚ و ئاگاداری بکەنەوە و بۆ رزگارکردنی ئێمە بینێرن بەڵام شووما رازی نابێت و دەڵێت:

نە، ئەمە کارێکی راست نیە.... من بەم داردەستە ئاسنینانە بۆ رزگارکردنی ئەوان هەوڵی خۆم دەدەم. ئەو منی لەمردن رزگارکردو پڵنگەکانی کوشت. ئەرکی منە لەم کاتە مەترسیدارەدا فریای بکەوم. ئەمانۆ گاڵتەی پیٚ دەکات و هەولەدات پەشیمانی بکاتەوە بەڵام شووما بەپێداگرتن دەڵێت:

هەرگیز، من دەزانم چۆن دەبیٚ ئاگرلەم داردەستانە بکەینەدەر و هەر ئەم شەو دەڕۆمە هۆز و هێرش دەکەمە سەر وەحشیەکان.

ئەو راستی دەکرد چونکە پێشتر چۆنیەتی کاری تفەنگم پیٚ وتبو و چونکە مناڵێکی زیاد لەڕادە وشیاربو دڵنیابوو دەتوانێت بەباشی ڕەشاش و تفەنگەکە بەکاربێنێت.

دواتریش دەبینین تاچەندە لەسەر ئەم قسەی راست بو و دەتوانێت.

ئەمانۆ نەیدەویست خۆی بەدەست مناڵێکی دوانزە ساڵە بسپێرێت وعەقڵی خۆی بداتە دەستی ئەو بۆیە هەوڵی دەدا دژایەتی بکات، شووماش لەسەر بڕیارەکەی خۆی سووڕ بوو و پێیدادەگرت تا ئەوەی سەرکەوت و سەرئەنجام ئەمانۆی رازی کردو لەگەڵ خۆیدا بردی.

سەیر لەوەدابو شووما ئەمانۆشی فێرکرد چۆن تەقە بەتفەنگ بکات و لەئەگەری مەترسی بەرگری لەخۆی بکات.

شووما شادمان و خەندان بەرەو هۆز بەڕێکەوت و ئەمانۆی بەدوای خۆیدا برد.

ئەو باوەڕی بەکارەکەی خۆی بوو. دڵنیا و هیواداربو بتوانێت من و شائکی رزگارکات. ئەمەبو ئەوەی لەکاتی خەوتنی من و شائکی رویدا. بەدەنگی کرانەوەی دەرگا و قەرەباڵغی وەحشیەکان و دەنگی تەپڵ لەخەوهەستام و لەناکاو خۆم لەگەڵ تاقمێك لەجادوگەرانانی هۆز کەبۆ بردنی ئێمە هاتبوون روبەڕو ببینەوە و زانیم کاتی مردنمان هاتووە.

ئەوان دەستی منیان کردەوە بەڵام شائکیان بەدەستی بەستراوە بردە ناو گۆڕەپان. ئەمەش رێکەوت بو رەنگە خوا وایدەویست کە جیاوازی لەنێوان من و ئەودا بکەن.

بەهەرحاڵ کەدەستی منیان کردەوە نەمزانی چی بو دەستم بردە گیرفانم و ساتێك دواتر بەشادمانی دەرم هێنا.

دەزانن لەگیرفانی خۆمدا چیم دۆزیەوە.

چەند دانەیەك فیشەکی دەمانچە.... دەمانچەکەم پیَ نەبو بەلاّم بەباشی دەمزانی چۆن و لەوکوێدا لە فیشەکەکان کەلك وەربگرم.

شائکی وەك پەیکەرێك بەرێگادا دەڕۆشت و لەسەماو دەنگە دەنگی وەحشیەکان نەدەترسا. دەتوت دەیبەن بۆ ئاهەنگی بوکێنی یەك لەهاورێکانی و ئەو بۆئەوەی یەخەی ئوتوکراوی نەشکێت تەنانەت سەری بۆ راست و چەپیش نەدەسوڕاند.

راستی بوونەوەرێکی سەیربوو، لەمردن نەدەترسا، نەمدەتوانی وەك ئەوبم هەرچی زیاتر هەوڵم دەدا و زیاتر زەختم لەخۆم دەکرد تا خوێنساردبم زیاتر پەرێشان دەبووم و دەشڵەژام.

وەحشیەکان ئێمەیان لای ئاگرەوە تێپەڕاند و ئەوکاتەی گەشتمە لای ئاگری گۆڕەپان، فیشەکەکانم خستە ناو ئاگرەکە و هەوڵم دا تائەو شوێنەی دەکرێت لەئاگرەکە دوور بوەستم.

بەخۆشحاڵیەوە ژمارەی وەحشیەکان ئەوەندە زۆربو کە لەنێوان من و شائکی و ئاگرەکە چەند ریز لە وەحشیەکان شادی و سەمایان دەکرد.

هەر ئەم وەحشیانە ئێمەیان لەزیانی تەقەی کتوپرو تەقینەوەی فیشەکەکان دەپاراست.

سەرەتا شائکیان بردە لای دارەکەو بۆ بەستنەوەی هەوڵیان دا.

جادوگەرانان دەستووریان دەداو کاری سەیرو سەمەرەیان دەکرد. کەلەناکاو دەنگی مەترسیدارو گویَ ئازاردەر بیستراو دەست بەجیَ هاواری یەك لەدوای یەك بەگویَ گەشت و چەندین کەس لەوەحشیەکان کەلای ئاگرەکە سەمایان دەکرد کەوتن و لەخوێندا گەوزان.

ئەمە دەنگی فیشەکەکان بو کەمن خستبوومە ناو ئاگرەکە.... وەحشیەکان سەرەتا بەهۆی تەقینەوەی ئەو فیشەکانە کوژران و پەرێشان و شڵەژان.

دەستی شائکیان نەبەست و بەجێیان هێشت بەلاّم هێشتا توانای راکردنمان نەبو چونکە وەحشیەکان لەدەوروبەرمان بوون و بچووکترین جووڵەیان دەبینی.

قەرەباڵغیەکی سەیر دروست بو و ژمارەیەك بەم لاولادا رایان دەکرد. لەم کاتەدا

دەنگی تەقەی ڕەشاش بیسترا.

گوومانم دەکرد ژمارەیەکیتر لەفیشەکەکانی ناو ئاگرەکە تەقین بەڵام دواتر هەستم کرد بەڕاستی دەنگی ڕەشاشە و کەسێك لەدوورەوە تەقە لە قەرەباڵغی وەحشیەکان دەکات.

خێرا ئەم گوومانەم بۆ دروست بو کەیوری بۆ رزگارکردنی ئێمە هەوڵ دەدات بۆیە بەشائکیم وت:

لەسەر زەوی راکشێ.

و هەردووك لەسەر زەوی راکشاین تا لەزیانی گوولەکان لەئەماندابین و وەحشیەکان کەنەیاندەزانی بەلاَ لەکام لاوە داباریوەو کێیە بێ بەزەییانە هێرشیان دەکاتە سەر، گێژو ورو بێ مەبەست رایان دەکردو دەیانقیژاند.

لەم بارودۆخە کەڵکم وەرگرت و بەشائکیم وت:

بەرەو لای چەپ..... خێراکە.

خۆم هەستام رامکرد. شائکیش بەدوامدا هات. هێشتا دەنگی ڕەشاش و تەقە تەقی تفەنگ دەهات کە ئێمە خۆمان گەیاندە دارەکانی جەنگەڵ و لەتاریکیدا لەچاو ون بووین.

چەند خولەك دواتر کە دەنگی ڕەشاش نەما، وەحشیەکان هەستیان بەڕاکردنی ئێمە کرد و بەدواماندا گەڕان بەڵام لەم ماوەدا من و شائکی زۆر لەهۆز بەڕادەی پێویست دوورکەوتبووینەوە.

ماندو و هیلاك، ناڵان و ناتەوان گەشتینە قەراغ رووبار و خۆم فڕێدایە سەر چەولمی رووبارو بێهۆش و بێحاڵ بووم. شائکی کە توانای زیاتری لەراکردن وپیادە رۆشتن لەناو دارەکانی جەنگەڵدا بو لەسەر سەرم دانیشت و چاودێری کردم.

تا دوایین سات لەبیری ئەمانۆدا بووم و لەشائکی سەبارەت بەو پرسیارم دەکرد. لای رووبار دووبارە لە شائکی پرسیاری ئەمانۆم کرد، وتی:

ئەمانۆ لەئێمە دووربو، سلاَمەت ماوەتەوە ئاسوودە بن بەخێرایی خۆی بەئێمە دەگەیەنێت.

وتم:

خۆزگە سیلاحەکانی لەناو گژوگیادا هەلەگرت و دەیهێنا.

بەڵام زیاتر لەسیلاحە و هەرشتێکی تر ئەمانۆم خۆش دەویست. ئەگەر دان بەوەدا بنێم کە ئەمانۆم زیاتر لەچاوی خۆم خۆش دەویست رەنگە بڵێن فشە دەکات. بەڵام

ڕاستیەکەی ئەوەیە کە دەیڵێم و ئەمانۆم لەچاوی خۆم زیاتر خۆش دەویست.

لەناو ئەم بیرو ئەندێشانەو بەهۆی هیلاکی زۆرەوە خەو بردمیەوەو ئیتر نەمزانی چی بوو و چی رویدا. بەرەبەیان کەتازە خۆر هەلاّتی ئاسمان ڕووناك ببوویەوەو لەناو گەلاّو لقی دارەکان ئاسمان زیو ڕەنگ تیکە تیکە دەبینرا چاوم کردەوە.

بەجوانی نەمدەزانی چەند و چەند کاتژمێر خەوتووم بەلاّم کاتێك هەستام هەموو جەستەم لێوانلێو بوو لەئاسوودەیی و ئارامی..... نە ئازارم بو نەپەڕێشانی خەیاڵ. تەنیا ونبوونی ئەمانۆ هەندێکات پەڕێشانی دەکردم و ئەویش بەقسەکانی شائکی و بەڵێنەکانی ئەو بەخێرایی لەناو دەچوو.

دوای چەند خولەکێك شائکی پێشنیاری کرد بەخێرایی لەوێ بڕۆین و خۆمان بگەیەنینە ئەو بەری ڕووبار. ئەو ڕووبارە لقێك لە ڕووباری گەورەی ئامازۆن بو کە لەرشتە کێوەکانی باکوورەوە سەرچاوەی دەگرت و ئاوی تاڤگەکان دەرژایە ناوی.

خێراکەن. ئێرە شوێنێکی مەترسیدارە و دوورنیە وەحشیە دڕندەکان بۆ سەندنەوە تۆڵە بەدواماندا بێن و ئەم جارەیان تیکە تیکە بین. خێراکەن.

لەشوێنەکەی هەستاو خۆی بۆ ڕۆشتن ئامادە کرد بەلاّم نەمدەتوانی لەوێ کە خۆشەویستەکەم لەدەست دابو دڵ هەڵبگرم و بڕۆم. گوومانم دەکرد تاچەند خولەکێکی تر ئەمانۆ لەپشت دارەکان دەردەکەوێت بۆیە نەمدەویست بڕۆم.

بۆ شائکی ژیان لەهەموو شوێنێکی دنیا وەك یەك وابو بەلاّم من عاشق بووم، دڵدارو دڵدارە، ئەمانۆی خۆشەویست و قیبلەی من ون ببوو و نەمدەزانی لەکوێیە.

شائکی دەتوت هەستی بەمەبەستەکەم لەدرەنگ کردن کردوە بۆیە بیری کردەوە وتی:

ئێمە لەهۆزەکەی خۆمان نیشانەی تیابەتمان هەیە، ئەمانۆش لەهۆزی ئێمەیە و ئەم نیشانە دەناسێتەوە. ئێوە بەڕێکەون من نیشانەکان لەقەراغ ڕوبارو لەرێگادا دادەنێم تا ئەگەر ئەمانۆ گەشتە ئێرە بەدواماناببێت.

ئەم ڕستانە کاریگەری تایبەتی لەسەر دروست کردم. شادمان بووم و لەگەڵ ئەوەی بێ سیلاح نەمدەویست لەڕووبار تێپەڕم تەسلیمی بۆچوونەکەی شائکی بوو وتم:

زۆرباشە.... ئەم نیشانانەی تۆ باسیان دەکەیت چیە؟

شائکی پرسی:

ئەمانۆ جلەکانی تۆ دەناسێت.

وتم: بەڵێ ئەو کراسەکەی من کەدڕابو، دووریەوە جیاواز لەوەش هەست بەبۆنی

جەستەم دەکات و ئەگەر....

شائکی قسەکی بریم و وتی:

کەواتە یەکێك لەقۆڵی کراسەکەتان لێبکەنەوە.

قۆڵ کراسکەم پێدا. شائکی بەشێکی بەستێنی رووباری تەخت کرد بەلقێکی دار چەولمی ساف کرد، بەشیوەیەك کە هەرشوێنەوارێکی لەسەر دەمایەوە. من بەوردی سەیری کارەکانی ئەوم دەکرد.

شائکی دوای ئەم کارە کراسەکەی لەوتەختاییەی سافکراوەدا بڵاوکردەوە بەشێوەیەك دوو قۆڵی کراسەکە بەرەو بەستێنی ئەولای رووبار خوار بوونەوە. وادەهاتە بەرچاو کە کەسێك خەوتووە و بەدەست لەسەر سەرەوە ئەوبەری ئاو نیشان دەدات.

کاتێك لەم کارە ئاسوودە بو، بەسەری دار هێڵ و چەند نیشانەیەکی لەسەر خاك کێشا. سەری دار بەجوانی دەجوولا و لەسەر زیخی نەرمی بەستێن شائکی چەندین وێنەی بەو جۆرەی دڵی دەیویست دروست کرد.

سەرئەنجام کارەکەی تەواو بو، دارەکەی فرێدا و وتی:

برۆین.... ئەمە بەسە.... لەگەڵ ئەوەی ئەمانۆ بگاتە ئێرە و ئەم نیشانانە ببینێت، مەبەستەکەمان تێدەگات و بەدوامانداد دێت.

رووت بووم. جلم لەبەردانەبو. یەکێك لەدەرلینگەکانی شەڕواڵەکەم هەڵکەنراو، شەڕواڵەکەم تەنیا یەك قاچی بو، کراسەکەشم بەو شێوە لەدەست دا، وەك پیاوانی ئامازۆن رووت بووم. ئەگەر موی بۆرو پێستی سپیم نەبو رەنگە لەگەڵ پیاوانی ئامازۆن هیچ جیاوازییەکم نەدەبو. و لەوان سەیر دەهاتمە بەرچاو چونکە شەڕواڵێکم لەپێدابو کە تەنیا یەك قاچی بو.

بەبێزاریەوە بۆ تێپەڕبوون لەرووبار دەستمان بەچالاکی کرد. شائکی دەستی بەهەڵکەندن و شکاندنی لقەکان کرد و دوای نیو کاتژمێر برێك زۆر داری کۆکردەوەو بە تونی نەرمی دارەکان پێکەوە بەستی.

ئەوەندە لەم کارەدا شارەزابو بەڕاستی سەیرو شیاوی دەستخۆشی کردن بو. کاتژمێرێك دواتر بەلقی دارەکان شتێکی دروست کرد کە هەرچی بو دەیتوانی ئێمە بگەیەنێتە ئەو بەری ئاو.

شائکی پەڕییە سەری، منیشی کێشایە سەر و لەلێواری دوداری درێژ کەلە قووڵایی رووباری گیردەکرد دەستی بەپێشرەوی کرد. پانایی ئاو ئەوەندە زۆرنەبو و زۆر خێرا

گەشتینە ئەوبەر و دابەزیین. لەوێشدا وەستام و دووبارە لەوبەری رووبار ئەو شوێنەی ئەمانۆم لەدەست دابو، روانیم. کاتێك گەشتینە ئەوبەری رووبار، شائکی وتی:

لەم رێگاوە بڕۆین..... لەنزیکی ئێرەدا هۆزێکی گەورە هەیە ! بەخێرایی پرسیم:

لەم هۆزە وەحشیانە.....؟ کەوایە بۆ هاتین......؟

شائکی وەڵامی دایەوە

نا...... ئاسوودە بن. ئەم هۆزە گەورەترین هۆزی ئامازۆنە و لەگەڵ هۆزی ئێمەدا خزمایەتیمان هەیە. مەترسیدارنین و بەپێچەوانەوە زۆر رێز لەپیاوانی ئێمە دەگرن. چونکە سیلاحمان پێ نیەو لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هۆزە لەسەرە رێگاماندایە و جیاواز لەمانە دوژمنی یوچپیەکانن باشترە سەرەتا بڕۆینە ئەوێ و چەند رۆژێك بمێنینەوە.

من لەرستەی (( زۆر رێز لەپیاوان دەگرن )) تێنەگەشتم. دەمویست بپرسم بەڵام شائکی مۆڵەتی نەداو وتی:

من بۆ ئەمانۆم نوسی دەڕۆینە ئێرە و لەچاوەڕوانیدا دەمێنینەوە. کێشە نییە چەند رۆژ هیلاکی رێگا و ئازارێك لەدەست وەحشیەکان چێشتوومانە لەناو بەرین.

ئەمەی وت و بەڕێکەوت. منیش بەدوایدا. لەوێوە تا هۆز زۆر دوورنەبوو و کاتێك هەتاو لەناوەڕاستی ئاسمان تێپەڕی و بەرەو رۆژئاوا دەڕۆشت گەشتینە سنوورەکانی هۆزی ناوبراو.

دانیشتوانی هۆز شێوە رازاندنەوەییەکی سەیریان بوو. بەشێك لەجەستەی خۆیان بەقووماش داپۆشیبو. دەستە دەستە پیاوان کە بۆراو رۆشتبوونە جەنگەڵ دەگەڕانەوەو ئێمە ئەوانمان دەبینی لە شائکیم پرسی:

ئەمانە قووماشیان هەیە.

وتی: ئەوان باشتر لەئێمە دەژین. زۆربەی قووماشەکانی هۆزی ئێمە ئەوان دەیچنن. ئەمانە قووماشی کرمیان هەیە. مەبەستی شائکی لەقووماشی دەزوی کرم بو . ئەوان چۆنیەتی راگرتنی کرم و دروست کردنی ئاوریشم دەزانن. سەرم سوڕمابو چونکە باوەڕم نەدەکرد لەناوەڕاستی جەنگەڵی باران و ئەو شوێنە ترس ئەنگێزە هۆزێکی پێشکەوتو بژین. تاڕادەیەك پێش کەوتو! وەحشیەکان ئێمەیان دەبینی بەڵام سەریان سووڕنەدەما.... تەنانەت پێستی سپی من سەرنجی ئەوانی رانەدەکێشا. هەرکەس سەرقاڵی کاری خۆی بو... دەهاتن و دەڕۆشتن و کەس گوێی بەئێمە نەدەدا.

سەرۆکی هۆز جلێکی درێژی لەبەردابو. کاتێك لەهاتنی ئێمە ئاگادار بو، هاتە

پێشوازی و ئێمەی بردە لای خۆی و لەژوورێکدا جیگەی کردینەوە کە کەرەستەی ژیانی تیا دەبینرا. ژوورەکە تاریك و شائکی بۆ رووناکی ئاگری کردەوە. لەم کاتەدا بەخێرایی بیریك بەزەینمدا هات و بەسەرۆکی هۆز کە هاتبووە بینینی ئێمە وتم:

ئایا ئێوە چۆنیەتی دروست کردنی مۆم و بەکارهێنانی چرا نازانن؟ ئەو بێ ئاگایی خۆی دەربڕی و وتی:

ئێمە جگە لەئاگر هیچ شتێکی ترمان بۆ رووناکی نیە.

داوام لێکرد کەمێك چەوری مانگاو قوماشم بۆ بێنێت. سەرۆك دەستووری دا و بەخێرایی قاپێکی گڵی پر لە بەزی پیوری گای کیوی و قوماشیان ئامادەکرد. قوماشەکانم بەشێوەی پلێتە دەرهێناو پیوم خستە سەر ئاگر تاتوایەوە. ئەوکات لەپیوو پلێتەکە مۆمم دروست کرد. کەمێك چەوری ناو قاپەکە لەماوەی نیو کاتژمێردا بو بە چل وسێ مۆمی بچووك.

سەرۆکی هۆز و شائکی بەسەرسوڕمانەوە سەیری کارەکانی منیان دەکرد و هێشتا نەیاندەزانی ئەو لوولە چەوریانە چیان پێدەکرێت. کاتێك مۆمەکان ئامادەبو دوانیانم خستە ناو ئەو قاپە گڵییەو رۆشنم کرد.

ژوورەکە لە رووناکی مۆمەکان دیمەنێکی دڵگیرتری بەخۆ گرت. سەرۆکی هۆز بەبینینی رووناکی لەشادمانیدا قیژاندی و بەڕاکردن لەژوورەکە رۆشتەدەر.

سەرۆك دانیشتوانی هۆزی کۆکردەوە بۆ سەیرکردن. چەند مۆمێکی ترم لەبەردەم ژوورەکە داناو رۆشنم کرد تا هەرکەس دەیەوێت سەیرم بکات. بەیانی ئەو رۆژە چۆنیەتی دروست کردنی مۆمم بەتاقمێك کە بۆ ئەم کارە راسپێردابوون، فێرکردو سبەی شەو هەموو ماڵەکان بەمۆم رووناك بوویەوە. جەژنێکی بەشکۆیان بۆ مۆم سازدا و سەماو شادی دەستی پێکرد. لەجەژنەکەدا بو کەسەرۆکی هۆز چوار کچ لەجوانترین کچەکانی هۆزی هەڵبژارد و بەرەو لای من هات وتی:

لەبەر خزمەتێك کە بەمنت کردوە ئەم کچانەت پێشکەش دەکەم. ئەوانە هی تۆن ماڵەکەی تۆ رێك دەکەن و خواردنت بۆ دروست دەکەن.

نەمدەزانی مەبەستی لەپێشکەش کردنی کچەکان چیە. داوای رونکردنەوەم لەشائکی کرد و وتی:

ئەم کچانە هاوسەری ئێون. لە هۆزەدا ژمارەی ژنان بیست بەرانبەری پیاوانە و هەرکام لەپیاوەکان دەبێت چوا تا دە ژنی هەبێت.... ئەگەر بیرتان بێت پێشتر ئەمەم پێ

وتوون.....

رەنگم پەڕا، دەمویست بەم چاکەیە راز نەبم بەڵام شائکی بەئیشارەی سەر پەشیمانی کردمەوەو دواتر وتی:

ئەم کارە مەترسیدارە چونکە بە ئیهانەیەکی گەورە دەژمێردرێت. دەبێت لەگەڵ ئەم ژنانەدا بژیت و چارەیەك جگە لەمە نیە.

لەهەمان شەو، ژنەکان هاتنە ژوورەکەی من و دەستیان بەخزمەت کردنی من کرد. ئەوان لەنێوان خۆیاندا رێك کەوتبوون و بچووکترینیان هەمان شەو دەستی بەسەرو روخسارمدا هێناو دەست و قاچی شۆردم.

لەقسەکردن لەگەڵیدا چێژم دەبرد.... ئێوەی خوێنەر باشتر لەهەر کەسێك دەزانن من لەبەرانبەر ژنان چەندە لاوازو بێ ئیرادەم.

من و شائکی دەمانویست بڕۆین. جیاواز لەوەش خۆم لەمانەوەی درێژ ماوەم لەجەنگەڵە ترس ئەنگێزەکانی ئامازۆن بێزار ببووم و دەمویست هەرچی زووتر بەجێی بێڵم و بگەڕێمەوە بۆ دنیای پێشکەوتو و بۆخۆم ماڵ و خێزانم پێکەوەبنێم و وەك هەموو خەڵك بژیم. روداوخوازی و گەڕان یەکێکە لەکارە چێژ بەخشەکان بەڵام کاتێك درێژەی پێدرا وەك هەموو کارە شیرینەکانیتر مرۆڤ بێزار دەکات.

منیش بێزار ببووم و بڕیارمدا دوای تۆڵە سەندنەوە لە لئۆنا و دۆزینەوەی یوری درێژە بەڕێگاکەم بدەم و لەوێ دوور بکەومەوە بەڵام بەوپەڕی سەرسوڕمان دەمبینی تازە بەتازە گرفتارییێکی تازەم بۆ دروست بووە و ئەم چوار کچە ڕەش پێستە نایەڵن بۆ خولەکێك سەرقاڵی کارەکەی خۆم بم و لێم دوورناکەونەوە.

ئەم بابەتە یانی دەربڕینی خۆشەویستی ئەوان سەرەتا وەك رابواردن و سەرقاڵیەك بۆمن دەژمێردرا و چێژم لێ دەبرد. چوار کچە پێشکەشییەکەی سەرۆکی هۆز ناشرین نەبوون شێوەی ئەوانیش ئەوەندە ناحەز نەبو مرۆڤ نەتوانێت خۆشیانی بوێت.

تەنیا کێشەی ئەو چوار کچە ڕەنگی ڕەشی ئەوان بوو. ئەگەر رەنگی پێستیان دەگۆڕا هەرکامیان لەگەڵ کچێکی جوان و دڵرفێنی دنیای پێشکەوتو بەرانبەریان دەکرد. لەکاتژمێرەکانی رۆژ ئەوان منیان بۆ شوێنی فێنك و خۆش ئاو هەوا دەبرد. لەسەر سەرم سێبەریان دروست دەکرد و یەك لەوان بەباوەشێن مێش و مێشوولەی دوور دەکردەوەو و ئاگادار بوون دەعباکان زیانم پێ نەگەیەنن. لەلای سەرچاوەی ئاو دەست بەکار دەبوون و خواردنیان دروست دەکرد. لەکاتی خواردن رێگەیان دەدا ئاسوودە بم.

لەسەر یەك، ئاسوودە بووم و ئەگەر ئەندێشەی گەڕانەوە و ناڕەحەتیەکانیتر نەدەبو، چەندین ساڵ دەمتوانی لەوێ بەو بارودۆخە بژیم.

سەرۆك و دانیشتوانی هۆز ڕێزیان لێ دەگرتم و باشترین ڕاو و بەتامترین میوەکانی جەنگەڵیان دەناردەماڵەکەی من.

چەند ڕۆژ بەم شێوە تێپەڕی، شائکیش سەرقاڵی عەشقبازی بوو. کەمتر دەهاتە لای من، وەك ئاماژەی پێدرا لەو هۆزە دا ژمارەی پیاوان زۆر کەمتر لەژنان بوو کەپیاوێکیان بێ ژن دەبینی بە خێرایی چەندین کچ یان بێوەژنیان پێشکەش دەکرد.

شائکیش ئەم بارودۆخەی بوو. نەمدەزانی چەند ژنیان پێداوە و چی دەکات بەڵام دڵنیابووم ژنە بێ پیاوەکانی هۆز نایەڵن ئاسوودە بێت.

ڕۆژێك بەیانی لەسێبەری دارەکاندا ڕاکشابووم و ژنەکانیش سەرقاڵی کاری خۆیان بوو کە لەناکاو دەنگی شائکی بیسترا کە دەیوت:

تۆ بۆ هاتوویتە ئێرە.... کێ ڕێگەی پێدایت.... نەدەبوا لەبەستێنی چەپی ڕووبار دوور بکەویتەوە... دەنگی شائکیم باش دەناسی و لە دوورەوە زانیم ئەوە، بەڵام نەمدەزانی لەگەڵ کێدا قسەدەکات سەرسوڕماو لەشوێنەکەم هەستام و سەیری دەوروبەرم کرد.

خولەکێك دواتر لق و گەڵای دارەکانی پشت سەرم تەکانیان خوارد و شائکی لەکاتێکدا دەستی شوومای لەدەستدابوو، دەرکەوت. بەبینینی شووما دڵم داکەوت و دەمم کرایەوە. باوەڕم نەدەکرد ئەو ئەم هەموو ڕێگایەی پێوابێت و گەشتبێتە ئێرە. گوومانم کرد ڕەنگە چاوەکانم بەهەڵە دەبینن.

بەڵام نە...... شووما بو.

شووما بەو ڕوخسارە نەجیب و نیگای سەیرو بەژنی کورتی...... شووما بو.... ڕەشاشەکەی منی لەشاندا و یاری بەدەسکەکەی دەکرد.

بەبینینی ڕەشاشەکە لە شادمانیدا هەستامە سەرپێ.

شووما لەبەرچاوی مندا گوناحکاربو.

گونحاکار لەبەرئەوەی بەبێ مۆڵەت و بەپێچەوانەی دەستوورێك کە دابووم، بەدواماندا هاتبو بەڵام بەبینینی ڕەشاشەکە هەموو شتێك تەنانەت گووناحە گەورەکەی شوومام لەبیرکردو و شادمان بووم شائکی کاتێك گەشتە بەرانبەرم دەستی مناڵەکەی بەرەڵاکرد و وتی:

ئەم منداڵە لێرە چی دەکات؟ کێ پێی وت بەدواماندا بێت؟

شائکی چاوەڕێ بو لێپرسینەوە لە شووما بکەم و سزای بدەم بەڵام من ئەوەندە پەرێشان و شادمان بوم، ئەگەر دەمتوانی پاداشتێکی باشم بەو منداڵە دەدا. پاداشتی زەحمەتێك کە کێشاویەتی و ڕەشاشەکەی منی تا ئەوێ هێناوە.

کاتێك منی بینی بزەیەکی هێنایە سەر لێو، قایشی ڕەشاشەکەی لەسەر سکی کێشایە خوارو دای بەمن. قایشی چەرمی ڕەشاشەکە لەسەرشانی لاوازی ئەو شوێنەواری بەجێ هێشتبوو و شینی کردبوویەوە. شووما هیلاك دەهاتە بەرچاو بەشێویەك ئیتر نەیدەتوانی لەسەرپێ بوەستێت و لەگەڵ ئەوەی بەبێ مۆڵەتی من دانەدەنیشت خۆی خستە سەر جێگاکەی من و خەوت. بە شائکیم وت:

ئەم ڕەشاشە لەنزیك هۆزی وەحشیەکان کاتێك کەوتبووینە گەمارۆوە، خستمە ناو گیاکان. ئەو چۆن دۆزیویەتیەوە؟ تفەنگەکە چی لێهات....

شائکی کەتازە هەستی بەم بابەتە کردبو سەیری من و دواتر سەیری شوومای کە هیلاك و بێحاڵ لەسەر جێگاکەی من کەوتبوو. بەدەنگێك کە ئەوپەڕی سەرسوڕمانی نیشان دەدا وتی:

ڕاست دەکەن، ئەم منداڵە چەند بوێر و ئازایە.... کەواتە دەبێت ئەمانۆشی بینیبێت. ئەمانۆ لای سیلاحەکان و لەو نزیکیەدا خۆی داشاردبو. چۆن ئەمانۆی لەگەڵدا نیە !

بەدوای ئەم ڕستە خۆی گەیاندە شووما، دەستی بەشانەکانیدا هێناو سەری بەرزکردەوەو لەروخساری ڕوانی تابزانێت هاتۆتە هۆش یان نە.

شووما لەهیلاکیدا بێهۆش ببو بەئاسانی نەدەهاتە هۆش خۆی. کە ئەوم بینی وتم: وازی لێبێنە.

دواتر رومکردە ژنەکان وتم: بۆ ئەم منداڵە خواردن بێنن و میوە ئامادە بکەن.

بەخێرایی کەبابیان بۆ شووما دروست کرد و بڕێك میوەیان لای جێگاکەی دانا منیش سەری منداڵەکەم خستە سەر رانی خۆم و ئەوەندە شان و دەستەکانیم شێلا تا هاتە هۆش و چاوەکانی کردەوە. هەر کە چاوەکانی کردەوە بزەیەك گرت، لەمنی ڕوانی و وتی: زۆر خۆشحاڵم رزگارتان بووە، نزیك بو من و ئەمانۆ گرفتار ببین. بەجوانی ناتوانم بەم داردەستە ئاگراویەی ئێوە کاربکەم و هەندێ کات لەجیاتی وەحشیەکان دارەکانم دەسووتاند و کون کونم دەکردن.

من و شائکی کە لەم ڕووداو ئاگادار نەبووین و هێشتا نەماندەزانی کێ ئێمەی

لەدەست وەحشیەکان رزگارکردوە لە قسەکانی تێنەدەگەشتین و زەق زەق سەیری دەمی ئەو و یەکترمان دەکرد. ئەو چی دەڵێت....

مەبەستی چیە؟

شووما هەستا، بەیارمەتی شائکی کەدەستی بەپشتیەوە گرتبو دەستی بەخواردن کرد. بەددانە سپیەکانی خۆی گۆشتی لێدەکردەوەو جواو و نەجواو قووتی دەدا، کاتێك تێر بو وتی: من ئەگەر درەنگ بگەشتمایە وەحشیەکان ئێوەیان کوشتبو. لەکاتی خۆیدا من و ئەمانۆ دەستمان بە تەقەکردن کرد.

شائکی پرسی: شێت بویت. چی دەڵێیت لەکوێ تەقەت کرد، رەنگە خەوت بینیوە.

شووما سەیری شائکی کردو پرسی:

مەگەر ئێوە گرفتاری وەحشیەکان نەببون؟

وتم: بۆ نا بەڵام یوری رزگاری کردین.

شووما منالأنە پێکەنی و دەستەکانی لەیەك داو وتی:

من ئێوەم رزگارکرد. من و ئەمانۆ.

دواتر زۆر بەوردی بەسەرهاتی تێپەرینی خۆی لەزۆنگاو و گەشتن بەشوێنی خۆشاردنەوەی ئەمانۆی باس کردو وتی:

کاتێك ئێوە راتان کرد، وەحشیەکان شوێن ئێمەکەوتن.

ئێمە رێگاکانی جەنگەڵمان باش دەزانی بۆیە نەیانتوانی بمانگرن و دوو رۆژ دواتر گەشتینە شوێنێك کە نیشانەتان دانابو.

بەخێرایی قسەکەیم پچری و وتم:

ئەمانۆ لەکوێیە؟

شووما وتی: سەرۆکی هۆز ئەوی راگرتووە. پرسیم:

بۆ....... بۆ رایگرتووە؟

شائکی وتی:

توورە مەبن. رەنگە هۆکارێکی تایبەتی هەبێت. دەرۆم و دەپرسم و دواتر رویکردە یەکێك لە ژنەکانی من و وتی بۆ سەرۆکی هۆز ئەمانۆی لای خۆی راگرتووە؟

ئەو وتی: ئاخر مێردەکان نابێت ژنی بێگانەیان هەبێت. لەبەرئەمە سەرۆکی هۆز ئەوی راگرتووە کە هیچ پەیوەندیەك لەنێوان مێردەکان و ئەودا دروست نەبێت.

زانیم دەمارگیری نەژادی لەو هۆزەدا زۆرە و لەگەڵ ئەوەی لەگەڵ ئامازۆنیەکاندا

خزمایەتیان هەیە بە چاوێکی تر سەیری ژنانی ئامازۆنی دەکەن و لێیان بێزارن.

بەهەرحاڵ شائکی رۆشت و بەهەر زمانێك بو ئەمانۆی هێنایە لای من. لەشادیدا بەرەو پێشوازی رام کرد و دەمویست لەئامێزی بگرم. ئەو کچێکی وریابو هەموو شتێکی بێ دەمارگیری کوێر کوێرانە و دوژمنایەتی ژنانە تێدەگەشت، رێگربوو پاڵی پێوەنام و وتی:

ئاگاداربە، ئەم چوار کچە کە بوونەتە هاوسەری تۆ، تووڕە دەبن و ئەوسات گیانی من دەکەوێتە مەترسیەوە. هەوڵ بدە لەگەڵمدا میهرەبان نەبیت و لەسەرنجدانی خۆت بەرانبەر بەوان کەم نەکەیتەوە. بەم شێوە ئەمانۆ و شووما پەیوەستمان بوون و دەستەکەمان بوو بەچوار کەس. چوار ژنەکەی من بەمۆرەوە سەیری ئەمانۆیان دەکرد. لەچاوەکانیانەوە بڵێسەی تووڕەیی و بێزاری دەهاتەدەر. دیاربو لە پەیوەندی عاشقانەی من و لەگەڵ ئەمانۆ ئاگاداربوون و بەدوای دەرفەتێکی گونجاو دەگەرێن تا لە ناوی ببەن.

ئەمانۆ وتی:

من باشتر لەهەرکەسێك ژنانی ئەم هۆزە دەناسم. ئەوان زیاد لەرادە حەسوودو مەترسیدارن. مانەوە لێرە لەبەرژەوەندیمان نیەو دەبێت هەرچی زووتر رابکەین.

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم.

بۆ رابکەین؟ مۆڵەت لەسەرۆك وەردەگرین و دەڕۆین.

ئەمانۆ پێکەنی و وتی:

سەیرە ! رزگاری تۆ لەدەست ئەم ژنانە ئەگەری نیە بەخۆشەویستیەکانیان هەڵمەخەڵەتێ. ژنانی ئەم هۆزە لەساڵەکانی یەکەم وەك کەنیزە خزمەتت دەکەن و پەرستاری لەمێردەکانی خۆیان دەکەن بەڵام کاتێك دەبنە خاوەنی منال، پیاوی داماو نەتەنیا دەبێت کەرەستەکانی بژیوی ژن و منالەکە ئامادە بکات بەڵکو دەبێت خزمەتی باوك و دایکی و خۆشك و براکانیشی بکات. ئەمانە بۆ منال یاسای زۆر توندیان هەیە بەتایبەت ئەگەر کوڕ بێت. بەپێچەوانەی هۆزی ئێمە زیاد لەرادە گرنگی بەکوڕ دەدەن و منالی کوڕ بەئازیز دەژمێرن. ئاگادار بە ئەم ژنانە لەتۆ نەبنە خاوەنی مندال.

ئەمانۆ بەشێوەیەك ئەم قسانەی وت کە مووەکانی جەستەم راست بوونەوە. بەڕاستی ترسابووم و نەمدەزانی چی بڵێم ! دوای چەند خولەك ئەمانۆ وتی:

هەرچی زووتر دەبێت رابکەین بەڵام دەبێت جۆرێك ئەم کارە بکەین کە ئەم ژنانە تێنەگەن. لەوساتە بەدواوە من و شائکی ترساو بۆ رزگار بوونی خۆمان لەم گێژاوە

دەست بەکار بووین. کارێك کەدەمانتوانی بیکەین ئەوەبو نەخشە بکێشین، نەخشەی هەڵاتن. بەڵام دیار نەبو لەئەنجامدا سەردەکەوین یان نە.

ئەو رۆژە تێپەڕی بەیانی شائکی بۆ راو رۆشتە جەنگەڵ و کە گەڕایەوە هاتە لای ئێمە و وتی:

رێگەی هەڵاتنم ئامادەکرد. ئەمشەو دەبێت رابکەین. ئامادەبن لەکاتی شەودا دەبێت رابکەین. ئەو رۆژە زۆر بەهێواشی و دژواری تێپەڕی. دڵم بەتووندی لێی دەدا و دەترسام..... خۆم نەمدەزانی بۆ دەترسم و لەبەرچی نیگەرانم. کاتی ئاوابوونی هەتاو لەشائکیم پرسی:

نەخشەی تۆ چیە....؟ چ رێگەیەکت بۆ هەڵاتن هەڵبژاردوە؟

شائکی سەیری دەوروبەری کرد و کاتێك دڵنیابو کەس قسەکانمان نابیستبێت وتی:

لەکۆتایی هۆز نزیك یەکێك لەلقەکانی رووباری ئامازۆن چەندین قەفەسی گەورە هەیە کەتیایدا ئاژەڵە وەحشیەکانیان زیندانی کردوە. قەفەسەکان جۆرێکن بۆ تێپەڕبوون لەسەر ئاو گوونجاون چونکە هەر قەفەسێك چەندین قەدی داری بەسەرەوەیە. بۆئەوەیە بتوانن قەفەسەکان لەئاو بپەڕێننەوە بێ ئەوەی نێچیرەکەیان تەڕببێت.

پێم وت:

تۆدەڵێت قەفەسەکان پرە. کەواتە.... ئەو قسەکەی منی بڕی و وتی:

دەبێت یەکێك لە قەفەسەکان خاڵی بکەین. من پلانی کارەکەم داڕێژراوە. نیگەران مەبن. هەڵبەتە چەند کەس لەپیاوانی هۆز لەوێ پاسەوانی دەدەن بەڵام گرنگ نیە ئەگەر بوێربین سەر دەکەوین. مانگە شەوێکی رووناك بو. نیوە شەو شائکی هاتەلای من و نیشانەی تایبەتی نیشان دان. یەك لەچوار ژنەکە لای من خەوتبو، من ئارام لێی دوورکەوتمەوە و هاوڕێی لەگەڵ شائکی بەڕێکەوتم. ڕەشاشەکەم لەدەستدا بو، تفەنگێك کە ئەمانۆ هێنابووی لەدەست شائکیدا بو. لەقەراغ جەنگەڵ لەدوایین ریزی ماڵەکان تێپەڕی و خۆمان گەیاندە شوێنی قەفەسەکان. شووماو ئەمانۆ پێشتر لەوێ ئامادە ببوون و چاوەڕوانی هاتنی ئێمە بوون. بارودۆخ زۆر گونجاو بو بەشێوەیەك هەر ئەوەندەی منی بینی بەندی یەکێك لە قەفەسەکانی کێشاو دەرگاکەی کردەوەو خۆی لەپشت دارێکەوە داشارد.

پڵنگێکی ڕەش لە قەفەس دەرچو و ئارام ئارام بەرەو جەنگەڵ رۆشت. نەڕەی ئاژەڵ سەرنجی دوو پاسەوانەکەی راکێشا. ئەوان بێ ترس رایان کرد تاپێگربن لەراکردنی

ئاژەڵەکە بەڵام سەرنەکەوتن پڵنگی ڕەش پەلاماری دان و یەك لەوانی هەڵدڕی. ئەویتر رایکردو بەخێرایی لەوێ دوورکەوتەوە. لەم ماوە کورتەدا کە پاسەوانەکان لەگەڵ پڵنگەکە دا سەرقاڵ بوون، شائکی و من قەفەسەکەمان بەرەو رووبار برد و خستمانە ناو ئاو.

شووما و ئەمانۆش پەیوەستمان بوون و هەرکام سووچێکی قەفەسەکەیان گرت و بەمەلەکردن رۆشتینە ئەوبەر.

کەمێك کە لەقەراغ دوورکەوتینەوە پەڕینە سەرداەکانی ژێر قەفەسەکەو لە مەلەکردنیش ئاسوودە بووین. تا ئێرە کار بەجوانی رۆشتبوە پێش و ئێمە رزگارمان ببو بەڵام وەحشیەکان ئاسوودەیان نەدەهێشتین ولەهەمووی گرنگتر چوار ژنەکەی من ئاسوودە دانەدەنیشتن. ئەوان دەیانویست هاوسەری سپی پێستەکەی خۆیان لەدەست نەدەن.

بەڕاستی نازانم دوای من چی بوو چی روویدا. لەهۆز نەبووم کە بینەری روداوەکان بم و لەو پەچەکردارەی ئەو ژنانە نیشانیان دەدا، ئاگاداربم.

ئاوێك کە ئێمە لێی تێپەڕدەبووین یەکێك لە لقەکانی رووباری ناوداری ئامازۆن و زۆر قووڵ نەبوو. خێرایی ئاو بەهۆی ئەوەی لەکوێستانەوە زۆر دوور نەبو، زۆر و لەبەر ئەمە هەوڵی ئێمە بۆئەوەی قەفەسەکە بەرینە بەستێنی ئەوبەر، بێ ئەنجام مایەوە و ئاو ئێمەی بۆ باشوور دەبرد. تاریکی شەو وەك پۆششێك لە قوماشی ڕەش کە بەسەر جەنگەڵ کێشرابێت، هەموو شوێنێکی ڕەش کردبوو و لەنزیکیشەوە هیچ شت و هیچ کەسێك نەدەناسرایەوە چ بگات بەوەی دانیشتوانی هۆزی ئەولا ئێمەیان لەکاتی راکردندا بینیبێت و رێگەیان لەسەر راگرتنی ئێمە گرتبێت.

لەم بارەوە بە تەواوی ئاسوودە بووین. لەگەڵە ئەوەی ئاو لەگەڵ رەوتی خۆی دەبردە پێش، لەبەستێنی بەرانبەر نزیك دەبووینەوە.

شائکی بەدارێکی درێژ کەلە دەستیدابو بەردەوام قووڵایی ئاوی هەڵەسەنگاند و شووماش بەدارێکی تر لە خێرایی ئاوی کەم دەکردەوە تا نەکەوینە دەست شەپۆلەکانی رووبار.

هەردووکیان لەکاری خۆیاندا شارەزابوون. شووما لەگەڵ تەمەنی کەم وەك گەنجێکی بەهێز کاری دەکرد. من و ئەمانۆ وەك مەهاراجە و ژنەکەی کە لەسەر فیل دانیشتبێتن و بۆ پیاسە رۆشتبێتن، پاڵمان بەقەفەسەکەوە دا و قاچمان درێژکرد. کاتێك لە تاریکی

شەو سێبەری دارەکانی ئەو رووبارە دەرکەوت و قووڵایی ئاو گەشتە مەترێك، ئەمانۆ بەهێواشی سەری لەروخساری من نزیك کردەوەو بەجۆرێك شائکی و شووما نەیبیستن وتی:

چۆن میوانداری چوار ژنەکەی خۆتت کرد؟ ئەم پرسیارە لەو کاتەدا زۆر سەیربو ! یانی بۆ ئەمانۆ لەکاتی راکردن و سەرگەردانی لەمن لەبارەی ئەو چوار کچە پرسیاردەکات.

لەتاریکی شەودا سەیرێکم کرد و بێدەنگ بووم. ئەمانۆ کەدەتوت لەتاریکی شەو مەبەستی منی لەو سەیرکردنە هەست پێکردبێت، هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی:

ئەگەر دەمزانی لەو هۆزە روبەڕوی ئەو دیمەنە دەبوومەوە و تۆم بەخاوەنی چوار ژن دەبینی، هیچ کات بەدواتا نەدەهاتم.

لەگەڵ ئێوەدا زۆرم باسی عەشقی خۆم و ئەمانۆ کردوە. باش دەزانن تا چەند خۆشم دەویێت و لەدڵما چ جێگایەکی گەورەی بوو. دەیویست لێم برەنجێت، نەیدەویست نیگەران بێت و ترسی لەدەست دانی ئازاری دەدام.

هەمیشە ترسی ئەوەم بو نەکا ئەمانۆم لەدەست بفرێنن، بیکوژن و لەناوی بەرن. لەوەلآمی پرسیارەکەی دەستیم گرت و ماچم کرد وتم:

تۆ کەباش دەزانی بەناچاری بەژیان لەگەڵ ئەو چوارکچە رازیبووم.

ئەمانۆ بەپەنجە ناسکەکانی خۆی نوقوچکی لەرانم گرت و بەتووندی فشاریدا و لەکاتێکدا دیانەکانی لەیەك گیر دەکرد لەوەلآمدا وتی:

بەڵێ...... دەزانم...... بەلآم ئەوانیش ناشرین نەبوون.... تۆش لەژن تێر نابیت.... ئەگەر هەموو دنیا ژن بێت و هەمووی بە تۆ ببەخشن، چاوت بەدوای سووچێکی تری دنیا دەگەرێت کە رەنگە لەوێش ژنانی تریش هەبن و داگیریان کەیت.

بزەیەکم لێداو وتم.

بەهەڵەدا چوویت.... لەوکاتەوەی تۆم بینیوە لەژنانی تر بێزاربووم.

ئەمانۆ وەك دادوەرێکی کارزان کە لەنهێنیەکانی دڵم بەئاگا بێت وتی:

درۆ دەکەیت..... من شەو تابەیانی ئاگاداری تۆ بووم.....

بەنارەحەت پرسیم:

تۆ چاودێری منت دەکرد.....؟

بەخوێنساردی وتی:

بەڵێ........ زۆر سەیرە....؟ تا بەیانی لەپشت ژوورەکەدا دانیشتبووم.

سەرەتا ئەو کچە ناسك ئەندامە هاتە لای تۆ و دواتر ئەوەی قژەکانی وەك سەوەتە دەچنێت و دواتر سێیەمی و و چوارمی......

رەنگم پەڕا، دڵم دەلەرزی. لەسەرەتای کار کاتێك ئەمانۆ زانی چوار ژنم هەیە نارەزایی نشان نەدا تادواین ساتیش خوێنساردبو. لەکاتێکدا من پێچەوانەی ئەوەم چاوەڕوان دەکرد و چونکە دەمزانی ئەمانۆ زیاد لەرادە حەسوودە، چاوەڕێی روداوە مەترسیدارەکان بووم. ئێستا شتێکی تری دەوت تازە ئەو کات زانیم ئەمانۆ تووڕەی خۆی بەکارامەی دادەشارێت و بەڵام لەبەر حەسوودی تا بەیانی دادەنیشێت و سەیری کردەوەکانی ئێمەی دەکرد. راستی کە ژن بوونەوەرێکی نامۆیە....! ژن، ژنە، چ سپی، چ ڕەش..... ژن حەسوودە چ وەحشی چ پێشکەوتو. بەهەرحاڵ رۆحی ژن لەهەر جەستەیەکی تردا بێت، یەکێکە.

ئەمانۆ هەمو شتێکی بینیبوو. چۆن دەمتوانی حاشای لێبکەم. لەناڕەحەتیدا دەلەرزیم و لێوم بەدیان دەگەست. هیچ وەڵامێکم نەبو.

بەخۆشحاڵیەوە خۆی بێدەنگی شکاند و وتی:

ئێستا تۆ سزادەدەم...... دەزانی سزاکەت چیە؟

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم: سزاکەم چیە......؟

دەستمی بەرداو پاڵی بەقەفەسەکەوە دا و وتی:

سزای تۆ ئەوەیە دانیشیت و عەشق بازی من لەگەڵ پیاوێکی بێگانەدا ببینیت. یەکێك لەم شەوانە گەنجێك دەدۆزمەوە و دەیبەمە لای خۆم ئەوکات تۆ دەبێت دانیشیت و بناڵێنیت و سەیری عەشقبازی من بکەیت چۆنە؟

بەخوێنساردی و تووڕەیی و ناڕەحەتی خۆم داشاردو وتم:

تۆ هیچ کات ئەم کارە ناکەیت..... دڵنیام !

ئەمانۆ بەدەنگێك کە لەگریان دەلەرزی وتی:

سوێند بەخوای جەنگەڵ ئەم کارە دەکەم و دواتر خۆم دەکوژم تا تۆ زیاتر رەنج ببەیت چونکە دەزانم منت خۆش دەوێت و لەمردنی من ناڕەحەت و گریان دەبیت.

لەسوێندێك کە ئەمانۆ خواردی، دەلەرزیم. خوێن لەدەمارەکانمدا مەیی، ناوچاوم ئارەقی کردەوە، بەڵام دەرفەتی قسەکردنم نەبو چونکە لەم کاتەدا شائکی وتی:

خێراکەن..... قووڵایی ئاو کەمە..... بپەڕنە ناو ئاو.

سەرەتا خۆی پەڕیە ناو ئاو و بەرهەدوو دەست قەفەسەكی گرت و دواتر شووما سیلاحەكانی گرت و ڕۆشتە وشكایی. ئەوسات من ئەمانۆم لەسەر دوو دەست بەرزكردەوەو پەڕیمە ناو ئاوەكە. شائكی قەفەسەكەی رەهاكرد و ئاو وەك ئەژدیها قووتی داو شاردیەوە.

كەم كەم قاچم لەئاو هاتەدەر. ئەمانۆ سەری لەسەر شانم دانابو. هەناسكە هەناسكی بوو. دیاربو زۆر ناڕەحەتە. بەهێواشی كوڵمیم ماچ كردو وتم:

ئەمانۆ كاتێك سویندت خوارد باوەڕم كرد بەڕاستی ئەو كارە دەكەیت ! تۆ ژنێكی حەسوودیت وەك ئاگر سووتێنەریت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆشم دەوێیت.

لێرەی قسەكەمدا گەشتینە بەستێن. من دەبوا لەسەر زەوی دامنایە، وتم:

سوێند دەخۆم لەمەودوا خۆشەویستیم بۆ هیچ ژنێكی تر جگە لەتۆ نەبێت. تۆش رازی بەو لەو بڕیارەی گرتووتە پاشگەز ببەرەوە.

ئەمانۆ سەری هێنایە سەرو دیانی لەگەردنم نزیك كردەوەو گازێكی وای لە گۆشتی گەردنم گرت كە لەتاو ئازار و سووتانەوە دەمویست بقیژێنم. دەمم كرایەوە بەڵام ئەمانۆ بەدەست دەمی گرتم و دواتر شوێنی گازەكەی خۆی ماچ كردو وتی:

تۆ درۆم لەگەڵ دەكەیت، تۆ پیاوێكی هەوەس بازیت و لەژنانی جوان ناتوانیت چاو بپۆشیت.

وتم: تاكاتێك تۆم نەبینیبو هەركاتێك ژنێكم دەدی ئەگەر كەمێك جوان بوویایە سست دەبوم بەڵام لەو رۆژەوە باوەڕبكە جگە لەتۆ كەسم خۆش نەویستووە و بۆ سەلماندنی قسەكانم تۆ دەبەم بۆ شارو وڵاتی خۆم.

لەناكاو لەباوەشم هاتەخوارو وتی:

چیت وت. مەگەر دەتەوێت بڕۆیت؟

چارەیەكم جگە لەوتنی راستی نەبو. ناچار درێژەم دا.

تەنیا چاوەڕێی دۆزینەوەی یوریم. ئەگەر ئەمڕۆ بیدۆزینەوە بەیانی بەڕێدەكەوم.

جاری پێشوو دەمویست مووناك و منالەكەم ببەم بەڵام ئەوان كوژران. بەڵام تۆ جێگەی ئەوانت گرتۆتەوە. من تۆ لەگەڵ خۆم دەبەم. سوار ئەسپت دەكەم جل و بەرگی هەوریشمی جوانت لەبەردەكەم. بە شەمەندەفەرو فرۆكە گەشت دەكەین.

ئەو لەبارەی فرۆكە و شەمەندەفەر پرسیاری كردو منیش بەوردی ئەوەی بۆ منالێك لەدنیای جن و حۆری قسەدەكات، قسەم كردو باسم كرد.

باوەڕی نەدەکرد مرۆڤ لەسەر شتێك دانیشێت و لەئاسماندا هەڵفرێت. ئەوەندە باسی دنیای پێشکەوتوم بۆکرد کەشەیدای بوو. لەبڕیاری پێشووی خۆی پاشگەز بوویەوە بەڵام وتی:

بەیەك مەرج لەهاوبەشی پیاوێکی بێگانە چاو دەپۆشم و لەگەڵ تۆدا دێم و سواری مەلی پۆلایین دەبم.

پرسیم: چ مەرجێك؟

بیری کردەوەو وتی:

بەمەرجی ئەوەی ئەگەر لئۆنات بینی بەدەستی خۆت بیخنکێنیت و سەری ببڕیت....

تەنیا بەم مەرجە بۆ هەمیشە دەبمە هۆی تۆ.

من پیاو کوژ نەبووم. نەمدەوێرا سەری کەس ببرم، ئەویش سەری ژنێك. دوای کوژرانی مووناك و منداڵەکەم سوێندم خوارد لئۆنا بکوژم بەڵام نەك بەدەستی خۆم.

بۆیە لەوەڵامی ئەمانۆدا وتم:

وامدەزانی پێشنیاری گەورەترت هەیە. کوشتنی لئۆنا لەکارەکانی داهاتووی منە.... ئەو دەکوژم دڵنیابە. لەشادیدا دەستی لەروخسارم ئاڵقە کرد وچەند جارێك روخساری ماچ کردم. هەوا کەم کەم روون دەبوویەوە. ئێمە هیلاك بووین. شائکی لە رووناکی بەرەبەیان سەیرێکی دەوروبەری کردو وتی:

لەسەرە رێگای یووچیەکان هۆزی جۆراوجۆر هەن، رەنگە پەنجا هۆز یان زیاترە ئێستا نازانم کام هۆزی یوچیەکان لەم دەوروبەرەدا دەژین بەهەرحاڵ دەبێت لێرە دووربکەوینەوە.

پێم وت:

ئەمڕۆ دەبێت بحەسێینەوە، دوێ شەو تابەیانی بەئاگا بووین و لەئەگەری مەترسی ناتوانین بەرگری بکەین. شائکی کە دەتوت خۆشی پێویستی بەخەوە وتی:

زۆر باشە.... کەواتە دەبێت بڕۆینە کێو.... لێرەدا لەئەماندانین.

بەدوای ئەم وتوێژە بەرەو کوێستانی سەر سەوز کە لەلای چەپماندا جێگیربو، بەرێکەوتین.....

تازە هەتاو هەڵاتبو کە کەوتینە سەرو لێژی و کاتژمێرێك دواتر گەشتینە بەرزایی و وەستاین. من و شائکی و ئەمانۆ دانیشتین و سەیری جەنگەڵمان دەکرد کە لەژێر پێماندا بو. شووما یەکێك لە تفەنگەکانی هەڵگرت و بەرەو لای راست رۆشت. من هەستم

پێنەکرد. ئەگەر دەمبینی ڕێگەم لێ دەگرت. شووما لەم بێ ئاگاییەی من کەڵکی وەرگرت و ڕۆشت.

کاتژمێرێك دواتر کاتێك لەسێبەری دارەکاندا باوێشکمان لێ دەدا، دەنگی گوولە بەرز بوویەوە. گوولە لە کوێستان دەنگێکی ترس ئەنگێزی دروست کرد. شڵەژاو بەرز بوومەوە چونکە ئەگەر دەنگی گوولە بەگوێی یوچپیەکان دەگەشت کە لەو دەوروبەرەدابوون، کارمان تەواو بوو. شائکی بەرزبوویەوە و رامکرد. هێشتا دوو سێ هەنگاو دوورنەکەوتبوویەوە کە لەناکاو لەپشت تاشەبەردێك، کەڵەکێویەك هیلاك و خوێناوی دەرکەوت و هێرشی کردە سەر شائکی. ئەگەر کەڵەکێوی دەگەشتە شائکی بەشاخی خۆی سکی هەڵدەدری و لەکێوەکە دەیخستە خوارەوە. بەخۆشحاڵیەوە شائکی خۆی خستە سەر زەوی و بەردێکی بچووکی بەرەو ئاژەڵە خوێناوییەکە هاویشت. کەڵەکیوی لەترسا وەستاو ڕۆشتە دواوە.

من لەم کاتەدا بەگوولەیەك ئەوم خست.

شائکی کە لەمەرگ ڕزگاری بب، هەستاو سەری کەڵەکیوری بڕی. تووڕەو ناڕەحەت بۆ تەمێ کردنی شووما کەبەبێ مۆڵەتی من تەقەی لە کەڵەکێوی پێکابو، ڕۆشتم کەبیدۆزمەوە بەڵام چەند هەنگاو ئەولاتر لەناکاو دەنگی تەقەیەکیتر بەرزبوویەوە و دوای ئەوەی دەنگی چەند تەقە لەولاوە بیسترا. لەیەك خولەکدا کوێستان بو بەگۆڕەپانی شەڕ و بەردەوام لەهەردولاوە تەقەکرا. دەمزانی کە شووما لەم لاوە تەقەدەکات بەڵام دیار نەبو کێ لەولاوە بۆ کوشتنی ئەو مناڵە تەقەدەکات. لەپشت بەردەکانەوە خۆم گەیاندە شووما.

ئەو خۆی لەپشت بەردێك داشاردبو و وەك یەکێك لەڕێگرەکانی تەکساس تەقەی دەکرد.

کاتێك منی بینی بەدەنگی بەرز وتی: خۆتان داشارن، تەقەتان لێ دەکەن.

بەدوای مندا شائکی بەڕەشاشەوە هات و هەرسێکمان لەپشت بەردەکە چاوڕێ ماینەوە. دەستورم دا تەقە نەکەن تا شوێنی تەقەکردن لەلای کێو دیاری بکرێت.

بەشوومام وت: تۆ ئەگەر تەقەت لە کەڵەکێوی نەدەکرد ئەم ڕووداوە دروست نەدەبو.

شووما کە هەستی بەتووڕەیی من کردبو بەپاڕانەوە وتی:

باوەڕ بکەن من تەقەم لەکەڵەکێوی نەکرد.... لەولاوە تەقەکراو کەڵەکێوی نزیك بو منیش هەڵداتە خوارەوە. هێشتا وتوێژی ئێمە لەمبارەوە درێژەی بو کە دەنگێك لەپشت

بەردەکەی ئەولاوە هات کەوتی: بوەستن...... هاتم...... من یوریم.

دەست بەجێ هەیکەلی یوریم بینی کە پەڕییە سەر بەردەکەو دەستی تەکاندا. لە دوورەوە بینیم کە رووتەو خراپتر لەمن هیچی لەبەردا نیە. تەنیا پارچەیەکی بچووک شەرمی خۆی داپۆشیوە.

لەشادمانیدا قیژاندم. شائکی و شووما مەبەستەکەی منیان نەدەزانی و کاتێك یوری بەڕاکردن خۆی بەمن گەیاند و باوەشمان بەیەکدا کرد، بەچاوی کراوەوە سەیریان دەکردین. لەوناوەدا تەنیا ئەمانۆ یوری دەناسی و لەبینینی شادمان بو.

ئێمەش وەك ئەو بووین و جلمان لەبەردانەبو بەڵام یوری لەگەڵ ئێمە جیاواز بو چونکە ئەو وەك وەحشیەکانی لێهاتبوو. بەپارچەیەك کەدیاربو بەشی پشتی کراسە کۆنەکەی بو، سمت و شەرمی خۆی داپۆشیبوو.

ئەوەندە لەبینینی یوری شادمان بووم نەمدەویست و نەمدەتوانی دەست لەملی بکەمەوە. چەند خولەکێك خۆم پێوە هەڵواسی و ماچم دەکردو چاوەکانم پڕببو لەفرمێسکی شادی. ئەویش ئەم حاڵەی بو. بەدەست دەیکێشا بەشان و پشتمدا و بەم شێوە شادمانی دەردەبڕی.

کاتێك ماچ و مووچ تەواو بوو، یوری سەیرێکی سێ هاوڕێ کەی منی کرد بەدەنگێك تێکەڵ بەگاڵتەو پێکەنین وتی:

خراپ نیە سەرۆك، لەشکرێکت بەڕێ خستووە !

من بۆ ئەوەی ڕەزامەندی خۆم لەخزمەتەکانی چەندین ساڵەی یوری دەربڕیبێت لە وەڵامدا وتم:

کەس بۆمن نابێتە یوری.... بەڵام تاڕادەیەك شائکی جێگەی تۆی گرتۆتەوە. دواتر بەپەنجە شائکیم نیشان داو یوریش سەیری کرد و بزەیەکی هێنایە سەر لێو، دواتر شووموام نیشان داو وتم:

ئەم منالەش شوومای ناوە و جارێك بەڕەشاش کە لەجەنگەڵدا ونم کردبو و لەدۆزینەوەی بێ هیوا بووم هێرشی کردە سەر وەحشیەکان و من و شائکی لەمردن رزگارکرد. شتێك کەسەیر دێتە بەرچاو تەنیا یەك جار بەشێوەیەکی سادە چۆنیەتی بەکارهێنانیم بەشێوەیەکی زۆر کورت پێوتوە بەڵام ئەو بەجوانی ڕەشاشی لەدەست گرت و تەقەی کرد و وەحشیەکانی وەك گەڵای دار دەکوشت. بەڕاستی توانایییەکی باشی هەیەو ئەگەر باشی رابهێنرێت پاڵەوانێکی وشیارو پڕ هێز دەردەچێت.

یوری سەیرێکی شوومای کردو وتی:

بەداخەوە دەرفەتمان بۆ راهێنانی نیەو دەبێت بەخێرایی جەنگەڵ بەجێ بێڵین. یوری ئەمانۆی پێشتر بینیبوو و دەیناسی، بۆیە زۆر لەبارەی ئەو قسەمان نەکرد و ئەو چەند خولەکێکیش باسی مەرگی مووناك و کچەکەمی کرد.

لەم ناوەدا شائکی شووما پێستی کەڵەکێویان لێکردەوەو بۆ کەباب کردن ئامادەیان کرد. جیگەیەکی گوونجاویشیان بۆ دانیشتن و حەوانەوە چاك کردو هەر پێنجمان رۆشتینە ئەوێ و دانیشتین.

شووما وەك خزمەتکارێکی کارامە کاری دەکرد. بەڕاکردن چیلکەو گیای وشکی کۆکردەوە. ئەوکات چەند لقێکی داری هێناو سەرەکەیانی تیژ و کوچکاوری دروست کرد و بەدانانی دوو بەرد بەستنی رێگای هەوا، ئاگری کردەوەو دەستی بەکەباب کردن کرد.

بۆنی کەباب ئیشتیامانی بزواند بەتایبەت یوری کەماوەیەکی زۆر گۆشتی نەخواردبوو و تامی کەبابی نەچێشتبوو، وەك پشیلە کە لەدوورەوە گۆشت دەبینێت و هێشتا نەیخواردوە، بەزمانی دەم و لێوی خۆی دەلستەوە، ئاوی دەمی قووت دەداو لەکاتی قسەکردن و بەردەوام سەیری سیخ و کەبابی دەکرد.

لەسەر یەك ئەمانۆ شادمان دەهاتە بەرچاو چونکە بەدۆزینەوەی یوری ئامادەکاریەکان ئامادەو بەشێك لەبەرنامەکان ئەنجامدرابوو. بڕیارماندابو کاتێك یوریمان دۆزیەوە بۆ کوشتنی لئۆناو تۆڵە سەندنەوە لە یوچیەکان هێرش بکەین و لەوێوە بگەڕێنەوەو راستەوخۆ لەجەنگەڵ بڕۆینەدەر.

بە دۆزینەوەی یوری هەموو شتێکمان بۆ روون بوویەوە و ئەمانۆ لەبەرئەمە زیاد لەرادە رێزی لەیوری دەگرت و خۆشی دەویست.

کەباب ئامادە بو. شووما سەرەتا بەشی ئێمەی داو دواتر کەمێکی دابە ئەمانۆ و ئەویتر هەرچی بو خرایە بەردەست شائکی.

ئەو گۆشتی بەتیکەی گەورە دەبڕی و دارەکەی وەك رم تێدەکرد و لەسەر ئاگر رایدەگرت.

بۆ برژاندنی هەرپلێك گۆشت تەنیا دوو سێ خولەکی تەرخان دەکرد. شتێکی زانراوە گۆشتی تازە بەسێ خولەك نابرژێت بەڵام شائکی گوێی بەمە نەدەدا کە گۆشت برژاوە یان نە، هەر ئەوەندەی گەرم دەبو و بۆنی خاوییەکەی دەڕۆشت دیانەکانی دەکەوتە

خوارو خولەکێك دواتر پلە گۆشت کەچارەکە کیلۆیەك کێشی بو، دەڕۆشتە خوار.

نان خواردنی ئەو، بەتایبەت کەبەوشێوە گۆشتی نەبرژاوی دەخوارد سەرسوڕهێنەر بوو، بێ فشە شانکی رانێکی کەڵەکیوری بەتەنیا خوارد و دواتر لەکێو رۆشتەخوارو سەری کردە ناو کانی و وەك ئاژەڵەکان دەستی بەئاو خواردنەوە کردو دووبارە گەڕایەوە. لەم ماوەدا یوری قسەی بۆ دەکردم و وتی:

لێرەو شوێنی ژیانی یوچیەکان دەست پێدەکات.

ئەگەر بیرت بێت جارێکیان یەکێك لەم هۆزە وەحشیانە هێرشیان کردە سەر ئامازۆن و مووناکیان بەدیلی گرت و تۆیشیان بریندارکرد. هۆزێك کە ئەوجارە مووناکیان بەدیلی گرت لەم رەگەزەیە بەڵام لێرەوە دوورن. یوچیەکان رەگەزی رەسەنی ئامازۆنن و بەپێچەوانەی ژنانی ئامازۆن کە رەگەزی تێکەڵیان هەیە، ئەوان دەست لێنەدراوەو رەسەن ماونەتەوە و لەبەرئەمە خووی وەحشیگەری خۆیان وەك سەرەتا پاراستووە سەر ژمێریەکی تەواو بۆ هۆزەکانی یوچی نەکراوە بەڵام شتێك کەشیاوی وردبوونەوەیە ئەوەیە وەك هۆزی پانچۆ، ئاپاچی، پونچی و سەرئەنجام هۆزی ناودار بەهێزی پوچی کا کە دانیشتوانی زۆر و شەڕکەری بێ ئەژماری هەیە. زمانیان یەکێکە و تەنیا زمانی رەسەنی ئامازۆن دەژمێردرێت و لەتێکەڵ بوون لەگەڵ زمانەکانی تر بەدوور بووە.......

قسەکەیم بڕی و وتم:

دەڵێی تۆ لەم ماوەدا سەرقاڵی خوێندن و خوێندنەوەی زانستی مرۆڤ ناسی بویت....؟

یوری وتی:

بەردەکانی ئەم کوێستانە شایەتە کەچەندین شەو و رۆژم لێرەدا گوزەراندوە، بەهەرحاڵ بەهۆی مانەوەی دوورو درێژم لەم ناوچە و ئاشنایی لەگەڵ هەندێ لە هۆزە بێ ئازارەکان ئەم زانیاریەم بەدەست هێناوە.

دووبارە پرسیم:

ئێستا دەبێت چی بکەین؟

یوری کەدەتوت مەبەستی منی لەم پرسیارە وەرگرتووە، وتی:

من لئۆنام دۆزیوەتەوە.... ئەو بۆتە هاوسەری سەرۆکی ئاپاچیەکان و تواناو دەسەڵاتێکی فراوانی بەدەست هێناوە.

بەهۆی وشیاری و لێهاتووی لئۆنا هۆزەکە چەند شەڕێکی نێوخۆیی ئەنجامداوە و

نزیکە هۆزی ئاپاچیەکان جێگەی هۆزی ناوداری پوچی کا بگرێتەوە. ئەگەر ئەو بتوانێت پوچی کا شکەست بدات ماڵیاتی هەموو ئەم ناوچەو باج و خەراجی ساڵیانە کە بەزێر بەراوردەکرێت دەبێتە هی ئەو و لەئەنجامدا لئۆنا دەبێتە شاژنی ئامازۆن.

یوری ئەم قسانەی بەزمانی ئامازۆنی وت، بۆیە ئەمانۆ بەجوانی تێگەشت و گوێی لەهەموو شتێك گرت.

کاتێك سەیری ئەمانۆم کرد بینیم تووڕەیی و حەسادەت و رق شۆڕشێکیان لەناخیدا دروست کردوە و چاوەکانی سوور بووە.

ئەم جارە ئەمانۆ هاتە قسەو لەیوری پرسی:

دەبێت چی بکەین؟ بەباوەڕی من باشترە لەم رێگای کەهاتووین بگەڕێینەوە و بڕۆین بەدوای کاری خۆماندا.

ئەمانۆ تاڕادەیەك خەیاڵی ئاسوودە ببو دڵنیابو لئۆنا ئیتر نایەتە سەر رێگای من چونکە شووی کردوەو مێردی هەیە و ناتوانێت من داگیر بکات و لەوم بستێنێت. لەگەڵ ئەوەشدا حەسوودی ژنانە ئەوی ئازار دەدا چونکە هاوسەری لئۆنا سەرۆکی هۆز ئاپاچیەکان گەنجێکە جوان وئازا وبەخۆشەویسترین گەنجی ئامازۆن دەژمێردرێت.

یوری لەوەلامی قسەکەی ئەمانۆ تەکانێکی بەخۆیدا و وتی:

بەباوەڕی من دەبێت لئۆنا چارە سەربکەین. ئەگەر ئەم ژنە خوێنخۆرو تاوانبارە زیندوو بمێنێت گووناحی تاوان و مرۆڤ کوشتنەکانی داهاتووی لەئەستۆی ئێمەدایە. ئەو بووە هۆی کوشتاری ترس ئەنگێزی ئامازۆن و ئەگەر نەیکوژین و لەخوێنی خۆش ببین، رۆحی کوژراوەکان و بەتایبەت رۆحی مووناك و مناڵەکەی لەعنەتمان لێ دەکەن.

ئەمانۆ وتی:

بەم جۆرە کەباسی دەکەیت بەدەستهێنانی ئەو شتێکی نا ئەگەرەو نەکرانە.

یوری وتی:

بەپێچەوانەوە کارەکە زۆر ئاسان بووە و ئێمە بەیەك کاری سادە و خێرا دەستمان پێی دەگات و سەری لەجەستە جیا دەکەینەوە.

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم:

چۆن......؟ پلانی تۆ چیە؟

یوری ساتێك بێدەنگ بو دواتر درێژەی دا.

وتم کە لەنێوان پوچی کاو ئاپاچیەکان دژایەتی دروست بووە و سەرۆکی ئاپاچیەکان

بەهاندانی لئۆنا دەیەوێت هێرش بکاتە سەر پوچی کا. ئێمە دەبێت بڕۆینە لای سەرۆك هۆزی پوچی کا و لەهێرشی چاوەڕوان کراوی ئاپاچیەکان ئاگاداری بکەینەوە و پێشنیاری هاوکاریان پێ بدەین.

وتم:

رەنگە باوەڕ بەقسەکانمان نەکەن. لەم شێوەشدا روبەڕوی دوژمنێکی تازە دەبینەوە.

یوری پێکەنی و وتی:

ئەگەر سەرنجت دابێت وتم کە پوچی کا لە هەموو هۆزەکانی پوچی گەورەترە و بەدەسەلاتێك هەیەتی لەهۆزەکانی تر باج دەستێنێت. ئەمساڵ ئاپاچیەکان باجی دیاریکراویان نەداوەو لەبەرانبەر رەخنەی ئەوان ژمارەیەك لە پاسەوانانی پوچی کایان گرتووە و کوشتوویانە ئەوانیش لەتۆڵە دا ژمارەیە ئاپاچیان دەستگیرکردوەو سەریان بڕیون.

ئەمە پێشینەیەکی دوژمنایەتیە بەلام پێشینەی تر ئەوەیە کە سەرۆکی هۆزی ئاپاچیەکان بە تەپڵ دەستووری بەتەواوی هۆزەکانی تری پوچی داوە کەلەمەودوا دەبێت ماڵیات لەجیاتی هۆزی پوچیەکان بدرێت بە ئاپاچیەکان. لە راستیدا ئەوان شەڕیان راگەیاندوە و دەبێت تا ئێستا شەڕێکی قورس دەستی پێکردبێت. بەلام پوچی کا تۆقاون و ترساون و ورەی شەڕیان لەدەست داوە. من لەچەند رۆژی پێشو کە لەم کوێستانەدا بووم بیرم دەکردەوە و نەخشەم دادەڕشت و تەنانەت کاتێك تەقەم لەکەڵەکێوی کرد بەخۆمم وت ئەگەر کەڵەکێویم راوکرد دەیبەمە لای هۆزی پوچی کا، بڕیارمبو ئەمڕۆ بەتەنیا بڕۆمە لایان بەلام بەخۆشحاڵیەوە ئێوە هاتن.

باوەڕم بەعەقڵ و وشیاری یوری بوو. ئەم جارەش وەك جارەکانیتر تەسلیمی بووم بەلام ئەمانۆ بەرگری کرد، بەڵگەی دەهێنایەوە و هەوڵی دەدا یوری لەبڕیارەکەی پەشیمان بکاتەوە. بەهەرحاڵ دوای خواردنی کەباب و حەسانەوە هەستام. یوری وتی:

ئێوە لێرەدا بمێننەوە. من و شووما و شائکی بەرەو هۆزی پوچی کا دەڕۆین. شائکی لەدەرەوەی هۆز بەجێ دێڵم و دواتر خۆم و شووما دەڕۆینە ناو هۆز. ئەگەر لەوتوێژەکاندا سەرکەوتنم بەدەست نەهێنا و مەترسی هاتەپێش. گوولەیەك دەتەقەێنم. ئەم تەقە شائکی دەیبیستێت و بەڕاکردن دێت و ئێوە ئاگادار دەکاتەوە.

من بەم پێشنیارە رازی نەبووم بڕیارماندا هەموومان پێکەوە بڕۆین بەلام لەوێ شووما و یوری بڕۆنە لای سەرۆکی هۆز و ئەگەر پێویست بکات شووما هەوڵ و وتوێژەکان

بەئێمە بگەیەنێت.

لەکوێستان ڕۆشتینە خوار. ژمارەمان پێنج کەس بو، دووڕەشاش و تفەنگێك و دەمانچەیەکمان پێبو. ئەگەر شائکی و شووما بەباشی من و یوری بیانتوانیایە تەقەبکەن ئەوەندەمان توانابو بەو سیلاحانە بەرگەی هێرشی هۆزێکی گەورە بگرین.

نزیك ئاوابوونی خۆر گەشتینە سەرەتای جەنگەڵ، شەومان لەسەر دارەکان بەسەر بردو بەرەبەیان بەڕێکەوتین و کاتی هەڵاتنی هەتاو گەشتینە هۆزی پوچی کا.

پوچی کا لەبینینی ژنێکی ئامازۆنی سەریان سوڕمابو. بەگوومانی ئەوەی لئۆنامان لەگەڵدایە بە پەنجە بەیەکیان نشان دەدا. من و یوریشیان بەئامازۆنی دەزانی چونکە ئێمە بەباشی بەزمانی ئەوان قسەمان دەکرد و لەرێگەی قسەکردنەوە جیاکردنەوەی ئێمە دژواربو.

لەناوەڕاستی گۆڕەپانی گەورەی پوچی کا وەستاین. لەدەوروبەری گۆڕەپانی هۆز زیاتر لەسەد ماڵی گەورە دەبینرا کە هەرکام پەیوەست بوون بەماڵێك.

هەر لەوێدا بەراوردێکم کردو گوومانم کرد پوچی کا دەبێت لەنێوان دە تا دوانزە هەزار کەس دانیشتوی هەبێت. ئەم قەربالغیە بۆ شارێك بەسەندەی دەکرد.

یوری و شووما رۆشتن. بڕیاردرا لەئەگەری پێویست شووما خۆی بەئێمە بگەیەنێت و ئاگادارمان بکاتەوە. من و شائکی و ئەمانۆ لەوێدا ماینەوە.

یوری بەلێهاتوویی سەرۆکی هۆزی لەهێرشی ئاپاچیەکان ئاگادارکردەوە و بۆئەو دیمەنی کوشتاری هۆزی ئامازۆن کە بەدەسکیسی لئۆنا ئەنجامی گرتبو، رونیکردەوە وتی:

ئەگەر سست بن سەرۆکی ئاپاچی بەهاندانی ژنە ئامازۆنیەکەی هەمووتان لەتیغی شمشێر دەگوزەرێنێت. سەرۆکی هۆز رەزامەندی بۆ یوری دەربڕی و دەستووریدا میواندارییمان بکەن.

ئەو شەوە لە هۆزی پوچی کا ماینەوە و بەیانی کەدەمانویست بۆ درێژەدانی وتوێژ بڕۆینە ماڵی سەرۆك هۆز، هەواڵیان هێنا کە دووبارە تاقمێك لە پاسەوانەکانی قەراغ رووباریان کوشتووە و فڕیان داونەتە رووبار.

ئەم هەواڵەیان کاتێك هێنا، ئێمە رۆشتبووینە ژوور.

سەرۆکی هۆز لەئێمەی پرسی:

ئێوە چەند کەسن؟

من سەیری سەرە براوەکانم دەکرد کە لەژووری سەرۆك هۆزدا هەلواسرابوون، و لەوەلامدا وتم:

ژمارەمان ئەمەیە کە دەیبینن.

سەرۆك سەری سوڕماو بەدەمی کراوە وتی:

هەر ئەوەندە، ئەی چۆن دەتانەوێت یارمەتیمان بدەن.

لێرەدا یوری هاتە قسە و وتی:

ژمارەمان کەمە بەڵام لەجیاتی ئەوە سیلاحمان پێیە کە لەدوورەوە و لەچەند خولەکێکدا ئاپاچییەکان دەکوژێت و جەستەیان کون کون دەکات.

یوری بەدوای ئەم قسە ڕەشاشەکەی نیشانداو بۆ دڵنیاکردنەوە سەرۆکی هۆز بەتفەنگی دەستی شائکی چەند گۆزەیەکی کەدو کە لەژوورەکە هەڵواسرابوون، کردیە نیشانەو کونی کرد.

سەرۆکی هۆز لەبینینی کاری سەرسوڕهێنەری تفەنگ شادمان بوو دەستوریدا هەرچی زووتر ئامادەکاریەکانی شەڕ بکەن و پیاوە شەڕکەرەکانیش سیلاح بەدەست بگرن و ئامادە بن.

پلانێکی ورد بۆ شەڕ ئامادە کرا و بڕیاردرا سەرەتا پوچی کاکان هێرش بکەن و دواتر لەبەرانبەر دەژە هێرشی ئاپاچیەکان پاشەکشێ بکەن. کاتێك گەشتنە ناوەڕاستی جەنگەڵ ئێمە لەسەر دارەکانەوە بە ڕەشاش هێرشیان بکەینە سەرو لە پێش و دواوە بیانکەینە ئامانجی گوولە.

بەیانی رۆژی سێیەم دەنگی تەپڵەکان بەرزبوویەوەو لەشکری دوو هەزارکەس پوچی کا کەوتەرێ.... گەنجەکان جەستەی خۆیان بەڕەنگی گیایی پڕ نەخش و نیگار کرد. رمە درێژەکانی خۆیان لەدەست گرتبو. تاقمێك بەشمشێری پان، لەوقەمانەی لەهەموو شوێنێکی جەنگەڵی باران پرە و هەیە، چەکدار بوون لەگەڵ ئەوەشدا قەڵغانی پێستی کەرگەدەنیان بو، ژمارەیەك کە تیروکەوانیان پێ بو لەدواوە دەڕۆشتن. ئەمانۆ سوور بوو لەسەر ئەوەی لەگەڵماندا بێت بەڵام تووڕەیی سەرۆکی هۆزی پوچی کا، لەم کارە پاشگەزی کردەوە.

ژنان وکچانی سەرۆك راسپێردرابوون بۆ میوانداری لەئەمانۆ و لەو دوورنەکەونەوە. هەرچی دەویست ئامادەیان دەکرد و هەردەستوورێکی دەدا بەوپەڕی خۆشەویستیەوە جێ بەجێیان دەکرد.

کاتێك دەستەکانی لەملم ئاڵاندبو وەك ماڵئاوایی منی ماچ کرد، ژنانی پوچی کا بەسەرسوڕمانەوە سەیریان دەکرد و هەندێ کاتیش پێدەکەنین.

لەدوایین سات ئەمانۆ وتی:

بیرت نەچێت.... بەڵێنت داوە سەری لئۆنا بەدەستی خۆت بېڕیت، هەوڵبدە لەسەر بەڵێنەکەت بمێنیتەوە.

وتم:

دڵنیابە.

بەڵام نەمتوانی قسەکەی خۆم تەواو بکەم چونکە سەرۆکی هۆز بازوومی گرت و لەگەڵ خۆیدا بردمی. بەم شێوە شەڕمان دەست پێکرد. شەڕێك کە ئەنجامەکەی نادیار بوو. کەس نەیدەزانی چی دەبێت. کاتێك لەگەڵ سەرۆکی هۆزی پوچی کا بەڕێگادا دەڕۆشتم، بیرم لەقسەکانی ئەمانۆو راسپاردەکەی دەکردەوە. یەکەم دیار نەبو لەم شەڕەدا سەردەکەوین و بەشێوەیەك لەم لاولا بیستبووم هاوسەرەکەی لئۆنا بوونەوەرێکی مەترسیدارو سەیربو. لەتواناییەکانی ئەو لە هێرش و پاشەکشێ و کاروباری تر زۆرم بیستبوو بۆیە ترس وەك ژەهێرێکی مەترسیدار دەڕۆشتە ناو دەمارەکانم و کاریگەری لەسەرم بەجێدەهێشت. هێشتا هاوسەرەکەی لئۆنام نەدیبو بەڵام لێی دەترسام. لەهەمان کات کەڕقیم لە دڵدا پەروەردە دەکرد دەمویست بەدەست بەستراوی بیسپێرن بەمن و سەری بەوشێوەی لەمناڵیدا سەری چۆلەکەم هەڵدەکەند، هەڵکەنم و فڕێی بدەم.

لەگەڵ ئەوەشدا دیارنەبو ئەو من دەکوژێت یان من لەشکەست دان و کوشتنی ئەو سەردەکەوم. ترس و ناڕەحەتی نەتەنیا رەخنەی کردبو گیانی من بەڵکو شەڕکەرانی پوچی کایش لەشەڕکەرانی ئاپاچی دەترسان. بیرم کەوتەوە ئەوان کە لەگەڵ ژنان پیاوانی هۆزی ئامازۆن بەوشێوە وەحشیانە مامڵەیان کردبو و ژن مناڵی شیرخۆری بێ تاوانیان رم بەدارەوە دووریبو، لەگەڵ من کەسیلاحم لەدەستدایە و دوژمنی ئەوانم چۆن هەڵس و کەوت دەکەن.

پوچی کاکان دەیانوت لەناو هەموو هۆزەکانی پوچی کا ئاپاچیەکان لەهەموویان وەحشیتر و خوێنخۆرترن.

زۆر باشە، کەواتە دەبێت چاوەڕێی رووداوی خوێناوی بکەین.

ئەمە یەك..... لەلایەکیتر ئەمانۆ داوای لێکردبووم و بەڵێنی لێ سەندبووم لە ئەگەری

سەرکەوتن بەدەستی خۆم سەری لئۆنا ببڕم. ئەمەش بەشێك لەبیرو مێشکی منی بەخۆیەوە سەرقاڵ دەکرد و ئەو ورەم لەخۆمدا نەدەدی سەری لئۆنا ببڕم. نەك لئۆنا بەڵکو توانای سەربرینی هیچ ژنێکی ترم نەبو.

لەگەڵ ئەم ئەندێشە سەیرو ناڕەحەتکەڕانە دەڕۆشتمە پێش. لەرێگادا پوچی کا بەدەستە بچووك و گەورەکان دابەش کران و ڕێگاکانی جەنگەڵیان گرتەبەر. شائکی فەرماندەیی یەکێك لەم دەستانە بو بەڵام دەستوورم بەشوومادا بو لەهۆز ولای ئەمانۆ بمێنێتەوە بەڵام ئەو ئەم جارەش دەستوورەکەی جێ بەجێ نەکردم و لەگەڵ ئەوەی لەهۆز دوورکەوتمەوە و سەیری دواوەم کرد شوومام بەوقیافە داماوەی بینی کە بەدوامەوە دێت. وەستام و بەتووڕەیی پێم وت:

دووبارە هاتیت......

شووماش وەستا، بەڵام وەڵامی منی نەدایەوە. بەنیگای خۆی قسەی لەگەڵ دەکردم. دەتوت دەپاڕێتەوەو دەڵێت:

من لەخۆتان دوورمەکەنەوە. من لەم دنیا گەورە جگە لەتۆ کەسم نیە.

کاتێك سەیری چاوەکانیم دەکرد هەستم بەلاوازی و ناتەوانی دەکرد و سست دەبووم. دڵم بۆی دەسووتا و لەگرتنی هەربڕیارێکی توند پەشیمان دەبوومەوە. ئەم جارەش رازی بووم لەگەڵما بێت. یوری لەپێش شەڕکەرانەوە دەڕۆشت. یوری بوونەوەرێکی سەیرو تایبەت بوو لەهەمووکاتەکاندا ئازایانە هەڵس و کەوتی دەکرد. لێی بێ ئاگابووم تەنیا ئەوەندەم دەزانی لەپێش شەڕکەرانی پوچی کاوەیە و نەخشەی هێرش کردنەکەش ئەو دایڕشتووە.

تاقمێك لەباشترین شەڕکەرانی هۆزی پوچی کا کەبەرم و قەمەی تیژ چەکدار بوون پارێزگاریان لەسەرۆکی خۆیان دەکرد. دەوری ئەویان گرتبوو و لەچاو دووریان نەدەکردەوە. منیش لە ژێر چاودێریدا بووم چونکە لەگەڵ سەرۆکی هۆزی پوچی کا دەڕۆشتم.

یەکێك لە لقەکانی ڕووباری ئامازۆن لەبەرانبەرماندابو بەڵام چونکە لەناوەڕاستی جەنگەڵ و لەشوێنێکی بێ هەتاو تێپەڕدەبو، ئەستێلکێکی مەترسیدار دروست کردبوو و بۆگەشتن بەوبەری ئاو دەبوا لەو ئەستێڵکە تێپەڕببین. هەڵبەت ڕێگایەکەی تریش بۆ تێپەڕبوون هەبو بەڵام دوور و درێژبوو. دەستەیەك لەوێوە ڕۆشتن بەڵام ئەوانیتر کە من و سەرۆك هۆزیشیان لەگەڵدا بووین دەبوا لەم ڕێگاوە تێپەڕین. کاتێك گەشتینە لای

ئەستێك، پیاوەکانی سەرۆك هۆز هەموو شتێکیان ڕێکخست و ژمارەیەك داریان بڕیەوەو ئامادەیان کرد.

پێش گەشتنی ئێمە زۆربەیان پەڕیبوونەوە. وەك باس دەکرا تەنیا یەك کەس ببوە خواردنی کرۆکۆدیلەکان و تیکە تیکە ببوو. سەرۆکی هۆز لەسەر لقی دارێك بەشێوەیەکی تایبەت دانیشت. من و شووماش لەسەر دارێکی تر. بەدوای ئێمە و لەپێش ئێمەش ژمارەیەك بەهەمان شێوە بەڕێکەوتن. شێوەی دانیشتنیان لەسەر دارەکە فێر کردین و پێشنیاریان کرد ئەگەر سووچێکی پەنجەی قاچمان بگاتە ئاو کرۆکۆدیلەکان کاری خۆیان دەکەن و مرۆڤ دەبەنە ناو ئاو. ناچار منیش وەك کەسانیتر ئەژنۆم گرت و ڕەشاشەکەم لەمل هەڵواسی. قەدی دارەکان دەڕۆشتەپێش کەلەناکاو هێرشی کرۆکۆدیلەکان دەستی پێکرد.

ئاو لەکرۆکۆدیلەکان داپۆشراو ئەو ئاژەڵەخوێن خۆرو دڕندانە، دەمی کراوەو ترس ئەنگێزی خۆیان کردەوەو پەلاماریان داین.

شووما بەدارەکەی خۆی لێی دەدان بەڵام دار نەیدەتوانی بیانتۆقێنێت. یەکێك لەکرۆکۆدیلەکان لەبەرانبەر قەدی ئەو دارەی ئێمە لەسەری سواربووین، سووڕی خواردو بەکلکە درێژو قورسەکەی خۆی بەشێوەیەکی وا کێشای بەقولاپەی ڕەشەکەی هاوڕێمان کەقیژاندی و هاوسەنگی خۆی لەدەست دا. بەخۆشحاڵیەوە ئەو دارێکی درێژی لەدەستدابو کەدارەکەی پێ دەبردە پێش یانی دارەکەی لەقووڵایی ئاوەکە ڕۆدەکردو دارەکەی دەبردە پێش. ئەو دارە بووە هۆی پاراستنی گیانی و ڕەشی ئاماژەپێدراو هاوسەنگی خۆی ڕاگرت و دووبارە لەشوێنەکەی خۆیدا جێگیربو.

ڕەشاشەکەم لەملم کردەوەو میلم هێنایەوە کە تەقە لە کرۆکۆدیلەکە بکەم چونکە دڵنیابووم بۆ گرتنمان دێتەوەو هێرشەکەی خۆی دەست پێدەکاتەوە.

بۆ دۆزینەوەی ئەو ئاژەڵە کە ڕەنگێکی قاوەیی تێری هەبو سەیری کۆمەڵی کرۆکۆدیلەکانم کرد کەلەناکاو قیژەیەکی دڵتەزێن بەرزبوویەوە. کاتێك ئاوڕم دایەوە، ڕووبەڕووی دیمەنێکی زۆر بێزارکەڕ بوومەوە. کرۆکۆدیلەکان یەکێك لەڕەش پێستەکانی سەرۆکیان بەهەمان فێڵ خستە ناو ئاوەکەو گرتیان.

ئەو نەیقیژاند چونکە لەگەڵ ئەوەی کەوتە ناو ئاوەکە کاسە سەری کەوتە ناودەمی تمساحێك و لەشانەکانی جیابوویەوە بەڵکو سەرۆکی هۆز کەلەناوەڕاستی ئاوەکە سەرگەردان بو قیژاندی.

تمساحەکان هێرشیان بردە سەر ئەودارەی کەسەرۆکی هۆزی لەسەر بوو هەوڵیان دەدا وەریبگێڕن و دانیشتووەکەی بخۆن.

سەرۆکی هۆز بەتەواوی ترسابوو و ڕەشەکانیتر نەیاندەتوانی تمساحەکان لای دارەکە دووربکەنەوەو لەگەڵ ئەوەشدا نەیاندەوێرا بپەڕنە سەردارەکە و دارکە لەئاودا بجووڵێنن و بیبەنەپێش.

لەڕەشە بەخت هەڵگەڕاوەکەی تر شوێنەوارێك نەمایەوە. تەنیا کەمێك خوێن لەسەر ئاوەکە دەرکەوت و زۆر بەخێرایی لەناوچوو.

یەکێك لەتمساحەکان بەدەمی کراوە و پۆزە درێژەکەی خۆی هەوڵی دەدا بیجووڵێنێت و تاڕادەیەکیش لەکارەکەی خۆیدا سەرکەوت کەمن دەستم لەگیان شۆردو خۆم خستە ناومەترسیەوە.

راستیتان بوێت من لەسەر عەقڵی تەندروست بەئەنجامدانی ئەم کارە هەڵنەستام. تەنانەت یوریش بەو هەمو چاونەترسیەی خۆی بێدەنگ دادەنیشت و خۆی تێوەر نەدەدا. بەڵام من...... نازانم چی بو کەخوێن لەدەمارەکانم هاتە جۆش و لەشوێنەکەم هەستام.

شووما بەپاڕانەوە وتی:

چی دەکەن، بۆکوێ دەڕۆن؟

وەڵامم نەدایەوەو بەجارێك پەڕیمە سەردارەکەی سەرۆك کەیەك مەتر لەئێمەوە دووربو. دووری دوو دارەکە زۆر نەبو، بەڵام چونکە شیاوبوون بۆ تلان، ترسی مردنی لێدەکرا.

بەهەرحاڵ من ئەم کارەم کرد و بەخۆشحاڵیەوە توانیم هاوسەنگی خۆم و دارەکە رابگرم. هەمان کرۆکۆدیل کە دارەکەی گرتبو بەپۆزە درێژەکەی پەلاماری قولاپەی دام.

لێرەدا بو کە لەناکاو زەربەیەك درا بەپۆزی تمساحەکە کە بەهەموو هێزی خۆی سووڕی خوارد و رۆشتە ناو ئاوەکە. شووما بەداردەستەکەی خۆی کێشای بەپۆزی کرۆکۆدیلەکە. کاتێك سەیرم کرد لەترسا لەئارەقدا خوسابو، دڵۆپە گەورەکانی ئارەق لەسەر پێستی بریقەی ئەدایەوە.

هێرشی کرۆکۆدیلەکان بەردەوام بو. یەك لەدوای یەك هێرشیان دەکردە سەرمن و سەرۆکی هۆز، هێرشی ئەوان بەردەوام بو، تەنیا ئەم دارە بێ جووڵە وەستابو و ئەوانیتر بە دەوریدا دەسووڕانەوە کە گیرۆدەی چارەنوسی ئێمە نەبن.

زۆر خێرا دەمتوانی لەڕەشاشەکەم کەڵك وەرگرم بەڵام دەزانن بۆ ئەم کارەم نەکرد چونکە لەوێوە تا هۆزی ئاپاچیەکان ئەوەندە دوور نەبو و ئەگەر تەقەم بکردایە لئۆنا هەستی بەمەترسی دەکرد و هاوسەرکەشی ئاگادار دەکردەوە. هەرچەندە سەرئەنجام ئەم رووداوە رویداو لئۆنا دەنگی تەقەکانی بیست.

دواتر لەمبارەوە قسە دەکرێت. بارودۆخەکە زیاد لەرادە مەترسیدار ببوو. سەرۆکی هۆز لەترسا نزیك بوو دڵی داکەوێت و من کەحاڵی بێزارکەری ئەوم بینی ناچار پەنجەم لەسەر پەلەپتکە داناو تەقەم کرد.

یەك یەك گوولەکانم دەتەقاند و هەرتمساحێك کەدەمی دەکردەوە، گوولەیەکم لەپۆز یان قورگە سووڕ رەنگەکەی دەداو لەقووڵایی ئاودا نوقم دەکرد.

بەخێرایی چەند تمساحێك کوژران و سەرۆکی هۆز لەهەمان کات کەلەدەنگی گوولەی ڕەشاش ترسا بو، هەناسەیەکی بەئاسوودەیی هەڵکێشا. یەك لەڕەشەکان دارێکی بۆ درێژکردم. دارەکەم وەرگرت. بەندی ڕەشاشەکەم کردە ملم و دارەکەم جووڵاند.

کاتێك ئێمەش چووینە ریزی ئەوانیتر و تمساحەکانمان بەجێ هێشت. دەنگی قیژەی شادی لەوەحشیەکانی پوچی کا بەرزبوویەوە، هەموویان هەلهەلەیان لێ دەداو دەستیان بەنیشانەی شادی تەکان دەدا چونکە سەرۆکە خۆشەویستەکەیان لەمەرگ رزگاری ببوو.

سەرئەنجام گەشتینە ئەوبەر ئاو و دابەزین. سەرۆکی هۆز لەشادیدا خۆی خستە سەرقاچی من. ژێر بازوویم گرت و بەرزم کردەوە. ئەو ماچی دەکردم، دەستمی لێسایەوە، شادی دەکرد و نەیدەزانی چۆن سوپاسی من بکات.

لەوکاتژمێرەو من و سیلاحەکەم خۆشەویست بووین و زیاد لەرادە رێزیان لێ دەگرتین.

تازە کەمێك لەئەستێلك دوور کەوتبووینەوە کەلەناکاو چەند لەوەحشیەکان پەڕێشان و ترساو خۆیان گەیاندە لای سەرۆك و وتیان:

پێشرەوەکان بەتەپڵ خەبەریان داوە کە ئاپاچیەکان بەشپرزەیی خۆیان بۆ شەڕ ئامادەکردو رێگاکانی جەنگەڵیان بەستووە. من لەزمانی ئەوان نەدەگەشتم. شووما بۆی وەرگێڕامەوە و بەزمانی ئامازۆنی لەوەی حاڵی ببو، منی ئاگادار کردەوە. سەرۆکی هۆز تووڕە هەندێ شتی وت و بەدەست چەندین نیشانەی نیشاندا.

شووما وتی:

سەرۆکی هۆز باوەڕی وایە کە کەسێك خیانەتی لێکردووین و پێشتر ئاپاچیەکانی

لەهێرشی ئەمان ئاگادار کردۆتەوە. خێرا هەستم بەڕاستی کارەکەکرد و دەستورم بەشوومادا وتەکانم بۆ سەرۆکی هۆز وەربگێرێتەوە..... پێم وت:

کەس خیانەتی نەکردوە، بەڵکو لئۆنا هاوسەری سەرۆکی ئاپاچیەکان دەنگی سیلاحەکەی ئێمە بیستووە و هاوسەرەکەی ئاگادار کردۆتەوە.

بەم روونکردنەوە سەرۆکی هۆز ئارام بوویەوە و چرچ و لۆچەکانی روخساری کرایەوە. بەخێرایی دانیشت و هەندێ شتی وت کەنەمزانی چی دەڵێت.

کەسانێك کە هەواڵیان هێنابو بەپەلە رۆشتن و چەند کاتژمێرێك دواتر چەند کەسێك بەشێوەی نارێك و پێك، هەرکام بەماوەی پێنج خولەك جیا لەیەکتر هاتن و بەشێوەیەکی نیو بازنە لەبەرانبەر سەرۆکی هۆز دانیشتن.

خێرا تێگەشتم کە دانیشتنێکیان بۆ راوێژکردن سازداوە.

هێشتا وتوێژی ئەوان درێژەی بو کەیوری بەهەڵەداوان خۆی گەیاندە ئەوێ. بەبێ ئەوەی قسەم لەگەڵ بکات لای ئەوان دانیشت و لەوتوێژەکاندا بەشداری کرد.

شووما بەخێرایی قسەکانی وەردەگێڕایەوە. دیار بو کارگەشتۆتە شوێنی مەترسیدار، دەستەیەکی شەڕکەران گەمارۆدرا بوون و رێگاکان بەجۆرێك بەسترابوون کە تێپەڕین ئەوان ئەگەری نەبو چ بگات بەهەزار یان دوو ڕەشی چەکدار.

یوری پێشنیاری کرد. لەسەر پێشنیارەکەی ئەو راوێژ کراو هەموویان ڕەزامەندیان نیشاندا. دەست بەجێ هەموومان هەستان. یوری بەمنی وت:

ئێوە کارەکەتان شێواند. سزاکەتان ئەوەیە لەگەڵ مندابێن. پرسیم:

ئێستا دەبێت چی بکەین؟

هیچ. ئەوان بۆ روبەڕو بوونەوە و شەڕی دەستەو یەخە دەڕۆن . بەڵام ئەمڕۆ و ئەم شەو شەڕناکەن تا ئێمە لەرێگایەکی ترەوە خۆمان بگەیەنینە پشت سەری ئاپاچیەکان. بڕیارماندا هەرکاتێك دەنگی ڕەشاشەکانی ئێمە بەرزبوویەوە ئەوان هێرش دەست پێبکەن.

سەرۆك لەگەڵ پیاوەکانی خۆی رۆشت. تەنیا تاقمێك لەڕەشەکان کە زیاتر لە سی کەس دەبوون لەگەڵ ئێمەدا هاتن.

رێگاکەمان لەقەراغ ئەو نەستێلکە مەترسیدارەوە تێدەپەڕی و لەناو جەنگەڵە مەترسیدارو دەست لێ نەدراوەکان دەگوزەرا.

من و یوری لەپێش و شووما لەپشت سەرمان و ڕەشەکانیتر بەدواماندا دەهاتن.

ماوەیەکی رێگا بەبێ رووداو تێپەڕی. لەشوێنێك لەجەنگەڵ یەکێك لەڕەشەکان بەڕاکردن خۆی بەمن گەیاند و وتی:

لەم رێگاوە مەڕۆن مەترسیدارە.

بۆ سەلماندنی قسەکەی خۆی پێستی دارەکانی نیشانداو رۆشتەدواوە.

من نەمدەتوانی بەزمانی ئەوان قسە بکەم. بەڵام یوری هۆکارەکەی پرسی.

ڕەش ئاماژە پێدراو وتی:

ئێرە ناوچەی مێرووڵە مرۆڤ خۆرەکانە. سەیرکەن چۆن پێستی دارە شیرینەکان دەخۆن وشکی دەکەن. ئەگەر هێرش بکەنە سەرمان لەچەند خولەکێکدا تەنیا ئێسکمان دەمێنێتەوە.

مەڕۆن.... رێگاکە خوارکەن و دەوری ئەم ناوچە بدەنەوە.

یوری شێت شانەکانی بەرزکردەوەو وتی:

مێرووڵە ترسی نیە...... وەرن.

ڕەشەکان لەفەرمانی بردنی ئێمە خۆیان بەدوور گرت و لەشوێنەکەی خۆیاندا مانەوە. یوری پێدادەگرت و ئەوان حاشایان دەکرد. سەرئەنجام بڕیاردرا ئەوان لەناو جۆگەی ئاوەکەوە بڕۆن و ئێمە لەناو ناوچەی مێرووڵە سووڕەکان کەتەنیا لەئاو ئاگر دەترسن. ڕەشەکان کە ئەزمونیان بوو لەناو جۆگەی ئاوەکە درێژەیان بەپێشرەوی خۆیان دا و ئێمەیان لەحاڵی خۆماندا بەجێ هێشت. نیو کاتژمێر دواتر روبەوری دیمەنێکی سەیر بوومەوە....... دیمەنێك کە تا ئەو رۆژە نەمدیبو. سەرەتا وام دەزانی لەبەر هیلاکی زیاد لەرادە دنیا لەبەرچاومدا سووڕ بووە بەڵام قیژەی شووما وشیاری کردمەوە. ئەو خێراتر لەمن هەستی بەهێرشی مێرووڵە سوڕەکان کردبو، قیژاندی و منی ئاگادار کردەوە. یوری لەلای چەپی ئێمەوە دەڕۆشت و نزیکەی بیست مەتر لەئێمەوە دووربو. دەتوت زەوی سووڕ لە قەدی هەرکام کەمتر لەپێنج سانتیمەتر و گەورەتر لەدەسانتیمەتر نەبوو، دەهاتنە پێش و هەرشتێکیان لەسەر رێگای خۆیان بدیایە لەناویان دەبرد. لقی دارەکانیان دەشکاندو دەرژاند.

گیا وشکەکان ورد دەبوون و دەنگیان لێوە دەهات.

قیژەی شووما منی بەئاگا هێنایەوە. ئەو مناڵە لەکاتێکدا دەنگی دەلەرزی وتی:

رابکەن...... رابکەن..... بەم لادا.

لەترسا کۆنترۆڵی خۆم لەدەست دابو، بەڵام شووما بەدارێك کە لەپشتمی دا، منی

بەئاگا هێنایەوە. کاتێك هەستم بەمەترسی کرد کەیەکەم ریزی مێرووولەکان گەشتبوونە ژێر قاچم.

دارەکەی شووما ئازارێکی سەیری لەپشتمدا دروست کرد بەڵام لەترسی مێرووولەکان ئازاری پشتم لەبیرکرد. مێرووولەکان خێرایەکی سەیرو سەرسوڕهێنەریان هەبو، نازانم رەنگە لە سەرێگای من لەزەوی هەڵەقولاًن و دەردەکەوتن. بەهەرحاڵ وەك ئاژەڵە تیژ پێ کان بۆ هەرشوێنێك دەڕۆشتم خۆم لە ناو مێرووولە سوورەکاندا دەبینەوە. ترس وەك ئاگرێکی بەتین لەدەمارەکانمدا دروست بوو نەمدەزانی دەبێت چی بکەم و چۆن لەم گێژاوە مەترسیدارە رزگارم بێت. بیری رۆشتنە سەردار و خۆشاردنەوە لەناو لقەکان بێ هۆ بو.

تەنیا شوێنێك دەمتوانی لە زیانی مێرووولەکان پارێزراوو بووم لەئاوی جۆگەکەدا بو بەڵام بەداخەوە ئاوی رووبار ئەوەندە زۆر نەبو من بگرێتەوە و دام شارێت. ئاو تا ژێر ئەژنۆم دەگەشت نەمدەتوانی خۆمی تیا حەشاربدەم. بەهەرحاڵ رامدەکردو مێرووولەکانم دەشێلا، کاتێك قاچم لەسەریان دادەنا دەتوت شوشە لەژێر قاچمدا وورد دەبێت و دەشکێت، راکردن نەیدەتوانی گیانم بپارێزێت. ژمارەی هێرشەبەران ئەوەندە زۆربوو کە بە کوژرانی چەند دانەیەك دەورووبەرم چۆڵ نەدەبو.

مێرووولەکان هێرشیان دەکردو شاخ و دوو شەویلاگی بەهێزی ئەوان گۆشتی جەستەمی دەرووشاند و ئازاری دەدام. کاتێك گەشتمە چەند هەنگاوی جۆگەی ئاوەکە، لەناکاو ئازارێکی بەهێزم لەقولاپەی پێمدا هەست پێکرد و ناچار دانیشتم. ئەم ئازارە لەگازی مێرووولەکانەوە دروست بوو. ئەوەندە بەهێز بوو تواناییمی بەتەواوی لەناوبردو ناچار دانیشتم.

دانشتن یەك و هێرشی مێرووولەکان یەکێك.... نەمزانی چی بوو، تەنیا دەنگی قیژەی شوومام بیست کە وتی:

یوری....... یوری........ سەرۆکیان خوارد.

ئەمە دوایین دەنگێك بو کەبیستم و بێهۆش بووم. شووما لەگەڵ ئەوەی کاری منی بەتەواوبوو دەبینی دەستی لەچالاکی هەڵنەگرت. یوریش یارمەتی داو هەردووکیان دەستیان بەئاو پرژاندن بەسەر روخساری من کرد. ئاو تەنیا شتێك بوو دەیتوانی من ڕزگارم بکات و شووما بەوشیاری خۆی باشترین رێگای هەڵبژاردو ئاوی پرژاند.

ڕەشەکانیش گەشتن. ژمارەیان زۆر بوو هەرکام مشتێك ئاویان هەڵەدا، لەئەنجامدا لە

هەرچەند چرکەیەك ژمارییەك ئاودەکرا بەسەرو روخسارمدا.

مێروولەکان لەبەرئەوەی لەئاو دەترسن کە شاخەکانیان وەك چاو و دەستگای پاراستن رێ نیشاندەری جەستەی ئەوانە و لەگەڵ ئەوەی شاخەکانی تەڕبو بەیەکەوەلکا، ئەم ئاژەڵە لەکار دەکەوێت.

لەهەمان کات کە وەحشیەکان و یوری ئاویان بۆمن هەلەداو لافاوێکیان لەنزیك من دروست کردبوو. شووما خۆی گەیاندە ئەم بەری ئاوو داردەستەکەی خستە گەر.

هەڵگرتنی جەستەی من بۆ شووما ئەگەری نەبو بەڵام ئەو مناڵە وشیارە داردەستەکەی خستە ژێر جەستەی بێهۆشی من و بەجووڵەیەکی خێرا خستمیە ناو ئاوەکە. ڕەشەکان منیان لەئاو گرتەوەو لەوبەر ئاو دایان نام.

هەموو ئەم رووداوانە لەبێهۆشی دا روویاندا و من نەمزانی چی بوو چی روویدا. کاتێك چاووم کردەوە لای شووما خەوتبووم و ئەومناڵە میهرەبانە بەگەڵای دار مۆز باوەشێنی دەکردم و مێش ومێشوولەی لەبرینەکانم دوور دەکردەوە. کەچاوم کردەوە شووما لەشادمانیدا قیژاندی و بەشادیەوە روویکردە یوری و وتی:

یوری...... یوری....... سەرۆك ژاراوی نەبوە..... هاتە هۆش.

یوری بەڕاکردن خۆی گەیاندە ئەوێ و ژێربالی منی گرت و بەرزی کردمەوەو قاقای لێدا. ئەم جۆرە پێکەنینە نیشانەی خۆشحالی زیاد لەرادەی یوری بوو. کە هۆکاری پێکەنینەکەیم پرسی وتی:

باش هاتنە هۆش..... ئاپاچیەکان لەم نزیکانەن. من رێکردنی بەکۆمەڵی ئەوانم لەناو دۆڵدا بینی.... خێراکەن...... دەبێت بەرێکەوین.

زۆر بێ حاڵ بووم. برینەکانم دەسووتاو خوێناوی کەم رەنگ لەشوێنی گازی مێروولەکان دەهاتەدەر و لەگەڵ ئەوەشدا میوەم خواردو لەشوێنەکەم هەستام.

چەند برینێکی ئەوەندە گرنگ نەبو چونکە دیارنەبو تاچەند خولەکی تر زیندوو بین و بەشێوەیەکی دڵتەزێن نەکوژرێین. ڕەشەکان لەهەردوو لامانەوە دەڕۆشتن و من و یوری و شووما لەناوەڕاستدا بووین. دووری ئەوێ تاکوێستانمان بڕی. یوری وەك فەرماندەیەکی کارامە کە سەربازەکانی ژێر دەسەلاتی خۆی بۆ کارو چالاکی هاندەدا، قسەی دەکردو شوێنە هەستیارەکانی کوێستانی نیشان دەدا.

ڕەشەکانی لەشوێنێکدا کۆکردەوەو وتی:

ئێوە لێرە خۆتان داشارن و خۆتان نیشان مەدەن تا من ئاگادارتان بکەمەوە. لەگەڵ

ئەوەی شووما لەلایەن منەوەهات هێرش بکەن و ڕێگەی هەڵاتنی ئاپاچییەکان ببەستن. ئەوان کاتێک ترسان و پاشەکشەیان کرد لەم ڕێگاوە تێدەپەڕن. ئێوە دەبێت بەتیروکەوان یەك یەك بیانکوژن.

کاتێک کاری ڕەشەکان دیاری کرا من و یوری ڕۆشتینە پشت تاشەبەردێک کەلەسەر ڕێگای ئاپاچییەکان بو. یوری کوێستانی داپۆشراو لە دارو سەوزی نیشاندا و وتی:

لەپش ئەم کێوە شەڕکەرەکانی پوچی کا جێگیرن بەڵام شتێک کە زیاد لەرادە گرنگە ئەوەیە ژمارەی ئاپاچییەکان زۆر زۆرە.

هێشتا قسەکەی یوری تەواو نەببو کە یەکەم دەستەی شەڕکەرانی ئاپاچی لەدۆڵەکە تێپەڕین و کەوتنە سەرەوخواری. ڕێگەی ئەوان لەبەردەم ئەو تاشەبەردەی ئێمە خۆمان لێ داشاردبو، تێپەڕدەبو و جوان لەبەردەم نشانەی تیرەکانی ئێمەدا بوون.

ڕەشەکانی ئاپاچی یەك جۆرو یەك شێوە نەبوون. یوری لەمبارەوە وتی:

هاوسەری لئۆنا هۆزەکانی تری پوچی خستۆتە ژێر فەرمانی خۆیەوە و لەشەڕەکانیتردا لەشەڕکەرانی ئەو هۆزانە کەڵك وەردەگرێت. هۆزەکان نەتەنیا دەبێت باج و خەراجی پێبدەن بەڵکو لە کاتی شەڕیشدا ناچارن کە کۆمەڵێك شەڕکەری بخەنە بەردەست، لەم کاتەدا یوری وتی:

سەیرکە، ئاپاچییەکان ئەوانەن.

کەسەیرم کرد لەیەکەم نیگا دیمەنێکی کەم وێنەم بینی.

ژمارەیەك لەڕەشەکان تەختەیەکیان لەسەر شان بو. لەژێر تەختەکە نزیکەی سی کەس جێگربوون و لەسەر تەختەکە لئۆنا و هاوسەرەکەی کەڕەشێکی جوان و چوار شانەبو دانیشتبوون.

بەبینینی لئۆنا شادمان بووم و خێرا پەنجەم لەسەر پەلەپتکەی ڕەشاشەکە داناو لوولەکەم لەسەر بەرد داناو کە بەیەکەم گوولە لئۆناو هاوسەرەکەی لەسەر تەختەکە بکوژم. بەڵام یوری ڕێگری کردو وتی:

نا، نابێت ئەو بکوژین.... هەوڵبدە لئۆنا بەزیندوویی بگرین تا لەهۆزەکەی خۆیان یانی ئامازۆن بەدەست دانیشتوانی ئامازۆن بکوژرێت. تیدەگەیت... ئاگاداربە کە نەکوژرێت... شووما وەك پشیلە لەسەر بەردێك دانیشتبوو. چاوی لەدۆڵەکە هەڵنەدەگرت. دەیویست ڕەشاشەکەی بدەمە دەست و وەحشیەکان دروێنە بکات پێم وت:

ئەو ژنەی لەسەر تەختەکە دانیشتووە دەناسیت؟

شووما نەسەیری کردم و نەقیافەی خۆی گۆڕی، بەهەمان شێوە کەچاوی تێبڕیبوون وتی:

بەڵێ دەیناسم. ئەو بکوژی دایك و باوکمە.

من وشووما لەقسەکردندا بووین کەیوری بە ئەنیشك دای لەکەلەکەم و وتی:

ئامادەبە گەشتن، هەوڵ بدە زیاتر لەئاپاچیەکان بکوژیت. ئەوانیتر گوناحیان نیە و بەزۆر لەم شەڕەدا بەشدارن.

یوری بەڕاکردن لەمن دوورکەوتەوەو خۆی خستە پشت تاشە بەردێکی تر. بەڵام هێشتا خۆمان ئامادە نەکردبو کە دەنگی گوولە بەرز بوویەوە. دیاربو کەشائکی لەکوێستاندا خۆی داشاردوەو شەڕکەرەکانی هاوڕێی کەمێك خوارتر جێگەیان گرتووە. ئەویش تاکتیکی شەڕی یوری گرتبووە بەر. بەهەرحاڵ گوولەکانی شائکی سیان لەهەڵگرانی تەختەی کوشت و ئەوانیتر ترسان. لئۆنا وەك هەڵۆ لەسەر تەختەکە پەڕیە خوار لەپشت بەردەکان خۆی حەشاردا. هاوسەرەکەشی پەڕیە خوار بەڵام لەشوێنەکەی نەجووڵاو هەر لەوێوە دەستی بەفەرماندان کرد.

شائکی نەیدەزانی چی بکات، دووبارە تەقەی کردەوەو ئەم کارەش بووەهۆی ئەوەی هاوسەرەکەی لئۆنا شوێنی خۆ شاردنەوەی دیاری بکات و دەستووری گرتنی دەرکرد. وەحشیەکان وەك مێروولە بەکێوەکەدا هەڵگەڕان، شائکی یەك یەکی دەکوشت بەڵام ئەو بەتفەنگێکی سادە چۆن دەتوانێ ئەو هەمووە بکوژێت نزیك بوو پێی بگەن کە یوری ڕەشاشەکەی خستەکارو تاقمێکی خستە سەرزەوی. ڕەشاشەکەی یوری کوشتاری دەکرد بەڵام ئەوانەی ڕۆشتبوونە کێو، بەسلامەت مانەوە چونکە ڕەشاش نەیدەتوانی یەك یەکەی ئەوان بدۆزێتەوە و بیانکاتە نیشانە. شائکی هێشتا لەمەترسیدابو.

نەمدەتوانی خۆم بگرم بۆئەوەی هەرچی زووتر ئەم شەڕەتەواو بێت، مێشکی هاوسەرەکەی لئۆنام نیشانەگرت و کوشتم. ڕەشی چوارشانە لەشوێنەکەی بەرزبوویەوەو کەوت و دەست بەجێ گیانی دا. لئۆنا وەك ئەوەی بڵێی هیچ ڕووداوێك ڕووینەداوە لەپشت بەردەکە هاتەدەرو جێگای هاوسەرەکەی گرتەوە. رمەکەی ئەوی کە نیشانەی فەرمانەدەیی بو هەڵگرت و لەبڵاوەکردنی سپاکەی ڕێگری کرد.

لەسێ لاوە بەردەوام تەقە دەکرا. وەحشیەکانی ئاپاچی لەناوەڕاستدا سەرگەردان مابوونەوەو دەکوژران وەحشیەکانی پوچی کا بەهەلهەلە کێشان خۆیان گەیاندە

دەروازەی دۆڵەکە.

دەنگی ئەوان زیاتر بووە هۆی تۆقاندن و پاشەکشەیان کردو تا لەولاوە رابکەن. لەوێدابو کە لەگەڵ تیرە سووتێنەرو گیانبرەکانی سی نەفەر ڕەشەکەی هاوڕێی ئێمە روبەڕو بوونەوەو شەڕوپێکدادانێکی قورس دەستی پێکرد.

لەدەرگای دۆڵەکە شەڕی دەستەویەخە دەستی پێکردو ڕەشەکانی پوچی کا کە تینوی خوێنی ئاپاچیەکان بوون وەحشیانە هێرشیان کرد. لەئەنجامدا ئاپاچیەکان لەدوو لاوە گەمارۆدران و لە سەریشەوە کەوتنە بەر هێرشی گوولەی ئێمە.

لئۆنا دەستووری دەدا و ڕێگەی هەڵاتنی بەپەنجە دیاری کرد. دەستەی یەکەم لەهەمان ڕێگاوە خۆیان خستە کەلێنی کێوەکە و ڕۆشتن. تیرهاوێژەکانمان نەبوونە لەمپەڕ لەبەردەم راکردنی ئەوان. لئۆناش رایکردو بەدوای ئەودا دەستەکانی تریش رایان کرد.

سەرۆکی هۆزی پوچی کا تاقمێکی نارد بەشوێنی ئەواندا و ڕێگەی هەڵاتنیشی بەست کەئەوانیتر لەگۆڕەپان دەرنەچن.

کاتێك ڕێگا بەسترا وەحشیەکان بەهەلهەلەلێدان دەستیان جووڵاندو لەسەر زەوی دانیشتن دووبارە بۆ تەقەکردن ڕەشاشەکەم بەرزکردەوە کەیوری وتی:

تەقە مەکە، تەقە مەکە. تەسلیم بوون.

تێگەشتم کە دانیشتنی ئەوان نیشانەی تەسلیم بوونیانە. شەڕکەرانی پوچی کا شەڕکەرانی ئاپاچیان بێ چەك کردو من ویوریش لە بۆ سەندنەوەی تۆڵە لە لئۆنا لەکێوەکە ڕۆشتینەخوار.

یوری وتی:

گرتنی لئۆنا کارێکی دژوارە چونکە لەگەڵ هەموڕێگاکانی ئەم ناوچە ئاشنایە لەکاتێکدا ئێمە نائاشناین.

وتم:

تا لئۆنا نەگرم، ئۆقرە ناگرم. ئەو دەبێت بەتاوانی کوشتاری ئامازۆن بکوژرێت.

یوری لەوڵامی قسەکەی مندا بێدەنگ بو بەڵام نالەیەکی کورت لەقوڕگی دەرچو. من ئەم دەنگەی یوریم باش دەناسی و دەمزانی لەچ کات و ساتێکدا ئەم دەنگە لە قوڕگی دەردەکات. یەکەم جار کاتێك روبەڕوی بوومەوە لەقاوەخانە لەبارەی سەفەرەکەوە قسەم دەستپێکرد ئەم دەنگەی لێوەهات و زانیم مەبەستیەتی گاڵتەم پێبکات.

( ١٦ )

لەرۆژ و هەفتەکان و مانگەکانی دواتریش یوری زۆر بەکەمی ئەم دەنگە لەقورگی دەهاتەدەر. بەگشتی کاتێك من ئەنجامدانی کارێك هەڵدەستام، ئەم دەنگەی لێوەدەهات. مەبەستی ئەوەبو من ئەنجامدانی ئەم کارە ناتوانم. راستیتان بوێت گاڵتەی بەمن دەکرد. ئەو رۆژەش کاتێك لەکێوەکە رۆشتە خوار بە ئیرادەیەکی بەبڕشت وتم:

لئۆنا دەکوژم و تۆڵەی خۆمی لێ دەستێنمەوە، ئەم دەنگەی لێوەهات..... زەق زەق چاوم تێبڕی. سەیر کردنەکەم هەزاران مانای بو.... دەمویست مەبەستەکەی بزانم و کەگوێی بەسەیرکردنەکانی من نەداو سەری داخست و بەتووڕەیی وتم:

مەبەستت لەم دەنگە چی بو...... چی دەڵێیت..... ئایا گوومان دەکەیت.

نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم و لەکاتێکدا پارچە بەردێکی لەژێر قاچیدا وورد کردو وتی: ئێستا کوشتنی لئۆناتان بۆ گرنگ نیە.... شتێك کە زۆر گرنگە ئەوەیە کە دەستگیری بکەین. دووبارە بەهەمان تووڕەیی کەهەوڵمدا زیاتر تۆقێنەرترو هەڕەشەی پێوەدیار بێت پرسیم: بۆ...... بۆ کوشتنی لئۆنام بۆ گرنگ نیە.... ئەمە چ قسەیەکە دەیکەیت....

ئەگەر ئەمانۆ ئەم قسانە ببیستێت گوومان دەکات هێشتا لئۆنام خۆش دەوێت.

یوری بزەیەکی هێنایە سەر لێو و وتی:

گوومان دەکەیت.......؟ ئەو داماوە دڵنیایە و بەراستیش هەروایە.... شەوێك پێش رۆشتن بەمنی وت کە ئێوە کاتێك لەگەڵ لئۆنادا روبەڕو دەبنەوە، عەشقە کۆنەکان لەناخ و قووڵایی رۆحتان دەبوژێتەوەو لەکوشتنی چاو دەپۆشن.

دواتر لەژێر چاو سەیری کردم و بەشێوەیەکی تایبەت وتی:

ئایا جگەلەمەیە.... جوان لەقووڵایی ناخی خۆتان بگەڕێن، بەویژدانەوە قسەبکەن.... من و ئەمانۆ کە ئەم قسەدەکەین، راست دەکەین.... ئایا هێشتا خۆشت دەوێت.... ئەگەر پێویست بێت توانایی ئەوەت هەیە بەگوولەیەك دڵی کون کەیت؟

کاتێك دەمویست تەقە بکەم، چاوم لەئێوە بوو جوان نیشانەکەتان دیاری کردو ئاگاداربوون نەکا لئۆنا پێوەبێت..... کاتێك رایکرد درەوشانەوەی چاوەکانی ئێوەم

بینی و شادمانیم لە هێڵەکانی روخسارتان هەست پێکرد. بەم شێوەیە ئایا دەتوانن حاشا لەوەبکەن کە هێشتا لئۆناتان خۆش دەوێت؟

خۆشم گوومانم بو. نەمدەتوانی بەبڕشتی دژایەتی باوەڕبو بۆچوونەکانی یوری بکەم. لەرۆحی خۆم، لە قووڵایی ناخ، لەدڵی خۆمدا گەڕام و ئاشکرا هەستم پێکرد کە لئۆنام بەو هەموو جوانیەوە خۆش دەوێت. چۆن دەکرا کەسێك لئۆنای دڵرفێنی خۆش نەوێت؟ چۆن دەکرا ئەو شەوە خۆشانەی لەگەڵ ئەو بەسەرم بردبو لەبیربکەم. چۆن دەمتوانی چاوە ڕەش و شەهلاییەکانی ئەو ببینم و لوولەی تفەنگ لەسەر دڵی ئەو کەڕەنگە هێشتا لەبەر من لێی دەدا، دابنێم و دڵێك کە جێگای عەشق و خۆشەویستی من بو کوون بکەم. نە...... نە..... من توانای کوشتنی لئۆنام نەبو دەبێت بڵێم کە ئەوم خۆش دەویست.

لەوساتە بەدواوە کە لەنێوان من و یوری وتوێژێکی گرنگ لەبارەی لئۆنا ئەنجامدرا، دەتوت ئیتر یوریم خۆش ناوێت و لێی بێزارم. هەستم دەکرد ئەو بکوژێ خوشەویستەکەی منەو بەهاوکاری من دەیەوێت لئۆنای جوان بکوژێت....

لەناو دۆڵەکە هەراو هوریایەکی سەیر دروست بو، شەڕکەرانی پوچی کا پیاوانی ئاپاچیان چەك کردبو. من و یوری کارمان بەوان نەبو و راستەوخۆ لەڕێگەیەکی باریك کە بەهۆی کەڵەکێویەکانەوە دروست ببو، تێپەڕبووین و گەشتینە ئەو بەری کێو. لەوێ شائکی و شووما چاوەڕوانمان بوون.

شووما پێشتر چبووە ئەوەیْ تاشائکی بدۆزێتەوە و چاوەڕێ گەشتنی ئێمە بکەن.

پێکەوە بەڕێکەوتین و رێگەی جەنگەڵی رۆژهەلاتمان گرتەبەر. شادمان بووم و دڵنیابووم ئەم چەند کەسە کە هەموویان دوژمنی لئۆنابوون دەستیان پێی ناگات و لەجەنگەڵدا نایدۆزنەوە. دەتوت یوریش ئاگای لەم بابەتەیە چونکە کاتی ئاوابوونی خۆر کە بۆ بەسەر بردنی شەو دانیشتین و شائکی بۆ چینینی میوە بەڕاکردن رۆشت، یوری لای من دانیشت. قاچەکانی درێژکردو لەکاتێکدا لوولەی ڕەشاشەکەی خۆی پاك کردەوەو هەوڵی دەدا سەیری چاوەکانی من نەکات وتی:

سەرۆك پێشنیارێکم هەیە..... گوومان دەکەم ئێوەش پێی رازی بن و پەسندەی بکەن. بیرۆکەیەکی خراپ نیە، گوێ بگرن تا بیڵێم.

دواتر بێ ئەوەی من رەزامەندی خۆم بەبیستنی پێشنیارەکەی رابگەیەنم وتی:

بەبۆچوونی من ئەگەر ئێوە لەجەنگەڵدا تەنیابن دەتوانن لئۆنا بدۆزنەوە.....

بەبیستنی ئەم رستەیە دڵم داکەوت چونکە خوازیار نەبووم بەتەنیا لەجەنگەڵدا بم و بەتایبەت لەم سنورە کەپێی ئاشنا نەبووم. ئەگەر ئاپاچیەکان منیان دەدی بەیەك تیری گیانبر دڵیان کون دەکردم.

جیاواز لەوانەش ئەگەر لەجەنگەڵ روبەڕوی لئۆناو هاوڕێکانی دەبوومەوە دەکوژرام چونکە لئۆنا بەپێی ئەو دوژمنایەتیەی کەبووی و لەبەرکوشتنی مێردەکەی، دەیکوشتم و بەحەزەوە لەدیمەنی مەرگی دڵتەزێنی منی دەڕوانی.

رەنگ لەرخسارمدا پەڕا، یوری لەگەڵ تاریك بوونی هەوا هەستی بەرەنگ گۆڕینی من کردو بەنیشانەی شادمانی دایە قەڵەم و بەم شێوە درێژەی بەقەسکانی خۆیدا.

دڵنیابووم ئێوە بەشادمانیەوە پێشوازی لەپێشنیارەکەی من دەکەن چونکە نارازی نین لەجەنگەڵدا تەنیاو دوور لەچاوی دژمن روبەڕوی لئۆنا ببنەوە.

هەناسەیەکم بەئاسوودەیی هەڵکێشاو پرسیم:

لەبەرچی ئەم پێشنیارە دەکەیت.

لەبەر دوو هۆ. یەکەم ئەوەی لئۆنا ئەگەر دڵنیابێت تەنیان خۆی نیشان دەدات و بەئاسانی دەتوانن دەستگیری بکەن، ئەویتر ئەوەی دەرفەتی ماڵئاوایتان هەبێت یەك دوو رۆژ پێکەوە تەنیا بن و دواتر بۆئەوەی لەترسی من کەم بکاتەوە وتی:

نیگەران مەبە تارۆح لەجەستەمدا بێت لەپاراستنی گیانی ئێوە درێغی ناکەم. هەمیشە و لەهەموو شوێنێك ئاگام لێتان دەبێت و هاوڕێ لەگەڵ شائکی دووراندوور بەدواتاندا دێین. لەگەڵ ئەوەش بۆئەوەی تەنیا نەبن شووما لەگەڵ خۆتان ببەن. ئەم مناڵە زۆر میهرەبانەو بەکەڵکی زۆر کاردێت.

وتوێژی ئێمە درێژەی کێشا..... دژایەتیم دەکرد چونکە بەڕاستی نەمدەویست لئۆنا بکوژرێت یوریش سووربو و پێیدادەگرت. سەرئەنجام یوری قەناعەتی پێکردم و بەرەبەیان تەنیاو بەبێ شووما و بەرووگرژی سیلاح و ڤیشەکم هەڵگرت و بەڕێکەوتم. یوری خۆی بەمن گەیاندو وتی:

ئەمانۆتان بەسە، ئەم کچە موو خورماییە و وەحشی ئێوە دەپەرستێت، مووناك بەو رۆح و دڵە ئاسمانیەی خۆی بەرادەی ئەمانۆ تۆی خۆش نەدەویست و بەژیان و بەختەوەری ئێوە ئارەزوومەند بو، ئەمانۆ لەگەڵ خۆماندا دەبەین هەم دەبێتە هاوسەرێکی باش بۆتان و هەم بەڵگەی پێویست بۆ گەشتی ئامازۆنی ئێمە.....

کاتێك لەم سەفەرەدا گەڕانەوە، بەبێ وەستان بەرەو رۆژئاوا دەڕۆین و رێگەی بەرازیل

دەگرینەبەر لەیەك مانگ دەگەینە قەراغ جەنگەڵ. خوێنساردبن و لەمەرگی لئۆنا خەمبارمەبن چونکە ئەم خوێنخۆرەو چارە ڕەشتان دەکات.

ئەوەندە خەمبارو ناڕەحەت بووم بێ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە بەخێرایی بەڕێکەوتم و ڕۆشتم.

رامدەکردو قاچەکانم بەخێراییەکی سەیر بۆ پێشەوە دەکێشرا. دەتوت دەستێکی بەهێز بەرەو چارەنووسێکی تازەم دەبات.

ڕۆژی یەکەم تێپەڕی.. ڕۆژی دووەم و سێیەمیش بێ ڕوودانی ڕوداوێکی شیاوی ئامارژە پێدان بەسەر چوو. بەرەبەیانی ڕۆژی چوارەم گەشتمە شوێنێك لەجەنگەڵ کە دەتوت لەبەیانی سەرەتا تا ئێواری کۆتایی قاچی هیچ مرۆڤێك بەوێ نەگەشتووە و وەحشی و دڕندەکان هەموویان لەوێدا کۆبوونەتەوە. لەهەر شوێنێکەوە دەڕۆشتم، ئاژەڵێك سەری لەکوونی دارێکەوە دەردەهێناو بەلقێکەوە خۆی شۆڕ دەکردەوەو یان بزنەمژەیەك هەڵدەبەزییەوەو رایدەکردو دەڕۆشت. کاتێك گەشتمە ئەوێ، وەستام. بەخۆمم وت: لئۆنا لێرە نیە بەڵام هێشتا قسەکەم تەواو نەکردبو کە دەنگی قیژەیەکی مەترسیدارم بیست، بەخێرایی خاوەنی دەنگەکەم ناسی. دەنگی لئۆنا بو. لئۆنا قیژاندی و داوای یارمەتی دەکرد. ئایا گیانی لەمەترسیدابو. بەخێرایی بەرەو شوێنێك کە دەنگەکەی لێوە دەبیسترا، رامکرد. زۆر دوور نەبوون و چەند خولەك دواتر کە لئۆنا رەنگە بۆ هەزارەمین جار قیژاندی، گەشتمە ئەوێ. ئاپاچیەکان دەیانویست لئۆنا بکوژن. بۆئەوەی بابەتەکەم کورت کردبێتەوە بێ باسکردنی روداوەکانی پێشو ئەوەی رویدابو دەگێڕمەوە... ئاپاچیەکان بەگوومانی ئەوەی لئۆنا بۆ کوشتنی سەرۆك هۆزەکەیان پیلانی گێڕاوە، دەیانویست بیکوژن و لەوشوێنە مەترسیدارەی جەنگەڵ ئەو و چەند ڕەشەکەی هاوڕێیان گەمارۆ دابو.

هاوڕێیانی لئۆنا تادوایین کەس دوای دوو ڕۆژ شەڕوپێکدادان کوژرابوون یان رایانکردبو. بەڕێکەوت ئاپاچیە هێرش بەرەکانیش زۆر نەبوون. بەڵام ژمارەی ئەوان زیاتر لە هاوەڵانی لئۆنابو و لەئەنجامدا ئەوان لئۆنایان گرفتار کرد و دەیانویست دەست درێژی بکەنە سەر.

لئۆنا دەیقیژاند بەڵام چاوەڕێی یارمەتی نەبوو. مرۆڤ کاتێك دەکەوێتە مەترسیەوە بێ ئیرادە دەقیژێنێت. لئۆناش لەگەڵ ئەوەی دەیزانی کەس لەو شوێنە دوورە بەفریای ناگات دەیقیژاند. بەخۆشحاڵیەوە لەکاتی خۆیدا گەشتم و دەستپێکردنی شەڕم بەچەند

تەقەیەك راگەیاند.

چەند کەس لەئاپاچیەکان کوژران و ئەوانیتر پێکەوە بۆ کوشتنی لئۆنا هێرشیان برد.

ئیتر نەمدەتوانی تەقە بکەم چونکە لەم شێوەدا لئۆناش دەکوژرا. ناچار ڕەشاشم لەمل کردو قەمەم دەرهێناو رۆشتمە پێش. شەڕێکی قورس دەستی پێکردو لەگەڵ ئەوەی لئۆنایان بریندار کردبو بەڵام فریای کەوتم. چوارکەسم کوشت و خۆم پێگەیاند.

کاتێك گەشتمە لای لئۆنا ئاسوودە بووم. دووبارە ڕەشاشەکەم خستەکارو ئاپاچیەکانم پرژوبڵاو کرد. لئۆنا بێهۆش بوو، سەرەتا وامدەزانی مردوە.

کاتێك وەحشیەکان رایان کرد لئۆنام خستە سەردەست و بەڕێکەتم. لەژێر قاچم لاشەکان کەوتبوون و لەکاتی رۆشتن لەسەر جەستەی خوێناوی ئەوان تێپەڕدەبووم.

ئەوەندە لەڕۆشتندا پەلەم بو کەتەنانەت ڕێگاکەش بەهەڵە رۆشتم و لەجیاتی ئەوەی بەرەو رۆژئاوای جەنگەڵ بڕۆم ڕێگەی باکوری رۆژهەلاّم گرتەبەر.

رەنگی لئۆنا پەڕابوو. ئەو رووداوەی بەسەری هاتبوو وگرفتاری چنگی ئاپاچیەکان ببو بەڕادەیەك ترساندبووی کەهێشتا روخساری رەنگی ئاسایی خۆی بەدەست نەهێنابوویەوە. بەڵام کاتێك لە ئەستێڵکی سەوز و ماری ئاناکندا و کرۆکۆدیلە خوێنخۆرەکان قسەی دەکرد، رەنگی روخساری زیاتر پەڕی و چاوەکانی کرایەوە وتم:

ئێستا لەو رێگاوە هاتووین دەگەڕێینەوە. ئەگەر بەدەستی کرۆکۆدیلەکانیش بکوژرێین بەباوەڕی من ئاسانترە لەوەی لەژێر شمشێری تیژی ئاپاچیەکان تیکە تیکەبین.

ئەو لەکاتێکدا لەشوێنەکەی هەستا وتی: نا..... ئاپاچیەکان شکستیان خوارد بۆیە دەگەڕێنەوە بۆ هۆزەکەی خۆیان. جیاواز لەوەش رێگای گەڕانەوەی ئێمە بەدڵنیاییەوە بەستراوە. مارەکانی ئاناکندا ئێستا لەرێگادا کەمینیان کردوە چاوەڕێی قوتدانی ئێمەن. بەوڕادەی گوومان دەکەیت زیندوو گەڕانەوە لەقەراغ ئەستێڵکی سەوز ئەگەری نیە و دواتر سەری خۆی داخست و قسەکانی خۆی بەم شێوە تەواو کرد.

من مەحکومم بەمردن و دەبێت بکوژرێم. کێشە لەوەدایە لەوەدایە ئیتر هیچ کام لەهۆزەکانی جەنگەڵی باران جێگەم ناکەنەوە. نە ئامازۆن، نە ئاپاچی نە پوچی کا، ئەوەی دەبینی دەترسم بۆئەوەیە گیانی تۆ بکەوێتە مەترسیەوە..... نامەوێت تۆ بمریت......

کاتێك قسەمان دەکرد چەند کرۆکۆدیلێك لەولای بەستێنی ئەستێڵك خۆیان گەیاندە

ئەمبەرو ئارام ئارام بۆ خواردنی ئێمە دەهاتنە پێش....

وەڵامی لئۆنام نەدایەوە، دڵم بۆئەوە کەبەڕاستی لەهیچ شوێنێکدا جێگەی نەدەبوویەوە، دەسووتا بەڵام نەمدەتوانی دڵنیایی بکەمەوە و لەلایەن کەسانیترەوە لەتاوانەکەی خۆش ببم. بۆیە بەبیانووی کرۆکۆدیلەکان دەستیم گرت و وتم:

بابڕۆین.... چەند تمساحێك بۆ ئێرەوە دێن.... خێراکە، ئێستا دەگەن.

لئۆنا بەدوامدا رایکرد تاکەمێك دوورکەوتینەوە. ئەوکات وەستا و پێی وتم:

کراسەکەت بدە بەمن، من رووت و قوتم.

من لەترسی مێشوولە ژاراوی و گوێزەرەوەی نەخۆشی نەمدەویست رووت ببمەوە بۆیە کەمێك بە گوومانەوە وەستام و بۆ ئەوەی تێنەگات حەزناکەم کراسەکەی پێ بدەم وتم: شەرم لەمن دەکەیت ! من و تۆ پێکەوە مەحرەمین و نابێت شەرم لەمن بکەیت....
لئۆنا بێ ئەوەی سەیرم بکات بەدەنگێك کە زیاتر لە هەرشتێك خەم و نارەحەتی پێوە دیار بو وتی: راست دەکەیت..... من و تۆ رۆژێك مەحرەم بووین. یەکمان خۆش دەویست. رۆژێك تۆ بەو هەموو سنوورانەی مووناك دایبنابوو هاتیتە مایلا. رۆژێك من و تۆ وەك ژن و مێرد وابووین بەڵام ئەمڕۆ.... ئەمڕۆ بێگانەین و من مافی خۆمە شەرم لەتۆ بکەم. ئەو رۆژە تۆ لە دەلاقەی عەشق، وەك عاشقێك سەیری منت دەکرد بەڵام ئەمڕۆ تۆ حاکمیت و من مەحکووم.

نازانم چی بو کەبێ ئیرادە وتم: تاوانی تۆ بو.... چیت بەسەر بێت لەدڵرەقی و خراپەی خۆتە. کەسانیتر بێ گووناحن.

لئۆنا وەڵامێکی دامەوە کە هێشتا لەگوێمدا دەزرنگێتەوە. ئەو وتی:

خۆت لەجیاتی من دابنێ ئەوکات داوەری بکە..... من عاشقێکی تێك شکاو بووم و دەمویست تۆڵە بستێنمەوە. من تۆم خۆش دەویست و ئێستاش خۆشم دەوێیت.

مووناك تۆی لەمن گرت و بردی..... کاتێك چاوەکانم کردەوە کە خاوەنی هیچ شتێك نەبووم..... تۆ بۆ من هەموو شتێك بوویت و مووناك تۆی برد.... هەموو شتێکم لێ سەندرایەوە.......

دڵی لئۆنا لێی دەا. لەکاتی ئەم قسانەدا واگرژ ببو کەبێ قسە دەنگی دڵیم دەبیست.... ئیتر نەیدەتوانی قسەبکات. سەرەتا پاڵی بەدارێکەوەدا و چونکە هێشتا ئەژنۆکانی دەلەرزی لەسەر گیاکان دانیشت.

دڵۆپەکانی فرمێسك وەك لافاو دەڕژانە سەر روخساری.... چاوە جوانەکانی سوڕ ببو

و لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵیدەدا کەمتر سەیری من بکات و چاومان بکەوێتە سەر چاوی یەك. لەگەڵ ئەوەی دەمزانی گریانی لئۆنا هێزی ئیرادەو بڕیاری من ورد دەکات و پەیوەندی من و یور ىو کەسانیتر دەشێوێنێت. نەمدتوانی لەکاریگەری لئۆنا لەسەر خۆم ڕێگری بکەم. دڵم بۆی دەسووتا و هەستم دەکرد کەم کەم سست دەبم و دووبارە بۆلای ئەو دەگەڕێمەوە.

دوای وتنی ئەو رستانە چەند ساتێك گریا و ئیتر قسەی نەکرد. کراسەکەم داکەندو پێم دا. ئەویش قۆڵی کراسەکەی لەپشتەوە لەسمتی گرێدا و ناوشانی کراسەکەی لەناوەڕاستی قاچیەوە تێپەڕاندو بەم شێوە شورتێکی کورتی بۆخۆی دروست کردو بەڕێکەوت.

لەوە بەدوا من و ئەو کەمتر قسەمان دەکرد..... چارەنووس بۆ لئۆنا روداوی تری پێش بینی کردبو ڕووداوێك کە نەمن بیرم لێ دەکردەوەو نەخۆشی چاوەڕوانی بو.

بەهەرحاڵ چونکە ڕێگا بەهەڵە ڕۆشتبووین یەك ڕۆژی تەواو کاتی ئێمە بەرێگە ڕۆشتن کۆتایی پێهات و بەخۆشحاڵیەوە لە ئەستێڵکی سەوز بێ مەترسی تێپەڕبووین و گەشتینە ناوچەی ئاپاچیەکان کە لەسەر ڕێگاماندا بو بەڵام لەچەند شوێنێك بەهۆی چوار خێوەتێك کە لەلقی دارەکان دروستمان دەکرد لە ئاو تێپەڕبووین.

هەوا تاریك ببوو. بەدرێژایی ڕۆژ من و لئۆنا بێ ئەوەی لەگەڵ یەك قسە بکەین ڕێگەمان بڕی. ئاوابوونی خۆر لای دارێك دانیشت و وتی:

هیلاك بووم... ئەم شەو دەبێت لێرە بمێنینەوە. بەیانی لەڕووبار تێدەپەڕین و دەڕۆینە ناوچەی پوچی کا...

نەمدەویست شەو لەگەڵ لئۆنا لەجەنگەڵدابم.... ئەم کارە لەبەر دوو هۆ لەبەرژەوەندیمدا نەبو. یەکەم ئەوەی ئەگەری بو لئۆنا لەخەوی من کەڵك وەربگرێت یان سیلاحەکەم هەڵبگرێت و رابکات و یان بەهەمان سیلاح بمکوژێت. دووەم ئەوەی جارێکیتر بەهێزی جوانی خۆی بمکێشێتە ئامێزی خۆی و هێزی ئیرادو بڕیارم داگیر بکات. لێم پرسی: لێرە تا پوچی کا چەندە ڕێگایە؟

بەخوێنساردی و لەکاتێکدا قاچە ئاوساوەکانی بەگەڵای پانی دارە گەرمەسێریەکان دەبەست تا لەکزانەوەی کەم بکاتەوە، وتی: نزیکەی ڕۆژێك....

بەخێرایی لای خۆم بەراوردم کرد. بەراوردەکەم راست بو؟ چونکە بەشەو نەماندەتوانی لەجەنگەڵ تێپەڕین و ئەم کارە یەکسان بو بەمەرگ ناچار ڕەزامەندی خۆم

ڕاگەیاند.

لئۆنا بزەیەکی لەروی ڕەزامەندیەوە هێنایە سەر لێو و وتی:

بۆئەوەی خەیاڵت ئاسوودەبێت دەتوانیت دەست و پێی من بەدارەوە ببەستیتەوە.

پێشنیارێکی باش بوو بەڵام دڵم بەم کارە رازی نەدەبو ئەگەر دەست و پێی لئۆنام دەبەست هەمووی شەو بەخەیاڵێکی ئاسوودە دەخەوتم.... بەڵام نا.... نا ئەوم خۆش دەوێت. ئەوم خۆش دەوێت هێشتا دڵم بۆی لێدەدا..... چی بکەم..... من پیاوێکی لاوازم..... ژنانم خۆش دەوێت ئەمانۆم دەپەرست.... لئۆناشم خۆش دەوێت. نەدەتوانم دڵی بشکێنم و نەدەتوانم چاوپۆشی لێبکەم.

لەهیلاکیدا دانیشتم. لئۆناش لای من دانیشت و بێ گوێدان بەرابردوو سەری خستە سەرشانم و دەستی گرتم و وتی: بیرتە ئەو ڕۆژە کە ئەو پیاو و ژنە تاوانبارەیان بۆ ئیعدام خستە بەردەم مێروولە سوڕەکان. تۆ بەمووناکت وت مەحکوومین بەئیعدام لەهۆزەکەی ئێمە هەر داوایەکیان هەبێت، جێ بەجێ دەکرێت و دەخرێتە بەردەستیان.

من کە لەمەبەستەکەی حاڵی نەبووم وتم:

ڕاستە.... لەوڵاتی ئێمە بە مەحکومین بە ئیعدام هەرچیان بوێت دەدرێت.

دەستی منی ماچ کردو وتی: منیش مەحکوم بەئیعدامم. بەیانی یان دووبەیانی لەهۆزی پوچی کا دەکوژرێم. لەم شێوەشدا تۆ دەبێت ئارەزووەکەم جێ بەجێ بکەیت.

وتم ئارەزووی تۆ چیە؟ ئارەزووم ئەوەیە من و تۆ ئەم شەو هەموو ڕوداوەکانی ڕابردو لەبیربکەین. ئەم شەو دۆستین و بەیانی تۆ دەبیتەوە بەدوژمن. چ کێشەیەکی هەیە.

پێکەنیم.... بەڕاستی پێکەنینم دەهات. لەژیرەکی ئەو سەرم سووڕمابو، بەڵام نەیهێشت بیر بکەمەوە و بڕیار بگرم.

ئەو شەوە بەخۆشی تێپەڕا، دنیا لێڵ بو کەلئۆنا بەپەلە منی لەخەو هەستاند و وتی:

هەستە کراسەکەت لەبەرکە. دەستەیەک بەرەو ئێرە دێن. پێم وابێت ئاپاچیەکانن ئەگەر بماندۆزنەوە تیکە تیکەمان دەکەن.

لئۆنا کاتژمێرێك زووتر لەخەو هەستابو. بەرشتەی ((کەنف ))ی جەنگەڵ بۆخۆی شۆرت و تەنوورەی دروست کردبوو و وەك ژنانی ئامازۆن گوڵێکی لەلای چەپی قژی خۆیدا بو. لەشوێنەکەم ڕاپەڕیم. کراسەکەم لەبەرکردو بەرێکەتم. لئۆنا بڕێکی زۆر (( کەنفی )) هەڵکەندبو، کاتێ ڕۆشتن پێی وتم:

ئەمانە هەڵگرە بۆ بەستنی بەلەم پێویست دەبێت. لەشوێنی تر لەمەی لێ نیە.

کەنفەکانم وەك دەستەی تەناف کردەشان و بەخێرایی لەویٚ دوورکەوتینەوە بەڵام کەمترخەمیمان ئەوەبو شوێنی خۆمان لەسەر خۆڵ پاك نەکردەوە. ئاپاچیەکان دوای ئێمە گەشتنە ئەو شوێنە و کەشوێنەواری ئێمەیان لەسەر خاك بینیبو، بەخێرایی بەدواماندا هاتن.

ئاپاچیەکان بەدەستەی سێ چوار کەسی دابەش دەبن و لەجەنگەڵدا بلاو دەبنەوە. دەستەیەکی چوار کەسیان کەوتنە سەر ڕێگای ئێمە و لەشوێنێك کە لەرووبار تەنیا چارەکە کاتژمێرێك دوور بووین، ئێمەیان بینی.

بەخۆشحاڵیەوە لئۆنا وەك کەڕوێشك هەموو شوێنێکی جەنگەڵ شارەزابو و ئەگەر فشەم نەکردبێت ژمارەی دارەکانیشی دەزانی هەڵبەت ئاوا شتێك ئەگەری نیە بەڵام بەڕاستی جوان شارەزای جەنگەڵ و شارەزایی ئەوبو ڕێگری لەمردنی ئێمەکرد. ئەو دەستی منی گرت و لەهەمان ڕێگە کەڕۆشتبووین گەڕاندمیەوە. ئاپاچیەکان کە چوار کەس بوون ئێمەیان بینی و خێرایی هەنگاوەکانی خۆیان زیاد کرد.

یەك لەوان تیرێکی هاویشت، تیرەکە لای منەوە تێپەڕی و بەردارکەوت. دووریان زۆر کەم بو ئەگەر ئەم جارە تیریان بهاویشتایە یان من یان لئۆنا دەکوژراین. بەلئۆنام وت:

با بەڕەشاشەکە بیانکوژم.

ئەو بەتووندی دەستی راکێشام و وتی: مەگەر شێت بوویت.... دەنگی تەقە ئەوانیتریش دێنێتە ئێرە. دەبێت خۆمان داشارین تا لەم ناوچەیە دوور بکەونەوە.

دەمویست بپرسم لەکوێ خۆمان داشارین کەڕۆشتە پشت دارێك و منیشی بەدوای خۆیدا برد. ئەوێ چاڵێك بو کەبرێکی زۆر داروگیا سێبەریان سەرخستبو. دەستی سروشت ئەشکەوتێکی لەوێ دانابوو. ئەوەندە تاریك بو کەچاوی ئێمە هیچ شوێنێکی نەدەدی. تازە ڕۆشتبووینە ناو کەئاپاچیەکان گەشتن. چەند خولەك بۆ چەپ و راست و سەرو خوار ڕۆشتن و دواتر لەبەردەم کونی ئەشکەوتەکە وەستان. نەیاندەوێرا بێنە ناو چونکە تاریك و ترسی ئەوەیان بو بەدەست ئێمە بکوژرێن. ناچار بەڕێکەوتن لەگەڵ یەك دەستیان بە بەرد هێنان کردو دوانیان بەردی بۆ ناو چاڵەکە هەلەدا. من و لئۆنا خزاینە سووچێك و لەقووڵایی تاریکیەوە ئەوانمان دەدی.

ئاپاچیەکان تا ئەوەی ئێمەیان بینیبوو و بەدوامانا هاتبوون و لەبەرانبەر ئەو ئەشکەوتە لەناکاو من ولئۆنا لەبەرچاویان ون ببووین و بۆیە دڵنیابوون من و ئەو لەوێ خۆمان داشاردوە و بۆ هیچ شوێنێکی تر نەڕۆشتوین و ناتوانین بڕۆین. بۆ کوشتنی

ئێمە بڕیاریان دابو بەڵام نەیاندەوێرا بێنە ناو ئەشکەوتەکە و بگەڕێن چونکە جیاواز لەهەموو مەترسیە سروشتیەکان کە هەڕەشەی لەوان دەکرد و ئەگەری بو مارە گەورەکان پەلاماریان بدەن لەڕەشاشەکەی منیش دەترسان و باش دەیانزانی ئەگەر ئیشارە بەپەلەپیتکەی سیلاحەکەم بگرم ژمارەیەکیان وەك گەڵای دار دەکەون.

بەم وەسفە تەنیا کارێك کە لەدەستیان دەهات ئەوەبو بەرد هەڵدەنە ناو چاڵەکە و جگە لەمە هیچ....

نزیکەی چەند کاتژمێرێکی بەردەوام بەردیان هاویشت بەڵام یەك بەرد بەر من و لئۆنا نەکەوت و زەحمەتی خۆڕاییان کێشا. هیلاك بوون و ئەم گوومانەیان لا دروست بو کەڕەنگە ئێمە لەوێدا نەبین. ئەگەر بارودۆخ بەم شێوە دەڕۆشتە پێش ئاسوودە دەبووین و بەخێرایی لەو ئەشکەوتە دەهاتینە دەرو دەڕۆشتین بەڵام بەدبەختانە ڕووداوێکی تازە ڕوویداو بارودۆخمان زیاتر مەترسیدار بو. دەزانن چی بو.... ئاپاچیەکان هیلاك ببوون و راوێژیان کرد. دەنگیانمان دەبیست. لەقسەکانیان ئاگادار بووینەوە ئەو کەسەی بەردی دەهاویشت زۆر هیلاك و باوەڕی وابو لەوێ بڕۆن و بگەڕێنەوە بۆ هۆز تا لە هەڵبژاردنی سەرۆکی تازە بەشداری بکەن. ئەوانی تریش زۆر نارازی نەبوون کە لەناکاو دەستەیەکی تر ئاپاچیەکان کە لەجەنگەڵ بۆ گرتنی من و لئۆنا بلاو ببوونەوە، گەشتن. کاتێك لەڕووداوەکە ئاگادار بوونەوە سووڕ بوون لەسەر ئەوەی ناو گۆڕەکە بگەڕێن.

دووان سیانێکیان خۆبەخشانە ئامادەبوون ئەشکەوتەکە بگەڕێن بەڵام کاتێك دەگەشتنە دەرگای ئەشکەوتەکە دەترسان و دەگەڕانەوە. گەڕانەوەی ئەوان نەبووە هۆی پەشیمانی ئەوانیتر و دووبارە چەند کەسێکیان بەڕم درێژەکان کە لەدەستیانا بو بۆ ژێرەو ژوو کردنی ئەشکەوتەکە هاتن. من و لئۆنا بێ دژواری ئەوانمان دەبینی و لەناو تاریکیەوە ئەم کارە بۆمان ئاسان بو. ئەوان دەهاتنە پێش و لەدەڕوازەی ئەشکەوتەکەدا دەوەستان. لەم کاتەدا لئۆنا دەستی منی گرت و بەترس و لەرز وتی:

دەبێت چی بکەین..... ئەگەر بێنە ناو تیکە تیکەمان دەکەن.

دەستم لەسەر ڕەشاشەکەم داناو وتم:

مەترسە... تاڕەشاشم پێ بێت ئاسوودە بە. ئەگەر هەزار کەس بن دەکوژرێن. بەڵام وتەکانی من لەترسی لئۆنای کەم نەکردەوە، ئەو بەدژواری هەناسەی دەکێشا وتی:

لەگیانی تۆ دەترسم. من لەمردن ناترسم. درەنگ یان زوو دەمکوژن. بەڵام تۆ حەیفە لەبەرمن بکوژرێیت خۆشم دەوێیت. باوەڕبکە لەگیانی خۆم زیاتر تۆم خۆش دەوێت.

بەدژواری هەناسەی دەکێشا.... ئاپاچییەکان کەمێك وەستان و دواتر لەکاتێك لە ژێر لچەوە دۆعایان دەخوێند هاتنە ناو ئەشکەوتەکە. دەستم بۆ ئامادەکردنی ڕەشاشەکەم تەکاندا بەڵام لئۆنا هەردوو دەستی منی گرت و وتی: نا..... نا...... تەقە مەکە. ئەوان ناتوانن بماندۆزنەوە. تاریکە. چاوەڕێ بە. تەقەکردن بارودۆخمان خراپتر دەکات.

لئۆنا لەم کارە پەشیمانی کردمەوە و بردمیە سووچێکی تاریك و دایشاردم. دواتر خۆی لەسەر زەوی راکشا، دارێکی هەڵگرت و لەناو گیاکاندا خستیە جووڵە....

من مانای ئەو کارەی ئەوم نەدەزانی و نەمدەزانی مەبەستی چیە و لەم کارە چ ئەنجامێك دەگرێت. شتێك کە گرنگ بو ئەوەبو کە ئاپاچییەکان رێگەیەك کە گرتوویانە تەبەر درێژە دەدەن یان دەگەڕێنەوە.

چاوی من و لئۆنا بەتاریکی عادەتی کردبوو و جوان ئاپاچییەکانمان دەبینی. دەنگێك بەهۆی جووڵاندنی دارەکە لەناو گیاکان بەرزبوویەوە لە دەنگی جووڵەی مارێکی قورس لەسەر گژوگیای جەنگەڵ دەچوو. ئەمە بووە هۆی ترسی ئاپاچییەکان. یەکێك لەوان وەستاو جوان سەیری کرد، چونکە هیچی نەدی بەترسەوە قیژاندی و گەڕایە دواوەو بەدەم قیژەوە دەیوت: کوانا..... کوانا.....

لەئەشکەوتەکە رۆشتەدەرو رۆشت. کوانا لەزمانی ئەوان جۆرێك ماری بچووکە کە ئەگەر بەگامێشەوە بدات دەست بەجێ دەیکوژێت. کوانا زیاتر لەهەرمارێکی تر لەجەنگەڵی ئامازۆن دەست دەکەوێت بەڵام چونکە مارێکی خانەنیشین و ئارەزوومەندی خێزانە مەترسی کەمتری هەیە. کوانا هەمیشە لەماڵی خۆیدا دەژی و تاکەسێك لەماڵەکەی نزیك نەبێتەوە پێوەی نادات.

قیژەی ترس ئەنگێزی وەحشی ئاماژەپێدراو ئەوانیتریشی ترساند و لەگەڵ ئەوەی زۆر خۆراگریان کرد تا رانەکەن نەیانتوانی بەسەر ترسی خۆیاندا زاڵ بن و رۆشتنەدەر.

دووبارە هەناسەیەکم بە ئاسوودەیی هەڵکێشاو دەستخۆشیم لەهۆش و وشیاری لئۆنا کرد کەبەدار دەنگی ماری دەرهێنابو. بەڵام شادمانی من زۆری نەخایاند و زۆر زوو بۆنی هیوایی گۆڕا چونکە لەم کاتەدا بیستم کە ئاپاچییەکان بۆ ئاگردانی ئەشکەوتەکە پلان دادەرێژن و بریاردەگرن.

دووان سیانێکیان بۆ کۆکردنەوەی چیلکە بەدەوروبەردا بڵاو بوونەوە و بەخێرایی برێکی زۆر گژوگیای وشکیان لەبەردەم دەرگای ئەشکەوتەکە کەڵەکە کرد. بەجۆرێك کەرێگەی بینینی ئێمەشیان بەست. ئەگەر دارەکانیان ئاگردایە گەرمیەکەی گۆشتەکەی

دەبرژاندین و ئەمە فێڵێ بو بەتەقکردنیش نەمدەتوانی چارەسەری بکەم.

لئۆنا بیری کردەوەو وتی:

بیرت لەوە کردۆتەوە رەنگە ئەم ئەشکەوتە رێگایەکی تریشی هەبێت. ئێرەیان بۆ دروست کردوە سروشتیە یان ئەوەی دەستی مرۆڤ بەدیهێناوە.

بێ بیرکردنەوە وتم: سروشتیەو بەدڵنیاییەوە رێگای تری نیە.

لئۆنا دەستی منی کێشاو وتی: بەهەرحاڵ کێشە نیە بابڕۆین. تا ئەو شوێنەی رێگا هەیە دەڕۆینە پێش. رەنگە رێگایەك بدۆزینەوە.

دڵم روون بوویەوە و ئەمە بەمنی سەلماند بێ مەترسی لەوگێژاوە دەرباز دەبین. لەم کاتەشدا وەحشیەکان ئاگریان کردەوە.

با ئاگری بۆ ناو ئەشکەوتەکە دەهێنا و بەشێکی زۆری رووناك دەکردەوە. لئۆنا سەیرێکی ئاگرەکەی کرد و وتی: دەبینی؟ ئاگرەکە دێتە ژوور.

پرسیم: مەبەستت چیە؟

سەیرە، من کەشارنشین و خوێنەوار بووم، سەرنجم بەم خاڵە فیزیکە نەدەداو کچێکی وەحشی جەنگەڵ باشتر لەمن تێدەگەشت. بەهەرحاڵ لئۆنا وتی:

مەبەستم ئەوەیە ئەم ئەشکەوتە رێگای تریشی هەیە ! مەگەر نابینی ئاگر دێتە ژوور. ئەگەر رێگای تری نەبوایە ئاگرەکە دەهاتە ناو ئەشکەوتەکەو دەکوژایەوە.

ئەو نەیدەتوانی بڵێت لەبەربوونی هەوا ئاگر بەڕۆشنی دەمێنێتەوە. باوەڕەکەیم پەسند کرد و چونکە بڵێسەکانی ئاگر بڕێکی زۆری رێگاکەمانی رووناك دەکرد بەخێرایی رۆشتینە پێش. شتێك کەدەبووە هۆی ناڕەحەتی ئێمە ئەوەبو گەرمی ئاگر مارو ئاژەڵەکانی تری ناو ئەشکەوتەکەی دەخستە جم و جووڵ و دوورنەبو لەکاتی راکردن بمانکەنە پاروی خۆیان.

لئۆنا لەپێش منەوە رایدەکردو منیش بەدوایدا دەڕۆشتم. کۆتایی ئەشکەوت تەسك بو بەڵام دووبارە فراوان دەبو. من و لئۆنا یەك لەدوایەك لەرێرەوە تەنگەکانی کۆتایی ئەشکەوتەکە تێپەڕیین و لەناکاو خۆمان لەپانتاییەکی بەربلاو دا بینیەوە کە سەد هەنگاو ئەولاتر جەنگەڵ بەهەموو جوانیەکەیەوە دەبینرا. بەخۆشحاڵیەوە ئاپاچیەکان ئەو رێگا شارەزانەبوون و ئێمە بێ مەترسی لەچنگیان رامانکردو رۆشتینە ناو دڵی جەنگەڵ. چەند کاتژمێر رامان کرد و سەرئەنجام گەشتینە رووبار کەیەکێك لەلقەکانی ئامازۆن بوو. لەوێدا حەساینەوە.

ئاوابوونی خۆر نزیك بوو. هەرچی سەیری دەورووبەرم کرد ئەو شوێنەم نەناسیەوە. یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی جەنگەڵ ئەوەیە لەهەموو شوێنەکان چوارچێوەی بینینی مرۆڤ یەکەو ئەگەر رێبوار نیشانە دانەنێت رەنگە رێگایەك دوو جار پیایدا بڕوات بێ ئەوەی هەستی پێ بکات.

بەهەرحاڵ لە لئۆنام پرسی: ئێستا لەکوێین؟

لەکاتێکدا لەقەراغ رووبار دادەنیشت تا قاچەکانی بشوات پێکەنی و وتی:

سەیرە.... چ پیاوێکی کەم هۆشیت.

بەسەرسوڕمانەوە سەیری دەورووبەرم کردو وتم:

سەیرنیە.... تا ئەمڕۆ نەهاتوومەتە ئەم شوێنە لەجەنگەڵ....

لئۆنا بەپەنجە شوێنێکی پڕ داری کەلەدرێژایی ئاوەکە بو نیشانداو وتی:

لەوێ کەدارەکان لەسەر ئاوەکە چەماونەتەوە بڕوانە. جوان ! دەیناسیتەوە....

هەرچەندە سەیرم کرد نەمتوانی شتێکم بیربێتەوە بۆیە وتم: نا.

لئۆنا عاشقانە سەیری کردم و وتی:

ئەوێ مایلایە..... مایلا..... ئەو شوێنەی مووناك تۆی زیندانی کردو بەنهێنی چاومان بەیەك کەوت..... بیرت کەوتەوە..... ئەو رۆژگارە شیرینەت لەبیر بردۆتەوە.....

بەبیتسنی ناوی مایلا دڵم داکەوت و حاڵەتێکی تایبەتم پێ بڕا. بیرەوەریەکانی رابردوم کەوتە بەرچاو. تاکاتێك رۆشنایی رۆژ بو سەیری دیمەنی مایلام دەکرد و لەدوورەوە دیاربو کەتاریکی هەمو شوێنێکی داگرت و رۆشتمە ناو خەوێکی قووڵ.

ئەوەندە هیلاك بووم بەبێ ترس خەوتم. بیرم نەکردەوە رەنگە لئۆنا رابکات و بڕوات. بەخۆشحاڵیەوە عەشق لەمپەڕێکی گەورە لەبەردەم راکردنی لئۆنا بو و ئێستا کە دووبارە بەخۆشەویستی من هیوادار ببو نەیدەتوانی رابکات. بەیانی کە لەخەو هەستام تا چاوم کردەوە وتی: دەمویست رابکەم.... بەڵام پەشیمان بوومەوە بێ تۆ ناتوانم بژیم و چونکە دڵنیام رێگە نادەیت بمکوژن، هەمیشە لەگەڵ تۆ دەمێنمەوە.

لەم کاتەدا دەنگە دەنگ لەدەورووبەرمان بەرز بوویەوە و تا هاتمە خۆم روبەڕوی یوری و شائکی و تاقمێکی زۆر لە ژنان و پیاوانی ئامازۆن بوومەوە.

لئۆنا رەنگی پێوەنەماو لەترسا دەلەرزا. یوری بەشێوەی سەر کۆنەکردن وتی:

دەمزانی کە بەڵێنە کۆنەکان دەژیینەوەو ئەمانۆ لەبیر دەکەیت !

پیاوان و ژنانی ئامازۆن بەرقەوە سەیری لئۆنایان دەکردو ئەگەر لەمن نەدەترسان

ویان ڕێزیان نەدەگرتم بەچنگ و نینۆك تیکە تیکەیان دەکرد و گۆشت و ئێسقانی جەستەیان دەخستە ناو ئاوی ڕووبار.

سەیرێکی دەوروبەرم کردو وتم: دەڵێی هەموو ژنانی ئامازۆن زیندوون....

شانکی وتی: ئەمانە لەجەنگەڵدا بڵاوببوونەو خۆیان داشاردبو و دواتر کە ترس نەما، بۆ هۆز گەڕانەوە و ئێستا سەرقاڵی خانو دورست کردنن.

چەند کەس لەژنان بەقاوەقیژ وتیان:

لئۆنا دەبێت بکوژرێت. ئەو دەبێت سزا بدرێت.

یوری سەیرێکی منی کردو شانەکانی بەرزکردەوەو وتی:

دەبینن.... چارە نیە... دەبێت لئۆنایان پێ بسپێرین کە هەرجۆرێك دەیانەوێت بیکوژن.

بارودۆخێکی مەترسیدار هاتبووە پێش و یوریش لەگەڵیاندا ڕازی بو.

من زیاتر لەیوری تووڕەبووم. ڕەزامەندی ئەو لەگەڵ ئامازۆنیەکان بۆ کوشتنی لئۆنا بووە هۆی تووڕەیی من. ڕاستیتان بوێت بۆ من لئۆناو ئەمانۆ جیاوازیان نەبو. هەردوکیان جوان بوون و هەردووکیانم خۆش دەویست. بەم جیاوازیە کە هەرکات هەرکامیان لای من بوایە، ئەوم زیاتر خۆش دەویست. بەگشتی حەزم لە ڕەگەزی ژن بو. ئەمانۆ جوانیەکی جادووی بوو. لئۆنا ژنێك بوو هەوەسەکانی منی تێر دەکرد و نەمدەتوانی بەمەرگی لئۆنا ڕازی ببم. ئەمە ئەنجامێك بو لەیەك دوو چرکە بیرکردنەوە بەدەست هات.... نە تەنیا لئۆنا بەڵکو نەمدەتوانی هیچ ژنێکی تر بە جەلاد بسپێرم.

ئەگەر من ڕازی دەبووم لەچاوترووکانێکدا لئۆنایان دەکوشت. ئەو تاوانبار بو، ئامازۆنیەکان ئەویان بەلێپرسراوی کوشتار دەزانی.... مووناك وکچەکەشمی کوشتبو. لەگەڵ ئەوەشدا خۆشم دەویست، جوان بو لەبەرئەمە بەمردنی ڕازی نەدەبووم.

یوری چاوی لەروخسارم هەڵنەدەگرت. دەتوت ئەندێشەکانم لەسەر هێڵەکانی ناوچاوم دەخوێنێتەوە بەڵام من لەروخساری وشکی ئەو هیچ تێنەگەشتم و نەمدەزانی بەڕاستی لەگەڵ کوشتنی لئۆنادایە یان ئەم کارەش وەك هەندێ کاری تری لەڕوی سیاسەت ودوورە ئەندێشیەوەیە.

داماو پەرێشان بووم. دەنگی ژنان و پیاوانی ئامازۆن کە لئۆنایان دەویست لەگوێمدا دەزرنگایەوە. سەرم دەنگی دەدایەوە.... دڵم ناڕەحەت بو بۆ لئۆنا کە لەبەردەم دەروازەی مردندا بو، خەمباربووم. ئێرە شوێنێك بوو یوری دەیتوانی یارمەتیم بدات بەڵام ئەو

بەڕاستی لەگەڵ ئامازۆنەیەکان بو و بۆ کوشتنی لئۆنا پێداگری دەکرد. هەموویان مافی خۆیان بو و یوریش بەپێچەوانەی ویژدانەوە قسەی نەدەکرد بەڵام من کەسێك بووم نەمدەویست ژنێکی ئازیزو خۆشەویست وەك لئۆنا بەدەست مردن بسپێرم. ئاشکرابو کەلئۆنا ببوە هۆی کوشتاری ئامازۆن و دەبوا سزای تاوانەکەی ببینێت و بکوژرێت.

دەمویست بەرگری لێبکەم بەڵام بەرگری دژوار بو، لەلایەك ئەمانۆم لەدەست دەدا کە وەك گیانی خۆم خۆشم دەویست و لەلایەکیتر هۆز و هەموو دانیشتوانەکەی دەبوونە نەیارم و بەشێکی گەورە لەرێزو خۆشەویستیم لەدەست دەدا.

لەم کاتەی کە بەتەواوی هیوابڕاو ببوم شائکی بەهێواشی خۆی بەمن گەیاند و وتی:

سەرۆك داوای مۆڵەتیان لێ بکەن... بەدانی مۆڵەت رازی دەبن....

پرسیم: گریمان مۆڵەتم وەرگرت دواتر چی دەبێت. سەرئەنجام دوای تەواوبوونی ماوەی دیاریکراو دەیکوژن. وتوێژی من و شائکی بەهۆی هاواری تووڕەو بەرزی ئامازۆنیەکان کە سات بەسات ژمارەیان زیاتر دەبو، پچڕا.. ئەوان بەڕاستی دەیانویست من لئۆنا وەك بەستەیەك بخەمە بەردەستیان کە بەچەند تیرێك سەری لەجەستەی جیابکەنەوەو ئەندامە جوانەکانی تیکە تیکە بکەن. شائکی وتی:

ئێستا باشتر لەمە رێگایەك لەبەردەستا نیە. داوای مۆڵەت بکەن. لەماوەی هەفتەیەکدا بیرێك دەکەمەوە و نەخشەیەك دەکێشم، خەیاڵتان ئاسوودە بێت.

لئۆناش وتوێژی ئێمەی بیست. بەترس و لەرزەوە خۆی لەپشت منەوە داشاردبو تا لەزیانی تیرەکانیان پارێزراوبێت. دوور نەبو لەناو قەرباڵغیەوە یەکێك لەپیاوەکان تیرێکی بۆ بهاوێت ودڵی کون بکات. لەم شێوەشدا ناسینی بکوژەکە ئەگەری نەبو ولەلایەکیتریش ئەوانیتر نەیان دەناساندو دایاندەپۆشی.

لئۆنا بەرادەی پێویست وشیارو زیرەك بو، ئەنجامی کاری خۆی بەباشی دەزانی. قیافەیەکی داماوی بۆخۆی دروست کردبو تا لەدڵی بینەڕاندا خۆشەویستی دروست بکات. لئۆنا کە لە گەڕان بەدوای شتێك بۆ رزگارکردنی گیانی خۆی بو، پێشنیارەکەی شائکی پەسەند کردو لەگوێی مندا بێ ئەوەی کەمێك سەرنجی راکێشرێت وتی:

راست دەکات. مۆڵەت وەربگرە. ئەوان رەزامەندی نیشان دەدەن.

هێشتا قسەکانی تەواو نەببو کە چەند کەس لەناو قەرەباڵغیی جیابوونەوەو بۆو پەلاماری ئێمە هاتن. پێنج کەس بوون. چوار ژن و پیاوێك. دواتر زانیم پیاوێك کەلەناو ئەو پێنج کەسەدا دەبینرا یەکێك بو لەعاشقەکانی ئەمانۆ و لەبەر ئەمە لەگەڵ مندا

دوژمنایەتی بو.

بەهەرحاڵ کاتێك ئەو پێنج کەسە گەشتن، یوری و شائکی وەك دوو دیواری ئاسنی ڕێگەیان بەستن.... ژنەکان خەنجەریان پێبو یەکێك لەوان تیروکەوان.

یوری پرسی: چیتان دەوێت....؟

ئەو پیاوە وتی: ئێمە لەلایەن دانیشتوانەوە هاتووین.

یوری سەیرێکی روخساوی وشك و سووتاوی کردو وتی:

تۆ کێیت......؟ ناوت چیە........؟

ئەم پرسیارە وەك ئاگادار کردنەوە بۆ ئەوکەسە دەژمێردرا چونکە لەوکاتەدا ئاگادار بوون لەناو زۆر پێویست نەبو. یوری لەچاوەڕوانی وەلامەکەی خۆی بە تووڕەییەوە سەیری روخساری کرد. دەتوت دەیەوێت مەبەستی ناخی خۆی لەچاوەکانی بکێشێتەدەر و تێبگات. پیاوی ئاماژەپێدراو کەماسولکەی بەهێزی بو وتی:

ناوم (( کۆماتۆ )) یە و تا ئێستا ژمارەیەکی زۆر پڵنگم کوشتووە...

لەنێوان یوری و کۆماتۆ چەندین نیگا ئاڵ و گۆڕکرا. تەنیا من مانای نیگای یوریم دەزانی و دەمزانی لەداهاتوودا چی دەبێت و هاوڕێ کەم چ بەڵایەك بەسەر پڵنگ کوژ دەردێنێت. یوری لەلات و فشەکەڕەکان بێزاربو و هەر بۆیە کاتێك لەگەڵ پیاوێکی لەو جۆرە روبەڕو دەبوویەوە، خێرا حسابێکی بۆ دەکردەوەو نەخشەی دەکێشا. ئەو و کۆماتۆش لەهەمان نیگای یەکەمەوە لەیەك بێزاربوون. من زۆر لەم رووداوە شادمان بووم. یوری بزەیەکی گرت و وتی:

زۆر باشە.... کۆماتۆی ئازا چیت دەوێت؟ قسە بکە !

کۆماتۆ وتی: لئۆنامان بەنە دەست.... ئەو خیانەتی لێکردوین و دەبێت لەبەرانبەر خوای جەنگەڵ بکوژرێت. کەسانێك کەخیانەت لەهۆز دەکەن لەئاگری پیرۆزدا دەسووتێنرێن.

یەك لەو چوار ژنە بەتەمەنتر لەوانیتر بو، هەنگاوێك هاتە پێش و لەکاتێکدا بە پەنجە ئیشارەی بۆ لئۆنا کرد وتی: ئەو...... ئەومان بەنە دەست.... نابێت بیشارنەوە.

یوری وتی: ئێمە نایشارینەوە.... مەگەر دوێنێکە پێم نەوتن هاوڕێکەم بۆ دەستگیرکردنی ئەو رۆشتۆتە جەنگەڵ و ئێوە باوەڕتان بەقسەکانی من نەکرد..... بینیتان کەڕاست دەکەم.....

هاوڕێکەم بەدژواری لەدەست ئاپاچیەکان رزگاری کردوەو تا ئێرە هێناویەتی:

لئۆنا بە ئەنیشك لە کەلەکەی منی دا و وتی:

ئێستا کاتی مۆڵەتە.

لە شوێنەکەم هەستام و ڕۆشتمە لایان. چوار ژنی ئامازۆنی لەبەر ڕێزی من سەری خۆیان دانەواند. ئەوان بەیادی مووناك و لەسەر ئەو ڕێزەی بۆ ئەویان دادەنا، منیشیان بەرێزەوە سەیر دەکرد. کۆماتۆ بە بێزاری و رقەوە سەیرێکی بەژن و باڵای کردم و وتی:

ئەم پیاوە عادەتیەی ژنانی ئامازۆن بفرێنێت و بیانباتە جەنگەڵ. ئەمانۆشی لەگەڵ خۆیدا بردبوە جەنگەڵ. ئەوان دەبێت ببنە خواردنی مێرووله سوورەکان چونکە بە پێچەوانەی یاسا تێکەڵاو بوون.

مەبەستی ئەوەبو کە من و لئۆنا ببینە پاروی مێرووله سوورەکان. ئاوا یاسایەك لەهۆزی ئامازۆندا هەبو بەڵام نە بۆ کچ و یان پیاوێکی بێ ژن و یان پیاوی ژن مردوو بەڵکو بۆ پیاوی ژندارو و ژنێك کەمێردی هەبێت.

وەڵامی کۆماتۆم نەدایەوەو بەو ژنەم وت:

ئێوە مافی خۆتانە. من ئەوم لە ئاپاچیەکان سەند کەسزا بدرێت بەڵام چونکە لەمێردە کۆنەکەی سکی هەیە مۆڵەتی بدەن هەفتەیەك لەزینداندابێت.

کۆماتۆ بەخێرایی قسەکەی بڕی وتی: ئەو درۆ دەکات...... سکی نیە.

یوری وتی: ئێمەش دەمانەوێت دڵنیابین کەسکی هەیە یان درۆ دەکات.... گوومان ئەکەم ئەگەر هەفتەیەك لەژێر چاودێریدا بێت هەموو شتێك دەردەکەویت. وانیە...

یوری بەپێچەوانەی گوومانی من ڕەزامەندی نیشان دا، زیاد لەرادە شادمان بووم. ژنان سەیری یەکیان کردو وتیان:

زۆر باشە بەڵام دەبێت لای ئێمە زیندانی بێت.....

کۆماتۆ وتی: رازی مەبن..... ئەو دەبێت بکوژرێت.

یوری بێ ئەوەی قسەبکات دەستی لەسەر ڕەشاشەکەی داناو لەژێر چاوەوە سەیری کۆماتۆی کرد. ئەو هەستی بەمەبەستەکەی یوری کردو بێدەنگ بو. بەم شێوەیە ڕەزامەندی نیشاندرا و منیش دوای ئەوەی بەڵێنم لێ سەندن کەزیان بە لئۆنا نەگات بۆلای لئۆنا گەڕامەوەو ڕووداوەکەم پێوت. لئۆنا شادمان بوو. بەروخسارێکی کراوە لەشوێنەکەی هەستاو هاوڕێ لەگەڵ ئامازۆنیەکان بۆ زیندانێك کە بۆیان دیاری کردبو، ڕۆشت.

## ( ١٧ )

ئەمانۆ لەماڵەوە چاوەڕێی منی دەکرد. شووماشی لای خۆی ڕاگرتبو. بارودۆخی هۆز شێوابو. ژن و پیاو پیرو گەنج کە زیندوو مابوون کاریان دەکرد و ماڵە نیوە سووتاو وێرانەکانی خۆیان چاك دەکردەوە. هەموویان لەهات و چۆ و چالاکیدا بوون، یوریش بیرێکی لەحاڵی خۆی کردبوو دووبارە ژنی هێنابو. بێ ئەندازە هیلاك بووم، ئەمانۆ بە ڕوخسارێکی مۆن و ڕووگرژی دەرگای لەسەر کردمەوە، تەنانەت کاتێك قاچەکانمی لەئاوی شیلەتێندا دەشۆرد، یەك وشە قسەی نەدەکرد و گرێی ناوچاوانی نەدەکردەوە. تێگەشتم کەچەند ناڕەحەت وتووڕەیە. جل و بەرگێکی تەنگ و تەسکی لەبەرکردبو.

ئەمانۆ بێ زیدەڕۆیی جوان و خۆشەویست بو. بەتایبەت چاوەکانی وەك مار دڵرفێن بو. زیاد لەرادە خۆشم دەویست چەند جارێك گاڵتەم لەگەڵدا کرد و لەژێر لچەوە قسەم کرد بەڵام ئەمانۆ بەهیچ جۆرێك نەیدەویست ئاشتیم لەگەڵدا بکات.

هێشتا خواردنێك کە ئەمانۆ بۆی دروست کردبووم نیوە تەواو بو کەشائکی هاتەژوور. تفەنگەکەکەی لەبەردەم دەرگاکە داناو بەرێزەوە سلاوی کردو دانیشت، دەست بەجێ وتی:

ئەم کۆماتۆیە پیاوێکی مەترسیدارە، ئەگەر ڕێگە بدەن ئەمشەو دەیکوژم.

ئەمانۆ بە بیستنی ئەم قسە ئاوڕی بۆ شائکی دایەوەو بەتووڕەیی وتی:

مافی ئەوەت نیە بیکوژیت.... ئەگەر زۆر پیاویت بەبێ تفەنگ بۆ کوشتنی بڕۆ تاسەرت وەك چۆلەکە لێبکاتەوە.

من کەلە هیچ شتێك ئاگادار نەبووم، بەسەرسوڕمانەوە پرسیم:

تۆ بۆ لەکۆماتۆ بەرگری دەکەیت !؟

شائکی پێش ئەوی ئەمانۆ وەڵام بداتەوە وتی:

مەگەر نازانن، کۆماتۆ عاشقی ئەمانۆیە. هەموو ئەم پێستە پڵنگانە کەئێوە لەسەری دانیشتوون و ئەمانۆ ژوورەکەی پێ فەرش کردوە، پێشکەشی کۆماتۆیە.

ڕەنگی ئەمانۆ وەك گەچ سپی بو. بەنیگەرانیەوە سەیری کردم و سەری داخست و لەتووڕەیدا دەلەرزیم چونکە دەترسام کردەوەیەکی ناشرین بکەم، لەشوێنەکەم هەستام،

ڕەشاش و فیشەکەکانم هەڵگرت و لەماڵەکەی ڕۆشتمەدەر. شائکی بەدوامدا هات و لەناوەڕاستی گۆڕەپانی هۆز خۆی بەمن گەیاند و وتی:

سەرۆك بۆ کوێ دەڕۆن.....؟ وەرن بۆ ماڵی من.

گێژو وڕبووم بێ ئیرادە لەگەڵ شائکی ڕۆشتمە ماڵەکەی و لەسەر پێست دانشتم و خەوتم.

نیوە شەو لەخەو هەستام. شوومام بینی کە لەسەر سەرم دانیشتبو ! کاتێك چاوەکراوەکانی منی بینی بزەیەکی لێداو وتی: ئەمانۆ دەگری، چیتان کردوە؟

بەتووڕەییەوە وتم: بێدەنگ بە، باسی ئەو لای من مەکە.

شووما ئیتر قسەی نەکرد و چونکە تینووم بوو، کەدوی ئاوی فێنك کە بەتەنافی ژوورەکە هەڵواسرابو دایە دەستم. هێشتا قومێکم نەخواردبو کەدەرگای ژوورەکە بەهێواشی کرایەوەو سێبەری پیاوێك دەرکەوت.

بەگوومانی ئەوەی بێگانەیەك دەیەوێت بمکوژێت بۆ هەڵگرتنی ڕەشاشەکەم دەستم درێژکرد بەڵام شووما دەستی گرتم و وتی: شائکیە، بێگانە نیە.

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم: شائکی لەم شەوەدا لەکوێ بویت؟

دەنگی بیستم و وەڵامی دامەوە.

پشت زیندانی لئۆنابووم.... ئاگاداری ئەوم... کۆماتۆ پیاوێکی مەترسیدارە دەترسم لئۆنا لەسەر دژایەتی کردنی ئێوە بکوژێت...

کاتێك شائکی روبەڕووم دانیشت وتم:

ئێستا دەبێت چی بکەین....؟ دەبێت چی بکەین.... ئەو بەگوومانی ئەوەی من لەبارەی کۆماتۆ قسە دەکەم وتی: هیچ.... ئەگەر ڕێگە بدەن وەك سەگ دەیکوژم.

لەوڵامدا وتم: نە وازی لێ بێنە. رەنگە پێش زانینی بابەتەکە بەکوشتنی ئەو رازی دەبووم بەڵام ئێستا کەزانیم ئەو عاشقی ئەمانۆیە و لەنێوانیاندا پەیوەندی هەیە حەزناکەم بمرێت. ئەگەر بکوژرێت هەمووان تێدەگەن کە ئەوم بەناجوامێری و لەرووی حەسوودیەوە کوشتووە.... نا، ئەو دەبێت زیندووبێت.

شووما جوان گوێی لەقسەکانی ئێمە دەگرت. دیاربو لەلایەن ئەمانۆوە راسپێردراوە کەهەرچی دەبێت بۆی باس بکات. شائکی وتی:

ئێوە ئەمڕۆ چاوەڕێ نەبوون من قسەکەم تەواو بکەم. بێهۆش و تووڕە بوون....

پرسیم: دەتویست چی بڵێیت کە ناتەواو مایەوە؟

وتی: زۆر کەس ئەمانۆیان خۆش دەویّت..... رەنگە لەنیّوان پیاوانی هۆزی ئامازۆن چەند کەس هەبن کە ئەمانۆیان خۆش نەویّت و عاشقی نەبن. ئەوانی تر بەبیّ جیاوازی ئارەزوی ئەویان لەگەڵدایە. کۆماتۆیش یەکیّك لەوانە بەلاّم ئەمە هۆی ناپاکی ئەمانۆ نیە... ئەمانۆ گویّی بەرەگەزی پیاو نەدەدا و من سەرم سوڕما کاتیّك ئەوم لەگەلّ تۆ بینی.... ئەو زیاتر لەهەموان لەکۆماتۆ بیّزارە !

سەرەتا وام دەزانی شائکی بۆ ئارام کردنەوەی من درۆ دەکات بەلاّم دووبارە بەهەموو وتەکانی رازی بووم و ئارمییەکی دڵگیر هەموو رۆح و گیانی داگرتم.

دڵم کرایەوە.... سەرم کە بەقوورسی ژانی دەکرد ئازاری نەما، هەناسەیەکم بەئاسوودەیی هەڵکیّشا.....

راستی نزیك بو شیّت ببم.

من ئەمانۆم خۆش دەویست. کاتیّك زانیم ئەو سەرنج بەکۆماتۆ نادات دەتوت دەرگاکانی بەهەشتیان بەسەردا کردومەتەوە، خۆم بە بەختەوەر دەزانی.

شائکی قسەکەی خۆی بڕی و روویکردە شووماو وتی:

باشە، ئیّستا تۆ برۆ لای ئەمانۆ، ئەو تەنیایە.

شووما هەستاو رۆشت ودواتر شائکی وتی: ئەم منالّە لای ئەمانۆ هاتبوو. ئەمانۆ ئیّوەی خۆش دەویّت و گویّی بەکۆماتۆ نادات لەویّوە کەشانستان لەگەڵدایە، رووداویّکی خۆش روویدا، هیچ هەستتان پیّ کردوە.....؟

شائکی روونیکردەوە و وتی: تووڕەبوونی ئیّوە لەئەمانۆ دەرفەتیّکی باشە تا ئازادانە بۆ رزگاری لئۆنا کاریّك بکەن.

هیّشتا قسەکەی تەواو نەکردبو کەدەنگی کرانەوەی ژوورەکە بیسترا و ساتیّك دواتر سیّبەری بچووکی شووما دەرکەوت و دەنگی بەگویّ دەگەشت کەترسان و شڵەژاو وتی:

لئۆنایان دزی...... لئۆنایان برد.

من و شائکی لەشویّنەکەمان بەرزبووینەوە. بەخیّرایی ڕەشاشەکەم هەڵگرت و بەڕاکردن لە ژوورەکە رۆشتمە دەر. لەدەرەوەی ژوورەکە بەشوومام وت:

ماڵی یوری دەزانیت؟

منالّ وتی: ماڵە تازەکەی دەزانم.

برۆ هەڵیستیّنە و بیهیّنەرە ئیّرە.... خیّراکە...... زووکە.

شووما بەخیّرایی رۆشت و من و شائکی بەرەو زیندان رۆشتن. دەرگای زیندان

کراوەبو. پاسەوانی یەکەم کوژرابو و ناوسکی رژابووە سەرخاك و دیار بو پیاوێکی بەهێز بەخەنجەر سکی هەڵدڕیوە و ئەم کارەی لەروبەڕوو بەپشت گەرمی هێزی خۆی ئەنجامدراوە.

هەمیشە زیندانی ژنانی ئامازۆن پاسەوانێکی ژنیشی بوو. من بەدوای ئەودا دەگەڕام بەڵام هیچ شوێنەوارێك لەو نەبو.

لئۆناش لەوێ نەبو. پەنجەرەی داری ژوورەکە شکابوو و لەدیوارە گڵەکەش دەرهاتبو و هەموو دیاردەو نیشانەکان نیشانی دەدا کۆماتۆ بەم کارە هەستاوە چونکە هیچ پیاوێکی تر ئەم هێزەی نەبو.

شائکی لەنیگای یەکەمدا وتی: دەبینن.... کۆماتۆ بەچ خێراییەك لەبێ ئاگایی من کەڵکی وەرگرت و لئۆنای برد. تەنیا نیو کاتژمێر کەمتەر خەمیم کرد.

پرسیم: گوومان دەکەیت بۆ کوێیان بردبێت؟

بەخوێنساردی وتی: بۆ کوشتن دەیبەنە پەرستگا و بەدڵنیاییەوە جادوگەرانان لە کوشتنەکەی ئاگادارن و هاوکاری دەکەن. دەتانەوێت بڕۆن بەدوایاندا.

شائکی کە منی لەبیرکردنەوەدا بینی وتی:

کۆماتۆ بۆیەکسەرەکردنی کار پشتی بەفێڵ بەستووە. سەرەتا لئۆنا دەکوژێت و تۆڵەی لێ دەستێنێتەوە. دواتر ئێوە لەهۆز دووردەکاتەوەو بەئامادەبوونی ئێوە ئەمانۆ دەفرێنێت و دەیباتە شوێنێکی دوور دەست لەجەنگەڵ، سەرئەنجام کاتێك ئێوە بەدوای ئەمانۆ و لئۆنا دەڕۆنە جەنگەڵ ناجوامێرانە هێرشتان دەکاتە سەرو دەتانکوژێت. دەبێت زۆر ئاگادار بن. لەتووڕەییدا دەلەرزیم. دیانەکانم وەك بڵێی لەناو بەفر و بۆراندا گیرم خواردبێت شەقەیان دەهات و هەرچیم دەکرد نەمدەتوانی خۆم کۆنترۆڵ بکەم. لەم کاتەدا یوری لەدوورەوە دەرکەوت و وتی: چی بووە... رکەبەری تازە کاری خۆی ئەنجامداوە؟

شائکی رووداوەکەی بۆباس کردو وتی: بە بۆچوونی من کۆماتۆ بە وەرگرتنی رەزامەندی جادوگەرانانی هۆز لئۆنای فڕاندوەو بۆ ئیعدام بردویەتیە پەرستگا. ئەگەر زووتر رێبکەوین لەرێگای پەرستگادا پێیان دەگەین.

وتم: رەنگە لەرێگادا لئۆنا بکوژێت.

یوری وتی: شائکی راست دەکات... دەبێت خێراتر بەرێکەوین.... دڵنیابە.... ئەوان لئۆنا لەرێگادا ناکوژن چونکە دەیانەوێت خوێنی ئەو بۆ رەزامەندی خواکانی جەنگەڵ بڕێژن و ئەم کارە تەنیا لەپەرستگا لەبەرانبەر خوای جەنگەڵ ئەنجام دەدەن.

پێش بەڕێکەوتن وتم: چی لەئەمانۆ بکەین؟ کۆماتۆ ئەویش دەفڕێنێت.

یوری بزەیەکی گرت و وتی:

ئاسوودەبە ئەو زیندوو ناگەڕێتەوە بۆ هۆز کە ئەمانۆ بفڕێنێت ! خێراکەن کات دەڕوات. لەم ماوەدا دانیشتوانی هۆز بەهۆی راکردن و هات و چۆی ئێمە هەستابوون و لەرووداوی دزینی لئۆناش ئاگاداربببوونەوە. کاتێك لەدەرگای زیندان رۆشتینە دەر، ژمارەیەکی زۆر لەئامازۆنیەکان لەوێدا کۆببونەوەو بۆ زانیاری و ئاگاداربوونی لەوێ وەستابوون. ئێمە لەناو دوو ریز تێپەڕین و گەشتینە ناوەڕاستی گۆڕەپان کەلەناکاو ژنێك خۆی بەمن گەیاندو وتی:

مەڕۆ..... مەڕۆ....... بەتەنیا جێم مەهێڵە...... منیش لەگەڵ خۆت ببە.

پێش ئەوەی روخساری ببینم لەدەنگیەوە ناسیمەوە. ئەمانۆ کە لەدرێژایی شەو گریا بوو و چاوەکانی ئاوسابوون بەهۆی شووما ئاگادار کرابوویەوەو بەپەلە خۆی گەیاندبووە ئەوێ. سەیرێکم کردو وتم:

لەبەرچاوم دووربە.... نامەوێت بتبینم. چاوەڕێ بە عاشقەکەت دێت و تۆم بەئەو ئەوم بەتۆ بەخشیوە لاچۆ.

یوری و شائکی کەمێك دوورکەوتبوونەوە و چاوەڕوانی من بوون. دەلەرزیم، تووڕەبووم. شائکی بەراشکاوی وتی کە لەنێوان ئەمانۆو کۆماتۆ هیچ پەیوەندیەك بونی نەبوەو نیە و ئەمانۆ ئەو پیاوەی خۆش نەویستووە و خۆشی ناوێت. بەهەموو خوێنساردی و دڵنیایی خۆم نەمدەتوانی تاریکی دەڵم دوور کەمەوەو وەك جاران بەئەمانۆ خۆشبین بم. لەگەڵ ئەمەشدا خۆشم دەویست. بەڵام راستیتان بوێت دەمویست ئازاری بدەم، بیگریێنم....

فرمێسك بڕژێنێت تاهەستی لەخۆبایی بوون و غروری پیاوانەی من تێر ببێت.

خاڵی گرنگتر ئەوەی لەو سەفەرە پر مەترسیدارەدا نەمدەتوانی لەگەڵ خۆم ببەم.

ئەمە ئەگەری نەبو، لەهەمان کاتیش دڵنیانەبووم کەلەهۆزدا بمێنێتەوە.... بەڵام مانەوەی باشتر بو لەوەی لەگەڵ مندابێت ولەبەرچاومدا بکوژرێت.

ئەمانۆ دووبارە سەرەرێگای لێ گرتم و لەکاتێکدا بەتووندی دەگریا وتی:

نا..... مەڕۆ، مەڕۆ یان منیش لەگەڵ خۆتدا ببە..... من نامێنمەوە..... ئەگەر بڕۆیت ئیتر من نابینیتەوە. دووبارە پاڵم پێوەنا.... یوری و شائکی و تاقمێك لەدانیشتوان لەولاوە وەستابوون و سەیریان دەکردین... هەوا کەم کەم رووناك دەبوویەوەو

خۆرهەڵاتی ئاسمان زیوی رەنگ دەردەکەوت. لەرووناکی بەرەبەیان روخساری خەمبارو چاوەپڕ فرمێسکەکانی ئەمانۆ جوانتر دەبینرا، بەبینینی چاوەکانی، بەبینینی قووڵایی نیگای کاریگەری، شڵەژام... بەڵام دووبارە.... پاڵم پێوەنا و ئەم جارە بەتووڕەییەکی دەستکردو وشك وتم: برۆ..... برۆ..... نێوانی من و تۆ تەواو.

ئەمانۆ منی خۆش دەویست خۆی خستە سەر زەوی و دووبارە رێگەی لێگرتم و بەپارانەوە وتی: بەزەییت بەمندا بێتەوە...... بمبینە... دەمرم بیَ تۆ ناتوانم بژیم.

لەم کاتەدا بەگریانەوە خۆی دەخستە سەرقاچم و باوەشی بەقاچمدا دەکرد، بەپارانەوە وتی: من بکوژە، ئەوسا برۆ..... نایەڵم برۆیت...... دەبێت بمبەیت.... سەرەتا بەگوولەیەك دڵم کوون بکەو دواتر برۆ...... تێدەگەیت.

نەمدەزانی چی بکەم..... نەمدەتوانی بڕیار بگرم... دڵم بۆی دەسووتا. ئەگەر شەرمم نەدەکرد، دادەموکامەوەو باوەشم پیادەکردو دەست و روخساریم ماچ دەکرد بەڵام.....

لەم کاتەدا یوری لەقەرەباڵغی جیابوویەوەو هاتەلامان و بەمنی وت:

ئێوە برۆن...... برۆن...... من و ئەمانۆ لەدواوە دێین.

دواتر چەمایەوەو ژێر بازووی ئەمانۆی گرت و بەرزی کردەوە. من رۆشتم و یوری و ئەمانۆ لەدواوە هاتن. بەم شێوە هەم ئەمانۆ لەگەڵ مندا ئاشت بوویەوەو هەم لەم سەفەرە پڕ مەترسیە کە چارەنوسی هەموومانی دیاری دەکرد و کۆتایی کارەکەمانی رادەگەیاند، لەگەڵما بو.

لە گۆرەپانی هۆز بەرێکەوتین. یوری وتی:

ئەوەندەش نابێت بەئامازۆنیەکان خۆش بین بین. ئەوان گوومانیان لەئێمە هەیە و رەش بین بوون و درەنگ یان زوو دژمان شۆرش دەکەن و شەرێکی خوێناوی روودەدات.

ئەمە بۆچوونی یوری بو. وەك هەمیشە بۆچوونەکانیم بەگونجاو دەزانی. کەمتر هەڵەی دەکرد و بەراستیش وابو، رووداوەکانی داهاتوو گریمان ئەگەر هەفتەیەك یان دوو هەفتە دواتر روویان بدایە، پێش بینی دەکرد. لەمنی پرسی:

سەرەتا بڵیَ ئایا دەتانەوێت لێرە بمێننەوە. گەران و گەشتی ئێوە تەواو نەبو، هیلاك نەبوون. وتم: نازانم مەبەستت چیە، ئێستا کاتی ئەم قسانە نیە، گوومان دەکەم خۆت هیلاك بوویت و بەم بیانووە دەتەوێت من ناچار بەگەرانەوە بکەیت.

شانەکانی بەرزکردەوەو تفەنگەکەی لەم دەست بەودەست کردو وتی:

ئێوە ناچار نین، ئەگەر دەتانەوێت دەتوانن تاکۆتایی تەمەن لەم هۆزەدا بمێننەوە.

منیش لەگەڵتانا دەبم بەڵام ئەوە بزانە ئیتر جێگەی من و تۆ لەم هۆزەدا نیە درەنگ یان زوو تیکە تیکەمان دەکەن.

پێش ئەوەی وەڵامی بدەمەوە یان بۆچوونی خۆم دەربیرم، پرسیارەکەمی دووبارە کردەوە وتی: نەتانوت چ بڕیارێکتان هەیە؟ ئایا دەمێننەوە یان دەڕۆین.

بێ درەنگ وتم: دەڕۆین... ئەم هەفتەیە یان هەفتەی داهاتوو دەڕۆین.

یوری بزەیەکی بەرەزامەندی هێنایە سەر لێو. لەژێر چاوەوە سەیرێکی ئەمانۆی کردو کەئێستا پێش ئێمە دەڕۆشت و وتی: ئەمە چی لێ دەکەن. مەبەستم ئەوەیە ئەمانۆو لئۆنا کە هەردووک جوان و جێگەی سەرنجی تۆن کامیان هەلدەبژێرن؟

بێ گوومان دوو دڵی وەك بڵێی چەندین رۆژی بەردەوام بیرم لێکردبێتەوە بڕیارمدا وتم: بیرکردنەوەی ناوێت. تۆش دەبێت تێگەشتبێتیت کە ئەمانۆم زیاتر لە لئۆنا خۆش دەوێت بەڵام هیچ ژنێك بەئەندازەی لئۆنا شیرین نیە.

یوری پێکەنی. پێکەنینێکی گاڵتە ئامێز و پڕ تانە و روخساری کردەوە و وتی:

ئێوە هەموو ژنە جوانەکانتان خۆش دەوێت. ئەگەر دەتوانن وەك مەهاراجەکانی هیندی حەرەم سەرایەکی گەورەتان بۆ خۆتان دروست دەکرد. سەدان ژنی جوانتان کۆ دەکردەوە، وانیە !

نەمدەزانی بۆ ئەم رستە پڕ گاڵتانەی یوری نەدەبوە هۆی رەنجاندنی من و کاریگەری خراپی لەسەر دانەدەنام. قسەکانی یوریم بەدڵ بو چونکە ئەو راستی دەکرد و من هەموو ژنە جوانەکانم خۆش دەویست. بەهەرحاڵ پێکەنیم و وتم:

تێدەگەم چی دەڵێیت.... لئۆنا و ئەمانۆ هەردوکیان جوان و خۆشەویستن بەڵام بۆ پلانێك کە ئێمە دامان رشتووە، ئەمانۆ شیاوترە. لئۆنا ژنێکی حەسوودو رقاویە و ئەگەر لەگەڵماندا بێتە دنیای پێش کەتوو دەبێتە ئەرك بۆ من و ئازارم دەدات. بەڵام ئەمانۆ ئارام و دەستە مۆیە.

یوری کەدەیویست زووتر کۆتایی بەم باسە بێنێت قسەکانی بڕیم و وتی:

کەواتە جێگەی درەنگ کردن نیە. چارەسەرێك بۆ لئۆنابکەین و بیسپێرین بەیەکێك لەهۆزەکانی دراوسێ و خۆمان رێگەی دنیای پێش کەوتو بگرینەبەر و هەرچی خێراتر لێرە دوورکەوینەوە.

بەم زووانە؟

زووە ! شەشەمین ساڵی مانەوەمان لەئامازۆن دەستی پێکردوە کام گەشتیارە

دەناسن شەش ساڵ لەشوێنێکدا مابێتەوە.

من کەحسابی ساڵ و مانگ و رۆژو هەفتەم نەبو وتم:

لەکوێوە دەزانن شەش ساڵ بەسەر گەشتەکەمان تێپەڕیوە؟ لەرووی کام رۆژپێو حسابی ساڵ و مانگت راگرتووە؟

یوری وەك ئەوەی سەیری منالێکی کەم هۆشیار بکات لەژێر چاوەوە سەیرێکی بەژن و بالأی کردم و وتی: تازە هاتبووینە ناو جەنگەڵ کەداری مۆز بەریان گرتبو، لەو رۆژە بەدواوە تائێستا پێنج جار مۆزمان خواردوە. چەند رۆژێکی تر وەرزی مۆز کۆتایی دێت. مەگەر نابینی کە پیرێژنەکانی هۆز سەرقاڵی وشك کردنی مۆزن. لەسەر ئەم حسابە شەشەمین ساڵی گەشتەکەی ئێمە لەچەند رۆژی داهاتوو دەست پێدەکات و یان چەند هەفتەیەك لەساڵ تێپەڕیوە.

یوری بەردەوام قسەی لەرابردوو و داهاتوو دەکرد. منیش جوان گوێم لەقسەکانی بو کەلەناکاو قیژەیەك بیسترا‌و شتێکی بەهێز و رەق وەك بەردێکی چەند کیلۆیی بەر کەلەکەی راستی من کەوت. ئازارێکی توند لەدڵ وسینەمدا دروست بو، هاوسەنگیم لەدەست داو لەلای چەپەوە کەوتم.

نەمدەزانی چی بو، ئەوەندەم زانی یوری وەك کەسێك بروسکە لێی دابێت لەشوێنەکەی بەرز بوویەوەو لقی دارێکی گرت و تەکانێکی بەجەستەی خۆی دا و چەند مەتر ئەولاتر لەسەر خۆڵ و گیاوەحشیەکان کەوت هەناسە لەسینەمدا توند ببوو. کەلەکەی راستم ئازاری دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا هێزم خستە سەر ئەنیشکی چەپ تا بەرز ببمەوە بەلأم هێشتا جەستەم لەسەر خاك بەرزنەکردبوویەوە کەدارێکی درێژ کەوتەسەر شانم و زەختێکی توندی لێکردم بەجۆرێك دووبارە کەوتمە سەر زەوی. لەم ناوەدا دەنگی شائکی بیسترا کەوتی: تەکان مەخۆن. بەتەواوی بێ جووڵەبن.

دارەکە لەسەر شانم بو بەدژواری سەیری ئەولام کرد، شائکیم بینی کەڕمێکی درێژکردوەو بەیارمەتی ئەو منی لەو حاڵەدا راگرتووە هێشتا لەرووداوەکە ئاگادار نەبووم هیچ شتێکم نەدەزانی. بەسەرسوڕمانەوە لەهەمان کات بەتووڕەیی پرسیم:

چی بووە بۆمنت راگرتووە؟

شائکی وتی: تەکان مەخۆن ئەگەر دەست یان قاچتان بەر تەنافەکە بکەوێت دەست بەجێ گرفتار دەبن. چاوەڕێ بن تارزگارت بکەین.

هێشتا سەیری دەوروبەرم نەکردبوو و بارودۆخی خۆم هەڵنەسەنگاندبو کەدەنگی

گریانی ئەمانۆ بەرز بوویەوە چی بووە..... ڕێگە بدەن منیش بڕۆمە لای ئەو.

دەنگی یوریم دەبیست کە ئەمانۆی ئارام دەکردەوەو دەیوت:

شووما جارێکیتریش سەرۆکی لەمردن رزگارکرد ئەو بەسەر کاتێك لە کەلەکەی سورۆکیدا کە دەیویست قاچی راستی بخاتە سەر تەنافەکە. دڵنیابە ئەو سەلامەتە.

بۆئەوەی ئەمانۆ ئارام بکەم بەدەنگی بەرز وتم:

من لێرەم........ حاڵم باشە.

شائکی و شووما بۆ پچڕاندنی تەڵەکە بەگەڕانێکی مەترسیدار سەرقاڵ بوون.

هەرسات ئەگەری ئەوەهەبو کە ئەڵقەی تەڵەکە بەرقاچی شووما یان شائکی بکەوێت و لەزەوی بەرزی بکاتەوەو بەتووندی بکێشێت بەزەویدا. تەڵەیەك کۆماتۆ بۆی ئامادە کردبووین، مەترسیدارترین جۆری تەڵە بوو. بەخۆشحاڵیەوە شووما خێرا هەستی پێکردو چوون و دەرفەتی قسەکردن و ئاگادار کردنەوەی منی نەبو بەسەر کێشای بە کەلەکەی راستم و منی خستە سەر زەوی و لەمردن رزگاری کردم.

ئەگەر قاچم بکەوتایەتە تەڵەکەوە تا بەرزترین لقی دارەکە بەرز دەبوومەوەو لەوێوە لەمێشکەوە دەدرام بەزەویدا. کۆماتۆ بەیارمەتی جادوگەرانان لەسەر ڕێگای ئێمە چەندین تەڵەی لەم جۆرەی دانابو. بەخۆشحاڵیەوە کەس گرفتار نەبو. چەند خولەك دواتر شووماو شائکی شوێنی تەنافەکەیان دۆزیەوەو هەموویان پچڕاندو بەم شێوەش لەتەڵەکە رزگارم بو.

ئەم ڕووداوە وەك راگەیاندنی مەترسی بو ئێمەی وشیارکردەوە کە لەوێ بەدواوە دەبێت ئاگاداری خۆمان بین و چاو و گوێ بەستراو گرفتار نەبین.

یوری وەك ئەوەی بەڵگەیەی بەبڕشتی بۆ قسەکەی خۆی دەسکەوتبێت، وتی:

ئێستا تێگەشتن کەبێ بەڵگە و لەخۆوە قسەناکەم.... پێم وتن ئامازۆنیەکان ڕەش بین بوون. راستیەکەی ئەوەیە جادوگەرانان تا ئەمڕۆ لەترسی مووناك و یان لەبەردەسەڵاتەکەی ئەو کاریان بە ئێمە نەبووە و ئێستا کە ئەونەماوە ئەوان بوونی ئێمە دووانە بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆیان بەمەترسی دەبینن و بڕیاریان داوە هەرچی زووتر لەناومان بەرن. کۆماتۆش ئەوانی هانداوە.

دزینی لئۆناش بەدەستووری ئەوان ئەنجامدراوە.

یوری ئەم بابەتەی بێ ترس و بەزمانی ئامازۆنی وت. شووما و شائکی و ئەمانۆش گوێیان لەقەسکانی دەگرت و لەم کاتەدا ئەمانۆ وتی:

ئەو ڕاست دەکات. ئەمڕۆ بەچاوی خۆم بینیم بۆ مردنی ئێوە دۆعای کەڵەشێر دەخوێنن.

پرسیم: دۆعای کەڵەشێر چیە....

بەدوای ئەم پرسیارە، قاقایەکی گاڵتە ئامێزم لێدا.

ئەمانۆ وتی: گوومانتان نەبێت.... گاڵتە مەکەن.... من دەیان جار بینیومە کە بۆ هەندێ کەس دۆعای کەڵەشێر خوێندراوە و ئەوکەسە خێرا نەخۆش کەوتووەو مردوە، یەکێك لەوان هەمان ڕۆژ کە دۆعا تەواو بو لەجەنگەڵ مار پێوەی داو مرد.

دووبارە پرسیم: ئاخر دۆعای کەڵەشێر چیە......؟ من نایزانم....

شائکی بۆ ڕونکردنەوە وتی: کەڵەشێرێك دەگرن و دۆعا لەدەمی دەخوێنن. پێش ئەوەی کەڵەشێرەکە دەنووکی خۆی جیابکاتەوە بەیەك زەربە سەری دەپەڕێنن و خوێنەکەی دەکەنە ناو قاپێك و لەپشت ماڵی کەسی مەبەست دەیپرژێنن بەخاکدا. ئەگەر ئەو کەسە لەسەر خوێنی کەڵەشێرەکە تێپەڕێت گوومانی تێدانیە دەکوژرێت و یان بەزووی توشی بەڵایەك دەبێت و دەمرێت.

من و یوری بەدەنگی بەرز بەنەزانی و بیروباوەڕی پوچی ئەوان پێکەنین و بۆئەوەی کۆتایی بەباسەکە بهێنرێت بەڕێکەوتین. من ژێر بازووی ئەمانۆم گرت و پێم وت:

مەترسە..... دۆعای کەڵەشێر کار لەمن ناکات.

ئەمانۆ کەمێك فرمێسك لەچاوە شەهلاکانیدا کۆببوویەوە، خۆی بەمنەوە نووساندو وتی: من ئەمەم دەزانی بۆیە سووربووم لەگەڵتا بێم. ناتوانم بێ تۆ بژیم. ئەگەر بڕیارە تۆبکوژرێیت منیش دەبێت بمرم و بەدەم قوڵپی گریانەوە سەری خستە سەرشانم و دەستی پێکرد.

دەستم بەقژە هەوریشمی و جوانەکانیدا هێنا، ڕوخساریم ماچ کردو وتم:

ئاسوودە بە، لەم یەك دوو ڕۆژەدا جەنگەڵ بەجێ دێڵین و لەم سنوورە کەدۆعای کەڵەشێر مرۆڤ دەکوژێت دووردەکەوینەوە.

ئەمانۆ بەسەرسوڕمانەوە وتی: مەگەر جەنگەڵ تەواو دەبێت؟

ئەو گوومانی دەکرد هەموو شوێنێکی دنیا جەنگەڵە و هەموو خەڵك لەناو دار وەك ئەو دەژین، کاتێك بۆم ڕوونکردەوە و چەند خولەك لەبارەی شارو خەڵکی شارنشین و شارستانیەت قسەم بۆکرد دەمی کرایەوەو ئەو دەیوت:

ئەگەر لەشاری ئێوەدا جەنگەڵ نیە، ئەی خەڵك چۆن ڕاودەکەن؟ لەکوێ میوە بەدەست

دێنن تا سکی خۆیانی پێ تێرکەن. ئەم خەڵکەی کەتۆ دەیڵێیت چۆن خواردن ئامادە دەکەن.

هەرجارێك کە من بۆ ئەمانۆ لەدنیای پێشکەوتوو قسەم دەکرد ئەو بەجوانی گوێی لەقسەکانم دەگرت و دیاربو چێژدەبات بەهەمان شێوە کەمناڵێك لەبیستنی چیرۆك و ئەفسانەی دایك و باوکی چێژ دەبات ئەمانۆش لەبیستنی قسەکانی من شادمان دەبو و دەڕۆشتە ناو بیرو خەیاڵ، کاتێك باسی ترۆمبیل و فرۆکەم بۆکرد دەستەکانی لەیەك داو گەشکەبو.

ئەو رۆژە دەرفەتی قسەمان زۆر نەبو بۆیە دەستم راکێشاو وتم:

ئێستا بابڕۆین..... کاتی بینینی ئەم شتانەش دێت.

بۆئەوەی ئەم جارەش نەکەوینە تەڵەوە، یوری پلانێکی تازەی داناو شائکی و شوومای راسپارد لەپێشەوە بڕۆن و رێگاکە دیاری بکەن. بە قەمە لقەکانی سەر رێکە بقرتێنن و ئەگەر تەڵەیەك دانراوە، بیپچڕێنن بەم شێوە ڕۆشتنی ئێمە دووبارە دەستی پێکردەوەو رۆشتین..... رێگەیەکی دوورو درێژمان لەبەردەمدابو. بەڕاستی بێزارکەر بەرچاو دەکەوت. رێگەی پەرستاگامان جارێکیتر بڕیبو. ئەگەر خوێنەران لەبیریان بێت لەبەشەکانی سەرەتای ئەم داستانە لەمبارەوە نووسیومانە بەڵام ئەم جارەیان دەتوت زووتر و زیاتر هیلاك بووین.

بەهەرحاڵ جگە لەڕۆشتن رێگایەکمان نەبو. یوری وەك کێو، وەك دێو وەك شێر دەڕۆشت و هەرگێز شوێنەواری هیلاکی و کوتران لەروخساری نەدەبینرا. هەمیشە حەسوودیم پێ دەبرد و دەمویست لەجێگەی ئەوبم.

رەنگە وەك پێکهاتەی جەستەیی و هێز شتێکی وام لەو کەم نەبوایە. ئەگەر پێویستی بکردایە دەمتوانی زۆرانی لەگەڵدا بگرم بەڵام لەرێپێوان، لەشەڕ، لەراکردن و رووداوەکانیتر خۆڕاگریەکی شیاوی دەستخۆشی کردنی بو. من زوو هیلاك دەبووم و لەپێ دەکەوتم.

شتێکی کەشیاوی باس کردنەوە ئەوەبو هیچ کات نەدەترسا. هەندێ کات لای خۆم گوومانم دەکرد رەنگە ئەو لەرۆژی مردنی خۆی ئاگادارە و دەزانێت لەچ کاتێکدا دەمرێت و لەبەرئەمە لەهیچ رووداوێکدا نەدەترسا. کەمێکیتر رۆشتینە پێش وسەرئەنجام ستوونەکانی پەرستگا لەجەنگەڵ کە لەگڵ و خۆڵ بەرد دروستکرابو دەرکەوت. شائکی دەیوت: ئەم ستوونانە هێلانەی مارە پیرۆزەکانە. رەنگە خوێنەران بیریان بێت

ئامازۆنیەکان جۆرێك ماری گەورەیان بەپیرۆز دەزانی.... بەڕێکەوت ئەم مارە لای پەرستگای ئەوان دەست دەکەوت و شائکی دەیوت ستوونەکانیان بۆ ژیانی ئەوان دروست کردوە.

هێشتا لە پەرستگاوە دووربووین کە شەو داهات و ناچار بووین تا بەیانی و ئاوابوونی هەتاو روون بوونەوەی هەوا لەهەمان شوێندا بمێنێتەوە. یوری شوێنی مانەوەی هەڵیبژارد و پێش هەرکارێك جێگەیەکی بۆ من و ئەمانۆ لەسەر دارەکە ئامادە کردو وتی: ئێوە دوو کەس لەوێدا بخەون.

بەڵام ئەمانۆ وتی: نە من دەبێت بەتەنیا بم......

بەسەرسوڕمان و تووڕەیی سەیرم کرد..... نەمزانی مەبەستی لەوتنی ئەم رستە چیە ! بۆ دەیەوێت بە تەنیا بێت.....؟ بەهەرحاڵ ئەوانیتر مافیان نەبو لەبارەی ژیانی تایبەتی ئێمە شتێك بزانن. بۆیە بێدەنگ بووم و بێ ئەوەی لەگەڵ ئەمانۆ قسە بکەم و داوای روونکردنەوەی لێبکەم، رۆشتمە سەردارەکەو خەوتم.

سەرم لەسەر لقێك دانابوو سەیری ئاسمانم دەکرد. بیرم لەرابردوو رووداوەکانی داهاتوو دەکردەوە کەلەناکاو دەنگی خشە خش بیسترا و کەسەیری خوارەوەم کرد بینیم ئەمانۆ لەدارەکە دێتە سەر. ئەو بۆ خۆی جێگایەکی ئامادەکربو بەڵام ئێستا دەهاتە لای من...... بەئەنقەست چاوەکانم بەست و خۆم کرد بەخەوتوو.

ئەمانۆ بەهەناسکەبرکێ هاتە سەرو لای من دانیشت. چەند جارێك سەیری روخساری کردم. دەیویست بزانێت خەوتووم یان نە. بچووکترین جووڵەیەك کەنیشانەی بەئاگابوونم بێت نەمدەکرد. چەند خولەك تێپەڕی و ئەمانۆ کەبێزار ببو دەستی خستە ناو قەژەکانم.

گوێم پێ نەدا.... پەنجەی دەخستە ناو قژم و سەری بەرز دەکردمەوە، یەك دوو جار ئەم کارەی کرد و کەئەنجامی نەگرت سەری خستە سەر روخسارم و وتی:

ناڕەحەت بوویت..... قسەم لەگەڵدا ناکەیت.....

دووبارە قسەم نەکرد..... دەمویست ئەوەندە لە وتەکەی خۆی پەشیمان ببێتەوە کەقسەنەکات و لە وتەکەی پەشیمان ببێتەوە، ئیتر نازم بەسەرا نەکات. ئەمانۆم خۆش دەویست و لەنازونیازەکەی چێژم دەبرد. ئەم راکێشان و هەوڵدانە عاشقانە بۆم چێژ بەخش بوو هەرچەند رۆژ جارێك دەمتۆران تا ئاشتی دووبارە ببێتەوە.

ئیتر نەمدەتوانی خۆم بکەم بەخەوتوو، ناچار چاوەکانم کردەوەو وتم:

چی دەڵێیت؟ بڕۆ بخەوە...! بەیانی ڕێگایەکی دوورو درێژمان لەبەردەمدایە.

بڕۆکانی هێنایە یەك و وتی:

گوێ بگرە... ئاخر من سکم هەیە ! ڕستەی ئاخر وەك پیکێك بو بەر سەرم کەوت.... گوێم گەرم بو و هەناسە لەسینەمدا وەستا. نەمدەتوانی باوەڕ بەقسەکەی بکەم... لەشوێنەکەم هەستام و وتم: چیت وت؟ سکت هەیە؟

نازێکی شیرینی کردو وتی:

ناتەوێت منالت لەمن هەبێت.... مەگەر ژنێکی خراپم، منت خۆش ناوێت...

ئەگەر لئۆنا لەتۆ سکی پڕبوایە شادمان دەبوویت؟

دڵی پڕبوو. دەستی بەگریان کردو سەری لەناو دوو لەپی دەستی شاردەوە.

هەزار جۆر بیرو ئەندێشە هێرشیان کردە سەر مێشکم. بیرەوەری مووناك و منالەکەم ئازاری دەدام و لەبەرئەوە نەمدەویست ئیتر منالم هەبێت، نە لە ئەمانۆ نە لەهیچ ژنێکی تر ! دیمەنەکان دووبارە دەبوونەوە و جارێکیتر سروشت دەیویست ئازارم بدات.

ئارامم کردەوەو زەختم لەخۆم کردو وتم:

مەگەری ئازیزم..... زۆر شادمانم. تۆو منالەکەتم خۆش دەوێت. ناتوانم هیچ ژنێکم بەقەدەر تۆ خۆش بوێت بەڵام بەم شێوە چۆن دەتوانین ڕێگەی دوورو درێژی جەنگەڵ ببڕین و لەئامازۆن بڕۆین ! مەگەر بڕیار نیە تۆ لەگەڵمانا بێیت.

ئەمانۆ سەری خستە سەر سینەم و وتی:

نارەحەت مەبە ژنانی ئامازۆن لەگەڵ ناسکی زۆرگیان سەخت و بەهێزن. دڵنیابە منالەکەت بەسلامەتی لەسکمدا رادەگرم و لەهۆزەکەی خۆت بەدنیای دێنم. تۆ تەنیا دڵنیام کەرەوە کە منت خۆش دەوێت.

وتم: دڵنیابە هەمیشە تۆم خۆش ویستووە و خۆش دەوێت....

هێشتا وتوێژەکەمان تەواو نەببوو کەلەناکاو شتێك وەك مار لەناو لقەکانەوە پەڕی و لای جەستەی من و سینەی ئەمانۆ تێپەڕی و لە لقەکەی بەرانبەر چەقی. بە یەك نیگا هەموو شتێکم بۆ روون بوویەوە. ئەمانۆ بەکورتی قیژاندی و رۆشتە دواوە. دووبارە ئەو دەنگە بیستراو شتێکی تر لای من و ئەمانۆ تێپەڕی.

ئەمانۆ خۆی خستە سەر سینەی من و وتی:

تەکان مەخۆ..... گەمارۆیان داوین..... کۆماتۆیە..

لەخوارەوە بەردەوام رمیان دەهاویشت و رمەکان لە لقەکان دەچەقی..

بەخۆشحاڵیەوە ئێمە زیانمان بەرنەکەوت. هێواش دەستم درێژ کردو ڕەشاشەکەم لە لقی دارەکە کردەوەو ئامادەم کرد. بەڵام لەتاریکیدا کەسم نەدەدی تەقەی لێبکەم.

هیچ دەنگێك نەدەبیسترا و ئاشکرابو بەشائکی و یوری هێشتا ئاگادار نین.

ئەمانۆ بێدەنگی شکاندو قیژاندی و وتی: یوری...... یوری.......

یوری بەڕاستی خێرابو. چەندین جار ئەو منی لەمردن رزگارکرد بەڵام ئەمجارەیان بەڕاستی موعجیزە ئاسابو چونکە هێشتا ئەمانۆ بێدەنگ نەببو کە دەنگی تەقە بیستراو دواتر چەند قیژەیەکی یەك لەدوای یەك ئەوەی سەلماند کە تاقمێك لەهێرشبەران بەر گوولە کەوتوون و کوژران.

ئیتر جێگەی درەنگ کردن نەبو و دەبوا یارمەتی یوری بدەم. لەبەرئەمە ئەمانۆم لەخۆم دوور کردەوە کە بە دوو دەست منی گرتبو. بەجوولەیەکی خێرا لە لقەکان رۆشتمە سەرو لەبەرزترین شوێن جێگەم گرت و لەوێوە تەقەم دەست پێکرد.

بەخۆشحاڵیەوە لەم کاتەشدا مانگ لەپشت دارەکانەوە دەرکەوت و لەتاریکی هەوای کەم کردەوە. سێبەری کۆماتۆو هاوڕێکانی بەجوانی دەبینران و ئەگەر رایاندەکرد هەموویان دەکوژران. بەهەرحاڵ یەکێك کوژرا و ئەوانیتر کەزیاتر لەدە کەس بوون رایان کرد.

یوری بۆ بەدواداچوونی هەڵاتوان لەدارەکە رۆشتەخوار بەڵام هێشتا چەند هەنگاوێك نەڕۆشتبو کە وەستاو بەشێوەیەکی سەیر لەسەر زەوی دانیشت و سەیری شتێکی کرد. هەستم کرد شتێکی چاوەڕوان نەکراوی بینیوە.

پێش ئەوەی من لەدارەکە بڕۆمەخوار و ئەمانۆ خۆی بەیوری گەیاند. شائکی و شووماش گەشتبوون لەگەڵ ئەوەی ئەمانۆ گەشتە لای یوری و سەیری زەوی کرد قیژاندی، ئاوڕی دایەوە و دەستی کرد بەگریان. نیگەران بووم. ناڕەحەت بووم. خەم و پەژارەیەکی بێ ئەندازە رۆحی داگرتم و ترسا و لەرزان لە دارەکە رۆشتمەخوار. پێش گەشتن بەوشوێنە یوری بەدەنگێك کەمنیش بیستم دەستووری بە شائکی دا لەنزیك بوونەوەی من رێگری بکات. بۆ؟...... ئەمە چیە کە نابێت من بیبینم؟ بۆ هەموان دەبێت ببینن من نەبێت. خۆشم نەمدەزانی. خێرایی هەنگاوەکانم زیاد کردو بەڵام شائکی زووتر بەمن گەشت، دەستەکانی کردەوە رێگای لێگرتم و بەپاڕانەوە وتی:

سەرۆك مەڕۆنە پێش..... لێرەدا بمێننەوە....

ئەمانۆ دەگریا. گریانێکی بەکوڵ ! قەت وا نەگریابو، دواتریش نەمبینی وا بگری.

دەنگ لە قوڕگم نەدەهاتە دەر لەگەڵ ئەمەشدا وتم:

چیە؟ چی بووە؟ قسە بکەن. بۆ من نابێت نزیك ببمەوە.

تووڕە نەدەبووم چونکە دڵنیا بووم ئەوان بەرژەوەندی منیان دەوێت بەڵام هەستەکانم نەیاندەهێشت ئارام بم، گیانمی دەسووتاند، دڵمی دەگوشی، ناڕەحەت و نیگەران بووم بەشائکیم وت: هەرچی هەیە دەبێت ببینم.

بەڵام ئێوە نابێت نزیك ببنەوە.

زیاتر لەهەرشتێك گریانی ئەمانۆ منی پەرێشان دەکردو هانی دەدام. شائکی دڵنیا بوو من تووڕە نابم. بۆیە ئارام و بێ خەیاڵ وەستابو. من لەم ئارامیەی ئەو کەڵکم وەرگرت و بەجووڵەیەکی خێرایی دەست پاڵم پێوەناو خۆم بەیوری گەیاندو لەرووناکی مانگەشەو دیمەنێکم بینی کە خۆزگە نەمدەدی.

هێشتا دوای چەندین ساڵ بەبیرەوەری ئەو شەوە فرمێسك دەڕژێتە چاوانم. خراپ نیە ئێوەش بزانن من چیم بینی.

لئۆنا بەسکی هەڵدڕاو و سەری بڕاو لەوێدا کەوتبو.

کۆماتۆی بێ بەزەیی دوای ئەوەی سکی هەڵدڕیبوو و کوشتبووی، سەری بڕیبوو لەسەر سینەی دانابو و روخساری جوان و چاوە دڵڕفێنەکانی لئۆنا کاڵ ببوونەوە و دەتوت هێشتا بە هیوادارییەوە لەئاسۆی دوور دەستی دەڕوانی و چاوەڕێی گەشتنی من بو. بینینی ئەم دیمەنە خوێنی لەدەمارەکانمدا کوڵاند، نزیك بو شێت ببم..... قیژاندم..... جنێوم بەهەموو دەدا. ئەمانۆش دەگریا و سەری بەدارێکەوە نابو.

دوای چەند خولەك وتم: بۆ وەستاون..... بەڕێکەون........ دەبێ کۆماتۆ بەسزای خۆی بگات. بەدەستی خۆم دەیخنکێنم.....

ئارام بە ئێستا ناتوانین بەدوای کۆماتۆدا بڕۆین.... شەوانە لە جەنگەڵدا پەلامارمان دەدەن. ئارام بە بەیانی بەدوایدا دەڕۆین.

دواتر رویکردە شائکی وتی: زەوی هەڵکەنە...... لێرەدا گۆڕیك بۆ لئۆنا ئامادە بکە.

لەژێر لچەوە وتی: حەیف.... بەڕاستی ژنێکی باش بو.

شائکی و شووما دەستیان بەهەڵکەندنی زەوی کرد و کاتژمێرێك دواتر جەستەی لئۆنای جوان و دڵڕفێنیان لەژێر خاکی ساردی گۆڕدا شاردەوە. بەم شێوە لئۆنا کوژرا بەڵام دوای ئەو بەتەواوی پەرێشان بووم، شڵەژام، لە ئامازۆن و ئەو شوێنە هیلاك کەڕە بێزار بووم... ئەگەر لەبەر تۆڵە سەندنەوە نەبو یەك خولەکیش لەوێدا نەدەمامەوە و

لەوشوێنەوە دەگەڕامەوە.... تەنیا دەمویست تۆڵە لە کۆماتۆ بستێنمەوە... جگەلەمە هیچ شتێکی تر منی ئارەزوومەندی جەنگەڵی ئامازۆن نەدەکرد. سەرئەنجام هەوا رووناك بوویەوە رۆژهات. یوری کەمێك میوەی کۆکردبوویەوە، دوای خواردن بەڕێکەوتین.... لەوێ دوور کەوتینەوە، کاتژمێرێك دوای هەڵاتنی خۆر بینای دارو گڵی پەڕەستگا لە دوورەوە دەرکەوت. جادوگەرانان و هاوڕێیانی کۆماتۆ لەوێ کەمینیان و سەنگەریان دانابو بە بەردو تیرو رم هێرشیان کردە سەر ئێمە بەڵام لەبەرانبەر ڕەشاش هیچیان پێ نەدەکراو ناچار پاشەکشەیان کرد.

خوێنم هاتبووە جۆش، شێتێکی زنجیری حاڵی لەمن باشتر بو. ددانەکانم لەیەك گیر دەکردو دەمویست کۆماتۆ چنگ کەوێت تا چاوەکانی دەربێنم.

بیرم دەکردەوە و دڵنیابووم کۆماتۆ ئەگەر بکوژرێت بەگوولەی من یان یوری دەکوژرێت و چاوەڕێی ئەوە نەبووم بەزیندوویی دەستگیری بکەم بەڵام راستم وتبێت لەوکاتەدا تەنیا ئارەزوویەك کەلەدڵمدا بو ئەوەبو کۆماتۆ بەزیندوویی دەستیگر بکەم و بەئازارو ئەشکەنجە بیکوژم.

بیرم لەوە دەکردەوە چۆن بیکوژم..... بیخنکێنم...... نا...... بەخەنجەر سەری لەپشتەوە دەقرتێنم. نا هیچ کام لەم مەرگانە شیاوی ئەو نەبوون.. ئەو دەبوا بەدەردو ئەشکەنجەو گیان بدات. بەڵێ ئەگەر چنگم دەکەوت بەدەست یەك یەك ئەندامەکانیم دەبڕی. دەست و پێم دەقرتاند، ئەوسا چاوەکانیم دەردەهێنا، دواتر لووت و گوێچکەکانیم جیادەکردەوە و سەرئەنجام سکیم هەڵەدڕی و دڵیم دەخستە سەر سینەی.

ئەو کارانەم تەنیا لەبەر تۆڵە سەندنەوە ئەنجام دەدا.... تۆڵەی مەرگی لێۆنا.... تۆڵەی ئەوەی ئەو ژنە جوانەی بەناجوامێری کوشت.

بەڵام بەداخەوە کە هەمووی ئەمانە خەیاڵ بو و دەستگیری کۆماتۆ دوور دەهاتە بەرچاو.

شەڕێکی قورس درێژەی بو. من و شائکی بەگوولە لێمان دەدان بەڵام جادوگەرانان کە بەرێنوێنی کۆماتۆ شەڕیان دەکرد ئێمەیان کردبووە ئامانجی تیرە ژاراویەکانی خۆیان.

گرنگ ئەوەبو ئێمە ئەوانمان نەدەدی و لەناو دارەکان جیاکردنەوەی ئەوان کارێکی دژوار بو. ئەگەر دەبینران زۆر بەخێرایی هەموو شتێك تەواو دەبو و کۆماتۆ هاوڕێکانی وەك ئاو کێش کون کون دەکران بەڵام بەداخەوە بوونی گەڵا و لقی زۆر و چڕی دارەکان

لەمپەڕ بوو لەوەی لەبەرچاوی ئێمەدا بن. ئەمانۆ بەدەستووری من لەسەر زەوی ڕاکشابو. دڵنیابووم کۆماتۆ دوای کوشتنی لئۆنا بۆ کوشتنی ئەمانۆ هەوڵ دەدات و زیان بەویش دەگەیەنێت بۆیە دەستورم دابو لەسەر سك ڕاکشێت و بێ پرسی من تەکان نەخوات.

ئەو ئارامی نەبوو. بەردەوام دەجووڵاو لەشوێنەکەی خۆیدا تەکانی دەخوارد و خراپتر لەهەمووی ئەوەی کەسەری خۆی بەرزدەکردەوە و سەیری شەڕەکەی دەکرد. یەکێك لەم جارانە لەناکاو چەند تیرێك بە ویزە ویز لەناو گەڵای دارەکانەوە هاتەدەرو بەرەولای ئەمانۆ هات.

بەرێکەوت و یان خۆشبەختانە هەرچی بو ئەمانۆ بێ ئیرادە سەری دەهێنایە خوار. لەم ناوە تیرێك بەردارەکەی لای ئەمانۆ کەوت و یەکێك لەتیرەکانی لەسەر سەرییەوە ڕۆی و تەنانەت چەند تاڵێکی قژیشی هەڵکەند. ڕەنگە بەروخساریەوە نەما. بەهەمان شێوە کە لەسەر گیاکان کەوتبوو وتی: چی بکەم.... دەترسم هەستم.....

ئیتر سەرنجم لای ئەمانۆ نەبو بەخێرایی لەپشت یەکێك لەدارەکان کەمینم کرد، ئەو شوێنەی تیرەکانی لێوەهات، گوولەبارانم کرد. دەنگی قیژەیەك بیسترا، لقەکان بەر یەك کەوتن و دوای چەند سات جەستەی یەکێك لەجادوگەرەکان کەوتە سەر خاك.

ئەو گەورەترین جادوگەری هۆز بو. لەنیشانەکەی سەر سەری گرنگی و پێگەی ئەو دیاری دەکرا. بەکوشتنی ئەو سەرکەوتنێکی گەورەمان پێبڕا و کۆماتۆ گۆڕەپانی خاڵی کردو پاشەکشەی کرد.

یوری پێش من خۆی گەیاندە سەنگەرەکانی ئەوان. من بۆ بردنی ئەمانۆ کەمێك دواکەوتم و کاتێك گەشتم یوری سەیری کوژراوەکانی دەکرد. سیان لەوان جادوگەری گەورەی هۆز بوون کە کوژرابوون و ئەوانیتر هاوڕێ لەگەڵ کۆماتۆ هەڵاتبوون.

یوری وتی: دەبێت پشت بەفێڵ ببەستین چونکە ئەگەر بەم شێوە بڕۆینە پێش کۆماتۆ ڕادەکاتە کوێستان و لەم شێوەشدا بەدەست هێنانی ئەوە ئەگەری نیە.

وتم: چ فێڵێك؟

سەری تەکانداو وتی: نەخشەیەکی وردم کێشاوە. مەرجی سەرکەوتن ئەوەیە ئێوە ئاگاداری نیشانەیەك بن کە من دەیدەم.

پرسیم: زۆر باشە ئێستا دەبێت چی بکەین؟

یوری وتی: ئێستا بەدوایاندا دەڕۆین...

کۆماتۆو هاوڕێکانی ڕادەکەن و دەڕۆنە ئەوبەری پەرستگا. شەوانە ئێمە پاشەکشە

دەکەین و جۆرێك نیشان دەدەین کە دەمانەوێت بگەڕێینەوە بۆ هۆز بەڵام لەراستیشدا لەپەرستگا خۆمان دەشارینەوە، کۆماتۆ ئاسوودە دەگەڕێتەوە بۆ پەرستگا و لەم شێوەشدا ئێمە دەستگیری دەکەین و دەیکوژین.

دواتر سەیری چاوەکانی منی کردو وتی: بە بۆچوونی تۆ جگە لەم ڕێگایە بۆ دەستگیرکردنی ئەو ڕێگایەکی تر هەیە؟

وتم: ئەگەر فێڵی لێبکرێت؟ خراپ نیە.

یوری کە وەك هەمیشە بەسەرکەوتنی خۆی دڵنیا بوو وتی: مەوەستن، بەڕێکەون.

پێشڕەوی دووبارە دەستی پێکرد.

چەند خولەك وەستان و وتوێژ دەرفەتی بەوان دابو رابکەن. لەشوێنێك کە یەکەم بینای پەرستگای لێبو، شەڕێکی خوێناوی دەستی پێکردو و سەرئەنجام کۆماتۆ پاشەکشەی کردو رۆشت.

یوری لەوێ دووبارە بەدواوە ئارام ئارام دەڕۆشتە پێش و بەئەنقەست کاتی بەفیڕۆدەدا و چاوەڕێی تاریکی بوونی شەوی دەکرد. بەخۆشحاڵیەوە بێ لەدەست دانی سەرکەوتنێکی گوونجاو کەهاتبووە پێش، شەو داهات و هەوا تاریك بو. یوری پێشتر هەموو شتێکی ئامادەکرد و کەمێك لەلقی داری ((گیلز ))ی بڕیبو.

داری گیلز جۆرە میوەیەکی وردی بچووکی وەك زەیتوونی هەیە و دانیشتوانی جەنگەڵ وەك فستق وشکی دەکەن و لەکاتی سەفەرو کاتی شەڕ کەدەستیان بەمیوەی تازە ناگات دەیخۆن. میوەی گیلز چەورە بەڵام لق وگەڵای چەوری زیاترە و ئەگەر ئاگری لێ نزیك ببێتەوە وەك پلیتەی چرا کە لەنەوت یان بەنزیندا بێت، بەجوانی دەسووتێت.

یوری چەند لقی گیلزی بڕی و دەستەی کردبوو. سەرەتای شەو گیلزەکانی رۆشن کرد و دوای شەڕە تەقەیەکی کەم و دڵنیایی لەوەی کۆماتۆ و هاوڕێکانی ئاگایان لەئێمەیە، بەشووما و شائکی وت:

ئێوە دووانە بەم مەشخەڵانە بەڕێکەون و تاکاتێك دەنگی تەقە نەبیستراوە بڕۆنە پێش. کۆماتۆ و هاوڕێکانی بەگوومانی ئەوەی دەگەڕێینەوە بۆ هۆز بەئاسوودەیی دەگەڕێنەوە بۆ پەرستگا.

بەم شێوەیە شووماو شائکی لەکاتێکدا هەرکام دوو دەستە گیلزیان لەدەستدابو، گەڕانەوە. من و یوری و نەمانۆش لەتاریکی شەو کەڵکمان وەرگرت بەرەو دەرگای پەرستگا کەبێ پاسەوان مابوویەوە بەڕێکەوتین. لەوتاریکیە چڕەدا کەس نەیدەدین.

ماوەیەك كە دوور كەوتینەوە، رووناكی گیلزەكانمان بینی. دیاربو كۆماتۆ و جادوگەرەكانیش ئاگری مەشخەڵیان بینیوە.

لەگەڵ ئەوەشدا لەسەركەوتنی خۆمان دڵنیانەبووین و بەبێ هیوایی رۆشتینە ناو پەرستگا. پەرستگا بە پێچەوانەی رابردوو بێدەنگ و چۆڵ بو. لەتالارەكاندا كەس نەدەبینرا. قەفەسی مارەكان بێ پاسەوان مابوویەوەو كەس نەیدەزانی خزمەتكارانی پەرستگا لەترسا رۆشتوونە كوێ و چیان بەسەر هاتووە.

بۆ ئەوەی بزانین كەس لە پەرستگادا هەیە یان نە دەستمان بەگەڕان كرد. تەنیا لەیەكێك لە ژوورە دوور دەستەكان دوان لە جوانترین كچانی ئامازۆن سەرقاڵی شۆردنی یەكتر لە ئەستێری پیرۆزی ئامازۆندابوون. سەرەتا لەدیوارەكە رۆشتمە سەرو و سەیری دیوارەكەم كرد. دیمەنێكی سەرنج راكێش لەبەرچاوەكانمدا بو، دوو كچی جوان لای حەوزەكەوە وەستابوون و ئاویان دەكرد بەخۆیانا.

لەسەیر كردنی ئەو دووكچە ئەوەندەم چێژ برد كە نەمدەویست بێمە خوار. ئەوان لەتەنیا شتێك كەبیریان نەدەكردەوە ئەوەبو پیاوێك لەدەلاقەی سەر دیوارەكەوە سەیریان بكات. بەڕاستی ئەگەر رووناكی مەشخەڵی ئەوان سەرنجی رانەدەكێشا هیچ كات هەستمان بەبوونی ئەو دوو كچە لەو سووچەی پەرستگا نەدەكرد.

من ئامازۆنم بۆ ژنە جوانەكانی خۆش دەویست. جیاواز لەمە چ شتێك دەیتوانی من بەو سەر زەوییە ترس ئەنگێزە ئارەزوو مەند بكات. ئەنیشكەكانی دەستم لەسەر لێواری دیوارەكە دانابو ولەخۆم بێ خۆم بووم كە لەناكاو ئەمانۆ قاچی گرتم و رایكێشام و كاتێك ئاوڕم دایەوە وتی: سەیری چی دەكەیت. چیە؟

پەڕێشان و شڵەژاو لەترسی ئەوەی نەكا ئەمانۆ بزانێت لەسەر دیوارەكە هاتمە خوارو بەهێواشی وتم: دووان لەم ژوورەدا دانیشتوون دەبێت بەبێ ئەوەی لەبوونمان ئاگادار ببنەوە لێرە دوور كەوینەوەو بۆ گرتنی كۆماتۆ كەمین بكەین.

یوری لەگەڵ ئەوەی كچەكانی نەبینیبوو دەیزانی من سەیری چی دەكەم چونكە باش ئەخلاقی منی دەزانی. لەشڵەژانی من هەستی بەوەكرد كەدووبارە بوونی ژنێك منی پەڕێشان كردوە، بۆیە بزیەكی نامۆو پرمانای هێنایە سەر لێو و بۆ ئەوەی ئەمانۆ لەدرێژەدان بە بابەتەكە پەشیمان بكاتەوە وتی: خێراكەن وەرن.

خۆی لەو رێگاوەی هاتبو، گەڕایەوە. ئەمانۆش كە تاڕادەیەك گوومانی كردبو، لەژێر چاوەوە سەیری كردم و بێ ئەوەی قسە بكات بەڕێكەوت. منیش بەڕێكەوتم بەڵام

هەنگاوەکانم نەدەڕۆشتن دڵم دەلەرزی. ئارەزووم دەکرد تەنیا بوومایە و بڕۆشتمایەتە لای ئەو دووکچە جوانە. دڵنیابووم کە کچەکان منیان لەخۆیان دوور نەدەکردەوە و لەئامێزی گەرمدا میوانداریان دەکردم.

یوری نەخشەیەکی وردی کێشابوو. بەهەمان شێوە کەوتم سەرەتا زۆرمان هیوا بەسەرکەوتنی خۆمان نەبو بۆیە لە دالآن و ڕێرەوەکانی پەرستگا بێ ترس دەڕۆشتین و بەدەنگی بەرز قسەمان دەکرد بەڵام لەیەکێك لە دالآنەکان نزیك دەرگای هاتنە ناو لەناکاو یوری خۆی کێشایە دواوەو بەخێرایی دەستی ئەمانۆی گرت و ئەوی لەپەنای دیوارەکەدا حەشاردا. منیش ئەم کارەم کرد و خۆم داشارد. دەنگی پێ بیسترا. کەسێك بەئارامی دەهاتە پێش بەڵام ئەگەر دەنگی ئێسقانە وردەکان کە وەك خەلخاڵ لەدەوری قاچی بەستبو بەگوێ نەدەگەشت دەنگی قاچی ئەوم لەسەر ئەرزی دالآنەکە نەدەبیست.

خولەکێك دواتر هەیکەلی یەکێك لەجادوگەرەکان لەتاریکی نیوە شکاوی دالآن دەرکەوت. هەناسەم لەسینەمدا راگرتبو. یوری وەك شێرێك کە خۆی بۆ هێرشکردنەسەر نێچیرەکەی ئامادەکردبێت لەپشت دیوارەکە کەمینی گرتبو.

جادوگەری ئاماژە پێدراو کە بۆ لێکۆڵینەوە هاتبو وەستا و سەیری دەوروبەری کرد، جوان گوێی گرت هیچی دەست نەکەوت، گەڕایەوە یوری دوای ڕۆشتنی ئەو وتی:

ئامادە بن، ئەمانۆ تۆ بڕۆ دواوە..... لە ئێمە دوور بکەوەرەوە.

ئەمانۆ لەسەر نووکی پێ خۆی گەیاندە یەکێك لە ژوورەکان کەلەکۆتایی ڕۆێرەوەکەدا بو و لەوێدا خۆی داشارد. من و یوریش سیلاحمان ئامادە کردو وەستاین.

نزیکەی پێنج خولەك بەهێواشی تێپەڕی کە دووبارە دەنگی پێ بەگوێ گەشت و سێبەری چەند کەس دەرکەوت.

یەکەم کەس کە کۆماتۆ بو وەك ستونێك لە گۆشت و ئێسك بەڕێگادا دەڕۆشت و رمێکی بەرزی لەدەستدابو، لەسەر شانی تیروکەوانێکی پڕ تیرو هەڵواسیبو.

پشت سەری ئەو چەند جاوگەرێك بەکڵاوی تایبەت دەبینران و تاقمێك لە کەسە ئاساییکانیش لەگەڵیدا بوو. لەسەر یەك ژمارەیان دوانزە یان سیانزە کەس بو.

کاتێك هەموویان هاتنە ڕێرەوەکەو گەشتنە چەند هەنگاوی ئێمە لەناکاو یوری لەحەشارگەکەی هاتەدەرو لوولەی ڕەشاشەکەی کردە ئەوان و بێ ئەوەی قسەبکات یان هەڕەشەبکات تەقەی کرد. ئاگری ڕەشاش تاریکی شەوی شکاند و قیژەی مەترسیداری جادوگەرانان بێدەنگی شێواند.

لەهەمان هێرشی یەکەم و پێش ئەوەی من کارێك بکەم ژمارییەك کوژران. دووان سیانێکیان کە لەدواوە لەدەرگای رۆشتنەدەر و نزیك بوون رایان کرد بەلاّم ئەوانیتر گرفتار بوون. کۆماتۆ بەرێکەوت و رەنگە لەبەرئەوەی لەپێشەوە بو بریندار نەبو، لەسەر زەوی راکشابو. کاتێك ئاگری ڕەشاش نەما، تەکانێکی خواردو رمەکەی حەواڵەی سینەی یوری کرد. بەرێکەوت بینیم و گوولەیەکم لەمەچەکی دەستی دا، قیژاندی و لەسەر جەستەیەکی بەردەمی تلا، بەلاّم هێشتا نەکوژرابو. ئەگەر یەك چرکە کەمتەرخەمیم دەکرد، یوری دوای چەند ساڵ ، بەدەست کۆماتۆی پڵنگ کوژ دەکوژرا و رمەکەی تا قوولاّیی لەسینەیدا جێگەی دەگرت. کۆماتۆش پشتی بەفێڵ بەست و پلانێکی جوانی کێشا بو. کاتێك یوری لە حەشارگەکەی هاتەدەرەو تەقەی کرد، بارودۆخی هەڵسەنگاندو زانی هەموو رێگاکان بەستراون. ئەو چەند کەسەی لەدواوە بوون توانیان رابکەن و گیان بەدەر ببەن، بەلاّم کۆماتۆ کە سینە بە سینە بو دەیتوانی چی بکات؟

ناچار خۆی خستە سەر زەوی و وای نیشاندا تیری بەرکەوتوە. ئێمەش لەسەر ئەم دڵنیاییە رۆشتینە پێش و بەتەواوکردنی کارەکە هەستاین کەلەناکاو تەکانی خواردو بەخێراییەکی سەیر رمەکەی بۆ سینەی یوری هاویشت بەلاّم پێش ئەوەی رمەکە لەدەستی جیا ببێتەوە، مەچەکیم بەگوولە کونکرد. کۆماتۆ قیژاندی و لای جەستەیەك تلا. یوری تازە هەستی بەوە کرد کەمردن لەپەنا گوێی تێپەڕ بووە ددانەکانی لەیەك گیرکردو مێشکی کۆماتۆی نیشانەگرت و بەلاّم رێگەم لێگرت و وتم:

بوەستە..... دەبێت بەتەشریفاتەوە بکوژرێت.

یوری یەکسەر قەناعەتی کردو لەمبارەوە تەسلیمی باوەڕی من بو، وتی:

جادوگەرانان هەموویان بکوژە..... ئەمانە وەك مار وان و ئەگەر یەکێکیان زیندوو بمێنێت هەموو هۆز دژی ئێمە رادەپەڕێن.

سەیرێکی زەویم کردو بینیم دووان لەجادووگەڕان کەوتوون و ئەوانیتر رایان کردوە. جیاوازی نێوان جادوگەرانان و ئەوانیتر زۆر بەخێرایی دەست نیشان دەکرا.

ئەوان هەمیشە کلاّوێکیان لەسەر دەکرد کە پەڕی رەنگاورەنگی پێوەبو و جەستەیان بە دەرمانە بۆگەنەکانی جەنگەڵ رەنگ دەکرد.

وتم: دوان کوژراون..... ئەوانیتر...

یوری قسەکەی بریم و وتی: ئەوانیتر رۆشتوون.... حەیف..... دەبێت بەدوایاندا

بڕۆین، ئەگەر خێراتر لەئێمە بگەنە هۆز، کاری ئێمە دەشێوێنێن..... خێراکە.

ئەمانۆ لەپشت دیوارەکە خۆی داشاردبو و کاتی تەقەکردن رۆشت. دڵنیابووم بۆ هیچ شوێنێك ناڕوات و لەم دەوروبەرەدایە. هێشتا چەند خولەك تێپەڕ نەببو و ئێمە بڕیارمان نەگرتبو کە لەناکاو دەنگە دەنگ لەناو ریزەکانەوە بیسترا، ئاوڕم دایەوە ئەمانۆم لەناو تاقمێك ژنی جوانی ئامازۆندا بینی.

ئەو دوو کچە کە کاتژمێرێك پێشتر خۆیان دەشۆرد لەگەڵ ئەمانۆدا بوون.

رێڕەو شوێنێك کە جەستەی کوژراوەکانی لێبو، رووناك بوویەوە چونکە کچە خزمەتکارەکانی پەرستگا مەشخەڵیان لەدەستدا بو و بەتەواوی ئەو دەوروبەرەی رووناك دەکردەوە.

ئەمانۆ کاتێك گەشتە ئەویٚ سەرەتا سەیری من و یوری کردو چونکە ئێمەی لەوپەڕی سلامەتی دا بینی، هەناسەیەکی بەئاسوودەیی هەڵکێشاو وتی:

کۆماتۆ چی لێهات؟ رایکرد؟

من ئیشارەم بۆ زەوی کردو هەموو کچەکان سەرنجیان بۆلای کۆماتۆ راکێشرا. ژێر جەستەی گۆلاوێك لە خوێن دروست ببو، ئێسقانەکانی دەستی راستی لەمەچەکەوە ورد و پەنجەکانی هەڵواسرابو. یەکێك لە کچەکانی پەرستگا چەمایەوەو سەیری روخساری ئەوی کرد.

کۆماتۆ لەم کاتەدا تەکانی خواردو ناڵەیەکی کرد. کچەکە بە پەلەو ترسەوە رویکردە من و وتی:

بیکوژن.... بازیندو نەبێت تاقمێك لەزیانی ئەو ئاسوودە کەن.

دەتوت کۆماتۆ قسەکانی بیست و تێگەشت چونکە بەدژواری لەسەر زەوی تلاو چاوە خوێناویەکانی بەهێواشی کردەوە بەبێزاری و رقەوە سەیری کچەکانی کرد.

سەیری یەك یەکی کچەکانی کردو تا ئەوەی چاوی کەوتە سەر ئەمانۆ. بەبینینی ئەمانۆ شڵەژا.....

دەتوت کارەبایان لێداوە. دەلەرزی و بەیارمەتی دەستی چەپی کەساغ بو بڕیاریدا هەستێت....

کچەکان بەترسەوە رۆشتنە دواوە. هەموویان لێی بێزاربوون، دەترسان و لەمەرگی ئەودا شادیان دەکرد. تەنیا ئەمانۆ لەشوێنەکەیدا مایەوە و وەستابو بیٚ گوێدان سەیری دەکرد.

کۆماتۆ دەیویست لەدوایین سات تۆڵە لەو بستێنێتەوە ئەو مەرگی خۆی بەگوناحی ئەمانۆ دەزانی و گوومانی دەکرد ئێمەی بۆ کوشتنی ئەو هانداوە.

لەرزان و ناڵان تا نیوە لەشوێنەکەی بەرز بوویەوە، تلاو پشتی کردە ئێمە.

سێبەرەکەی جۆرێك لەسەر زەوی کەوتبو کەلای ئێمەوە هیچ شتێك نەدەبینرا.

ئاسوودە بووین. ئەمانۆش بەئاسوودەیی لەشوێنەکەی خۆیدا راوەستابو. تەنیا شتێك کە هەرگیز بیرم لێ نەدەکردەوە ئەوەبو کە لەناکاو کۆماتۆ بەدەستی شکاو، لەگەڵ ئەو هەموو خوێنەی لێی رۆشتبوو، بیر لە کوشتنی ئەمانۆ بکاتەوە.

بۆیە بەوپەڕی خوێنساردی و بێ گوێدان سەیرمان دەکرد و کەلەناکاو کۆماتۆ وەك کێوێك لە شوێنەکەی بەرز بوویەوە، سووڕاو پەلاماری ئەمانۆی دا. لەدوایین سات شتێکی درەوشاوەم لەچاوی ئەودا بینی کە لە رووناکی مەشخەڵەکان لەدەستیا دەبریسکایەوە، ئیتر نەمزانی چی بو..... هاواری ترس ئەنگێزی ئەمانۆم بیست.

هەموو جەستەم لەئارەقدا خوسابو. گێژو وڕبووم. ئەوەندە بەخێرایی پەلاماریدا کە من و یوری نەمانتوانی رێگەی لێ بگرین. بەتەواوی کۆنترۆڵی بیرو فکرەکانی خۆم لەدەستدابو، نەمدەزانی دەبێت چی بکەم.

دووبارە یوری فریام کەوت بەقۆناغی تفەنگ لەدواوە چەند زەربەیەکی لەپشتە سەری کۆماتۆ دا و خستی. ئەم رووداوە چەند چرکەیەك درێژەی کێشا بەڵام کۆماتۆ لەم دەرفەتە کەمەدا خۆی بەئەمانۆ گەیاندو تیغی خەنجەری لەگۆشتی ئەودا چەقاند.

کۆماتۆ لەم لاکەوتبوو ئەمانۆ لەولاتر لە گۆلاوێك لەخوێنی خۆی دەتلایەوە..... دنیا بەدەوری سەرما سووڕا، سەراپای گیانم بوو بەپارچەیەك ئاگرو تووڕەیی، خوێن بەرچاوی گرتبووم. کارم بەئەمانۆ نەبوو چونکە دڵنیابووم بەهۆی برینی خەنجەرەوە مردوە، بۆ تۆڵە سەندنەوە بەرەولای کۆماتۆ رۆشتم.

دەتوت ئەویش چاوەڕوانی منە چونکە کاتێك گەشتمە سەری چاوەکانی خۆی کردەوەو بەسەر کەوتوانە سەیری کردم و بزەیەکی بەوپەڕی رەزامەندی هێنایە سەر لێو.

بەم بزەتاڵە کەوێنەی مردنی تیا رەنگ دەدایەوە دەیویست تێمەگەیەنێت کە بۆمردن ئامادەیە. تۆڵەی عەشقی خۆی گرتووەو منی لەم شەڕەدا شکاندوە و خۆشەویستەکەی من، ئەمانۆی کوشتووە. لەبزەی ئەو ئەم بابەتە دەخوێنرایەوە و ئەگەر جوانتر و ووردتر بومایەتەوە رەنگە شتی تریشم دەسکەوتایە بەڵام لەوکاتەدا مێشکم باش کاری نەدەکرد و بێجگە لەکوشتنی کۆماتۆ و سەندنەوەی تۆڵە بیرم لەهیچی تر نەدەکردەوە. کچە

خزمەتکارەکانی پەرستگا دەوری ئەمانۆیان گرتبو، لەسەر دەست بەرزیان کردەوەو بردیانە ناو پەرستگا، یوریش چاودێری کاری ئەوانی دەکرد و دەستووری دەدا. بەڵام من نە قسەکانی ئەوم دەبیست نەدەمبینی و نەمدەزانی حاڵی ئەمانۆ چۆنە.

رۆشتمە پێش.... لەمێشکی خۆمدا بۆ دۆزینەوەی رێگایەی باشتر بۆ کوشتنی کۆماتۆ دەگەڕام. ئەگەر کاسە سەری بەچەند گولەیەك بپرژێنم بەئاسانی دەمرد و دڵی ئاگر گرتووی من ئارامی نەدەگرت و لەئەنجامدا تۆڵەی ئەمانۆو لئۆنای داماو نەدەسێندرایەوە.

دەمویست بەشێوەیەکی ناشرین بیکوژم... رۆشتمە پێش و لەقەیەکی بەهێزم لەسەری دا بەڵام هێشتا قاچم بەرزنەکردبویەوە کە دەستی چەپی کۆماتۆ کە ساغ بو قولاپەی گرتم و بەڕادیەك زەختی لێکرد و سووڕاندی کە بەدەمەوە کەوتم. هەرچی هەوڵم دەدا هاوسەنگی خۆم رابگرم نەدەکرا.. سوڕام و بەدەمەوە هاوتەریب لەگەڵ کۆماتۆ کەوتم.

تەنیا کارێك کە ئەنجامم دا ئەوەبو لەکاتی کەوتن لەو دوور کەوتمەوەو دوو مەتر لەو جێگەم گرت. ئەم رێکەوتە منی لەمەرگ رزگارکرد و گەرنە تیغی خەنجەری کۆماتۆ لەدڵمدا جێگەی دەبوویەوە.

ئەو دەستی خۆی درێژ کرد بەڵام بەمن نەگەشت و تیغی لەبیست سانتیمەتری من لەزەوی چەقی. ئیتر شوێنی درەنگ کردن نەبو، لوولەی ڕەشاشەکەم تێکردو پەنجەم لەسەر پەلەپیتکەکە فشاردا. چەند گوولەیەك یەك لەدوای یەك دەرچوو، کۆماتۆ قیژاندی و دووبارە لەسەر زەوی بەرز بوویەوە و کەوت. تەواوبوو... کۆماتۆ بەهەمان شێوە کە دەمویست کوژرا. گوولەیەك لووت و لێوو بەشێکی پێشەوەی رووخساری وورد کردبو، گوولەیەکیتر لە کەلەکەی چەپیەوە رۆشتبووە ناوجەستەی و لەولایتر ریخۆڵەکانی پەرێشان کردبو، گەردنی بە گوولەیەك شکا و تانیوە لەجەستەی جیاببوویەوە.

قاچم ئازاری بوو..... یوری یارمەتیدام لەشوێنەکەم هەستم. هێشتا جوان لەسەر قاچ جێگیر نەببووم کەدەنگی پێی چەند کەس کەڕایان دەکرد بیسترا. لەروشنایی یەکێك لەمەشخەڵەکان کەبەدیوارەکەوە بوو، سەیری دەرگاکەم کرد، شائکی و شوومام بینی کە دێنەژوور.

شتێکیان لەدەستدابو کە لەدوورەوە نەمدەزانی چیە، بەڵام کاتێك گەشتنە روبەڕوی ئێمە، لەسەرسووڕمان دەمم کرایەوە.

سێ سەری بڕاو....!! ئەم سەرە بڕاوانە چیە؟ کێن؟ کێ بڕیوویەتی.....؟ شائکی پێکەنی و وتی:

سەرۆك نەمهێشت رابکەن. من راکردنی جادوگەرانانم لەبیرکردبو، بۆیە هیچم نەوت. شائکی دووبارە وتی: ئەگەر رایان دەکرد خۆیان دەگەیاندە هۆز، دانیشتوانیان دژی ئێوە هاندەداو رەنگە خوێنیان بڕشتایە.

پاڵم بەشانی یوریەوە داو بەشائکیم وت:

لەبارەی کێ قسە دەکەیت....؟

جادوگەرانان.... ئەم شەیتان سروشتانە دنیا تێك دەدەن. بەڵام جێگەتان خاڵی بوو بۆ سەیرکردن کاتێك لەجەنگەڵ ئەوانم لەکاتی راکردندا بینی، لەپشت دارەکان خۆم حەشاردا وەك جەلاد یەك یەك سەرم بڕین... فەرموون، ئێستا بەتەواوی خیاڵتان ئاسوودەبێت.

یوری پێکەنی و وتی: دەستخۆش.... بەڕاستی لەبارەی جادوگەرانان نیگەران بووم.... ئێستا هیچ مەترسیەك هەڕەشەمان لێناکات.

دواتر رویکردە من و وتی: بەمەرگی جادوگەرانان و کۆماتۆ کاری ئێمە تەواو بوو..... تەنیا دەبێت شائکی بۆ سەرۆکایەتی هۆز هەڵبژێرین و تاجی لەسەرکەین، دواتر بڕۆین بەدوای کاری خۆمان....

شائکی بەسەرسوڕمان پرسی:

من.......؟ من.......؟ من پیاوم.... سەرۆك دەبێت ژن بێت.

یوری وتی: کێشە نیە... هەمو کارێك لەم دنیادا دەکرێت.....

شائکی ئاوی دەمی قووتدا. چاوەکانی لەخۆشحاڵیدا کرانەوەو نەیدەتوانی چاوی لەسەر شوێنێك تەرکیز پێبکات.

یوری لەوەی لەهەموو کارەکان سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو بەیەك رستەی سادە ئەو شادمانیەی لە شائکیدا دروست کردبو، خۆشحاڵ و پێدەکەنی بێ ئاگا لەوەی لەناخی مندا چی دەگوورەزێت. قۆڵیم راکێشا و وتم:

ئەمانۆ چی بەسەرهات...... مردوە؟

نا.... هێشتا نەمردوە....

بەناڕەحەتیەوە پرسیم:

کەواتە دەمرێت.....؟ برینەکەی مەترسیدارە....

وتی خەنجەر تەنیا قۆڵی هەڵدڕیوە، شتێکی گرنگ نیە، بەم زووانە چاك دەبێتەوە.

یوریم بەجێهێشت و بەرەو ناو پەرستگا ڕۆشتم. چەند هەنگاوی یەکەم قولاپەی پێم زیاد لەرادە ئازاری بوو، بەڵام دواتر باش بوو.

یوری و شائکی هێشتا قسەیان دەکرد کە من خۆم گەیاندە ژوورێك کە ڕووناکی لێ دەهاتەدەر، ڕۆشتمە ژوور. کچەکان ئەمانۆیان لەسەر جێگەیەك لەپێستی پڵنگ خەواندبو، دەرمانیان لەقۆڵیدابوو بەستبوویان. خەنجەر تەنیا پێستی قۆڵی چەپی بریندار کردبوو.

یەکێك لە کچەکان لەترسی ئەوەی نەکا ئەمانۆ بێتە هۆش و دەنگم ببیستێت وتی:

لەم ژوورە بڕۆینە دەر.... بائاسوودەبێت.

بەم بیانووە دەستی منی گرت و لەژوورەکە هاتینە دەر. یەکێکیتر لەکچەکان لەدەرەوەی ژوورەکە بۆ رفاندنی من لەدەست کچی یەکەم وتی:

لەهەنباری پەرستگا هەندێك شتی لێیە بەکەڵکی ئێوە دێت..... لەجل و بەرگ و لەم داردەستە ئاگراویانە لەهەنباردا زۆرە....

پرسیم: لەکام جل و بەرگانە....

لەوانەی ئێوە لەبەری دەکەن ! تازە.... خاوێن. ئەگەر دەتانەوێت تەنیا لەگەڵمدا وەرن تا ئێوە ببەمە هەنبار چونکە هەنبار تەنیا لەدەستی مندایە.

کچە جوانەکە ببووە ڕێنیشاندەرم، دەستی راکێشام و بەخێرایی دەڕۆشت تا هەرچی زووتر لەو ناوە دووركەوینەوە.

لەوکاتەدا من خۆم بەهێزو بەرزتر لەهەرکەسێك دەبینی و دەمزانی چونکە توانای هەموو کارێکم بوو بە لەناو بردنی کۆماتۆ و دەستەی جادوگەرانان هیچ کام لەدانیشتوانی ئامازۆن نەیارمان نەبوون. خۆم بەخاوەن سوڵتانی ئەو سەر زەوییە دەبینی.

سەرکەوتوانە و بەغرورەوە هەنگاوم هەلەگرت و برزەکانی ئەو کچەم بە پێکەنینێکی تایبەت وەڵام دەدایەوە، لە پێچی ڕێرەوەکە سووڕاین و لەبەرچاوی کچەکان کە هێشتا سەیریان دەکردین، ونبووین.

لەوساتە جگە لە من و ئەو کەسیتری لێ نەبو، نەکەس دەنگی دەبیستین و نەکەس دەیتوانی بمانبینێت.... کچەکە بەدڵنیاییەوە وەستا.

دڵی لێیدەدا، لێدانی دڵی ئەوەندە تووند بوو کە یەکێك لەدەمارەکانی ملی بەرزو نزم

دەبوویەوە، رەنگی پەڕابوو کاتێك دەستی بە قسەکردن کرد هەستم کرد دەنگیشی دەلەرزێت.

کاتێك وەستا تاچەند چرکەیەك توانایی قسەکردنی نەبو، دیویست بەسەر پەرێشانی خۆیدا زاڵ بێت و ئەوکات شتێك بڵێت... بۆ ئەوەی یارمەتیم دابێت وەك سوڵتانێك کە لەگەڵ یەکێك لە کەنیزەکانی خۆی قسەدەکات، قوڕگم ئاوساندو وتم:

ناوت چیە...... چەند ساڵتە؟

نازانم هیچ کات ئەسپتان کڕیوە... ئەگەر لە کڕینی ئەسپ ئەزموونتان نەبێت لانی کەم شتێکتان لەمبارەوە بیستووە. کاتێك رواڵەتی ئەسپەکەیان بینی و هەیکەلیان پەسەندکرد کریار یەکەم پرسیار کە لەفرۆشیاری دەکات ئەوەیە: (( ناوی ئەسپەکە چیەو چەند ساڵیەتی؟ ))

مرۆڤ زۆر خێرا کۆنترۆڵی خۆی لەدەست دەدات. شوێن کاریگەری سەیر لەسەر مرۆڤ بەجێدێڵێت مەبەستم ئەوەیە رووداوەکانی رابردوو ژیانی چەند ساڵە لەوجەنگەڵەو لەناو وەحشیەکان و نیوە وەحشیەکان بەڕادەیەك منیان گۆڕیبو کەیاساو رێساکانی مرۆڤایەتیم لەبیرکردبو و ببومە لە خۆڕازیترین پیاوی دنیا.

ئەم پرسیارە ئەوپەڕی لەخۆرازی بوونی منی نیشان ئەداو ئێوەش جوان دەتوانن هەست بەوە بکەن بەچ چاوێك سەیری دەوروبەری خۆمم دەکرد. بگوزەرێن، کچەکە لەوەی بەبزەوە پرسیارم لێکردبو زیاد لەرادە شادمان و لەپێستەکەیدا جێگەی نەدەبویەوە، بەهێواشی وتی:

ناوم (( نیکی )) یە و حەڤدە ساڵمە.

پێش ئەوەی وەڵام بدەمەوەو شتێك بڵێم خۆی دووبارە خۆی لەمن نزیك کردەوەو بۆ ئەوەی هەستەکانی خۆم داشارم دوو سێ جار کۆکیم و ئاوی دەمم قوتدا....

نیکی دەستی راستی خستە سەر پشتم و وتی:

پێش رۆشتنە ناو هەنبار دەمەوێت قسەت لەگەڵ بکەم..... گوێبگرە..... ئایا هیچ کات لە هەتاو کە لەئاسمان دەسووڕێتەوە، بیرت کردۆتەوە؟

مانای ئەم پرسیارە سەیرەم نەزانی. نەمدەزانی چ پەیوەندیەکی دەتوانێت لەگەڵ مندا هەبێت. یانی چی؟ ئەو چی دەڵێت؟ بەلەقاندنی سەر وەڵامی نام دایەوە، ئەو وتی:

زۆر باشە.... گوێ بگرە.... هەتاو شتێکی زۆر باشە و چونکە زۆریاش بڕیاریان داوە هەموو شوێنێکی جەنگەڵ بەیەکسانی لەتیشکی هەتاو کەڵك وەربگرن. تەنانەت

تاوانباران و گوناحکاران مافی بەکارهێنانی هەتاوی گیان بەخشیان هەیە.

سەیری دەمیم دەکرد. لێوە سوورِ رەنگەکانی وەك شکۆفە چرۆیان دەکرد و دەنگێك کە لەناو دوو ریزی ددانە سەدەفیەکانی دەهاتنەدەر وەك ئاهەنگێکی دڵنشینی مۆسیقی تا قووڵایی رۆحم کاریگەری دادەنا. بێدەنگ بو. دەیویست کاریگەری قسەکانی لەناوچاوم بخوێنێتەوە و کە حەزی منی بینی وتی:

لەم شێوەدا کەس مافی ئەوەی نیە هەتاو زیندانی بکات کەتەنیا خۆی کەڵکی لێ ببات و ئەوانیتر بێ بەش بکات.

تازە ئێستا بو کەهێڵێکی رووناك لەمێشکمدا دەرکەوت و تا ئەندازەیەك هەستم بەمەبەستەکەی کرد بەڵام هێشتا دڵنیا نەبووم. نیکی دووبارە بێدەنگ بو، دواتر وتی:

تۆش لەم هۆزەدا وەك هەتاو وایت. ماوەیکی زۆر خۆری مووناك بوویت.... لەم ناوەدا لەگەڵ لئۆناش عەشقبازیت دەکرد.... ئێستا ئەمانۆ تۆی داگیر کردوە.... مەگەر من کچێکی جوان نیم.....

لەناکاو پێکەنیم..... بەڵگە هێنانەوەی سەیرو بەڕاستی پێکەنیناوی بو. لەهەمان کات کە پێدەکەنیم بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەو زۆر دەمێکەیە بۆ ئەم رۆژە خۆی حەشارداوە و خۆی ئامادەکردوە. قۆڵی گرتم و تەکانیداو وتی:

بێهۆ پێمەکەنە.... ئەمانۆ بێهۆشە.... سێ کاتژمێر زیاتر یان کەمتر کاتمان هەیە. من تۆ دەبەمە ناو هەنبار کەس جگە لەمن ناتوانێت بێتە ناو هەنبار، شتی وات پێدەبەخشم لەتەمەندا نەت بینیوە....

خێرا وەڵامم بدەرەوە.... خێراکە، کات بەفیڕۆ دەڕوات.

هێشتا پێدەکەنیم. ئەو ئەم پێکەنینەی بەنیشانەی رازی بوونی من لەقەڵەم دا و دواتر دەستی راکێشام و وتی: وەرە..... وەرە ئازیزم گەشتین، ئێرەیە.

لەبەردەماندا دەرگایەکی داری گەورە دەرکەوت. بەپەلە بەرەو دەرگاکە رۆشت و چەند ئاڵقەیەکی بچووکی ئاسنی راکێشاو قوفڵێکی سەیر کەلە دەرگاکەیان دابو، کردیەوە. بەشێوەیەك خۆی دەیوت کەسیتر جگە لەو ناتوانێت ئەو قوفڵە داخات و ببەستێت.

کاتێك دەرگای هەنبار کرایەوە، بۆنێکی دڵ ئەنگێز لەگەڵ هەوای گەرمی ناو هەنبار گەشتە لووتم.

حەزم لە هەموو شتێکت و هەمووشوێنێکبو. رەنگی دنیا لەبەرچاوەکانم گۆڕا و لەژێر

کاریگەری هێزێکی شاراوەو نەبینراو بۆ ژوورەوە راکێشرام.... دەتوت دەستێك یەخەمی گرتووەو دەمکێشێتە ناو هەنبارەکە. نیکی لەسەرکەوتنەکەی خۆی دڵنیابوو. بەبزەیەکی سەرکەوتوانە سەیری کردم. مەشخەڵێکی هەڵکردو خۆی بەمن گەیاند، قۆڵی گرتم و وتی: بۆ سست بویت چیت لێهاتووە؟

دواتر زانیم کە ئەو زانی بۆ سست بووم بەڵام بۆئەوەی لەزمانی خۆمی بیستبێت پرسیاری کرد.....

بەحەزو ئارەزوویەکی زیاد لەڕادە قۆڵی ئەوم گرت و لەگەڵیا هەنگاوم هەڵگرت.

دوو سێ هەنگاو رۆشتمە پێش، نیکی مەشخەڵەکەی دایە دەستم و خۆی گەڕایەوە بۆ لای دەرگای هەنبارەکە و دایخستەوە. بێ ئیرادە وەك کەسێك ئەم رستەی خستبێتە سەر زمانم و بەوتنی ناچارم بکات وتم:

دەرگاکە دادەخەیت.... دەترسم لەکاتی گەڕانەوە نەتوانیت قوفڵەکە بکەیتەوە و ئێمە لەم هەنبارە تاریك و سەیرە زیندە بەگۆڕبین.

مەترسە..... چەندین ساڵە ئەم دەرگا دادەخرێت و دەکرێتەوە. لەچەند مانگی پێش ئەم کارە بەمن راسپێردراوە و هات و چۆ دەکەم و هەرجار کەدایدەخەم دەیکەمەوە.... ئاسوودە بە.....

دەرگاکەی بەست، هاتە لام و قۆڵی گرتم. وتی:

بڕۆین.... ئێرە تاریکە..... بەڵام هەنباری سەرەکی رووناکە. مەشخەڵەکە لەکۆتایی ئم رێڕەوەدا دەکوژێنینەوە.

دواتر پرسی: نەت وت بۆ سست بویت...؟

وتم: سست نەبووم.... حەزم لەم بۆنە دڵگیرەیە.... ئەم بۆنە چیە؟

ئەمە بۆنی عەشقە...

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم: بۆنی عەشق؟ بۆنی عەشق یانی چی.....؟

وتی: ئەم بۆنە ناوی عەشقە. بۆیە ناویان ناوە بۆنی عەشق کە هەرکەسێك بۆنی بکات هەموو حەزو هەوەسە خەوتووەکانی زیندوو دەبنەوە.

دەتوت راست دەکات ! منیش کاریگەریم لەسەر دانرابوو. بۆنی عەشق سات بەسات زیاتر کاریگەری خۆی دەکردو منی ئارەزوومەندی نیکی دەکرد.

کەم کەم گەشتینە کۆتایی رێڕەوەکە. لەشوێنێکی دیاریکراو نیکی مەشخەڵەکەی لەسەر دیوارەکە داناو وتی:

لێرەوە وەرە !

دوای تێپەڕین لەدەرگایەکی بچووک گەشتینە ژوورێکی بەربلاو کەبەڕادەی پێویست رووناك بو. سەر دیوارەکانیان کون کردبو و لەهەمان رێگاوە نوور دەهاتە ناو ژوورەکە.

من زووتر لەنیکی گەشتمە ژوورەکە و لەگەڵ رۆشتنە ناو لەشوێنی خۆمدا چەقیم.... سەرم سوڕما..... شتی سەیرم دەبینی.... شمشێری زێڕ..... گەردنبەندی ئەڵماس و مرواری.... جەواهیر.....

لەخۆم پرسی: ئایا بەڕاستی ئەم بەردانە بەردی گرانبایی راستەقینەن... ئەولاتر برێك سیلاحی کۆن، وەك تفەنگی سەرپڕ و شمشێری خوار، کەمێك ئەولاتر چەندین دەست جلی پیاوانە، پێڵاو و کڵاو کراسی و جانتاو پەتو کەڕەستەی راو، پرسیم:

ئەمانە چین و لەکوێوە هاتوونەتە ئێرە؟ ئەم هەموو کڵاو پێڵاو جل و بەرگە لێرەدا رژاون هی مووناکە؟

نیکی وتی: ئەمانە هی مووناك نەبوە تا بیبەخشێت بەئێوە.... ئەمانە هی خواکانە ! تەنیا جادوگەرانان مافی بەخشین یان بەکارهێنانیان هەیە و ئەویش لەئەگەرێکدا داوای مۆڵەت لەخواکان بکەن....

قسەکەیم بڕی و وتم:

ئێستا کە جادوگەرانان نین... خواکانیش زۆر بەرچاو تەنگ نین. ئێستا کە جادوگەرانان کوژراون من لەخواکان مۆڵەتی پێویستم وەرگرتووە.

ئەمەم وت و بەرەو جلەکان رۆشتم، پێش هەرشتێك جووتێك پۆستاڵم بەپێی خۆم دۆزیەوەو لە پێم کردو دواتر سەیری شەڕواڵەکانم کرد، وتم:

نەت وت.... ئەم شتانەتان لەکوێوە هێناوە؟

نیکی وتی:

چەندین ساڵ پێش ئەوکاتەی من هێشتا لەدایك نەبووم تاقمێك هاتنە ئێرە.....

سەرۆکی هۆزی ئێمە میوانداری لێ کردن و رێزی لێ گرتن و بەڵام ئەوان بەمەبەستی خیانەت چەند کەس لەژنان و کچانی هۆزەکەمان دەگرن بەنهێنی لەگەڵ خۆیاندا بیانبەن. لەرێگا گرفتار دەبن و بەدەستووری سەرۆك هۆز هەموویان بەبێ جیاوازی دەکوژرێن. ئەمانە جل و بەرگ و تفەنگی ئەوانەو لەهەنباردا کەڵەکە کراوە.

وەك وتم لەهەنبار زێرو جەواهیراتی زۆری لێ بو، ئەڵماسی گەورە، مرواری، یاقووت. بینینی ئەو ئەڵماسانە چاوی زەق دەکردو من لەهەمان کات کە لەبینینی ئەو گەنجە

لەپێستەکەی خۆم جێگەم نەدەبوویەوە، بەتاقی کردنەوەی پێڵاو ئەندازەگرتنی کلاّوەکان سەرقاڵ بووم.

لەسیلاحەکان بەتایبەت تفەنگەکان گوومانی بەکارهێنان نەدەکرا چونکە هەموویان تفەنگی کۆن بوون لەکاتێکدا ئێمە ڕەشاشمان بو بەلاّم چەند خەنجەرێکی جوان کەتیغی پۆلاّیینیان بوو، سەرنجی منیان راکێشا. بەخێرایی یەکێك لەوانم بەخەنجەری کەمەرم گۆڕییەوە. جوتێك پۆستاڵی ڕەنگ قاوەیم هەڵبژاردو لەپێم کرد. دەتوت لەکارخانە ئەو پێلاّوەیان بۆمن تەواو کردوە. کاتێك پۆتینەکانم لەپێ کرد هەستم بەئارامی کرد. چەندین ساڵ بوو پێلاّوێکی باشم نەبو. ئامازۆنیەکان بەگشتی پیلاّو لەپێ ناکەن بەلاّم جۆرە سەرپێیەکیان هەیە کە لەپێستی بەراز دروستی دەکەن.

جگە لەپێلاّوەکان شتی تریش بو، شەڕواڵ، کۆت و کراسی پیاوانە. بێ ئیرادە یەکێك لەسنوقەکانم کردەوە کە جگە لەجل و بەرگی تازە هیچ شتێکی تری تیانەبو.

داماو خاوەنەکانیان کە دەرفەتی کەڵك وەرگرتن لەوجل و بەرگانەیان نەبوو هەموویان کوژرابوون، نەیاندەزانی رۆژێك بەئێمە دەبڕێت.

بەپەلە جلەکانم دەرهێناو لەشادمانیدا دوو شەڕواڵم لەپێ کردو شەڕواڵە کۆن و دراوکەی خۆم فڕێدا. کاتێك سەرقاڵی ئەم کارانە بووم نیکی بەردەوام قسەی دەکرد و دەیوت:

لەکۆندا دانیشتوانی ئێمە لەگەڵ بیانیەکان دوژمنایەتیەکی سەیریان بو. هیچ بێگانەیەك.... چ سپی پێست و چ دانیشتووی جەنگەڵ توانای نزیك بوونەوەی لەهۆز نەبو و لەکاتی پێویست کە ژمارەی پیاوانی هۆز کەم دەبوویەوە، ژنانی شەڕکەر و پیاوە بەکرێگیراوەکان هێرشیان دەبردە سەر هۆزە دوورەکان و تاقمێك گەنجی بەژن و بالاّ رێکیان دەستگیر دەکرد و دەیانهێنان و لەناو بنەماڵە بێ پیاوەکاندا دابەشیان دەکردن...

من وەك کەسێکی برسی کەدوای چەند رۆژ برسیەتی و تینوویەتی بەسەرچاوەی ئاوو سفرەیەکی رازاوە گەشتبێت بەتەماحێکی زۆرەوە سەرقاڵی جیاکردنەوەی جلەکان بووم لەگەڵ ئەنجامدانی ئەم کارانە بو کە گوێم لەقسەکانی نیکی دەگرت. ئەو دەیوت:

شانستان هەیە کە جادوگەران کوژران. ئەگەر ئەوان زیندوو بوونایە کەس جگە لەوان نەیدەتوانی کەڵك لەم جل و بەرگە وەربگرێت. بەگشتی جگە لەیەك دوو کەس مافی هاتنە ناو هەنباری نیە. هەرچی لێرەدایە هی خواکانی جەنگەڵ و هەتاوە و باوەڕ وایە

خواکان پارێزگاری لەشتەکانی خۆیان دەکەن.

بەقسەکانی پێکەنیم. نیکی بەسەرسوڕمانەوە پرسی: بۆ پێدەکەنیت؟

وتم: ئەم قسە پووچ و خۆڕاییانە لەسەرت دەرکە. خوا ماڵی نیە.

کاتێك قۆپچەی کراسە تازەکەم دەبەست پرسیم:

ئەگەر ماڵی ئەوان بدزن چی دەکەن؟

وتی: هیچ.... دیوارەکانی پەرستگا بەسەرماندا دەروخێت و بۆ هەمیشە لێرەدا دەمێنینەوە... خوای جەنگەڵ بیَ بەزەییەو خێرا تۆڵە دەستێنێتەوە.

بۆئەوەی خێراتر کۆتایی بەم وتوێژە بێنم رۆشتمە پێش و وتم:

زۆر باشە... ئێستا بۆ یوری و شائکیش جل و بەرگ هەڵدەگرین و دەڕۆین.

دواتر دەگەڕێینەوە و شتەکانی تر دەگوازینەوە. یوری بەم پێلاو و جل و بەرگ و کلاوە شادمان دەبێت چونکە قاچەکانی ئاوساوە و جەستەی بەهۆی مانەوە لەژێر تیشکی هەتاو، سووتاوە.

نیگەرانی یوری و ئەمانۆ بووم.... دەترسام ئەمانۆ بێتە هۆش و کچەکانی پەرستگا بەحەسوودی پێی بڵێن کە من و نیکی رۆشتووینەتە ناو هەنبار... ئەگەر ئەمانۆ تێبگات دنیای لەبەرچاومدا ڕەش دەکرد و رەنگە خۆی دەکوشت و جەنگەڵی دەسووتاند.

لەلایەکیتر بارودۆخ گونجاو نەبو. ئێمە هێشتا لە شەودا بووین و یوری نەیدەزانی لەکوێم و چی دەکەم...

سەرئەنجام وتم: چاوەڕیَ بە... تۆ لێرەدا بمێنەرەوە.... من دەڕۆم یوری ئاگادار دەکەمەوە و پێی دەڵێم ئەگەر ئەمانۆ هاتە هۆش سەرقاڵی بکات.... زوو دەگەڕێمەوە.

نیکی دەستی گرتم و وتی: راست دەکەیت..... دەگەڕێیتەوە؟

وتم:بەڵێن دەدەم دڵنیابە کە درۆناکەم.

نیکی رازی بو. جلەکانم خستە ژێر باڵم و بەرەو دەرگا رۆشتم. نیکی بەدوامدا رایکردو بەبزەوە وتی: دەرگاکە داخراوە.... دەبێت بیکەمەوە.... ئەمەی وت و بەکردنەوەی ئەو قوفڵە سەیرە سەرقاڵ بوو. خولەکێك تێپەڕی..... دوو خولەك بەسەر چوو بەڵام دەرگا نەکرایەوە.

کەم کەم جووڵەکانی دەستی نیکی توند تر دەبو دیاربو ترساوە. قۆڵیم گرت و بەخوێنساردو لەسەرخۆ وتم: چی بووە..... بۆ قوفڵەکە ناکەیتەوە...

نیکی روخساری رەنگ پەڕاوی خۆی کردە من و لەکاتێکدا لێوەکانی دەلەرزی و

دەنگی گۆڕابو وتی:

پارچەکانی قوفڵ تێکەڵ بووە... ڕەمزی قوفڵەکە گۆڕاوە و هەرچی دەکەم ناکرێتەوە. هەوڵم دا خوێنساردی خۆم بپارێزم. لەبێدەنگیەکی زۆر کورتدا بەسەر لەرزینی دەنگی خۆم زاڵ بووم وتم: گرنگ نیە.... دەرگاکە دەشکێنین.

سات بەسات دڵەراوکێ و پەرێشانی نیکی زیاتر دەبو ئەم جارە دەستەکانی خستە کەمەرو بەوپەڕی بێ هیوایی و خەمباری وتی:

ئەگەری نیە.... ئەم دەرگا ناشکێت. پەنجا پیاوی شەرکەر ناتوانێت یەك تاکی تەکان بدات نە.... نە.... ئەمە تووڕەیی خواکانە... پێم وتی قسەی خراپ لەبارەی خواکان مەکە. پێشتر دەمزانی و ئێستا بەچارەنووسێکی شووم و بەئازار گیان دەدەین. خواکان ڕەمزی قوفڵەکەیان گۆڕیوە و ئێمەیان لەناو پەرستگادا زیندە بەگۆڕکردوە.

پێشتر وتم نیکی زۆر گەنج بو. دەمەوێت بڵێم منالێکی بێ ئەزموون و دژواری بەسەردا نەهاتبو.

هەڤدە یان هەژدە ساڵ تەمەنی بوو، کچێکی هەژدە ساڵەی ناسك کە هەموو تەمەنی بەخورافات و وەهمی پووچ بەسەر بردبو، لەبەرانبەر ڕووداوێکی ئاوا مەترسیدار چ پەچەکردارێك نیشان دەدات ئێوە دەتوانن بەراوردبکەن. نیکی مافی خۆی بو. ئەوە ئەرکی من بو ئارامی بکەمەوە. نیکی ئیتر نەیتوانی ئارام بێت، سەری خستە نێوان دوو دەستی و بەرەو سەکۆیەك کەماری تایبەتی لەسەر خەوتبوو ڕۆشت. لەبەردەمیدا چۆکی داداو بەزمانی ئامازۆنی دەستی بە دۆعا کردن و پاڕانەوەکرد.

سەیربو لەدۆعاکانیدا داوای لێخۆش بوونی بۆمن دەکردو دەیوت:

توندی خۆشەویستەکەم لەبەرچاو مەگرە و دەرگاکانی پەرستگامان بۆبکەرەوە.... ئاگای لەمەزنی و توانای تۆنیە و من دەزانم تووڕەیی تۆ بۆتە هۆی نەکرانەوەی قوفڵەکە. بەزەیت بەمن و خۆشەویستەکەمدا بێتەوە. منیش چەند خولەکێك لەگەڵ قوفڵەکەدا سەرقاڵ بووم بەڵام کارێکم پێ نەکراو زۆر زوو هەستم بەوەکرد کەنیکی بەهۆی پەلەکردن لەئەنجامی شادی زۆر قوفڵی دەرگاکەی جۆرێك داخستووە کە کردنەوەی بۆتە شتێك نا ئەگەر. بەبێ هیوایی بۆ لای نیکی گەڕامەوە، کاتێك نزیکی بوومەوە لەناکاو بڕیارێکم گرت و ڕۆشتمە پێش. دەمویست بەتەواوی باوەڕی نیکی لەناوبەرم.

لەسەر ئەم بیرۆکەیە ژێر باڵیم گرت و وتم:

چاوەڕێ بە نیکی مەگری سەیری من بکە.

ئەو چاوە پڕ فرمێسکەکانی بڕییە من و هیچی نەوت.

ئایا ئەم پەیکەرە و ئەم سەکۆیە کەماری لەسەر خەوتووە، خواکانی تۆن.

بەسەرسوڕمانەوە وتی: بەڵێ، ئەوان بوون کەقوفڵەکەیان تێك شکاند.

پرسیم: کەواتە ئەگەر بڕۆمە پێش و بمەوێت بیانشکێنم و وردیان بکەم ئەوان دەمکوژن و لەناوم دەبەن وانیە؟

ئەو سەری خۆی بەنیشانەی پشت ڕاست کردنەوەی تەکان دا بەڵام ئەوەندەی نەبو بەوتنی ڕستەیەك بۆ ئەم کارە هانم بدات بەدوای ڕستەکەی پێشوومدا وتم:

زۆر باشە... کەواتە من دەڕۆمە شەڕی خواکانی ئێوەو ئەوان لەناو دەبەم.

نیکی وەك شێت خۆی خستە سەر قاچم و منی لەناو بازوەکانیدا گرت، بەپاڕانەوە وتی: نا.... نا....... ئەم کارە مەکە. هۆزەکەمان ژێرەو ژوو دەبێت. نەخۆشی و وشکە ساڵی دێت. بەلا دەبارێت... هەتاو گەرم دەبێت و هەمووان لەئاگری ئاسمانیدا دەسووتێین.. نەکەیت..... نەڕۆیتە پێش....

بەنەرمی لەسەر زەوی بەرزم کردەوەو وتم:

یەك خولەك چاوەڕێ بە... من کارێکی گرنگم هەیە.

لەبێ ئاگایی ئەو کەڵکم وەرگرت و بەرەو پەیکەرەکە رام کرد.

لەسەر ڕێگای خۆم یانی لەسەر قادرمەیەکی بەربلاو کە ئەرزی ژووری پەرستگای دەگەیاندە پەیکەرەکە، رمێکی درێژم هەڵگرت و رۆشتمە پێش.

کاتێك گەشتمە پەیکەرەکە زانیم پێویستم بەرم و هیچ شتێکی تر نیە. هەیکەلەکە لەسەر پایەکەی خۆی جێگیرە و هیچ پەیوەندیەك لەنێوان پایەو پەیکەرەکە دانیە. بەلەقەیەك خوای هۆزم لەقادرمەکان خستە خوار.

هەیکەلەکە تلێکی خواردو کەوت وەك شووشەیەکی کە لە بەرزاییەوە دەکەوێت بوو بە سەدان پارچە. دەستم بەپێکەنین کردو بەدەم قاقاوە لەقادرمەکان هاتمە خوار بەڵام لەسەر قادرمەی دووەم و سێیەم لەناکاو وەستام، واقم وڕما..... چونکە......

دەزانن چیم بینی...... لەبەردەم خۆم..... ئەرزی ژوورەکە... تەپۆڵکەیەك لەخۆڵی زێر... خۆڵی زێرم بینی.

هەیکەل قاڵبێك بوو کەبڕێکی زۆر خۆڵی زێریان تیا حەشاردابو. گەردیلەکانی زێر بەدەوروبەردا بڵاوبوبونەوە، دەدرەوشانەوەو دەبریسکانەوە و چاویان زەق دەکرد. جگە لەخۆڵی زێر بڕێکی زۆر زێر لەناو هەیکەلەکە هاتبوەدەرو لەوشوێنێکدا کۆپەڵەکرابو و

سەرنجی رادەکێشا.

بەچاو لێکردنێك بەهاکەیم بەراوردکرد.... گریمان ئەگەر لەئەمریکا بەهای هەرگرامێك زێر دوو دۆلار بێت سێ سەد کیلۆ گرام خۆڵی زێر دەبێتە چەند. زۆر ئاسانە.... هەرکیلۆ هەزار گرام. سێ سەد هەزار گرام.... شەش سەد هەزار دۆلار نزیك ملیۆنێك.

کەواتە من و یوری ملیۆنەر بووین...

لەوێدا وەستام و سەیری دیمەنەکەی روبەڕوی خۆم کرد. دنیایەکی تر لەزەینمدا وێنەکرابو، بیرم دەکردەوە کە کۆشکێکی مەزن لەکالیفۆرنیا دەکرم. دواتر کەشتیەك و کارخانەیەکی گەورە دادەمەزرێنم. وە...... لەچەند ساڵ داهاتوودا بەم دەست مایە لەئاقا خانی محلاتی و ئۆناسیس دەوڵەمەندتر دەبم و لەدەریا رکەبەرایەتی کەشتیە بارهەڵگرەکانی ئۆناسیس دەکەم.

خۆم ئاوساندو بەهێواشی رۆشتمە خوار.... نیکی هێشتا دەگریا و لەژێر لێوەوە تۆبەی دەکرد.

من وەك شێت بەرەولای رامکرد، قۆڵیم گرت و تابەردەم خۆڵی زێرەکە هێنام و وتم:

بڕوانە ئازیزم..... بەم سامانە تۆش دەبەمە دنیای پێش کەوتو.... تۆ و ئەمانۆ پێکەوە دەژین.... من ئەم بەختەوەریە قەرزاری تۆم و تاکۆتایی تەمەن رێزت لێ دەگرم.

نیکی خۆی خستە ناو باوەشم و وتی:

ئێمە لەم پەرستگادا دەمرین ! تۆ چی گوومان دەکەیت. خواکان بەم زووانە دەمانکەنە خۆڵەمێش. لەم کاتەدا دووبارە کەوتمە بیری داخرانی دەرگاکە.

نیکی راستی دەکرد. ئێمە لەوێدا زیندە بەگۆڕ بووین. مەحکووم بوین بەمەرگێکی لەسەر خۆو هێواش هێواش. لەتینوویەتی و برسیەتیدا دەمردین... لەبرسیەتیدا ناچار دەبووم گۆشتی نیکی بخۆم...

بەڵێ مرۆڤ کاتێك لەمردن نزیکە هەموو کارێك دەکات.... خواردنی گۆشتی مرۆڤ کە زۆر گرنگ نیە..

بەراست ئایا شتێك ئەگەری هەیە؟ ئایا ئەگەری هەیە گۆشتی نیکی بخۆم.

ئەمە پرسیارێك بو لەخۆمم دەکرد. وەڵامی پرسیارەکە ئاشکرابو، یانی کاتێك مرۆڤ برسی بێت و لەبرسانا بەرەو مەرگ بڕوات گۆشتی خۆشەویستەکەی خۆشی دەخوات.

لەبیرکردن لەم بابەتە جنێوم بەخۆم دەداو لەعنەتم دەنارد..... لەئارەقدا خوسابووم

مێشکم باش کاری نەدەکرد کە بۆ رزگار بوون لەپەرستگا بیرێك بکەمەوە.

چەند جارێك لەدرێژی و پانی پەرسگاکە گەڕام و بیرم کردەوە. فشارێکی زۆرم بۆ مێشك و دەمارەکانم هێنا.

بەڵام هیچ رێگە چارەیەکم بەمێشکدا نەهات..... دوای چەند خولەك بەنیکیم وت:

جارێکیتر قوفڵەکە تاقی بکەرەوە.... بەدڵنیاییەوە تۆ لەبەر پەلەکردن لەشوێنێکدا هەڵەت کردوەو ئەمە بۆتە هۆی گۆڕینی رەمزی قوفڵەکە.

نیکی بەبێ قسە بەپێشنیارەکەم رازی بو و جارێکیتر بەرەو لای قوفڵەکە چوو. سەرقاڵی بوو رەنگە بتوانێت کارێك بکات بەڵام بەداخەوە هیچ و زۆر خێرا هیوابڕاو بوو، بەچاوی فرمێسکاوی هاتەوە لای من سەری لەسەر شانم داناو بەدەم گریانەوە وتی:

قوفڵ نەکرایەوە..... ناکرێتەوە..... چی بکەم..... تەواو، بەم زووانە لەم پەرستگایەدا گیان دەدەین و دەمرین و بەدوای بێدەنگیەکی کورت وەك ئەوەی نەیەوێت ئەم رستەیە بێنێتە سەر زمان وتی:

بینیت تووڕەیی خواکان بووە هۆی لەناو چوونی ئێمە....؟ دڵنیا بە بەڵایەك لەئاسمانەوە دەبارێت.

بەدژواری دەمتوانی نیکی ئارام بکەمەوە. کاتێ گریانی وەستاند بۆ ئەوەی دووبارە نەچێتە سەر باسی مردن و زیندە بەگۆڕ بوون، بزەیەکم لێداو وتم:

ئایا دوێ شەو لەحەوزەکەدا خۆتت شۆرد؟

بەسەرسوڕمانەوە وتی:

بەڵێ من و خوشکەکەم هەفتەی جارێك لەو حەوزەدا خۆمان دەشۆین.

## ( ١٨ )

ئەو شەوە لەسەر پێستی ئاژەڵەکانی هەنبار خەوتین. شەوێکی خۆش بو.

بەیانی کەلە خەو هەستام نیکی لەسەر سەرم دانیشتبوو، یاری بەقژەکانم دەکرد و کاتێك لەشوێنەکەم هەستام و دانیشتم، کاتێگ گەڕامەوە بۆ رۆح و دڵی خۆم زانیم جۆرێك حەزو ئارەزووی رۆحی لەدڵمدا هێلانەی کردوە و پەیوەندیەکی نەپچڕاو من بەو دەبەستێتەوە.

بەخێرایی ئەمانۆم بیرکەوتەوە. بەڵێنم پێدابو لەکاتی گەڕانەوە لەگەڵمانا بێت. چۆن دەمتوانی لەژێر ئەم بەڵێنە ئەخلاقیە دەربچم. جیاواز لەوەش ئەمانۆ منالێکی منی لەسکدابو. درەنگ یان زوو ئەم منالە بەدنیا دەهات و بەبوونی ئەو هیچ کات نەمدتوانی ئەمانۆ بەتەنیا جێ بێڵم. دەمویست نیکی لەگەڵ خۆم ببەم. ئەمانۆشم خۆش دەویست بەڵام نیکی پاکیەکی کچانەی بو کەمنی مەست دەکرد. ئەم گوومانانە مێشکیان سەرقاڵ کردبووم کە لەناکاو دەنگی نیکی رشتەی بیرکردنەوەمی پچڕاند و دووبارە لەوپەڕی ئاسمانەکان بۆ ناو پەرستگا دەرگای داخراوی دابەزاندم.

سەری خستە سەرشانم و وتی:

چارەیەك بکە. ئەمە دووە مین رۆژە لەهەنبارین.

بێ درەنگ جلم لەبەرکردو دەستم بەچالاکی کرد... بەڵام هەرچی زیاتر هەوڵم دەدا کەمتر ئەنجامم دەگرت. دەرگای گەورەی پەرستگا بەهیچ جۆرێك نەدەکرایەوە..... نە ئەو قوفڵە دەکرایەو نەدەرگاکە دەشکا...... دیوارەکانیش بەجۆرێك دروستکرابوون سەرکەوتن لێیان ئەگەری نەبو.

تا نزیك نیوەرۆ هەوڵم دا و هیچم پێ نەکرا.... کاتێك هەتاو بەشێوەیەکی ستوونی لەکونەکانی سەر دیوار کەوتە سەر سەکۆکەو نیوەرۆی راگەیاند، هیلاك و ماندوو گەڕامەوە بۆلای نیکی.....

ئەو لەسەر سەکۆکە خەوی لێکەوتبو.....

زانیم برسیەتی زۆری بۆهێناوە و نزیکە لەبرسانا بمرێت. بەنەرمی لەخەو هەڵمساند. نیکی هەستاو کەزانی هیچم پێ نەکراوە و رێگەیەکم بۆ دەرچوون نەدۆزیوەتەوە،

دووبارە سەری خستە سەر پێستی پڵنگ و خەوت. چەندین کاتژمێر بەدوای یەکدا تێپەڕین..... نیکی هێشتا لەخەودا بو کە هەواتاریك بو....

یوری و شائکیش دەنگیان نەبو.... دیارنەبو ئەوان بۆ دۆزینەوەی من ڕۆشتونەتە کوێ و چی دەکەن. هیوادار بووم.... هیوام لەوێوە سەرچاوەی دەگرت کەدەمزانی یوری لەسەر ئارەزوومەندیەك کەبەرانبەر بەمنی هەیە، بێکار دانانیشێت و دەست لەهەوڵدان هەڵناگرێت..... بۆ چەندین جار ڕۆشتمە پشت دەرگای پەرستگاو قیژاندم و یوریم بانگ کرد. بەڵام جگە لەدەنگدانەوەی دەنگی خۆم دەنگی تر بەگوێ نەدەگەشت. دەتوت بەسەر پەرستگا خۆڵی مەرگیان پرژاندوە....

لەم کاتەدا کە لەپشت دەرگاکە دەگەڕامەوە دەمویست یەکێك لە مەشخەڵەکان بۆ ڕووناکی پەرستگاکە ڕۆشن بکەم لەناکاو نیکی لەخەو ڕاچەنی و بەترسەوە وتی:

نا....... نا...... بڕۆ ! من لەتۆ دەترسم.

کەمنی لەبەرانبەر خۆیدا بینی، هەناسەیەکی هەڵکێشا، بەپشتی دەست ئارەقی ناوچاوی پاك کردەوەو وتی:

چ خەوێکی مەترسیدارم بینی.....

بەدوای ئەم ڕستە سەیرێکی سەر سەکۆکانی پەرستگا کە پێشتر پەیکەری خوای جەنگەڵ لەوێدا بو، کرد بەناڕەحەتیەوە سەری داخست.

مەشخەڵەکەم ڕۆشن کرد و دواتر شانەکانی نیکیم لەناو دوو دەستمدا گرت و وتم:

مەترسە.... ئارام بە..... برسیەتی زۆری بۆ هێناویت و ئەم جۆرە خەوانە لەبرسایە.

نیکی هیچی نەوت بەڵام من پرسیم:

دەی، نەت وت چ خەوێکت بینی کە ئەوەندە ترسایت....؟

شانەکانی بەرزکردەوەو وتی:

نا لەدووبارەکردنەوەو بیرکردنەوەشی دەترسم..... دەترسم.

پێکەنیم وتم: تۆ کەئەوەندە ترسنۆك نەبویت... قسە بکە.... چیت بینی کەترسایت؟

نیکی سەری هەڵبڕی... بەچاوە پڕ فرمێسکەکانی سەیرێکی سەکۆکەی کردو لەمنی پرسی: ئایا کاتێك من لەخەودا بووم تۆ نەڕۆشتوویتە پشت دەرگای پەرستگا.... نەت قیژاند و یوریت بانگ نەکرد؟

بەسەرسوڕمانەوە وتم: با ئەم کارەم کرد.

دواتر لەخوار سەکۆکان پیاسەت کرد..... دوای چەند خولەك ڕۆشتیتە دەوروبەری

کەیەکێك لە مەشخەڵەکان ڕۆشن بکەیت.... من لەخەودا تۆم بینی.....

لە قسەکانی نیکی سەرم سوڕما. هەرکەس لەجیاتی من بوایە نەیدەتوانی لەدەربڕینی سەرسوڕمانی خۆی ڕێگری بکات.

چونکە نیکی لەخەودا ئەوکارانەی من کردبووم، بینیبووی، پرسیم:

دەباشە بینینی ئەم کارانە ترسی نیە لەچی ترسایت....

نیکی بۆ چەندین جار سەیری پەیکەڕەکەی کردو بە هێواشی وتی:

کاتێك تۆ ئەم کارانەت دەکرد ئەو پیاوە ڕەش پۆشە، دەزانی کام پیاوە....؟ ئەو پیاوەی لەگەڵ مندا سەمای دەکردو تیغی خەنجەرەکەی نیشان دەدام.... ئەو پیاوە سەری لەسەکۆی ژێر پەیکەڕەکە دەرهێنا و بەمن پێکەنی، بەدەست ئیشارەی کرد کە لە کونی تاریکی ژێر قاچی ئەو دا بڕۆم. تەنانەت جارێکیش بەناو بانگی کردم و وتی:

وەرە..... مەترسە...... لەگەڵمدا وەرە.....

نیکی خەوێکی ناخۆشی بینیبوو. موو لەسەر ئەندامەکانی بەرز ببوویەوە. ترس و لەرز دایگرتم:

هەستم کرد نیکی بێ هۆ قسەناکات و بەدڵنیاییەوە شتێکی بینیوە..... بەڵام نە.... من نابێت ئەم قسە نابەجێیانە باوەڕ بکەم. ئامازۆنیەکان خورافاتی وەهم پەرستن.

نەمدەزانی چی بکەم لەبەرئەمە بەنیکیم وت:

تۆ بەهەڵەدا چوویت. لەژێر پەیکەڕەکە کوون نیە... بۆ دڵنیایی زیاتر لەگەڵمدا وەرە تا نیشانت بدەم کە لەوێ بەردێکی گەورەو قورس زیاتر هیچی تر نیە.

دەست بەجێ دەستیم گرت و لەگەڵ خۆم بردمە ئەوبەر. نیکی خۆراگری دەکرد و نەیدەویست لەگەڵ مندابێت بەڵام بەڕاکێشانم ئەوم برد. بەهەمان شێوە کەنیکی وتبووی بەردێکی گەورەو چوار گۆشە لەوێدا بو کەزیاتر لە دوو تەن کێشی بو.

بەردەکەم نیشان دا و وتم:

سەیرکە، کوێی ئەم بەردە کونە؟

نیکی دانیشت و بەپارچەیەك لە پارچە وردەکانی پەیکەڕ، بەسەر بەردەکەی دەکێشا. دەنگی گامبی گامبی قووڵ بیسترا. چەند جارێکیتر لێیدا و ئەو دەنگە جوانتر بەگوێ دەگەشت. سەرم سوڕما بوو نەمدەتوانی قسە بکەم. نیکی لەشوێنەکە هەستاو وتی:

بینیت، بینیت کە درۆناکەم. ناو ئەم بەردە کونە و کونەکەش پەیوەندی بە تراویلگەیەکی گەورە هەیە، دەنگەکەت بیست؟

بێدرەنگ ڕەشاشەکەم لەسەر زەوی داناو پاچم هەڵگرت، دەست بەکار بووم.

ئەگەری بو ڕێگایەك بۆ  رزگار بوون دەست بکەوێت. پاچ بەئاسانی پێستی ناسکی سەر بەردەکەی شکاند و کوونی قووڵ و تاریکی ژێر بەردەکەی دەرخست. نیکی بە بینینی کوونی سەر بەردەکە ئاوڕی دایەوەو دەستی بەگریان کرد. دەستم لەکار نەکێشایەوە و ئەوەندەم پاچ لێدا تا دەمی کوونەکە گەورەبو. بۆی نمی هەوای ماوە بەلووت دەگەشت و نشانی دەدا تراویلگەکە چەندین ساڵ چۆڵ و دەست لێنەدراو ماوەتەوە.

بەهەرحاڵ بەبینینی کوونی بەردەکە شادمان بووم.

نیکی ترسا و سەیری دەکرد و دەمی نیوەکراوەبو، وەك مەلێك کە لە مۆزەخانەکانی ڕاو لەحالاتی جۆراو جۆر وشکیان کردبێت و بۆ بینینی خەڵك دایان نابێت، ئەویش دەمی نیوەکراوە سەیری کوونەکەی دەکرد. نەیدەوێرا قسەبکات نەیدەوێرا تەکان بخوات.

نەمدەزانی ئەو کوونە دەگاتە کوێ و ئەگەر بڕۆینە ناوی چ چارەنوسێکمان دەبێت. شتێك کەلام ئاشکرابو ئەوەبو ئەگەرشەو ڕۆژێك بەهەمان حاڵ لەو پەرستگایەدا بمێنینەوە بەشێوەیەکی دڵتەزێن دەمرین.

لەم شێوەشدا دەرکەوتنی ئەو کوونە وەك کردنەوەی دەرگاکە بوو. بەشادمانیەوە قۆڵی نیکیم گرت و وتم:

بۆ وشك بویت. خێرا مەشخەڵ هەڵکە. لەم ڕێگاوە دەڕۆینەدەر. بە تۆ ئیلهام کراوە و من خەوەکەتبە باشی دادەنێم. خێراکە.

نیکی بەپاڕانەوەو بەدەنگێك کەدەیویست من لەڕۆشتن پەشیمان بکاتەوە وتی:

نە.... ئەمە خەوی شەیتان بو من بینیم.... خواکان دەیانەوێت بەشێوەیەکی دڵتەزێنتر بمانکوژن...... مەڕۆ......

بەهیچ جۆرێك نەمدەویست تەسلیمی بۆچوونەکەی ببم بۆیە بێ گوێدان وەك ئەوەی قسەکانیم نەبیستبێت وتم:

تۆ مەشخەڵێك ڕۆشن کە، منیش جل و بەرگ و شتەکانی تر هەڵەگرم.

نیکی تێگەشت کە بڕیارم داوە، ناچار بەگریان و لەکاتێکدا دڵۆپەکانی فرمێسك لەچاوی دەهاتە خوار لای کوونەکە دوورکەوتەوە و بەرەو یەکێك لە مەشخەڵەکان ڕۆشت.

بەخێرایی جلەکانم کۆکردەوە، یوری جگە لەجوتێك پێلاو و دەستیك جل پێویستی

بەشتی تر نەبو. جلەکانم لەبەرکردبو، باشترین شتەکانم بۆ خۆم هەڵبژاردبو لەگەڵ ئەوەشدا هەرچی لێبو و توانایی هەڵگرتنیم لەخۆمدا بینی، کۆمکردەوە.

چەندین دەست جل، پۆستاڵ و ژمارێەکی تر کراس و شتی پێویستی ترم بەتەنافێك بەست و وەك کۆڵە پشتم لێکرد.

نیکی مەشخەڵی رۆشن کرد و چاوەڕوانی من بو. کەمنی لەحاڵەتی پێچانەوەی شتەکان بینی بەشێوەی سەرکۆنەکردن وتی:

بۆ زەحمەتی خۆرایی دەکێشیت..... ئەگەر زیندوو لێرە دەرچووین دووبارە لەهەمان رێگا کە رۆشتینە دەر دەگەڕێینەوەو هەرچیمان پێویست بێت هەڵیدەگرین. ئەمە چ زەحمەتێکی خۆڕاییە بەسەر خۆتی دەسەپێنیت.....

بۆچوونەکەی گوونجاو بو. هەرکەسی تر لەجیاتی من بوایە خێرا تەسلیمی بۆ چوونەکەی دەبوو و کۆڵە پشتەکەی دادەنا بەڵام نازانم چی لەقوڵایی ناخمدا دروست بو نەمتوانی بە پێشنیارەکەی رازی بم.

هەرچی هەیە داینێ با لەشوێنی خۆیدا بمێنیت. ئەگەر زیندوو ماینەوە لەرێگەی ئەم کوونەوە دێینەوە. لەم کاتەدا چاوم بە زێڕو جەواهیرەکان کەوت و بیرم کەوتەوە کە لەجل و بەرگ پربەهاتر، زێڕو خاکی زێڕە کەدەبێت بۆ دەرەو بگوازرێتەوە. ئەگەر توانایم هەبوایە هەرچی بوایە لەسەر شانم هەڵم دەگرت و دەمبرد. بەداخەوە برسیەتی و تینویەتی ئەوەندە توانایی بۆنەهێشتبوومەوە کەبتوانم نیوەی کێشی خۆم هەڵگرم.

هیوای زیندوو رۆشتنتەدەر لەپەرستگامان نەبو و ئێمە بەهیوای خوا رۆشتینە ناو کوونەکە، لەگەڵ ئەوەشدا کۆڵەکەم خستە سەرشان و کاتی تێپەڕبوون لەسەکۆی جەواهیرات دەستم بردەپێش و چەند مشت ئەڵماس و بەردی گرانبایيم خستە گیرفانم و بەنیکیم وت: نابێت دەرفەت لەدەست بدەین ئێستا هەرچەندە دەتوانین لەگەڵ خۆماندا دەبەین، خێراکە، کات بەفیڕۆ دەڕوات.

نیکی ئەم پێ و ئەوپێی دەکرد. سست و لاواز دەهاتە بەرچاو. بەتەواوی نیشانی دەدا نایەوێت بێتە ناو کوونەکە و گیانی خۆی لەدەست بدات.

لەهەمان کات لەمن دەترسا. جۆرێك ترسی تێکەڵاو بەرێزو لەبەرئەمە ئەوەی دەموت ئەنجامی دەدا.

بەمەشخەڵەکەوە لەپێشمەوە بەرێکەوت.

قادرمەکانی یەك لەدوای یەك بڕی و خۆمان گەیاندە کوونەکە. دووبارە هەمان

دیمەنی ترس ئەنگێز لەبەرچاوم دەرکەوت. هەمان کوون تاریك و هەمان رێگەی نادیار هەمان بۆی نمی و هەوای گەنیو؟

چەند چرکەیەك وەستام. ئەژنۆکانم سست بوو و ئەگەر دووبارە درەنگم بکردایە رەنگە ئیرادەشم سست ببوایە. لەهەمان چەند چرکەدا قسەکانی نیکیم بیرکەوتەوە کە دەیوت: هەمان پیاوی رەش پۆش سەری لەکوونەکە دەرهێنا، پێم پێکەنی و ئیشارەی کرد کە برۆمە ناو کوونەکە. لەخۆمم پرسی:

ئەم مۆتەکە چی بو هاتۆتە خەوی نیکی. رەنگە وەهم و خەیاڵ بێت بەڵام نە...... نە..... وەهم و خەیاڵ نیە چونکە دەست بەجێ کە پاچم لێدا ئەو کوونەی نیکی باسی دەکرد دەرکەوت. کەواتە ئەوە مۆتەکەیە راستەو بوونی هەیە.

ترسێکی کەم سەراپامی داگرت. پشت و ناوچاوم ئارەقی کردەوەو دڵم کەوتە لێدان. لەم کاتەی کە ئەژنۆکانم سست ببو، ئەگەر چاوەڕێم بکردایە ئیرادەشم سست دەبو و بەخۆشحاڵیەوە ورەیەکم بەدڵ و رۆحی خۆم دا و بەئیرادەیەکی بەبڕشت رۆشتمە ناو کوونەکە و بەنیکیم وت: بەدوامدا وەرە. من لەپێشەوە دەڕۆم ئەگەر مەترسیەك هەبێت سەرەتا من تووشی دەبم بەڵام مەشخەڵەکە جۆرێك رابگرە کەرێگاکەی منیش رووناك بکاتەوە و بەردەمی خۆم ببینم !

نیکی چەمایەوە. چاوەکانی لەرووناکی مەشخەڵ دەدرەوشایەوەو دنیایەك ترس بەروخساری دیاربو. لە هاتنە ناو ئەوکوونە ئەوەندە دەترسا کە ئەگەر شەرمی لەمن نەکردایە بەقاوەقیژ رایدەکرد و خۆی لە سووچێکدا دادەشارد.

مەشخەڵەکەم لەدەست گرت و خستمە دەستەکەی ترم ئەوکات شانی راستم بردەپێش و وتم: قاچت لەسەر شانی من دانێ و وەرەخوار و مەترسە.

بۆئەوەی دڵگەرمی پێ ببەخشم وتم:

لێرە لەژووری پەرستگا رازاوەترو خاوێنترە. وەرە سەیرکە.

نیکی قاچی لەسەر شانی من گرت و دەستی بەلێواری بەردەکە گرت. کەم کەم لەسەر ئەژنۆکانم چەمایەوە و هێنامە خوار. کاتێك بەرزاییەکەی کەم بوویەوە بەئارامی هاتەخوارو لای من جێگیر بو. هێشتا دەرفەتم دەست نەکەوتبوو کەسەیری دەوروبەر بکەم و بارودۆخی خۆم هەڵسەنگێنم. نەمدەزانی ئەوێ کوێیە و دیار نەبو بۆکوێ دەڕۆین و چی دەبێت.

نیکی لەگەڵ ئەو هەموو دڵگەرمیەی پێم دابو، قۆڵی چەپی منی گرت و خۆی بەمنەوە

لکاند، وەك ئەو کەسانەی لەخەودا دەڕۆن هەنگاوی هەڵەگرت.

مەشخەڵ تەنیا سێ چوار مەتری دەوروبەری ڕۆشن دەکردەوە. هەوا تاریك و خنکێنەر بو بەڵام شتێك کە دەبووە هۆی هیواداری من ئەوەبو مەشخەڵ بەجوانی لەوێ دەسووتا و ئەمەش نیشانی دەدا هەوای ئەو کوونە لەگەڵ هەوای دەرەوە پەیوەندی هەیە.

دالآن شەش یان حەوت مەتر درێژ نەبو، کاتێك گەشتینە کۆتایی، هەوا بەشێویەکی هەست پێکراو گۆڕاو باشتر بو. چەند جارێك پشت سەری یەك هەوام هەڵمژی و وتم:

هەستی پێ دەکەیت؟ دەبینی هەوا چەندە باش بووە.

نیکی ئەوەندە ڕەش بین و ترساو بو کەبیری دەکردەوە بەرەو مردنی دەبەم. دڵنیابوو دەمرێت و لەسەر ئەم گوومانەش وتی:

هەوا چ کاریگەریەکی لەسەر مردنی ئێمە هەیە.

من لەمژینی هەوای تازە شادمان ببووم. بزەیەکم لێداو وتم:

شێتیت؟ مەگەر مرۆڤ بەم ئاسانیە و بەم خێراییە دەمرێت ئەگەر مەرگ ئەوەندە ئاسان بووایە تا ئێستا کەس زیندوو نەبو.

نەمدەزانی قسەکانم تاچەند لەسەر نیکی کاریگەری دانا. بەهەرحاڵ هەرجارێك کە قسەم و بەجۆرێك دڵنەواییم دەکرد وەڵامی نەدەدایەوە.

لەم کاتەدا لەدالآنەکە ڕۆشتینەدەر و ڤاچمان خستە ساردخانەیەك کەلەلایەنی پانی و درێژی وەك ژوورەکەی سەرو یانی بەرانبەر هەنباری پەرسگا بو. تەنیا جیاوازی ئەو دوو ژوورە ئەوەبو ساردخانە بەهیچ جۆرێك ڕووناکی نەبو بەڵام ژووری پەرستگا ڕووناك سەقفێکی بەرزو دیوارەکانی ساف و بەرز بو.

هەردووکمان بێ ئیرادە لەکۆتایی دالآنەکە وەستاین. مەشخەڵ بڕێکی زۆری ئەوێی ڕووناك کردەوەو لەڕووناکی کەم ڕەنگی خۆی دیمەنێکی ترس ئەنگێز کەموی لەسەر ئەندامی هەرکەسێك ڕاست دەکرد ودڵی هەرپیاوێکی بەهێزی دەخستە لەرزە، دەرکەوت.

لەدەوروبەری ساردخانەکان، لاشەی مردوەکان وەستابوون و بەشێوەی جۆراوجۆر سەیری ئێمەیان دەکرد. ڕوویان لەئێمە بوو بەشێویەك هەر مرۆڤێك بیری دەکردەوە هەموویان بۆ بینینی ئێمە ئاوڕیان داوەتەوە و سەیرمان دەکەن.

ژمارەیەکی زۆر ئێسکە پەیکەڕ لەناو ساردخانەکە لەسەر یەك کەڵەکە و بەشێوەیەك ناڕێك ڕژابوون.

ئەو لاشانەی لە دەوروبەری دیوارەکاندا بوو بەزۆری روخساری خۆیان پاراستبوو بەکەمێك گۆرانی رەنگ و حاڵەت بە شێوەی خۆیان مابوونەوە.

ژنەکان مووی درێژو خورمایی رەنگیان بو پیاوانیش ریش و سمێڵێکی چر وپر. شتێك کە لەهەمووی ئەم ساڵانەدا نەگۆڕابو قژی سەری ژنان و ریش و سمێڵی پیاوان بو.

مووی سەرو روخساری تەنانەت لەناو گۆڕیش دوای بیست ساڵ دەمێنێتەوە لەکاتێکدا ئێسقانی لاشە لەماوەی دەساڵدا دەفەوتێت.

بەیەك نیگان لەهەموو شتێك گەشتم. دیمەنێکی ترس ئەنگێز بو، نیکی مافی خۆی بو بەو شێوە بلەرزێت و خۆی لەپشت من داشارێت بەڵام شتێك دەبوە هۆی ئارامی ئێمە ئەوەبو لە مردوەکانەوە هیچ جووڵەیەك نەدەبینرا و لەلایەن ئەوانەوە مەترسیمان لەسەر نەبو.

کۆڵە پشتەکەم داناو دەستی نیکیم گرت و گووشیم، دەتوت گوشینی دەستی هێزی پێ بەخشی چونکە سەری بەرزکردەوەو بێ ئەوەی سەیر دەوروبەری بکات یان چاوەکانی بکاتەوە بەپارانەوە وتی:

زووکە، هەر کارێك دەکەی خێراتر. توانای وەستانم نیە و ئەگەر دووبارە چاوەڕێ بم دەکەوم و بێهۆش دەبم:

راستی دەکرد لەوەستان و سەیرکردن چ ئەنجامێکمان دەست دەکەوت. نیکی نەیدەتوانی لەسەر ئەو سارد خانە و لاشەکان زانیاری بەمن بدات ئەگەر یوریم لەگەڵدا بوایە چەندین کاتژمێر لەو پەرستگایە دەمامەوە و خوێندنەوەم بۆ ئەو شوێنە دەکرد. دەمویست بزانم ئەوانە کێن و بۆ لاشەکانیان لەوێدا کۆکراونەتەوەو بەو شێوە دانراون.

کۆڵە پشتەکەم خستە سەرشان و پێشکەوتم.

نیکی وەك کەسێکی کوێر بەیارمەتی کەسانیتر بەرێگادا دەڕوات لەگەڵما دەهات و توانای ورەی چاوکردنەوەی نەبو.

خاڵێکیتر کە کۆتایی رێگاکە سەرنجی منی راکێشا ئەو رشتە بو کە ژنان بەگەردن و گوێچکەو ناوچاویان هەڵواسرابوو، ئەو دەستبەندانەی کەلەدەست کرابوون. ملیۆنان دۆلار لەگەڵ ئەو مردوانەدا لەخاك نرابوون و چەندین ساڵ دوور لەچاو بوون. لەدڵی خۆمدا وتم:

بەزوویی یوری ئاگادار دەکەمەوە و پێکەوە دێینە ئێرە و ئەم ملیۆنان دۆلارە

دەگوێزینە دەرەوە پاشماوەی ژیانمان بە بەختەوەری دەگوزەرێنین.

کاتێك گەشتینە کۆتایی ساردخانەکە جارێکیتر ئاوڕم دایەوەو سەیری دواوەم کرد بەڵام لەناکاو دڵم داکەوت و رەنگ لەروخسارمەوە پەڕی.

کەمێك بوێری و ورە کە هەمبو لەم ساتەدا بەم نیگایە لەناچو. کەوتمە لەرزین. ناوچاوم ئارەقی کردەوە پشتم تەربو. هەناسە لەسینەمدا قورس ببوو، هەستم دەکرد شتێکی بەهێز قوڕگم دەگووشێت و هەناسەم زیندانی دەکات دەزانن چیم بینی؟

کاتێك لەدالآنەکە رۆشتمەدەر و چوومە ناو ساردخانەکە، مردوەکان سەیریان دەکردین.

شتێکی گرنگ نەبو. گوومانم کرد لەبەرشتێك لاشەکانیان وادانـاوە و سەریان بەئەنقەست بەو شێوە داناوە کەوەك بڵێی دەرگای هاتنەناوەی ساردخانەکە سەیر دەکەن.

تا ئێرە بابەتەکە زۆر ئاسایی و ناگرنگ بو بەڵام لەکۆتایی سارد خانەکە کاتێك ئاوڕم دایەوە، هەموو شتێك رەنگێکی تری بەخۆ گرت و گۆڕا.

لاشەکان سەیریان دەکردین و دەتوت بەچاوە بێ نوور و کاسەی چاوی وشك بووی خۆیان لەهەموو شوێنێك بەدوامانەوە بوون لەگەڵ ئێمەشدا سەر دەسووڕێنن.

ئیتر شوێنی وەستان نەبو. ئاوڕم دایەوە و دەستی نیکیم گرت وتم:

وەرە..... بابڕۆین....

نیکی بەرێکەوت بەڵام چەند هەنگاوێك کە دوور کەوتینەوە وتی:

لەچی ترسایت. بۆ دەلەرزی بۆ رەنگت پەڕاوو پەرێشان بویت.

وتم: شتێك نیە وەرە.

لەکۆتایی ساردخانەکە دالآنێکی شەش حەوت مەتری وەك دالآنی یەکەم دەرکەوت. ئەو دوو رێرەوە لەیەك دەچوون بەم جیاوازیە کە لەدالآنی دووەم هەوای ئازاد بەلووتمان دەگەشت. بۆنێکی گونجاو لە رژانی باران لەسەر گەڵای دارەکان دروست ببوو، هەستی پێدەکرا، لەکۆتایی دالآن رووناکی رۆژ دەرکەوت. کەلێنێك لەسەقفەکەدا بوو، هەتاو لەودیوەوە دەهاتە ناو. نیکی بەبینینی تیشکی هەتاو قیژاندی وتی:

ئاخ ! رزگارمان بو، زیندوومانین.

بەخێرایی کۆڵە پشتەکەم داناو بۆ دۆزینەوەی رێگا دەرچوون دەستم بەهەوڵدان کرد. هەوڵەکانم بەخێرایی گەشتنە ئەنجام. لەسەر کۆڵە پشتەکەم بەچنگ و نینۆك خۆڵم

دەرژاند خوارو کوونەکەم گەورەتر دەکرد.

نیکی هەرچەند سات جارێك ئاوڕی دەدایەوە. دەتوت چاوەڕێ بو ئەو مۆتەکە ڕەشپۆشە دوایین سات ڕێگە لەڕۆشتنە دەری بگرێت و لەناوی بەرێت.

سەرئەنجام کوونەکەم کردەوەو لەکاتێکدا ئارەق لەروخسارم دەچۆڕا بە نیکیم وت:

خێراکە بڕۆرە سەر.

نیکی کچێکی میهرەبان و جوان بو. ئەم ئەخلاق و تایبەتمەندی دڵ و ڕۆحی ئەو بووە هۆی ئەوەی لەگەڵ ئەو هەموو خۆشەویستیەی بەرانبەر بەئەمانۆ بووم، شەیدای بووم.

لەم کاتەشدا بەو هەموو ترسە لەساردخانەکەی بو قۆڵی گرتم و بەبزەیەك کە ئەوپەڕی پاکی ڕۆحی ئەوی نیشان دەدا وتی:

سەرەتا تۆ بڕۆ. دەترسم دوای ڕۆشتنی من ڕووداوێك ڕوو بدات و تۆ لێرەدا بمێنیتەوە.

بەپەلە وتم: مەترسە. خێراکە، کاتێك تۆ ڕۆشتیت سەر پێم بڵێ لەکوێدایت.

نیکی سوار سەر شانی من بو، بەدژواری خۆی لە کوونەکە کێشایە سەر. لەیەکەم دەرفەت سەیری دەوروبەری کردو وتی:

لەپشت دیواری پەرستگاین. جەنگەڵ لێرەوە زۆر دوورنیە. خێراکە، دەستت بدە بەمن.

پێش ڕۆشتنە سەر کۆڵە پشتەکەم دا بەنیکی. ئەوەندە زەختم لێکرد تا لەکوونەکە تێپەڕی و گەشتە سەر. دواتر تفەنگەکەم پێداو لەکۆتایشدا بەدژواری و هاوکاری نیکی ڕۆشتمە سەر.

کاتێك گەشتینە هەوای ئازاد، هەردووکمان دانیشتین.

هەناسەیەکم بەئاسوودەیی لێداو تازە ئەوسات بەنیکیم وت:

بەراستی ترس ئەنگێز بو.

هەستە لێرە دووركەوینەوە.

منیش کۆڵە پشتەکەم خستە سەرشان و هاوڕێ لەگەڵ نیکی بەرەو دەرگای پەرستگا ڕۆشتین. دەرگای پەرستگا کراوەبو. هیچ کەس لەوسنوورەدا نەدەبینرا و کەس نەیدەدین. لە دالانەکان تێپەڕین لەحەوشەی یەکەم کەس نەبو بەڵام کاتێك لەناو دوو حەوشی کە دەڕۆشتین یەکێك لەکچەکان ئێمەی دی بەشادمانی دەستی لەیەك داو قیژاندی و وتی:

هاتن، هاتن.

دەنگی ئەو کچەکانی تریشی ئاگادار کردەوەو یەکێك لەوان بەڕاکردن مژدەی سلامەتی ئێمەی بە یوری گەیاند و یوری بەپەلە خۆی گەیاندە لامان و کاتێك گەشتە دوو هەنگاوی، بزەیەکی لێداو وتی:

دەستخۆش دەستخۆش ! لەکوێی بویت. ئەوەندەی نەمابو بینای پەرستگا بتەقێنەوە. پێش ئەوەی وەلامی بدەمەوە دەستکانی لەملم ئالاند و ماچی کردم.

لێم پرسی: ئەمانۆ لەکویَ یە؟ ئێستا چۆنە؟ لەم کچەی لەگەڵمابو، تووڕە نیە.

یوری سەیری کۆڵە پشتەکەمی کردو وتی:

ئەو نەخۆشەو لەجێگادا کەوتووە. مناڵەکەی لەبارچووە. هێرشی ئەو شەوەی کۆماتۆ بوە هۆی مردنی دووەم مناڵی تۆ. خوا نایەوێت تۆ لەئامازۆن ببیتە خاوەن رەچەڵەك !

هێشتا وەلامم نەدابویەوە کەپرسی:

ئەمە چیە؟ ئەم کۆڵە پشتەت لەکویَ هێناوە؟

ڕووداوەکەم بەتەواوی باس کرد و بۆئەوەی زیاتر شادمانی بکەم باسی جل و بەرگم نەکرد و دامنا بۆ دوایی، باسی خۆڵی زێرو جەواهیرو مردوەکانم بۆکرد و ئەوسا وتم:

ئەمانەش جل و بەرگن بۆتۆم هێناوە....

یوری وەك کەسێك کەدوای چەندین ساڵ بیابانگەڕی و برسیەتی کێشان بەسفرەیەی رازاوە گەشتبێت و خۆی خستە سەر کۆڵە پشتەکەو دەستی بەکردنەوەی کرد.

یەکەم شت لەکۆڵەپشتەکە کەوتەخوار، پێلاوەکان بو. یوری لەسەر زەوی دانیشت، پێلاوە کۆن و دراوەکانی داکەند و تازەکانی لەپێ کرد.

بەڕێکەوت پێلاوەکە بەئەندازەی قاچی بوو دوای بەستنی قەیتانەکانی وەك سەردارانی کۆنی رۆم کە لەبەرانبەر ریزی دوژمن پیاسە دەکات و فەخر دەفرۆشێت، دەستی خستە پشتی و دەستی بەڕێگا رۆشتن و بەرەزامەندی سەیری چەپ و راستی دەکرد.

لەخزمەتێك کە پێم کرد و ببومە هۆی خۆشحالی هاوڕێکەم زیاد لەرادە هەستم بەشادمانی دەکرد. یوری بەڕاستی پیاوێکی بەئەمەك بوو. لەنیگاکانی هەستم کرد وەلامی هەموو چاکەکانیم داوەتەوە.... ئەو پێلاو و کراس و شەرواڵەی لەبەرکردو دواترپێکەنی.

نیکی پێشتر رۆشتبو. دەیزانی من ناچار دەبم بڕۆمە لای ئەمانۆ ولەم بارودۆخە

قەیرانیەدایە سەردانی بکەم.

هاوڕێ لەگەڵ یوری بەرەو ژوورێك کەئەمانۆ تیایدا کەوتبوو رۆشتم. بەرنگی پەڕاو چاوی هیلاك لەجێگادا کەوتبوو. دیاربو رەنج و ئازاری کێشاوە.

کوڵمە گوڵ رەنگەکانی ئەمانۆ بەهۆی خوێن بەربوون و تای زۆر، سپی ببوو. چاوە شەهلاو دڵرفێنەکانی دڵگیری کۆنی لەدەست دابو لەگەڵ ئەوەشدا بەبینینی من زیاد لەرادە شادمان و وتی:

ئەگەر یەك رۆژی تر نەهاتیتایە دەمردم.

دڵی پر بو بەدژواری لەهاتنەخواری فرمێسکەکانی رێگری کردو وتی:

لەم چەند رۆژەدا هەستم بەبابەتێکی گرنگ کرد.... دەزانی چیە... نا بەدڵنیاییەوە نازانیت.... گوێ بگرە. تێگەشتم کەبەبێ تۆ ژیانم خۆش ناوێت. بۆئەوەی زیندووبم ناچارم هەمیشە لای تۆ بم. تەنیا بەڵێنم پێ بدە کەیەك هەزارەی رێژەکانی سەرەتا منت خۆش دەوێت... هەرئەمە.... یەك هەزارەم بۆ زیندووبوونی من تەواوە... پاشماوەی دڵی خۆت بدە بەژنانی تر. بەنیکی و هەرژنێکی تر کە خۆشت دەوێت، من بەگیان و دڵ خزمەتی ئەوانیش دەکەم.

بەبیستنی ئەم قسانە دڵ و رۆحم کرایەوە. بەڕادەیەك شادمان بووم کەوەسف کردنی ئەگەری نیە. دەتوت هەموو دنیایان بەجوانیەکانەوە بەخشیوە بەمن و مۆڵەتیان داوم هەرچیم دەوێت داگیری بکەم و هەرکارێك ئیرادەی بکەم ئەنجامی بدەم.......

لەوە دەترسام بوونی نیکی ببێتە هۆی تێکچوونی پەیوەندیەکانی نێوان من و ئەمانۆ و ئەو لەمن دوور بکاتەوە. ئەم نیگەرانیە هێواش هێواش رۆحمی دەخوارد و ئێستا کە ئەمانۆ رێگەی دەدام بەڕاستی بەختەوەر بووم. جێگەی خۆی بوو دەست بەسەماو گۆرانی بکەم.

لەگەڵ هەموو شادمان بەرووی خۆمدا نەهێنا و بۆئەوەی پاداشتی خۆشەویستیەکەیم دابێتەوە وتم:

دڵنیابە هیچ ژنێکم بەقەدەر تۆ خۆش ناوێت. تەنانەت مووناك بەو هەموو جوانیە و هێزو توانای خۆی، نەیتوانیوە وەك تۆ دڵم داگیر بکات.

چاوەکانی جارێکیتر پڕ بو لەفرمێسك. باوەڕی بەقسەکانی من کرد بەڵام راستیتان بوێت منیش زۆر درۆم لەگەڵدا نەکرد چونکە ئەمانۆم تاڕادەی پەرستن خۆش دەویست و هەموو کات لەهەموو شوێنێکدا لەبیریدا بووم.

یوری قۆڵی گرتم وبەمە تێیگەیاندم دەبێت لەژوورەکە بڕۆمەدەر. ئەمانۆ هیلاك بوو زیاتر لە هەرشتێك پێویستی بەحەوانەوە بو. هەستام ئەمانۆ بەپارانەوە دەستی گرتم و لەسەر سنگی داینا، چەمامەوە کوڵمە رەنگ پەڕاوەکەیم ماچ کرد.

من و یوری بەخەیاڵێکی ئاسوودە دەستمان بەپیاسە کردن و قسە کردن کرد. یوری وتی: شائکی و شووما رۆشتوونەتە هۆز.

شائکی بەشارەزایی جڵەوی کارەکانی گرتۆتە دەست و جۆرێك هەڵس و کەوتی کردوە کەداوایان لێکردوە تا هەڵبژاردنی سەرۆك کارەکان بەرێوەببات یانی بەوەکالەت سەرۆك بێت. ئەمە ئەو شتە بوو ئێمە دەمانویست و بەڵێنمان بە شائکی دابو، هیچ کەس دژایەتی نەدەکردین و بەپێی قسەی یوری شائکی تاقمێکی راسپاردبو تا پارێزگاری لەگیانمان بکات.

یوری وتی: زۆر باشە بەم جۆرەی تۆدەیڵێیت بەسامانێکی زۆرەوە دەگەڕێینەوە بۆ ئەمریکا.

بەیانی لەگەڵ ئەوەی هەوا رووناك بوویەوە دەڕۆینە ساردخانەی پەرستگا و هەرچی زێر و مرواری و ئەڵماسی لێیە، هەڵیدەگرین.

چەند تیکە جەواهیرێك کە هێنابووم نیشانمدا. بە بینینیان چاوەکانی زەق بوویەوە و دەمی لەسەرسوڕماندا کردەوە، ئاوی دەمی بەدەنگێکی ناخۆش قووت دا و وتی:

. لەمانە...... چەندەی لێیە؟

لەوەڵامدا وتم: ئەوەندە خاکی زێڕو جەواهیری لێیە کە رەنگە هەڵگرتنی بە ئێمە دووانە نەکرێت و پێویستمان بە یارمەتی کەسانیتر هەبێت.

یوری لەشادیدا دەستەکانی لەیەك دا، سەیرێکی دەوروبەری کرد و وتی:

ئەی چاوەڕوانی چیت...... هەر ئێستا...... ئێستا دەڕۆینە ساردخانە.

وتم: بوەستە..... زیاد لەرادە هیلاك و برسیم. هێشتا هیچم نەخواردوە. سەیرکە زمانم لە تینویەتیدا وشك بووە..... ئەم شەو دەحەسێمەوە و بەیانی دەڕۆینە ساردخانەی مردوەکان.

یوری رازی بوو بەڵام دیاربوو بۆ بەدەست هێنانی گەنج زیاد لەرادە پەلەیەتی و ئەو شەوە بەناڕەحەتی دەباتە سەر.

لەم کاتەدا کچێك بەرەو لامان هات و کاتێك گەشتە بەردەم من، بەرێزەوە کورنوشی برد و بە بزەیەك کە هەزاران مانای بو وتی:

فەرموون.... ژوورەکەیان ئامادەکردوون..... چاوەڕێی ئێوەیە....

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم: کێ ژوورەکەی ئامادەکردوە......؟ کێ چاوەڕێ مە......؟

کچی ئامازۆن بزەی لێوە گوڵ رەنگەکانی خۆی ئاشکراتر کرد و وتی: نیکی.....

کچەکە لەسەر ئەم وشە وەستاو ئەوەندە بەقورسی و تاڵی وتی کە لەگەڵ ئەو وشە هەموو حەسوودی دڵی خستە دەر....

یوری قۆڵی گرتم و چاوم لەسەر چاوە دڵڕفێنەکانی کچەکە هەڵگرت.

ئەو پێش کەوت و من و یوری بەڕێنوێنی ئەو بەرەو ژوورێك کەدەیوت نیکی ئامادەی کردوە، رۆشتین.

هەردووك رۆشتینە ژوور، بێ ئیرادە پێکەنیم و دەستخۆشیم لەنیکی کرد.

جێگایەك لەپێستی سمۆرەو پێستی مشکی جەنگەڵیان بۆ دانا بوو کە باشترین جۆری پێستی دنیایە، سفرەیەکی رەنگینی رازاندبوویەوە کە جۆرەها خواردن و شەربەتی تایبەت بەجادوگەرانانی تیا دەبینرا.

من و نیکی و یوری لەسەر سفرەکە دانیشتین. نیکی لەگەڵ ئەوەی لەبرسانا نەیدەتوانی لەسەر قاچ بوەستێت و دەلەرزی جگە لەپەرداخێك ئاو هیچی تری نەخواردبوو، وتی:

دەمویست لەگەڵ تۆدا بخۆم. خواردنێك بێ تۆ بخورێت تامی نیە و باشترە کەنەبێت.

من و نیکی بە ئیشتیاوە نانمان خوارد بەڵام یوری لەوکاتەدا زۆر ئیشتیای نەبوو. یاری بەخواردنەکە دەکرد. لەکاتی خواردن نیکی لەگۆزەیەکی گڵی قاوەیی رەنگ کەوێنەو نەخشی سەیری لەسەر دەبینرا پەرداخەکەی منی پڕ کردو بەشێوەیەکی تایبەت وتی:

لەم شەربەتە بخۆ تا هەموو ئازارو ناڕەحەتیەکانت لەبیر بکەیت... هەرکەس لەم شەربەتە بخوات ئەوەندە شادمان دەبێت کە دەست دەکات بەسەماو گۆرانی...

لەسەرخۆ پەرداخەکەم لەلێوەکانم نزیك کردەوە، بۆنەکەی زۆر خۆش بو، قومێکم خواردو دامنا، تامێکی توند و شیرینی هەبو بەڵام کارێگەرییەکەی سەیرو باوەڕ پێنەکراو بو، ئەو قومە کاری خۆی کرد هیچ کەس ناتوانێت باوەڕ بکات بەخواردنەوەی قومێك مەست ببێت بەڵام ئەوەندە مەست ببووم کە یوری لەهەمان نیگای یەکەم تێگەشت.....

روخسارم سووڕ بوویەوە.... کولمەکانم گەشانەوە. گوێچکەکانم ئەوەندە گەرم ببو گەرمیەکەیم هەست پێکرد.... یوری وتی:

چاوەکانت بۆتە دوو کاسەی خوێن.

ئاسایی نەبووم. بەدەنگی بەرز پێدەکەنیم و قسەم دەکرد دەمویست هەستم سەما بکەم.

یوری کەئەمەی بینی پیاڵەکەی هەڵگرت و قومێکی خوارد و دەست بەجێ بەشادمانی وتی: شەرابە..... ئەمە شەرابە و من تائەمڕۆ ئاگادار نەبووم. ئەگەر دەمزانی لەم پەرستگادا شەراب هەیە یەك خوولەك لێی دوور نەدەکەوتمەوە و یەك هەنگاو نەدەڕۆشتمە دەر...

شەراب کاریگەری لەسەر یوری دانا. گۆڕا، چەند قومێکی تری خوارد و بەتەواوی سەرخۆش بو. ئەگەر بیرتان بێت جارێك لەهەنجیر شەرابی دروست کردو سەرخۆش و ئەو کارەساتەی خولقاند. من قومێکم زیاتر نەخوارد بەڵام یوری تا دوا دڵۆپی خواردەوەو پیاڵەیەکی تری پڕکرد.

نیکی دەستی گرت و وتی:

نە....... نە....... مەخۆرەوە....... مەترسیدارە. خواکان تووڕە دەبن..... بەزەییت بەخۆتدا بێتەوە، یوری لەکاتێکدا زمانی گیرابو، رەتەڵی دەبرد هەستاو دەستی کرد بەسەما کردن. دەنگی ئاوازی ئەو کچانەی پەرستگا لەپشت ژوورەکە کۆکردەوە..... یوری هیچ کات سەرنجی بە رەگەزی ژن نەدەدا بەڵام ئەو رۆژە بەوحاڵە کچەکانی لەدەوری خۆی کۆکردەوەو خۆی لەناویانا دانیشت.

ئەمانۆ دەنگی قاقا مەستانەکانی من و یوری و نیکی و کچەکانی دەبیست، لەخۆی دەئاڵاو خەفەتی دەخوارد، تەنیا بیرکردنەوەی ئەمانۆ ئازاری دەدام. بەهەرحاڵ هەرچی بو گوزەرا.

( ١٩ )

کاتێك هەتاو هەڵات یوری بەسیلاح و تەواو ئامادە هات بەدوامداو وتی:
هەستە...... خێراکە........ دەبێت بڕۆینە ساردخانە. کات بەفیڕۆمەدە.....
هیلاك بووم دەمویست لە ژێرباری ئەم کارە شان خاڵی بکەم. پرسیم:
باشە....... بەرنامەی تۆ چیە؟ دەتەوێت چی بکەیت؟
وتی: ئاشکرایە..... ئێمە لەئامازۆندا ئیتر کارمان نیە. ئەمڕۆ دەڕۆینە ساردخانەو دوای دەرهێنانی زێر و جەواهیر خۆمان بۆ ڕۆشتن ئامادە دەکەین. ئەمڕۆ هەینیە. ڕۆژی یەك شەممە یان دوو شەممە بەرەو دنیای پێشکەوتو بەرێدەکەوین. بەم حاڵەش نەمدەویست ئەو لەتەنبەڵی و لاوازی من دڵنیابێت. بەزەحمەت و دژواری لەشوێنەکەم هەستام. سەرم ژانی دەکرد.
نیکیش هەستا و جل و بەرگی پۆشی. کاتێك خۆم بۆ ڕۆشتن ئامادەکرد ئەو لەجل لەبەرکردندا یارمەتیدام و لەکۆتاییدا دانیشت قەیتانی پێڵاوەکانمی توند کردو بەپارانەوەو گریان وتی:
مەڕۆنە ساردخانە..... ئەوێ نفرین کراوە. خواکان لەناوتان دەبەن.... لەم بڕیارە پەشیمان ببنەوە.... کارێکی باش نیە مرۆڤ دەست درێژی بکاتە سەر موڵکی خواکان.
نیکی قۆڵی گرتم و وتی:
ئەو پیاوە ڕەش پۆشە نوێنەری خوای جەنگەڵ بو کەهاتە خەوم و ڕێگەی ڕۆشتنەدەر لەو زیندانەی نیشان دام. ئەگەر بڕۆنە ساردخانە توورە دەبێت و بەهەمان شێوە کەڕێگەی هاتنەدەری نیشان داین ڕێگە لەسەر ئێوە بەدەستێت وبەم شێوە بۆ هەمیشە لەوێدا دەمێننەوە. تا کات و دەرفەتتان هەیە لەم بڕیارە پاشگەز ببنەوە.
ئەم جارە من و یوری پێکەنین و گاڵتەمان پێ کرد. نیکی ئیتر قسەی نەکردو قۆڵی بەردام. ماچم کردو هاوڕێ لەگەڵ یوری لە ژوورەکە ڕۆشتمەدەر بەڵام نەمدەزانی چی بو کە بیری مردوەکانی ساردخانەم کەوتەوە و وەستام.
بیرم کەوتەوە کە ئێسکە پەیکەرەکان سەیری باکوریان دەکرد و دواتر کە ئێمە درێژی ساردخانەکەمان پێوا و ڕۆشتینە ئەولاتر، سەری مردوەکانیش سوڕا و سەیری ئێمەیان

دەکرد. لە بیرکردنەوەی ئەو دیمەنە مەترسیدارە لەئارەقدا خووسام بەڵام بەرووی خۆمدا نەهێناو نەم هێشت یوری تێبگات کە لەرۆحی مندا چی دەگوزەرێت.

دڵم دەکولاً. دەتوت چاوڕێی روداوی شوومم. نەمدەزانی چی دەبێت و چی پێش دێت. لەڕۆشتن بۆ ساردخانە لەگەڵ هەرکەس و لەژێر هەرناوێك دەترسام.

چارە نەبو... دەمتوانی چی بکەم..... ڕەشاشەکەم لەسەرشانم جی بەجێ کردو رۆشتم. نزیکەی چارەکە کاتژمێرێك دواتر گەشتینە کوونەکەو من بەپەنجە ئەویم نیشاندا.

یوری مەشخەڵەکەی رۆشن کردو بۆئەوەی ورەی بەمن دابێت لولەی ڕەشاشەکەی کردە کوونەکەو چەند جارێك پەلەپتکەکەی فشاردا بەڵام بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە گوولە نەتەقێنرا. یوری لوولەکەی بەرز کردەوەو وتی:

ڕەشاشەکەم خراپ بووە.

بەڵام ئەم جارە کەفشاریدا، دەنگی گوولە بیسترا. سەیربو...... بۆ گوولە لەناو ساردخانەدا ناتەقێت. ڕەشاش کارناکات بەڵام کاتێك لە کوونەکە دێتەدەر ڕەشاش کار دەکات؟

بیرمان کردەوە کە ئەو جارە ڕێکەوت بووە.

یوری چەند جارێك ئەم کارەی دووبارە کردەوە بەڵام لەوپەڕی سەرسوڕماندا بینیمان تفەنگ لەساردخانەدا کار ناکات.

رەنگە ئێوە رۆشنبیربن و باوەڕ بەم قسەی من نەکەن بەڵام سوێند دەخۆم جگە لەراستی هیچی تر نەنوسم.

رەنگ لەروخساری یوری پەڕی بەڵام بۆئەوەی ترس و لاوازی نیشان نەدابێت شانەکانی بەرزکردوە رۆشتە ناو ساردخانەکەو بەمنیشی وت:

وەرە.... مەترسە..... لەگەڵ مندا وەرە.

بە مەشخەڵەکانەوە رۆشتینە ناو ساردخانەکە و هێواش هێواش بەرەو مردوەکان رۆشتنیە پێش.

ئێسکە پەیکەڕەکان بەچاوە کەم سوو وشکەکانی خۆیان سەیریان دەکردین. نووری مشخەڵەکان بەدژواری دەوروبەری رووناك دەکردەوە و لەو رەنگە سووڕەی بەدەورماندا بلاّو ببوویەوە، ئێسکە پەیکەڕەکان زیاتر ترسیان دروست دەکرد.

یوری لەتامەزۆری ئەو جەواهیرانەی وتبووم بەدەوری ئێسکەپەیکەڕەکانەوەیە،

رۆشتە پێش و کاتێك گەشتە بەرانبەری ریزی یەکەمی مردوەکان بەسەرسوڕمانەوە ئاوڕی دایەوەو وتی:

بەملی ئەمانەوە هیچ نیە. ئەی تۆ چیت دەوت؟

مردوەکان رووت بوون. لەو جەواهیرە گرانباییانەی من بینیبووم، شوێنەوارێك نەبو، هەرکەسیتر لەجیاتی من بوایە دەیقیژاندو بێهۆش دەبو. ئایا بەڕاستی سەرسوڕهێنەر و ترس ئەنگێز نەبو؟ ئایا ئێوە کە ئەم دێڕانە دەخوێننەوە سەرتان سووڕنەماوە؟ بەدڵنیاییەوە با، کەواتە بەراوەردی بکەن من کەبەچاوی خۆم ئەو دیمەنەم بینی، تا چەند سەرم سوڕما.

مردوەکان وەك خۆیان وەستابوون. جەستەیان وەك پێش رووت و نیوە رووت بو، تەنیا جیاوازیەك دەبینرا ئەوەبو جەواهیرو زێرەکان دیار نەمابوون.

بەخێرایی ئەم بیرۆکەم لادروست بو کە رەنگە کەسانێك لەساردخانەکەدان کە گاڵتەیان لەگەڵ دەکەن و و جەواهیرەکانیان پێوەدەکەن و دواتر هەڵیدەگرن و دایدەشارن. بەڵام ئەو کەسە کێیە دەتوانێت لەو شوێنەدا بژی.

سەرم سوڕمابو، دەنگی یوریم نەدەبیست کە قسەی لەگەڵ دەکردم. بەناڕەحەتی سەیری دەوروبەرم کرد و هەندێ کات چاوی مردوەکان موی لەسەر ئەندامەکانم راست دەکردەوە.

یوری وەك بڵێی هەستی بەحاڵم کردبو، قۆڵی گرتم و تەکانیدا. بەهۆی تەکانەکەی ئەو هاتمە خۆم و سەیری روخساری رەنگ پەڕاوی ئەوم کرد و بێ ئەوەی هیچم لێ بپرسێت وتم: نا...... یوری من هەڵە ناکەم...... بەچاوی خۆم بینیم، نیکی شایەتە. ئەویش مردوەکانی بەو جەواهیرانەی لەملیانا بوو بینی و تەنانەت کاتێك دەستم درێژکرد و چەند دانەیەکیانم هەڵگرت وتی:

با لەدەرفەتێکی کەدا ئەم کارە ئەنجام بدەین. دواتر لەگەڵ یوریدا وەرەو هەرچیت دەوێت هەڵیبگرە.

من رەنگە خەو دەبینم..... ئاخر شیاوی باوەڕ پێکردن نیە.

یوری بۆئەوەی لەناڕەحەتی من کەم بکاتەوە، وەك گوێ نەدان شانەکانی بەرز کردەوەو وتی: زۆرباشە گرنگ نیە. دڵنیام تۆ بە هەڵەدا نەچوویت و هەرچیت بینیوە بۆمنت باس کردوە بەڵام....

قسەکەی خۆی تەواو نەکرد، دەیویست بڵێت چی بوو....؟ ئاخر لاشەی مردوەکان

نارۆن و هەستیان نیە کە شتێك داشارن و یان دووبارە بیکەنە ملی خۆیان؟

هەرچی بو ئەو قسەکەی خۆی پچری و قۆڵی منی گرت و وتی:

وەرە...... وەرە........ بابرۆینە ناو پەرستگا.

تازە لەم کاتەدا بیری خاکی زێرو جەواهیراتەکەی ناو پەرستگام کەوتەوە و وتم:

راست دەکەیت.... کاتێك پەیکەرەکەم شکان نزیکەی سیٚ سەد کیلۆ گرام خاکی زێر لەناویەوە هاتە دەر. جیاواز لەویش برێکی زۆر جەواهیراتیش لەویٚ هەیە کە ئەوەمان بەسە و ئەگەر بتوانین بیٚ روبەرو بوونەوەی لەگەڵ روداوی مەترسیدار بگەینە دنیای ئازاد، هەموو تەمەنی خۆمان بەسامان و بەختەوەری بەسەر دەبەین.

یوری لەپێشەوە دەرۆشت و من نزیکەی بیست سانتیمەتر لەدوایەوە بووم، لەگەڵ ئەوەی زۆر بەهێواشی قسەمان دەکرد دەنگی یەکترمان دەبیست. من دوای وتنی رستەی سەرەوە وەك ئەوەی لەسستی و لاوازی خۆم شەرمەزاربو بێتم وتم:

بەڵام نە...... ئەم سامانە گەورەیە کە من بینیم نابێت لەقووڵایی ئەم جەنگەڵەدا بمێنێتەوە. من هەموو شوێنێکی ئەم پەرستگایە ژێروژوو دەکەم و دەیدۆزمەوە.

یوری قسەی نەدەکرد. وەك پەیکەرێك لەئاسن و پۆڵا ساردو بێدەنگ و بەهەنگاوی قورس بەرێگادا دەرۆشت.

بەزوویی ماوەی نێوان دوو داڵانەکەمان بری. یوری کە لەپێش منەوە بو هەنگاوی خستە داڵانی دووەم یانی پەرستگا کە بەکوونی ژێر پەیکەرەکە کۆتایی دەهات. لەگەڵ گەشتن بەداڵا بڵێسەی مەشخەڵەکە دەستی بەسەما کردن کرد، لەرزی و رووی لەکوژانەوە کرد.

یوری کەلەپێش منەوە بو خۆی کێشایە دواوەو دووبارە گەرایەوە بۆ ژووری مردوەکان و وتی: ئەم داڵانە هەوای نیە مەگەر نەتانوت کونەکە رێگەی بۆ تالاری پەرستگا هەیە.

بەسەرسوڕمانەوە سەیرم کردو وتم: مەبەستت چیە؟ من کەدرۆ ناکەم.

یوری وتی: راست دەکەیت بەڵام چۆن ئەگەری هەیە مەشخەڵەکە بکوژێتەوە.

وەڵامم دایەوە:

من و نیکی لەم رێگاوە هاتین و مەشخەڵەکە نەکوژایەوە. ئێستا هەوانیە و دەکوژێتەوە، یانی چی؟

چۆن شتی وا ئەگەری هەیە؟

وتی: بەهەرحاڵ دەبێت بڕۆینە پێش.

یوری ئەمەی وت و دووبارە ڕۆشتە ناو کوونەکە. هات و چۆی ئێمە بووە هۆی جوولەی ئێمە هەوای وەستاوی کوونەو ئەم جارە مەشخەڵەکە درەنگتر کوژایەوەو تاکۆتایی دالآنەکە یانی تا شوێنێك من سەکۆی ژێر پەیکەرەکەم کون کرد، نەکوژایەوە.

لەڕووناکایی لەرزانی مەشخەڵ هەردووکمان سەیری سەرەوەمان کرد. لەوپەڕی سەرسوڕماندا بینیم کە ڕێگاکە بەستراوە.

ڕەنگە ئەم گوومانە خوێنەرو بیسەردا دروست ببێت کە بۆ نموونە سەر کوونەکەیان بەدارو تەختەو خاك و گڵ داپۆشی بو.... نە دەرگای کوونەکە وەك پێشتر ڕەنگە باشتریش بەسترابو. دەتوت دەیان بەرد تاشی وەستای شارەزا چەندین هەفتە کاریان کردوەو بەردیان بۆ کوونەکە تاشیوە و بەستوویانە.

من و یوری هەناسەیەکی قووڵ بەسەرسوڕمانمان هەڵکێشا و دواتر چەند چرکەیەکی درێژ بێدەنگ بووین. هەرکەسی تر لەجیاتی من بوایە نەیدەتوانی لەسەرسوڕمانی خۆی ڕێگری بکات چونکە ئەوەی من دەمبینی شیاوی رازی بوون و باوەڕ پێکردن نەبو.

سەر ئەنجام یوری بێدەنگی شکاندو وتی:

ڕەنگە بەهەڵەدا چوویت ! ئایا دالآنێکی تر هەیە؟

بەدەنگی لەرزان و گیراو لەوەڵامدا وتم:

دڵنیام کەدالآنی تر نیە. لەدالآنێك ڕۆشتینە ناو ساردخانە. لەدالآنی دووەم ڕۆشتینە دەر و ئەم ڕێگایە ئەوەندە ئاڵۆز نەبو کە من لەبیری بکەم.

یوری لێوی بەدیان گرت و بیری کردەوە، وتی:

کەواتە لەبەرژەوەندیمان نیە بۆ بەدەست هێنانی جەواهیرەکان زیاتر بگەڕێین. ڕۆحی پێشینیان سامانی پەرسگای هۆزەکەی خۆیان دەپارێزن و هەرچی بێت بۆ ئێمە بێ مەترسی نیە. لەم ڕێگای کەهاتووین دەگەڕێینەوە.

من کەلەشکستی خۆم نارەحەت و تووڕە ببووم بەتووندی و تورەیی وتم:

واز لەم قسە قۆرانە بێنە. بۆ من شیاو نیە پێبەندی خورافات و وەهم پەرستی بین گریمان ئەرواح بونیان هەبێت. قازانج و زەرریان نیە کە بۆ پاراستنی سامان و زێڕ هەوڵ بدەن.

یوری کەتووڕەیی منی بینی ئیتر قسەی نەکرد بەڵام چەند چرکە دواتر دوای کەمێك هەوڵدان و چالاکی کە ئەنجامی نەگرت وتی:

بەهەرحاڵ ڕێگاکە ناکرێتەوە. بەردی سەر کونەکە ئەوەندە گەورەو قورسە کە یەکێك لە سلنگەکانی نیویۆرك بۆ جووڵاندنی پەسەندە ناکات.

ناچار وتم: بگەڕێینەوە..... مەشخەڵەکان ئێستا دەکوژێنەوە..... لەتاریکیدا دەمێنینەوە خێراکە.

دواتر بۆئەوەی ڕازیم کردبێت وتم: جێگەی داخ نیە.... ئەم برە جەواهیرەی لەکاتی هاتنەدەر هەڵم گرت زایاتر لە سێ سەد هەزار دۆلار بەهایەتی و ئەمەش پارەیکی کەم نیە.

یوری وتی: ئێمە کەدەلاڵ و زێر فرۆش نین، بەهاکەیان نازانین ڕەنگە زیاتر لەوەی بیری لێدەکەیتەوە بەهایان بێت.

لەم کاتەدا لەساردخانەکە تێپەڕین و گەشتینە دالآنی یەکەم. هەوای ئازادی لێ بو، مەشخەڵەکان باشتر دەسووتان و دەورووبەریان ڕووناك دەکردەوە.

هێشتا لەدالآنەکە ندەڕۆشتبووینە دەر کەیوری بەپەنجە سووچێکی نیشان داو بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئەمە چیە.....؟

هەردووك وەستاین سەیرمان کرد..... نیگام لەسەر زەوی سووڕاو هەموو شتێکم بینی تا لەسەر شوێنێك کە یوری بە پەنجە نیشانی دا جێگیر بو.

دەفرێکی گەورەی گلی لەو دەفرە گەورانەی ئامازۆن کە بەزۆری هەنگوینیان تێدەکرد، لێوانلێو لە شتێك بو کەنەماندەزانی چیە.

یوری دانیشت دەستی لەناو دەفرەکەدا و لەناکاو لەشوێنەکەی هەستاو بەرزبوویەوەو وتی:

بڕوانە..... خۆڵی زێر..... ئەو خۆڵەی تۆ باست کرد.... سەیرکە منیش دانیشتم و کاتێك دەستم نەبردە پێش بەر خۆڵەکە نەکەوت نەمتوانی باوەڕ بە قسەکەی یوری بکەم. خۆڵی زێر لەناو سکی پەیکەڕەکەدا بوو من دوای شکاندنی پەیکەڕەکە پێم زانی کاتی تێپەڕین لەساردخانەکە هەموو شوێنێکم بینی. ئەو دەفرەی لێ نەبو. ئەی کێ پڕی کردوە لەخۆڵی زێڕ و لەوێ دایناوە.....؟ ئایا ڕۆحەکان پارێزەری پەرستگای هۆز پاداشتی لێخۆش بوونی ئێمەیان داوەتەوە....؟ ئایا ئەگەر ئێوە لەجێگای من بوونایە، باوەڕتا بەم بۆچوونە نەدەکرد و پێی ڕازی دەبوون؟

بەهەرحاڵ چەندین کیلۆ خۆڵی زێر لەو دەفرەدا بو، یوری هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو وتی:

خواکانی پەرستگا پاداشتیان پێداین، لەسەر ئەم گوومانەش ئەگەر بەزۆر بەردەکەمان بشکاندایەو بڕۆشتینایەتە ناو پەرستگا، گیانمان دەکەوتە مەترسیەوە.

قسەکەیم بڕی و وتم:

ئێستا کەبەشی ئێمەیان داوە، بۆ وەستاویت؟ هەڵیگرە بابڕۆین. ئێرە شوێنی وەستان نیە، من لەچاوی مردوەکان لەهەموو لایەکەوە سەیرمان دەکەن دەترسم.

یوری مەشخەڵ و تفەنگەکەی دا بەدەست من و خۆی دەفرەکە کەزیاتر لەبیست کیلۆ کێشی بو، بەرزی کردەوەو بەڕێکەوت.

لەوێوە تا دەمی کوونەکە زۆر دوور نەبو، زۆر خێراگەشتین و ڕۆشتینە دەر. لەرووناکی هەتاوی بەرەبەیان خۆڵی زێر لەناو دەفرەکە دەدرەوشایەوە. مرۆڤ لەدەست لێدانی تێر نەدەبو، دەمویست وەك منالێك لەسەری دانیشم و یاری پێبکەم.

یوریش لەسەر دەفرەکە چەمابوویەوە و هەندێ کات یاری بەزێڕەکان دەکرد.

سەیرکە..... چ دەفرێکی جوانە..... ئەم دەفرە کەم وێنەیە.

منش سەیرم کردو لەبینینی نەخش و نیگارەکەی سەرم سوڕما.

یوری وتی: بەهای دەفرەکە زیاتر لەزێڕەکەیە.

دەبێت بەساغی بیگەیەنینە ئەمریکا و بەنرخێکی گران بەمۆزەخانەکانی بفرۆشین. ئەو راستی دەوت منیش باوەڕەکەیم پشت راست کردەوە بەڵام نەمدەتوانی رازی بم نرخی دەفرەکە یەکسان بێت لەگەڵ بیست کیلۆ خۆڵی زێر.

هێشتا سەرقاڵی وتوێژ بووین کە دەنگی نیکی لەپشت سەرمانەوە بیسترا. هەردووکمان ئاوڕمان دایەوە.

نیکی کە لەدرەنگ کەوتنی چەند کاتژمێری ئێمە نیگەران ببو بۆ ئاگادار بوون دەهاتە ئەوێ، کاتێك چاوی بەخۆڵی زێر کەوت وتی:

بینیت کەڕاست دەکەم خواکان پارێزگاری لەپەرستگا دەکەن. هیچ بێگانەیەك ناتوانێت بچێتە ئەوێ، خوا بەزەیی پیاتانا هاتەوە کە بەسلامەتی گەڕانەوە.

یوری قسەکەی بڕی و وتی:

نیکی خێرا دەست بەکار بە..... ئاو بێنە. منیش خۆڵ و بەرد کۆدەکەمەوە. ئەم کونە دەبێت ببەسترێت کە کەس دوای ئێمە نەڕواتە ناوی. خێراکە.....

هەرسێکمان دەست بەکار بووین و کاتژمێرێك دواتر یوری وەك وەستایەکی شارەزا، کوونەکەی گرت و رێگاکەی بەجۆرێك بەست کەبینەر نەیدەتوانی هەست بەوەبکات

کەڕۆژێك لەوێدا کونێك هەبوە.

بۆ هەڵگرتنی خۆڵی زێرو جەواهیرەکان پێویستمان بەکەڕەستە بو.

نیکی پارچەیەك پێستی پڵنگی وەك کیسە دووری و خۆڵەکەی کردە ناوی. چەند تیکە ئەڵماس و زێرەکانیتریش من و یوری لەنێوان خۆماندا بەشمان کرد و بەجلەکانمانەوە دووری کە بەهۆی رێکەوت یان رووداو ون نەبێت.

نیکی لەهەمان رۆژ لەگەڵ ئەمانۆ دا ئاشنابو و پەرستاری لێکرد.

ئەمانۆ و نیکیش خۆیان بۆ سەفەرێکی دوورو درێژ کەلەبەردەمانا بو ئامادە کرد.

سەرئەنجام بڕیارماندا هەردووکیان لەگەڵ خۆماندا ببەین.

ژنان و کچان و بنەماڵەکانی نیشتەجێی پەرستگا بۆ ماڵئاوایی کردن لەئێمە خۆیان ئامادە دەکرد. شائکیش تاقمێکی راسپاردبو لەخزمەتمانا بن و لەبەستنی بارەکان یارمەتیدەرمان بن. لەسەر یەك ئەو رۆژانە بەخۆشی تێپەڕ دەبوون. یەك رۆژ بەیانی کەنیکی لەخەو هەستا هاتە لای من و وتی:

دوێ شەو خەوێکی مەترسیدارم بینی.

بەخوێنساردی پرسیم: چ خەوێك؟

وتی: خەوم بینی کە ئەوپیاوە ڕەش پۆشە بەمن دەڵێت.... ئیتر لەو شەڕابە مەخۆنەوە...

پێکەنیم و وتم: دوێ شەو زۆرت خواردوە بۆیە خەوی پەرێشانت بینیوە، گرنگ نیە.

تا ئەو رادە گوێم بەبابەتەکە نەدا کەتەنانەت بویوریشم نەوت. بەرێکەوت هەمان شەو یوری رۆشتە هەنباری شەڕاب و بڕێکی زۆری خواردەوە بەڵام لەناکاو دەنگی قاوەقیژی ژنان وکچانی پەرستگا بەرزبوویەوە..... یەکێك لەوان وتی:

یوری....... سووتا..... یوری سووتا فریای کەون.

بەپەلە رامکردە دەر. ئاگر یەکەم بینای پەرستگا کەلەوانیتر جیابو، گرتبوویەوە، هەموو شوێنێکی دەسووتاند و لەهەرلایەکەوە بڵێسەی دەسەند.

هەموان کۆ ببونەوە و بۆ کوژانەوەی ئاگرەکە هەوەڵیان دەدا. بەڵام بێ ئەنجام بو.

لەژنێکم پرسی: یوری لەکوێیە....؟

قۆڵی گرتم و وتی: یوری لەهەنبارە.... فریای کەون. خوشکەکەم و منداڵەکەشی لەوێن.

بەیەك نیگا بارودۆخم هەڵسەنگاند.... بەهیچ جۆرێك نەمدەتوانی بۆ رزگارکردنی ئەو

ژنەو منالەکەی و یوری کە رەنگە مەست و بێ ئاگا لای گۆزەی شەرابەکان کەوتبێت، کارێك بکەم. ئاگر هەموو شوێنێکی گرتبوویەوە، رێگاکان بەسترابوون و هەرکەس نزیك ببوایەتەوە، دەسووتا. لەم کاتەدا یوری لەناو بڵێسەکانی ئاگر لەکاتێکدا ژن و منالەکەی لەدەستدا بو، دەرکەوت.

یوری بەگیانبازێکی کەم وێنەو سەیر گیانی دوو مرۆڤی لەمردن رزگار کرد.

کاتێك یوری گەشتە بەرانبەرمان و ژنەکەی دانا، بێهۆش بو، دەست و قاچی سووتابوون بەلام ژن و منالەکەی زیانیان پێ نەگەشتبوو.

خێرا بۆ یەکێك لەژوورەکانی پەرستگامان گواستەوە. ئاگرەکە بەهاوکاری پیاوانی یارمەتیدەر کەشائکی ناردبووی کوژایەوە و بینای سووتاوەکە بەشێکی زۆری وێران ببو، ببوە زۆپایەکی دوکەلاوی کچەکان لەدەوری یوری کۆببوونەوە و چارەسەریان دەکرد. هیچ کارێك بەمن نەدەکرا.

بەدەرمانە ناوچەییەکان کە لەروەك و رۆنی تایبەت دروست دەکرا زۆر باوەرم نەبو بەلام دەمتوانی چی بکەم رێگەیەکی تر بۆ چارەسەرکردنی یوری نەبو.

دەست و روخساری بەجۆرێك سووتابو کەهەستم کرد بۆهەمیشە عەیبدار دەبێت ویان سۆمای چاوانی لەدەست دەدات. بەخۆشحالیەوە کاتێك رۆنیان لێدا، کاریگەری موعجیزە ئاسایی دەرکەوت و پێچەوانەی بۆچوونەکانی منی سەلماند و ئاشکرابو کە یوری زیانی زۆری پێنەگەشتووە. لەگەڵ ئەوەی هاتۆتە هۆش و چاوەکانی کردەوە، سەیری منی کردو وتی:

ئەو ژن و منالە سەلامەتن؟ ئەوان نەسووتان؟

دڵنیام کردەوە کەئەوان سەلامەتن و بەم شێوە دڵی یوری کە پیاوێکی مرۆڤ دۆست بو، ئاسوودە بو یەك دوو رۆژ تێپەری. یوری کەم کەم باش دەبوویەوە و برینەکانی وشك دەبوونەوە و قەتماغەی دەبەست.

پەیوەندیەکانی نیکی و ئەمانۆ باش بو و ئارەزووم دەکرد هەموو کات لەهەموو شوێنێکدا ئەم پاکی و هاورێیەتیەیان لەنێواندا بمێنێت. بەلا بێ ئاگا بووم لەوەی کە ژن حەسوودە و هەرچەندە بەسەر خۆیدا زاڵ بێت ناتوانێت بەرانبەر بەپیاوێك کەخۆشی دەوێت بێ سەرنج بێت و لەگەڵ هەوێکەی خۆیدا ئارام بێت.

دواتر زانیم کە ئەو رۆژانە نیکی و ئەمانۆ چەندە زەحتیان لەخۆیان کردوە تا ئارام بن. هۆی گوێنەدانی رووکەشی ئەوان بەرانبەر بەیەکتر ئەوەبو کە نەکا من توورە ببم و

یەکیان هەڵبژێرم و بیبەم.

ئەو رۆژە تا ئێوارە لەنیکی و ئەمانۆ کە سەرقاڵی دوورینی کراس بوون بێ ئاگا بووم. شائکی کە کەرەستەی سەفەرەکەی ئێمەی ئامادەکردبو هاتە پەرستگا و ئاگاداری کردینەوە کە هەر رۆژێك بمانەوێت دەتوانین بەرێکەوین بەڵام.....

شائکی لەسەر ئەم وشە وەستا..... سەری بەشەرم و نارەحەتیەوە داخست و لە ژێر لچەوە هەندێ قسەی کرد کەم تێنەگەشتم.

یەك دوو چرکە بەبێدەنگی تێپەری و تا من بێدەنگیم شکاند و وتم:

بەڵام چی...... مەبەستت چیە؟ چی دەڵێیت؟

شائکی بێ ئەوەی سەیری چاوم بکات وتی:

بەڵام بردنی کچانی ئامازۆن کارێکی دژوارە ! دەزانن چی بووە.....؟ حەسوودی کچانی تر کە لەلایەن ئێوە گوێیان پێنەدراوە ئەم کێشەی دروست کردوە..... دوێ شەو تاقمێك لەژنانی پیری هۆز هاتنە لای من و وتیان ئێوە مافی ئەوەتان نیە کچەکان لەگەڵ خۆتان ببەن؟ ئەوان لە جوانترین کچەکانی ئامازۆنن و دەبێت بۆ پاراستنی نەژادی ئامازۆن بمێننەوە.

سەیری چاوی شائکیم دەکرد و دەمویست بزانم بۆچوونی خۆیەتی یان نارازی بوونی ئەوان بۆ من دەگێرێتەوە. دیاربو شائکی لەم رووداوە بێ تاوانە چونکە بەراستی نارەحەت و لەکاتی قسەکردندا شەرمەزار بو.

کچەکانی پەرستگا دووبارە ئاژاوەیەکیان نابوویەوەو من نەمدەزانی چی بکەم، لەشائکیم پرسی:

بۆچوونی تۆ چیە....؟ تۆش لەگەڵ ئەواندا رازیت....؟

شائکی وتی: هەرگیز چۆن دەکرێت لەگەڵ ئەواندا رازیبم؟ دوێ شەو نزیکەی دوو کاتژمێر بەرگریم لەئێوەکرد. لەبارەی ئەو خزمەتانەی بۆ هۆزتان ئەنجامداوە و ئەو پێشینەی هەتانە قسەم کرد بەڵام بێ ئەنجام بو چونکە ئەوان سوورن و دەڵێن نابێت ئێوە کچەکان لەگەڵ خۆتانا ببەن.

من و شائکی سەرقاڵی وتوێژ بووین کە یوری هاتە ژوور و کەلەبابەتەکە ئاگادار بوویەوە، رویکردە شائکی و وتی:

ئێستا کە تۆ لەگەڵ ئێمەدایت، زۆر گرنگ نیە.... گوێ بگرە... دەمەوێت پرسیارێکت لێ بکەم بە بۆچوونی تۆ ئێمە چی بکەین کەنیکی و ئەمانۆ لەگەڵ خۆماندا ببەین و بێ

ئەوەی ڕووداوێکی خوێناوی روبدات و کەس بکوژرێت؟

شائکی لەوەلامی یوریدا وتی: بە بۆچوونی من باشترە بەنهێنی بڕۆن و پێش ئەوەی بزانن چی بووەو چی ڕوویداوە مەودایەکی زۆر لێرە دوور بکەونەوە. هیچ کام لەم ئامازۆنیەکان لەپەرستگا نین کە ئێوە لەگەڵ خۆیانا ببەن کچەکانیش لەکاتی شەو ناتوانن بڕۆنە هۆز و ئەوانیتر لەڕۆشتنی ئێوە ئاگادار بکەنەوە....

یوری وەك ئەوەی بیرێکی تازەی کردبێت هاتە پێش و وتی:

گوێبگرە بلاوی دەکەینەوە کە چوار ڕۆژی تر بەڕێدەکەوین بەلام لەراستیدا ئەم شەو یان سبەی شەو بەڕێدەکەوین و لێرە دوور دەکەوینەوە. ئەم کارەش شەوانە ئەنجام دەدەین کەکچەکانی پەرستگا نەتوانن هۆز لەڕۆشتنی ئێمە ئاگادار بکەنەوە. بەرەبەیان کاتێك دەزانن کە ئێمە مەودایەکی زۆر لێرە دوور کەوتووینەتەوە و بەلام ئەرکی تۆ کە هاوڕێی ئێمەیت ئەوەیە ڕێگایان بەهەڵە نیشان بدەیت و سەر گەردانیان بکەیت. تەنیا لەم شێوەدایە ئەگەر بەدواشماندا بێن ناتوانن پێمان بگەن و لەجەنگەڵدا سەرگەردان دەمێننەوە.

منیش ئەم باوەڕەم پەسەند کرد، شائکی وەك خزمەتکارێکی بەئەمەك سەری داخست و وتی:

بەسەر چاو، فێڵێکی زۆر باشە. کەواتە کاتێك من گەشتمە هۆز پێیان دەڵێم ئێوە چوار ڕۆژیتر دەڕۆن.

لەدرێژەی قسەکەی ئەودا یوری وتی:

بەلام لەراستیدا سبەی شەو کاتێك مانگ هەلات بەڕێدەکەوین و لەرێگەی بەستێنی ڕووبار بەرەو ڕۆژ ئاوا دەڕۆین.

شائکی لەشوێنەکەی هەستاو لەگەڵ پارێزراوانی خۆی ماڵئاوایی لێکردین و ڕۆشت. کاتێك لە ژوورەکە ڕۆشتەدەر، یوری بزەیەکی گرت و سەری بەنیشانەی ڕەزامەندی و سەرکەوتن تەکاندا.

بەهێواشی لێم پرسی:

چۆن بیر دەکەیتەوە؟ یوری سەری لەدەرگاکە بردە دەرو سەیری دەرەوەی کرد و چونکە دڵنیابو کەس ئاگای لێ نیە و دەنگمان نابیستێت وتی:

هەندێ کات مرۆڤ ناچار دەبێ درۆ لەگەڵ خۆیشی بکات و عەقڵ و دڵی خۆی هەڵخەڵەتێنێت، شائکی بلاوی دەکاتەوە کە ئێمە چوار ڕۆژی تر دەڕۆین و من پێم وت کە

سبەی شەو دەڕۆین با لەگەڵ هەردوو دەستەکەدا درۆمان کردبێت.

پرسیم: کەواتە سبەی شەو ناڕۆین.

یوری پەنجەی لەسەر لووتی داناو وتی:

بێدەنگ بە دیوار مشکی هەیە و مشکیش گوێچکەی و ئاژاوەگێریش دەزانێت.... سبەی شەو ئێمە دەیان میل لێرە دوورین.

دڵم داکەوت. یوری دەیویست شائکیش هەڵخەڵەتێنێت و دوور نەبو ئەو ببێتە هۆی بزواندنی هۆز و کار زیاتر قووڵ و مەترسیدار بێت. وتم:

کارێکی باش نیە، لانی کەم باشائکی هاوڕێمان بێت.

یوری ڕێگەی نەدا قسەکەم تەواوبکەم و بە پەنجە ئیشارەی بێدەنگی پێدام، بەخێرایی لە ژوورەکە ڕۆشتە دەرو ڕۆشت.

بڕیاری خۆی دابو نەمدەتوانی دژایەتی بکەم. هەمیشە هەروابو، هەرکاتێك بۆ ئەنجامدانی کارێك بڕیاریدەدا هیچ ڕووداوێك نەیدەتوانی پاشگەزی بکاتەوە.

هێشتا بیرم لەکارەکانی ئەو دەکردەوە کە نیکی هاتە ژوور و بەهاتنی ئەو سەرنجم لەلای یوری بۆ لای کچێکی جوان و دڵرفێن ڕاکێشرا.

نیکی پەڕیە ناوەڕاستی ژوورەکەو دەستی بەسەماو گۆرانی کرد. نیکی بەردەوام ئاوازی دەخوێند و سەمای دەکرد و من بۆ ئەوەی یارمەتی سەمای دڵرفێنی ئەومدابێت لەسەر ئەو سنوقە دارەی لەسەری دانیشتبووم دەستم بەتەپڵ لێدان کرد.

نیکی زۆر جوان سەمای دەکرد و ئەم بیرۆکەم لا دروست ببو کاتێك گەشتمە دنیای پێشکەوتو بۆ فێربوونی سەما بینرێمە پێگەکانی ڕاهێنانی سەماکردن.

نیکی سەمای دەکرد و دەیخوێند منیش تەپڵم لێدەدا لەناکاو ئەمانۆش هاتە ژوور و دەستی بەسەما کردن کرد.

نیکی بەهاتنی ئەمانۆ سەمای خۆی کۆتایی پێهێناو لای من دانیشت. ئێستا سەرەی ئەمانۆ بۆ ئەویش زۆر جوان سەمای دەکرد بەڵام شێوەی سەمای ئەوان بەتەواوی جیاواز بوو هەرکام بەشێوەیەکی تایبەت سەمایان دەکرد. سەرم سوڕمابو بە خۆمم دەوت:

حەیفە ئەم هەموو توانابیە لەکچان و ژنانی ئامازۆن داهەیە و لەقووڵایی جەنگەڵدا بەفیڕۆ بڕوات خۆزگە دەمتوانی کارێك بکەم تا ئامازۆنیەکان بەراهێنان و پەروەردەکردنی دنیای پێشکەوتو ئاشنا بکەم بەڵام نا، چێژێك کە من لەم چەند ساڵەدا برومە، چێژێك بو

كەدنیای پێشكەوتو نەیدەتوانی بەمنی بدات.

ئەمان ئارامی و بێدەنگیان هەیە كە لەگەڵ هیچ كام لە لەپێشیەكانی دنیای پێشكەوتو شیاوی بەراوردكردن نیە ئەمانۆ هێشتا سەمای دەكرد و دەیخوێند. نیكی هیلاك ببو لای من دانیشتبو كەیوری هاتە ژوور و دەرگاكەی داخست و بێ ئەوەی سەرنج بداتە كراسە تازەكانی نیكی و ئەمانۆ وتی:

زووكەن، خێراكەن، من بارەكانم بەستووە.

ئەمانۆ دەستی لەسەماكردن هەڵگرت. منیش هەستام و وتم:

بۆچی خێراكەین، مەبەستت چیە؟

یوری بەنادڵنیایی و گوومانەوە سەیرێكی دەرگاكەی پشت سەری خۆی كردو وتی:

مەبەستم ئەوەیە ئێستا دەبێت بەرێكەوین. من بارەكانم بەستووە و ئامادەم كردوە. بارێكی زۆرمان پێ نیە. هەركام بەستەیەك هەڵەگرین و دەڕۆین. ڕێگاش شارەزام و بەپێچەوانەی ئەوەی بەشائكیم وت لەرووبارەوە دەڕۆین و لەبەستێنی راستی رووبار بەرەو باشووری رۆژئاوا دەڕۆین.

ڕۆشتمە پێش و وتم: ئەم كارە باش نیە، شائكی هاوڕێمانە و ئەگەر درۆی لەگەڵدا بكەین دەبێت بە دوژمنمان و مەترسی گەورە روودەدات. نا یوری ئەم كارە مەكە. باشائكی لەرووداوەكە ئاگادار بكەینەوە و داوای یارمەتی لێ بكەین.

یوری بەناڕەزامەندی بڕۆكانی هێینایە یەك و وتی:

دژایەتی مەكە. گوێ بگرە. من ئەمانە باشتر لەتۆ دەناسم. هەركەس بۆ پێگەی خۆی لەژیانیدا هەر كارێك پێویست بێت دەیكات و هەركارێكی قێزەون ئەنجام دەدات كە ناسوپاسی و بیركردنەوەی خۆشەویستی كەسەكان سادە ترینیانە. شائكیش بۆ رەزامەندی دانیشتوانی هۆز و بەدەست هێنانی باوەڕی ئەوان كە دەبێت تەمەنێك لەگەڵیا بژین، خیانەتمان لێ دەكات. كاتێك كوژراین هەستی شەرمەزاریش لەناو دەچێت و بەخێرایی ئەفسانەی ژیانی ئێمە و سەفەرەكەمان لەبیر دەچێت.

شائكی دەمێنێتەوە و دەسەلاتێكی فراوان و هۆزێكی فەرمانبەردار.

بەڵگە هێنانەوەو قسەكانی یوری زۆر زووتر لەوەی گوومان دەكرا، رازی كردم. بێ یەك وشە دژایەتی وتم: زۆر باشە... رازی بووم ئێستا دەبێت چی بكەین؟

وتی: زۆر سادەیە. نیكی و ئەمانۆ لەپێشەوە دەڕۆن و لەقەراغ جەنگەڵ، لەوێ كە بەردێكی ڕەشی گەورەی لێیە چاوەڕوانمان دەكەن.

یوری لەم کاتەدا روی تێکردن و وتی: ئێوە بڕۆن.... خێراکەن...

نیکی و ئەمانۆ بەڕاکردن لەژوورەکە رۆشتنەدەرو رۆشتن.

دوای ئەوان یوری وتی: من سیلاحەکانم پاك کردۆتەوە، پێویستمان بەهیچ شتێك نیە و بۆدڵنیایی تفەنگێك کەلای شائکی بە ئەمانەت دامنابو، ئەمڕۆ وەرم گرتەوە نەکا بۆ کوشتنی ئێمە کەڵکی لێوەرگرێت.

خێراکە..... بەدواماندا وەرە.

کچانی پەرستگا سەرقاڵی هات وچۆ بوون وکاری رۆژانەیان ئەنجام دەدا...

بە دەستووری شائکی تاقمێك بۆ چاك کردنەوەی پەرستگا سووتاوەکە هاتبوون و سەرقاڵی کارکردن بوون. شوێنی کارکردنی ئەو تاقمە دوور بو ونەیان دەتوانی ئێمە ببینن.

کاتێك رێرەوەکە چۆڵ بو من و یوری بەخێرایی کۆڵە پشتەکانمان خستە سەر شان و سیلاحمان بەدەستەوە گرت وبەڕێکەوتین. بەخێرایی لەڕێرەوەکان تێپەڕ بووین و گەشتینە پانتایی یەکەم. لەوێش کەسی لێ نەبوو. لە حەوشەکەش تێپەڕ بووین و سەرئەنجام لەدەرگای پەرستگا رۆشتینە دەر. تا ئەوێ بێ ئەوەی روبەڕوی کەس ببینەوە، رۆشتین بەڵام لەم کاتەدا یەکێك لە کچەکان لەکاتێکدا گۆزەیەکی ئاوی لەدەست دابو، ئێمەی بینی بەدەم بزەوە وتی:

بۆ کوێ دەڕۆن؟

یوری دەستی لەغەبغەبەی داو بەمیهرەبانیەوە وتی:

کچی جوان دەڕۆینە راو. بە ئومێدی خوا پێستی بەوری سوورت بۆ دێنین تا بۆخۆت دۆشەکی لێ دروست بکەیت، پێت خۆشە؟

دەتوت کچەکە باوەڕ بەقسەکانی ئێمە ناکات چونکە روخساری بێ گۆرانکاری مایەوەو بەچاوانی پڕ لەگوومان و دوو دڵی سەیری دەکردین.

یوری بەئەنیشك لە کەلەکەی دام و هەردووکمان بەڕێکەوتین. کەمێك کە دوور کەوتینەوە کچەکە گۆزەکەی لەسەر زەوی داناو بەڕاکردن رۆشتە ناو پەرستگا. یوری وتی: کاتێك بزانن نیکی و ئەمانۆ لەپەرستگا نین، بەخێرایی شائکی و دانیشتوانی هۆز ئاگادار دەکاتەوە خێراکە دەبێت پێش گەشتنی ئەوان لەرووبار بپەڕینەوە.

یوری راستی دەکرد و باشتر لەمن دانیشتوانی هۆزی دەناسی. کچان و ژنانی ئامازۆن زیاتر لەسەر رق و حەسوودی بەرانبەر بە نیکی و ئەمانۆ، دوژمنایەتیان لەگەڵ

من و یوریدا دەکرد و، ئاژاوەیان دەنایەوە.

هەرکام لەوان بەهۆی کەمی پیاو و سەرنجێك کە کچان بەگشتی بەمنیان دەدا دەیانویست جێگەی نیکی یان ئەمانۆ بگرنەوە و ببنە هاودەم و هاو خەوی من و چونکە ئەمە ئەگەری نەبو لەگەڵما خراپ بوون و دەیانویست بەشێوەیەك تۆڵە بستێننەوە و ئێستا کە خۆیان لەمن بێ بەشن نیکی و ئەمانۆش لەم بەختەوەریە بێ بەش بکەن.

دوژمنایەتی ئەوان لەگەڵ من و یوری لەسەر ئەوەبو و ئەگەر ئەمە نەبوایە ڕەنگە تا ئەوپەڕی گیانبازی خزمەتیان بکردینایە و لەکاتی هەستیارو مەترسیداردا گیانیان بخستایەتە مەترسیەوە.

جگە لەراکردن چارەیەکی ترمان نەبو. درەنگ یان زوو هەواڵی رۆشتنی ئێمە لەناو هۆزدا بلاو دەبوویەوە و نەیارانی ئێمەی ئەوانەی لەترسی ڕەشاش و گوولەکانی بوێری دوژمنایەتی کردنیان نەبو رادەپەڕین و دەستیان بەهاندانی ئەوانیتر دەکرد.

لە گۆڕەپانی بێ داری بەرانبەر پەرستگا رۆشتینە دەر بەڵام ئەو رێگا کورتە بەڕادەیەك هیلاکی کردبووم کە ئەژنۆکانم دەلەرزی.

یوری وەك کێو بەڕێگادا دەڕۆشت. ئەندام و ماسوولکەکانی دەتوت لەپۆڵا دروست کراوە. هیچ کات هیلاك نەدەبو و هیچ کات لەدرێژی رێگا و قورسی بارو دژواری ڕووداوەکان گلەیی نەدەکرد و لەبەر ئەمەش بەحاڵی منی نەدەزانی و نەیدەزانی چیم بەسەردا دێت و چەند هیلاکم.

بەخۆشحاڵیەوە کاتێك گەشتینە دارەکانی جەنگەڵ ولەبەرچاو دوور کەوتینەوە یوری بۆ هەڵبژاردنی رێگا وەستا. ئەم وەستانە چەند چرکەیەکی کورتی خایاند بەڵام بۆ من دەرفەتێکی گوونجاو بو بەپشتی دەست ئارەقی ناوچاوم بسڕم و هەناسەیەك بەئاسوودەیی لێبدەم و پاڵ بەدارەکەوە بدەمەوە. تازە کۆڵە پشتەکەم لەم شانەوە خستە ئەو شانیترم کە یوری بەپەنجە شوێنێکی نیشانداو وتی:

لەوێن. من سێبەری یەکیانم بینی.

تازە هەستم بەوەکرد کە یوری بەدوای نیکی و ئەمانۆدا دەگەڕێت. کاتێك گەشتینە روخساری ئەمانۆ وەك گەچ سپی ببو بەڵام دواتر لەشادمانیدا سوور بوویەوەو لێوەکانی کەوتە لەرزە.

هەریەك لەوان بەشێك لەبارەکانیان هەڵگرت و لەوێوە سەفەری چوارکەسی ئێمە دەستی پێکرد. دیار نەبو چی دەبێت. تەنیا خوا دەیزانی چ چارەنوسێك چاوەڕێمانە و

چ ڕووداوێك پێش دێت؟ ئەم ناڕەحەتیە قووڵە لەچاوی هەموومانددا دەبینرا و مەگەر یوری کەبەپێی عادەت لە هەمو شتێکی بە خوێنساردی دەڕوانی و پێشوازی ڕوداوە خوێناوی وکارەساتبارەکانی بە باوەشێکی کراوە دەکرد. یوری لەپێشەوە دەڕۆشت. نیکی و ئەمانۆ چونکە ژن بوون بەدوای یەك ولەناوەڕاستدا جێگیر بوون و منیش دوایین کەس ڕیزی چوارکەس بووم و هەندێ کات ئاوڕم دەدایەوە لەگەڵ بیستنی دەنگێکی نامۆ ڕەشاشەکەم دەخستە سەر دەست.

کەمێك کە دوور کەوتینەوە یوری وەستاو وتی:

لێرە دەبێت ڕێگاکە بگۆڕین. ئەگەر شائکی و دانیشتوانی هۆز بەدوامانددا بێن لەم ڕێگاوە تائێرە دێن بەڵام ئێمە ڕێگا دەگۆڕین و لە لاڕێوە بەرەو ڕووبار دەڕۆین.

ئاگادار بن هیچ نیشانەیەك لەخۆتان بەجێ نەهێڵن.

ئەمەی وت و خۆی لای دارێك وەستاو یەك یەك هەموومانی لەڕێرەوە تازەکەوە پەڕانەوە. لەوێ بەدواوە هەموومان تاڕادەیەك خەیاڵمان ئاسوودە بوو چونکە دەمانزانی ئەم ڕێگایە ڕێگایەك نیە بتوانن بەئاسانی بیدۆزینەوە.

بەم شێوە ئەو ڕۆژە تێپەڕی و ئێمە گەشتینە لای ڕووبار. ئەگەر لەڕێگای پێشوو بڕۆشتینایە پێش ئاوابوونی خۆر لەڕووبار تێدەپەڕین بەڵام ئەو ڕێگایە درێژتر بو و شەو تەنیا گەشتینە نزیك ڕووبار و ناچار بووین شەو لەوێدا بەسەر ببەین.

دارەکانی ئەو ناوچە جیاواز بو ولقەکانی ئەوەندە خۆڕاگر نەبوون مرۆڤ بتوانێت لەسەری بخەوێت. یوری بارودۆخی هەڵسەنگاندو خێرا شوێنی حەوانەوەی دیاری کرد. ئەو لەناو چەند دارێك شوێنێکی نیشانداو بەنیکی و ئەمانۆی وت:

بەلقی دارەکان گسکی بدەن.

ئەوان بەلق و گەڵای دارەکانیان بەیەکەوە گرت و ئەوێیان خاوێن کردەوە. یوریش لەدارکە ڕۆشتە سەرو بە قەمە هەندێك لقی تازەی لێکردەوەو وتی:

ئەمانە ڕاخەن.

ئەوانیش ئەم کارەیان کردو بەخێرایی زەوی بەگەڵاو لق داپۆشراو جێگەیان ڕاخست.

یەکەم نیشانەکانی دژایەتی نیکی و ئەمانۆ لەوشەوەوە دەرکەوت.

( ٢٠ )

ئەو شەوە بەهەر شێوەیەك بو بەسەر چوو. بەیانی زوو یوری لەخەوی هەستاندین و بەڕێکەوتین هێشتا خۆر ئاوا نەببو کەلەرووبار تێپەڕ بووین.

یوری چەند هەفتەیەك پێشتر شوێنی وشك و کەم ئاوی رووباری دۆزیبوویەوە و نیشانەی کردبو. بەخۆشحاڵیەوە نیشانەکانی لەشوێنی خۆیدا بوو کاتێك گەشتینە بەستێن بەبێ دژواری تێپەڕین و چووینە بەستێنی راست.

یەك دوو کاتژمێر دواتر گەشتینە ناوچەیەکی خۆش ئاو هەوا و پڕ گوڵ. چەندین چاوگی ئاوی شیرین لەزەوی هەڵەقولاً.

دەوروبەری کانیەکان پڕ لەگوڵی رەنگاو رەنگ و وەحشی بو و بۆنی دڵ ئەنگێزی گووڵەکان رۆحی ئارام دەکردەوە.

دوو کاتژمێر دواتر لەکانیەکان تێپەڕین و چووین چەندین میل دوور کەوتینەوە، یوری سەیری دەوروبەری کردو وتی: تێگەشتیت چی بووە؟

بەسەر سووڕمانەوە پرسیم: چی بووە؟

بزەیکی لێداو وتی: نابینی چاووم ئاوساوەو سووڕ بۆتەوە؟

وتم: بۆ نا؟ تاڕادەیەك سووڕ بوو بەلاّم وابزانم بەهۆی هیلاکی رێگا بێت.

وتی: نە رێگا رۆشتن هیلاکم ناکات جیاواز لەوەش کاریگەری هیلاکی لەسەر چاووم دەرناکەوێت دوێ شەو ئێوە ئارام و بێ خەیاڵ خەوتبوون و من تابەیانی بەئاگابووم و ئاگام لەدوروبەری بوە من کە لەرووداوەکە هیچم نەدەزانی وەستام، دەستی یوریم گرت و بەسەرسوڕمانەوە پرسیم: مەگەر چی روویداوە؟

وتی: دەتویست چی رووبدات؟ شائکی و چەند پیاوێکی چەکدار بەدوامانەوە بوون. تازە خەریك بو دەخەوتم کە بەدەنگی خشەخشی گەلاّ وشکەکان خەبەرم بوویەوە بەگوومانی ئەوەی ئاژەڵێکی برسی لەئێوە نزیك دەبێتەوە سیلاحەکەم هەڵگرت و رۆشتمە پێش و لەتاریکیدا هەیکەلی چەند پیاوێکم بینی، بەخێرایی هاتمە دواوەو خۆم داشارد.

ئەوان قسەیان دەکردو بەدوای شوێن پێکانی ئێمەوە بوون. لەوێوە کە هێشتا

شانستان بەئاگایە و کاتی مردنتان نەگەشتووە، ئەوان لای ئێوە تێپەڕین و هیچ کام لەئێوە سیانەیان نەبینی. لەگەڵ ئەوەشدا تابەیانی بەئاگا بووم و لەدەورووبەری شوێن خەوەکەی ئێوە دەسووڕامەوە.

هۆی هیلاکی چاوەکانی من بێ خەوی دوێ شەوە.

چەند خولەك دواتر کە نیکی و ئەمانۆش ئاگادار بوونەوە، یوری وتی:

بینیتان من راست دەکەم. بەو هەموو خۆشەویستیەمان بەرانبەر بەشائکی کە ئێوە گیانتانی لەمردن رزگارکرد دووبارە خیانەتی کردو بۆ کوشتنی ئێمە لەگەڵ دانیشتوانی هۆز یەکیگرت.

بۆئەوەی دژایەتیم کردبێت وتم:

رنگە شائکی مەبەستی کوشتنی ئێمە نەبوبێت. نابێت ڕەش بین بین.

یوری بزەیەکی هێنایە سەر لێو، شانەکانی بەرزکردەوەو وتی:

زۆر باشە، بڕۆین. تەنیا کاتێك خەنجەری شائکی سکی من و ئێوەی هەڵدڕی باوەڕ دەکەیت کە ئەو مەبەستی کوشتنی ئێمەیە. وانیە؟ فەرموون بەم هەموو گەش بینیەتان رۆژی ڕوودانی ئەم ڕووداوە زۆر دوورنیە.

ئیتر قسەی نەکردو کۆڵەکەی لەسەرشان جێ بەجێ کردو لەپێش ریزەکەی ئێمەوە بەڕێکەوت. ئاوابوونی هەتاوی رۆژی دووەم گەشتینە شوێنێك کە لەخاڵی بەرانبەر شوێنی وەستانی دوێ شەو بو، یوری وتی:

بە بۆچوونی من باشترە لەژێر یەکێك لەم دارانەدا بحەسێینەوە. لەوێوە هەر چوارلامان بەجوانی دەبینرێت و هەرکەس مەبەستی نزیك بوونەوەی هەبێت، دەیبینین.

بەردەوام گوێڕایەڵی یوری بووم. ئەم جارەش دژایەتیم نەکرد و لەئەنجامدا بەرەو ناوەڕاستی دەست کە چەند دارێکی نزیك لەیەکی لێبو، بەڕێکەوتین، ئەمانۆ و نیکی بێ ئەندازە هیلاك ببوون، بوڵە بوڵیان دەکردو دەیانناڵاند، کە گەشتین بێ ئەوەی هیچ بخۆن هەرکام خزانە سوچێك و خەوتن.

یوری کەشەوی پێشتریش نەخەوتبو، لەنیوەی شەو تابەیانی خەوت. دەنگی مرخەمرخی دەگەشتە ئاسمان.

بەو هەموو نارەحەتیەوە شەو بەسەر چوو، هەوا کەم کەم روون بوویەوە. بەهەمان شێوە کەهەوا روون دەبوویەوە. دەشتێك کەئێمەی تیابووین باشتر دەرکەوت و لەسکی تاریکی هاتە دەر.

کەمێك ئەولاتر کانیاوێکی دڵگیری لێبو. ئاو لەزەوی هەڵەقولاَ و لەحەوزێکی گەورەدا کۆدەبوویەوە و دواتر لەجۆگەیەکی بچووکدا بەرەو جەنگەڵ دەڕۆشت.

لەرووناکی بەرەبەیان، دیمەنی کانیاو و دار و گیاکان زیاد لەرادە دڵ ئەنگێز و دڵ بزوێن بو بڕیارمدا تا هەستانی ئەوان لای کانیاوەکە دانیشم بەڵام لەناکاو چاوم کەوتە سەر زەوی و لەسەر خاکی نمداری دەوروبەری کانی شوێن پێی ئاژەڵی جۆراوجۆر سەرنجیان راکێشام و خێرا تێگەشتم ئەویَ ئاو خۆری ئاژەڵە وەحشی و دڕندەکانە.

لەسەرخۆ، کەمێك خۆم کۆکردەوە، میلی تفەنگم هێنایەوە. بەیانی بو هەرسات ئەگەری ئەوە هەبو ئاژەڵەکان بۆ خواردنەوەی ئاو بێنە کانیاوەکە.

نزیکەی نیو کاتژمێر تێپەڕی. عەقڵم کاری نەدەکرد لەناکاو دەنگی سمی ئەسپم بیست. وەك جەرەقە راچەنیم و ئاوڕم دایەوە. بەیەك نیگا هەموو شتێکم بۆ دەرکەوت و لای خۆم کێشەکەشم چارەسەر کرد.

گایەلێك گامێشی وەحشی بەخێرایی بەرەو لای ئاوخۆرەکە دەهاتن. ئەگەر رام بکردایە بارودۆخ مەترسیدارتر دەبو چونکە گایەل بەدوامدا دەهات و لەژێر دەست و پێیاندا ورد دەبووم ئەگەر دەمامەوە بەیەك شاخیان دەکوژرام. چی بکەم.

دەنگی سمی گایەلی گامێشەکە یوری هەستاند. ئەوانیش لەسەر رێگای گایەلەکەدا بوون. یوری نیکی و ئەمانۆشی خەبەر کردەوەو ئەوان خۆیان خستە پشت دارەکەو لەسەر رێگای گایەلەکە نەمان. من هیچ چارەیەکم نەبو. شتێك کە زۆر سەرنج راکێش دەهاتە بەرچاو ئەوەبو بۆ گامێشەکان بەخێرایی بەرەولای ئاو خۆرەکە دێن؟ بۆ رادەکەن.

ناچار لەسەر ئەژنۆ دانیشتم و سیلاحەکەم خستە سەر دەست. لەم کاتەدا یەکەم گامێش گەشتبووە دە هەنگاوی من کەپەنجەم لەسەر پەلەپتکە داناو فشارمدا. رەگبارێك دوو گامێشی خست و گایەلەکەی لە من دوور کردەوە. گامێشەکان رێگەی خۆیان خوارکردو رۆشتن بەڵام یوری دەیقیژاند و دەیوت:

تەقە مەکە..... تەقە مەکە.

تێنەگەشتم مەبەستی چیە بۆیە بیَ گوێدان سەیری گامێشەکانم دەکرد. گامێشەکان لەمن دوور کەوتنەوەو لەدەشتەکە تێپەڕین و بیَ ئەوەی لەهیچ خاڵێکدا درەنگ بکەن رۆشتنە ناو جەنگەڵ لەبەرچاو نەمان.

بەشادمانی لەشوێنەکەم هەستام و، یوریش گەشت و هەردووکمان بەقەمە سەری گامێشەکانمان بڕی. ماوەیەکی زۆر بو کەگۆشت بەتایبەت گۆشتی چوار پێمان

نەخواردبو چونکە گۆشتما تەنیا گۆشتی مەڵ و باڵندەکان بو. کاتێك لەگۆشتی گامێشەکان ئاسوودە بووین لەیوریم پرسی:

بۆ وتت تەقە مەکە؟

یوری لەکاتێکدا دەستەکانی پاك دەکردەوە وتی:

بەزۆری لەو شوێنانەی گامێشی لێیە، هۆزە وەحشیەکانی جەنگەڵ نشین بۆ راوکردنی گامێش بەرەبەیان دەردەچن. شێوەی راوی ئەوان بەجۆرێکە کە سەرەتا گایەلی گامێش گەمارۆ دەدەن و دواتر هێرشیان دەکەنە سەر. وتم تەقە مەکە نەکا دەنگی گوولە بەگوێی وەحشیەکان بگات. بینیت گامێشەکان لەکاتی راکردن گەشتنە دەشتەکە. دڵنیام ئێستا سەروکەلەی وەحشیەکان دەردەکەوێت.

یوری راستی دەوت بەلاّم من بەقسەکانی پێکەنیم و باوەڕم پێ نەکرد. ئەو هەمیشە راستی دەوت و ئەمە جاری یەکەمی نەبو کەبێ ئەزموونی خۆم نیشاندەدا و بەپێچەوانەی عەقڵ کارم دەکرد، بەدرێژایی ئەو سەفەرە دوورو درێژە هەزار جار رویدابو کەمن کارێکم دەکرد و کارەساتی لێدەکەوتەوە مەترسی گەورە دروست دەبو یوری دووبارە چاو نەترسی شیاوی دەستخۆشی کردن منی لەمردن رزگار دەکرد.

بەهەرحاڵ کار لەکار ترازابوو رێگەیەك بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەم هەڵە ئەنجامدراوە نەبو. ئەمانۆ و نیکی لەحەشارگەی خۆیان هاتنە دەر و پەیوەستمان بوون. من و یوری بەخێرایی پێستی گامێشمان لێکردەوەو بەتیغی تیژی خەنجەر بەشێك لە باشترین بەشەکانی جەستەی گامێشمان بڕی و بۆ کەباب ئامادەمان کرد.

نیکی و ئەمانۆ ئاگریان داگیرساند، داریان هێناو گۆشتیان دالە دارو خستیانە سەر ئاگر، برژاندیان. من و یوری لای کانیاومان بۆ بەسەربردنی یەك دوو کاتژمێری نان خواردن هەڵبژارد ئەمانۆ و نیکی لەگەڵ ئەوەی لەجەنگەڵ و لای گامێشەکان دەژیان هێشتا گۆشتی ئەو ئاژەڵەیان نەخواردبو تام و چێژیان نەدەزانی. لەئەمانۆ لەمبارەوە روونکردنەوەم ویست و پرسیم چۆنە تا ئێستا گۆشتی ئەم ئاژەڵەتا بەکار نەهێناوە؟ لەکاتێکدا لەبەرکەمی گۆشت ورچ و راودەکەن.

لەجیاتی ئەمانۆ یوری وەلاّمی دایەوە وتی:

دەزانی بۆ؟ لەهۆزی ئەمازۆن راو کاری و کاری لەم شێوە لەئەستۆی ژنانە و پیاوانێك کەئامازۆنین ئەوەندە کەم و ئازیزن کەژنان دڵیان نایەت ئەوان بۆ راوی مەترسیداری گامێش ببەن. ژنەکانیش توانای ئەم کارەیان نیە. لەبەرئەمە راوی گامێش بۆیان بۆتە

ئارەزوویەك.

کاتێك یوری قسەی دەکرد کەبابمان دەخوارد و داخمان دەخوارد کەناتوانین گامێشەکان لەگەڵ خۆمان ببەین. گەرمای هەوا دەبووە هۆی بۆگەن بوونی گۆشت و گریمان ئەگەر توانای هەڵگرتنی گامێشێکی سێ سەد کیلۆییمان هەبوایە، بەکارهێنانی دووبارەی ئەگەری نەبو.

دوای خواردن لەئاوی کانیەکە تینویەتیمان شکاند، نیکی لەم دەرفەتە کەڵکی وەرگرت و ئارام ئارام وەك ماسی خزایە ناو ئاوەکە. ئەمانۆ تارادەیەك باشترو ئەخلاقیاتی لەبەر چاو دەگرت.

یوری سەری سووڕاندو وتی:

لەم دەوروبەرەدا میوە نیە؟ ئەگەر کەمێك میوەمان دەخوارد گۆشتی گامێشمان زوتر هەرس دەکرد.

ئەو بەم بیانووە لەوێ دوورکەوتەوە کە ئەگەر ئەمانۆش ئارەزوومەندە بڕواتە ناو ئاوەکە، ئەمانۆش پەڕیە ناو ئاوەکە. هەردوکیان وەك ماسی لەئاودا دەتلان و مەلەیان دەکرد، هەلبەزو دابەزیان دەکردو هەندێ کات مشتێك ئاویان دەکرد بەسەرو چاوی مندا.

منیش حەزم دەکرد مەلە بکەم بەڵام هێشتا بڕیارم نەگرتبوو قۆپچەی کراسەکەم نەکردبوویەوە کە لەناکاو دەنگە دەنگ بەگوێم گەشت و سەرنجم بۆ شوێنێك کەیوری وەستابو و سەیری جەنگەڵی دەکرد راکێشرا.

بەترس و ناڕەحەتیەوە ئاوڕم دایەوە ولەگەڵ ئەوەی سەیری دواوەم کرد لەشوێنەکەمدا وشك بووم.

دەستەیەی سێ سەد یان چوار سەد کەسی وەحشیەکان بەرەو لای ئێمە دەهاتن.... رمە درێژەکانی خۆیان تەکان دەدا قسەیان دەکرد کە لەدوورەوە دەنگیان دەبیسترا بەڵام نەشیاو بۆ تێگەشتن بو.

دووری ئەوان لە ئێمە زۆر بو هێشتا لەکانیاوەکەوە دوور بوون.... وام دەزانی رەنگە من و ئەمانۆ و نیکیان نەبینیووە تەنیا سەرنجیان بۆلای یوری راکێشراوە و بۆ کوشتنی ئەو دێن. بەڵام ئەم گوومانە هەڵە لەئاو دەرهات چونکە کاتێك لەکانیەکە نزیك بوونەوە. بوون بەچەند دەستەیەکی وەك یەك و لە دەوروبەری کانی و دارەکانیان گەمارۆ دا.

نیکی و ئەمانۆ بەخێرایی لەئاو هاتنەدەر و جلیان لەبەرکرد. منیش بەڕاکردن

ڕۆشتمە لای سیلاحەکەم و ئامادەی بەرگری کردن بووم.

یوری پشتاو پشت دەڕۆشت تا ئەوەی خۆی بەئێمە گەیاند و کاتێك گەشتە لای من بەسەر کۆنەکردن و تووڕەیی وتی:

دەبینی چیت کرد.... چاوەڕێی ئاوا ڕووداوێك بووم. ئێستا لەجیاتی چێژێك لەخواردنی گۆشتی گامێش بردمان بەدەست ئەم وەحشیە بێ بەزییانە دەکوژرێین.

نەمدەزانی چی وەڵام بدەمەوە ! تاوانبار بووم و قورسایی گوناحەکەم لەسەر شانی خۆم هەست پێدەکرد. یوری ڕاستی دەکرد چونکە بەڕاستی حەیف بوو دوای شەش ساڵ شەڕ لەکێشەکان بەهۆی نائاگاییەوە بکوژرێین.

بۆئەوەی ورەم بەخۆم دابێت وتم:

هەرچی دەبێت با ببێت.... هیوادار بە........... خوا لەگەڵمانە.

یوری سەر خۆی تەکان داو هیچی نەوت و من لەدرێژی رستەی پێشووی خۆمدا وتم:

ئەگەر بتوانین خۆمان بگەیەنینە جەنگەڵ، ڕاکردنمان ئاسان دەبێت. هەردووك بەڕەشاش هێرش دەکەینە سەر لایەك و بەتەقە ڕێگا دەکەینەوە... ئەگەر قاچمان بگاتە جەنگەڵ ئەوان ناتوانن دەستگیرمان بکەن.

یوری دەرفەتی قسەکردن و بۆڵە بۆڵی نەبوو بەڵام بۆنەوەی ئەم گوومانە پووچەی من بێ وەڵام نەهێڵێتەوە بەتووڕەیی وتی:

چ بیرۆکەیەك ! ئەوان ماڵی خۆیان نازانن بەڵام ئێمە بێگانەین هەموو ڕێگاکان شارەزاین ! گریمان گەشتینە جەنگەڵ دووبارە گرفتار دەبین چونکە ئەوان پێچ و پەنای ماڵی خۆیان باشتر لەئێمە دەناسن.....

قسەکانی بەهاواری ترس ئەنگێزی وەحشیەکان پچڕاو یوری بێدەنگ بو بەڵام لەچاوەکانی ئاگری تووڕەیی و رق بڵێسەی دەسەند..... لەچاوەکانی یوری دەترسام..... لەسەر ئەزموونێك کە هەمبوو هەرکاتێك چاوەکانی ئەم حاڵەی بەخۆی دەگرت، خوێنی ژمارەیەك دەڕژا. یوری بوونەوەرێکی سەیر بو لەدژوارترین بارودۆخ بە یارو هاوکارم دەژمێردرا.

نیکی و ئەمانۆ دوای لەبەرکردنی جل پەیوەستمان بوون. یوری لەم چەند چرکەدا ڕێگەی چارەی دۆزیەوەو دەتوت بەهەموو نابەجێی پێشنیارەکەی منی لەوبارودۆخەدا بەعاقڵانە نەزانی چونکە ئاوڕی دایەوەو بەئێمە سێ کەسی وت:

بارەکان هەڵبگرن...... بۆ ڕۆشتن ئامادە بن.... بارەکەی منیش بێنن.

لەیوریم پرسی: دەتەوێت چی بكەیت؟

وتی: دەتوانین چی بكەین؟ ئایا دەتوانین تەسلیم بین..... نا....... كەواتە ناچار تا دوایین دڵۆپ خوێن بەرگری دەكەین. لەلایەكیتر سیلاحەكانمان كوشندەن و زۆر خێرا دەیانكوژین و رێگا دەكەینەوە. ئاگادار بن لەگەڵ ئەوەی من رامكرد ئێوەش بەدواما لەهەمان رێگاوە بێن.

دەستوورەكانی یوری جێ بەجێ كرا و بارەكان كرا بەچوار بەش و هەركاممان بەشێكمان بەپێی توانای خۆمان هەڵگرت. بارەكەی یوریشم خستە بەر قاچی، قایشی بارەكەی گرت و خستیە سەرشانی و سەیرێكی دەوروبەری كردو وتی:

لەو شوێنەوە كەهاتووین دەبێت بڕۆین.... تێدەگەن.

لای یوری جێگیر بووم و ڕەشاش ئامادەی تەقەكردنم خستە سەردەست. هاواری وەحشیەكان گوێی كەڕ دەكرد. سات بەسا نزیكتر دەبوونەوە و بەڕمەكانیان ئێمەیان بۆشەڕ بانگێشت دەكرد. ئێستا ئەوەندە نزیك ببوونەوە كە گلێنەی چاوی ئەوانم دەبینی و ئەگەر رمەكانیان دەهاویشت لە چاو تروكانێكدا سەدان كوون لەجەستەمان دروست دەبو.

ئەوان ئەگەر دەیانزانی ڕەشاشەكانمان چەندە توانای هەیە. هیچ كات ئەوەندە نزیك نەدەكەوتنەوە و بەچاو نەترسیەوە نەدەهاتنە پێش. گوومانیان دەكرد ئێمەش رم و خەنجەرمان پێیە و یان توانای بەرگری كردنمان نیە.

سەرۆكی ئەوان سی هەنگاوی ئێمە وەستا، دەستی بەرزكردەوەو هەموومان وەستاین. ژمارەیەك دەوریان گرتبوو وكەسێك چەترێكی لەلق و گەڵای دارخورما لەسەر سەر گرتبوو سێبەری بۆ دروست كردبو.

سەرۆكی هۆز بەدەنگی بەرز پرسی:

ئێوە كێن و لێرە چی دەكەن؟

وتەكان بۆ ئێمە كەئاشنای زمانە ناوچەییەكان ببووین شیاوی تێگەشتن بو. ریشەی هەموو زمانەكانی جەنگەڵی باران یەكێك بوو جیاوازی كەمیان لەگەڵ یەكدا بو و جگە لەچەند هۆز كەپێشتر ئاماژەی پێدرا ئەوانیتر بەگشتی بەیەك زمان قسەیان دەكرد.

ئەمانۆ كە قسەكانی ئەوی بیست خۆی بەمنەوە نووساندو وتی:

ئێستا ئەوانم ناسیەوە..... ئەو سەرۆكی هۆزی ((شامبرا)) یە بە جۆرێك كە دەڵێن لە ژوورەكەی خۆیدا زیاتر لەسەد سەری پەڕاوی هەڵواسیوە. ئەو لەبێ ڕەحمی و دڵ ڕەقیدا

بەناوبانگە و زیاتر لە دوو هەزار پیاوی شەڕکەری لەبەردەستدایە. گوومان ناکەم لەشەڕکردن لەگەڵ ئەو گیان دەرببەین....

بزەیەکم لێداو وەڵامم نەدایەوە. یوری وەڵامی سەرۆکی دایەوە:

سڵاوی من بۆ سەرۆکی هۆزی شامبرا ! ئێمە هاوڕێی هۆزی ئێوەین و بۆ راو هاتوینەتە ئێرە و ئەمڕۆ لێرە دوور دەکەوینەوە...

سەرۆکی هۆز بەپەنجە گامێشەکانی نیشانداو وتی:

بۆ ئەم ئاژەڵە پیرۆزانەتان کوشتووە و گۆشتەکەیتان خواردوە.... گوناحەکەتان ئەوەندە گەورەیە کە جگە لەخوێن بەهیچ شتێکی تر پاك نابێتەوە.

یوری وتی:

ئێمە ئەوانمان نەکوشت. ئەوان شاخیان لەداردەستە ئاگرینەکەی ئێمەداو داردەستەکانی ئێمەش ئەوانی کوشت.... داردەستی ئاگرین.

قسەکانی یوری بەڕاستی پێکەنیناوی بو و ئەگەر لەبارودۆخێکی تر ئەم قسانەی دەکرد لە پێکەنیندا ریخۆڵەکانم دەپچڕا. ئەمانۆ و نیکی لەگەڵ ئەمەشدا نەیاندەتوانی رێگرین لەپێکەنینی خۆیان. بەڵام زەختم لەخۆم کردو بێدەنگ بووم. سەرۆکی هۆز پرسیاری کرد:

چۆن داردەستە ئاگرینەکانی ئێوە گامێشە پیرۆزەکانی کوشتووە؟

یوری وتی:

داردەستەکانی ئێمە لەرێگای دوورەوە کەسەکان دەکوژێت. بوەستە. ئێستا پێیان دەڵێم چەترەکەی سەرت ورد بکەن.

یوری ئەمەی وت و تەقەی لەچەترکە کرد. چوار پێنج گوولەی یەك لەدوای یەك چەتری سەرۆکی وردکردو بەدەوروبەریدا پرژاندی. کەسێك کە چەترەکەی گرتبو، قیژاندی و لەوێ دوور کەوتەوەو رۆشت.

ئەوانیتریش سەرسوڕماو ترساو سەیری چەترە دار حەسیریەکەیان دەکرد و نەیاندەزانی چۆن لەرێگەی دوورەوە چەترەکەی سەرۆك وردکرا.

یوری لەم دەرفەتە کەڵکی وەرگرت و وتی:

داردەستەکانی ئێمە زۆر تووڕەن ئەگەر ئێوەش بێنە پێش دەکوژرێن....

ڕەشێکی قەڵەوی کورتە باڵای ناحەز لای سەرۆك وەستابو. ئەو بەتووندی هەندێ قسەی کرد و رمەکەی بۆ یوری هاویشت بەشێوەیەك ئەگەر یوری خۆی نەکێشایەتە

دواوە، سینەی کوون دەکردو دەکوژرا.

یوریش پەنجەی لەسەر پەلەپتکەی ڕەشاشەکە فشارداو سینەو سکی ڕەشەکەی کوون کوون کرد. ئەو وەك گامێش لەشوێنەکی بەرزبوویەوە و کەوت و دواتر چەند هاوارێکی جەرگ بڕی کردو گیانیدا. گۆلاوێك لەخوێن لەبەردەم قاچی سەرۆکی هۆزدا دروست بو، لەکاتێکدا لەمەرگی براکەی تووڕەبو نەیدەوێرا تەکان بخوات. چەند خولەکێك بەبێدەنگی تێپەڕی و سەرئەنجام سەرۆکی هۆز قیژاندی و وتی:

بەدبەخت براکەی منت کوشت...... سزای تۆ مەرگە.... مەرگ.

ئەمەی وت و لەگەڵ ئەوەی دەیزانی دەکوژرێت فەرمانی هێرشی دەکرد. یوریش دەست بەجێ تەقەی کرد. من لەلایەك و یوری لەلایەکیتر پشتمان بەپشتی یەکەوەداو هێرشی وەحشیەکانمان بەرپەرچ دایەوە.

لەچاو تروکانێکدا ژمارەیەکی زۆر رم بۆمان هاوێژرا. بەخۆشحاڵیەوە نیکی و ئەمانۆ خۆیان لەنێوان دوو داری نزیك لەیەك داشارد و لەزیان دوورکەتنەوە. من و یوری هەرسات جێگەی خۆمان دەگۆڕی وەك جالْجالۆکە لەم لاو لا بۆ ئەولا دەپەڕین و سەرو سك و سینەمان بۆ چەپ و راست خوار دەکردەوە. بەهیچ جۆرێك هیچ کام لەرمەکان بەرمان نەکەوت.

ژمارەیەکی زۆر لەوەحشیەکان کوژرابوون و لەخاك و خوێندا گەوزابوون ژمارەی کوژراوەکان زۆر بوو هەرساتێك کەتێپەڕ دەبو، پێیان زیاد دەکرا. سەرۆکی هۆزی شامبرا دەستووری پاشەکشەی دەرکرد بەڵام نەك وەك شکەست بەڵکو بۆ رێکخستنی تازەو هێرشی دووبارە....

هێرش بەخێرایی دەستی پێکرد. ئەم جارە بەتیروکەوان هێرشیان کردە سەرمان. لەماوەی پاشەکشێ و هێرشی دووەم هەڵوێستی بەرگریمان گرت و بەبڕێك بەردو گەڵا و قەدی دارێك کەبەهۆی تۆفان و بومەلەرزە کەوتبوون، پەناگەیەکی دڵنیامان دروست کردبو و پێشتر ئەمانۆ و نیکیمان لەپشتەوە داشاردبو.

بارودۆخێکی زۆر مەترسیدار هاتبوە پێش و دیارنەبو ئەنجامی کارەکەمان چی دەبێت. مەرگمان لەچاوی خۆمان دەدی بەڵام لەترسی ئێمە لەمردن نەبو بەڵکو ناڕەحەتیەکی ترمان هەبو ئەویش ئەوەبو کەدوای شەش ساڵ شەڕ لەگەڵ روداو دژواریەکان، کاتێك بەرەو دنیای ئازاد دەگەڕاینەو، دەبێت بکوژرێین.

ئەم هەستە ئازاری دەداین و جگە لەمە هیچ مەترسیەکی ترمان نەبو. ئەم جۆرە

ڕووداوانە ئاسایی ببوو کەم تا زۆر لەئەنجامی کۆتایی دڵنیاببووین.....

بەهەرحاڵ چارە نەبو.... تەقە دەستی پێکردو چەند کەس لەوەحشیەکان لەخوێندا گەوزان و ریزێك کە خۆیان گەیاندبوە لای سەنگەر بڵاوەیان لێکردو ئەوانەی زیندوو مابوون گەڕانەوە پەیوەستی ئەوانیتر بوون سەیر نەبوو لەژمارەیان کەم نەدەبوویەوە هەرکات زیاترمان دەکوشت ریزەکانیان چڕتردەبو وا دەهاتە بەرچاو کە ژمارەیان زیادی کردوە.

من و یوری هەمووی ئەو رۆژە لەسەنگەرەکەدا گەڕاین و لەچەپ و راست و سەرو خوار بەرپەرچی هێرشەکانمان دەدایەوە تا ئەوەی رۆژ تەواو بو هەوا روی لەتاریکی کرد.

وەحشیەکان بەئاوابوونی خۆر دەستیان لەهێرش هەڵگرت و وەك هەمیشە ئاگریان کردەوەو دەستیان بەسەماو شادی کرد.

یوری بەهەمان شێوە کەپشتی بەدارەکەوە دابو ڕەشاشەکەی لەدەستدا بو، سەیرێکی دەوروبەری کردو وتی:

هێرشەکان وەستان..... تا دەرفەت هەیە شتێك بۆ خواردن ئامادە بکەین. برسیمانە لەبەیانیەوە تا ئێستا هیچمان نەخواردوە.

ئەمانۆ هەستا. خەنجەرەکەی منی بردو بەرەو گامێشێك کەلای دارەکە کەوتبوو رۆشت. نیکیش بۆ کردنەوەی ئاگر دەستی بەکۆکردنەوەی دارو چیلکە کرد.

کانی و ئاوەکە دوورتر لەسەنگەرەکی ئێمە بو وزیاتر لەهەرشتێك تینویەتی گیانی دەکوتین....

قوڕگم وشك ببو سینەم دەکزایەوە دەتوت لەقەفەسەی سینەم ئاگریان کردۆتەوە و بڵێسەی سووتێنەری ئەو ئاگرە ئێسقانەکانمی گەرم کردوە و قووڕگ و دەم و زمانمی وشك کردوە.

خۆم گەیاندە یوری ولای ئەو دانشتم و وتم:

چ پلانێکت هەیە..... دەبێت چی بکەین؟

یوری چاوی لەولای سەنگەر هەڵنەدەگرت. هەرسات چاوەڕوانی هێرش بو بۆیە خولەکێك بێ ئاگایی بەڕەوا نەدەزانی، لەکاتێکدا لەگەڵ مندا قسەی دەکرد، چاوە تیژو نیگا وردبینینەکانی خۆی بەگەڕان و چالاکی ناچار دەکرد.

یوری بەپشتی دەست ئارەقی ناوچاوی سڕی و وتی:

ڕێگەچارەیەك دەدۆزینەوە.... ئێستا بۆ تێرکردنی سکمان کەبابی گۆشتی گامێشمان هەیە و.....

قسەکەی خۆی تەواو نەکرد.... دوای چەند چرکە وەستان لەژێر چاوەوە سەیری کردم و وتی:

بەڵام لەگەڵ تینویەتیا چی بکەین..... نزیکە بمرم. زمانم ئەوەندە وشك بووە وەك دار دەنگی لێوە دێت ئایا لەدەوروبەری کانیکە کەسی لێیە....

من کەلە بەیانی بەم لاوە ئاگام لەکانیاوەکە بو زانیاریم لەمبارەوە هەبو وتم:

چاوەڕێ بویت کانیاوەکە و گامێشەکان بۆ ئێمە دانێن.....؟ کانیەکەیان گەمارۆداوە و تاقمێك لەبەتواناترین شەڕکەرانی شامبرا لەو دەورەدان و چاودێری کانیەکە دەکەن.....

یوری ئاوی دەمی خۆی تف کردەوەو لێوەکانی بەقۆڵی کراسەکەی پاك کردەوەو وتی: ئەم وەحشیانە دەیانەوێت لەتینویەتیدا بمانکوژن. ئەگەر دوو ڕۆژیتر ئاومان پێنەگات دەمرین.

ئەوەندە تینو بووم کەوتم دوو ڕۆژ.....؟ ئەگەر زۆر بەتوانابم تا بەیانی دەتوانم بەرگەی تینویەتی بگرم ئاخ.... چ مەرگێکی دڵتەزێن !

دواتر سەرنجم بۆلای ئەمانۆو نیکی راکێشرا. ئەمانۆ سەرقاڵی دروست کردنی کەباب بو، نیکی لەتینوانا پاڵی بەدارێکەوە دابو، قاچەکانی درێژ کردبوو بەگەڵای دار خۆی باوەشێن دەکردو لەژێر لێوەوە قسەی دەکرد کە لەرێگەی دوورەوە حاڵی نەدەبووم.

لەم کاتەدا کەباب ئامادە بو. بۆنی دڵگیرو ئیشتیا بزوێنی بەرزبوویەوە. ئەمانۆ بەدەنگی بەرز وتی: وەرن....... وەرن بخۆن.

بۆئەوەی سەنگەرەکەمان خاڵی نەبێت وتی:

ئێوە سەنگەر خاڵی بکەن و من ونیکی چاودێریان دەکەین.

ئەوان لەپشت سەنگەرەکەدا جێگەیان گرت، من و یوری سەرقاڵی خواردنی کەباب بووین. برسیمان بو بەڵام تینویەتی ئیشتیامانی سووتاند بو وە پلەکانی گۆشتمان بەدەمی وشك قووت دەدا. دەنگی ئاوازی لە دوورو نزیك دەبیسترا. ئەم دەنگە ترسێنەرە تێکەلاو بەئاوازی یەکەنگی دەهۆڵەکان زیاتر ببووە هۆی ناڕەحەتی وگرژبوونی دەمارەکانی ئێمە.

دوای خواردنی گۆشتی گامێش، تینویەتیمان زیاتر بو و حاڵی یەك یەکمان

خراپتر....

هەوا ئەوەندە گەرم و بێزارکەر بو کەهەرگیز شەوێك بەوپلەی گەرمایەم بەبیردا نایەت.

یوری دەیوت: هەوا زۆر گەرم نیە، ئەوە تینویەتیە گەرمی جەستەمانی بەرزکردۆتەوە. دەبێت چارەیەك بدۆزینەوە و من بۆ هێنانی ئاو دەڕۆمە کانیاوەکە.

یوری ئەم بڕیارەی گرت و ئێمە سیانە دژایەتیمان کرد و لەڕۆشتن بۆ کانیەکە رێگریمان لێکرد. هەرچی زیاتر پێماندادەگرت ئەو زیاتر سوور بو تائەوەی لەبڕیارەکەی پاشگەزبوویەوەو لەپشت سەنگەر جێگەی گرت.

ئەگەر یوری بۆهێنانی ئاو دەڕۆشتە کانیاوەکە، بەدڵنیایەوە دەکوژرا. ئەو بەتەنیایی نەیدەتوانی لەگەڵ ئەو چەند پاسەوانە وەحشی و توورە و خوێنخۆرەدا شەڕبکات.

دەنگی وەحشیەکان هێشتا بەگوێ دەگەشت. دەوروبەری ئێمە بەتاریکی چڕ داپۆشرابو. بەڵام لەناو ئەم تاریکیەدا چەندین خاڵی رۆشن ونوورانی بو کەهەندێ کات بەهۆی تێپەڕبوونی شەرکەران و جێگۆڕکێ ئەوان لەچاو ون دەبو دووبارە دەردەکەوتەوە. ئەم خاڵە نوورانیانە ئەو ئاگرانە بوون کە وەحشیەکان هەڵیانکردبو بەدەوریدا سەمایان دەکرد.

دەنگی وەحشیەکان لەدوورەوە دەبیسترا و لەمێشکمدا دەرزنگایەوە. دەتوت بەپیکێکی ئاسن ئێسقانەکانی سەرم دەکوتن و چەند کەسێك بەمشت لەقەفەسەی سینەم دەدەن.....

حاڵەتێکی سەیرو بێ وێنە بو. هیچ کات تا ئەوساتە خۆم لەمردن بەنزیك نەبینیوە چەندین جار بریندار ببوم بەهۆی خوێن بەربوون و لاوازی گشتی جەستەم کەوتبوومە حاڵەتی مردن بەڵام ئەم جارە ساغ، لە تینوانا نزیك بو بمرم. قیافەی ترس ئەنگێزی مەرگم لەبەرچاوی خۆمدا دەدی.

دڵنیا نەبووم ئەگەر بارودۆخ بەم شێوە تابەیانی درێژە بکێشێت، دەمرم... ئیتر لەبیری کەسدا نەبووم.... نیکی و ئەمانۆشم لەبیرکردبو..... ئەو دووانە لەسوچێکدا کەوتبوون و لەتینویەتی زۆر سکیان لەسەر خۆڵی نمداری ژێر دارەکان دانابو و دەیانناڵاند.

پێشتر نەمزانی چی بو چی گوزەرا. چەند جارێك بەرچاوم ڕەش بو و هەرچی هەوڵمدا خۆم وشیارو بەئاگا رابگرم، نەکرا و کەم کەم لەحاڵ و هۆش چووم.

بەخۆشحاڵیەوە وەحشیەکان لەشەودا هێرشیان نەکردو تا بەرەبەیان ئاسایشێکی ڕێژەییمان هەبو.... نازانم چ ماوەیەک تێپەڕی.

چەند خولەک یان چەند کاتژمێر تێپەڕی لەناکاو هەستم کرد کەسێک شانم تەکان دەدات و بەدەنگێکی لاواز و کز دەڵێت:

هەستە..... هەستە........ چاوەکانت وەکە.

شڵەژاو ترساو هەستام و نیکی و ئەمانۆ لەم لاولای خۆمدا بینی، نیکی هەرئەوەندەی سپیەتی چاوەکانی منی بینی بە پەنجە چەناگەی گرتم، روخسارمی بۆ لای خۆی سووڕاند و وتی:

سەیری من بکە...... دەنگی خشە خش دەبیسترێت. دەڵێی کەسێک یان چەند کەسێک لەسەنگەر نزیک دەبنەوە، هەستە...

ڕەنگە ئەگەر شتێکی تریان دەوت لەشوێنەکەی خۆمدا بێ گوێدان دەمامەوە بەڵام بەبیستنی ئەم هەواڵە لەشوێنەکەم هەستام ڕەشاشەکەم خستە سەر دەست و پرسیم:

ئەی یوری لەکوێیە؟

یوری دەنگی منی بیست و خۆی وەڵامی ئەم پرسیارەی دایەوە:

من لێرەم.... ناتوانم بجووڵێمەوە.

وەحشیەکان خۆیان بۆهێرش ئامادەکردوە.

جم و جووڵیان هەیە و دەڵێی دەیانەوێت پێش بەرەبەیان بمانکوژن.

ئەمانۆ بەترسەوە قۆڵی گرتم و وتی:

بیستت؟ دەبیستی......؟

دەنگی خشە خش بەجوانی دەبیسترا.... گوێ بگرە... لێرەوە جوان وورد ببەرەوە.

من بەرەو لایەک کە ئەمانۆ بەپەنجە نیشانی دام ڕۆشتم و خۆم لەپشت دارێک داشارد و بۆئەوەی دەنگەکە ببیستم هەناسەم لەسینەمدا زیندانی کرد.

ئەو راستی دەوت دوای یەک دوو چرکە کە بە بێدەنگی تێپەڕی، دەنگ خشە خش بیسترا. دەتوت کەسێک خۆی لەسەر گیا وشکەکان دەکێشێت و لەتاریکی شەو بەدژواری دێتە پێش.

ئیتر درەنگ کردنم بە ڕەوا نەزانی.

گوومانم نەدەکردەوە ڕەنگە ئاژەڵێک لەوکاتەی شەو بەتەمای خواردنی لاشەی گامێش بەرەو لای ئێمە بێت دڵنیابووم کەوەحەشیەکان بۆ کوشتنی ئێمە دێن.

ڕەشاشەکەم ئامادەکرد، پەنجەم لەسەر پەلەپتکەکە داناو ئامادە وەستام. زەختم لەچاوەکانی خۆم کردو کە لەتاریکی شەو بتوانم دەوربەر ببینم، هیچ شتێك بەرچاو نەکەوت و هیچ سێبەرێك نەدەبینرا. دەنگی خشە خش بەگوێ دەگەشت و سەیربو کەسات سات نزیکتر دەبوویەوە. یەك دوو خولەك بەم شێوە تێپەڕی. من ئامادە بووم، لەگەڵ ئەوەی کەسێك یاسێبەرەکەیم دەدی، تەقەم لێدەکرد.

لەناو دەنگێکی ئاشنا بەگوێم دەگەشت کە دەیووت:

یوری..... یوری...... تەقەمەکەن منم.

سەیرە...... لەم کاتەی شەو، لەو شوێنە مەترسیدارە.... ئەمە کێیە یوری بەناو بانگ دەکات دەنگە کە ئاشنا بو بەڵام نەمدەتوانی بزانم خاوەنی دەنگە کە کێیە. نیکی و ئەمانۆ لەم لاولام وەستا بوون و وەك دوو بەچکە پشیلەی شەیتان کەچاوەڕێی هاتنەدەری مشك لەکوونی دیوار بن، بەچاوە درەوشاوەکانی خۆیان، سەیری قووڵایی تاریکیان دەکرد و هەناسکە هەناسکیان بو.

ئەمانۆ دەستی منی گرت و وتی:

هەڵنەخەڵەتێیت. ئەگەر بینیت تەقەی لێبکە.

گوێم لەقسەکانی ئەمانۆ کە لە ترسا دەلەرزی نەگرت و لەجیاتی تەقەکردن بەهێواشی پرسیم:

کێیت..... ناوت بڵێ...... لەکوێوە دێیت.

دەنگە کە لەناو تاریکی و لەناو گیاکانەوە دەبیسترا کەدەیووت:

تەقەنەکەن. شوومام.

چاوەکانم دەبریسکایەوە. نیکی لەشادیدا قیژاندی و دەستەکانی لەیەك داو چەند جارێك بەدەوری خۆیدا سووڕا. ئەمانۆش وەك منداڵێك کە بووکەڵەیەکی جوانی دیبێت، هەڵبەزودابەزی دەکرد.

کەمێك لەسەر دارەکە چەمامەوە و وتم:

شووما....... وەرە........ دەی بۆ وەستاویت.

شووما وتی: سەرۆك، بارم قورسە.

ئێستا دەنگەکە بەتەواوی نزیك ببوویەوە. نیکی ڕۆشتە پێش و پرسی:

چیت پێیە؟

وەڵامی شووما زۆر دڵگیر بو. کەمێك وەستاو وتی:

مەشکەیەك ئاوم پێیە. وەرن یارمەتیم بدەن. بەدژواری خۆم گەیاندۆتە ئێرە.وەرن. ئیتر نەمزانی چی بکەم، بەڕاستی ئەگەر بۆ کوشتنی ئێمە پلانیان دانابو، باش سەردەکەوتن چونکە بێ ترس لەسەنگەرکە رۆشتمە دەرو بەرەو دەنگەکە رۆشتم.

شووما بەبالاّ کورتی خۆی، چاوە درەوشاوەکانی و روخساری شیرینی خۆی لەناو گیاکاندا دانشتبوو مەشکە ئاوەکەی لەسەر ئەژنۆکانی دانابو.

ئەوەندە هیلاك بوو نەیدەتوانی بەڕێگادا بڕوات. کاتێك بینیم و چاوم بەئاوەکە کەوت بێ ئیرادە چەمامەوەو چەندین جار روخساری ڕەش و لچە ئەستوورەکانی شوومام ماچ کردو سەریم نا بەسینەمەوە.

ئەو منالّە جارێکیتر بەگیانبازی خۆی ئێمەی لەمردن رزگارکرد. نەمدەزانی چۆن سوپاسی بکەم. من تەنیا یەك جار گیانی ئەوم رزگار کردبو بەلاّم ئەو چەند جارێك خزمەتی گەورەی بەمن کردبوو لە راستیدا منی قەرزاری خۆی کردبو.

ئەمانۆو نیکی بەگوومانی ئەوەی کوژرام کەوتنە هەوڵدان و دەیانویست لەسەنگەرەکە بێنەدەر. لەم کاتەدا من سەرم بەرزکردەوەو ئەوان چونکە سێبەری منیان لەناو تاریکیدا ناسیەوە، ئارام بوون بەلاّم هێشتا نەیاندەزانی من چ گەوهەرێکی گرانبابیم پێیە.

لێوەکانی نیکی وەك دار وشك ببوو، ئەمانۆش باشتر لەو نەبوو بەلاّم خۆراگر بوون تا ئەو شوێنەی دەکرا لەگلەیی کردن خۆیان بەدوور دەگرت کە نەکا ببنە هۆی ناڕەحەتی ئێمە.

بەهەرحاڵ شووما دوای ئەوەی ئاوەکەی دا بەدەست من، هەناسەیەکی بەئاسوودە هەڵکێشا هەستاو وتی: خێراکە، ئاو بەرە بۆ ئەوانیش و بۆ بەرگری کردن ئامادەبن.

شامبراکان سەرقاڵی ئامادەکاری بۆ هێرشن و تا یەك دوو کاتژمێری تر قورسترین هێرشەکانی خۆیان دەست پێدەکەن.

ئەمەی وت و زووتر لەمن بەرەو سەنگەرەکان رۆشت.

لەگەڵ ئەوەی نیکی و ئەمانۆ ئەویان لەبەرانبەر خۆیان بینی، سەریان سوڕما، دەتوت لەبینینی ئەو ترساون و بوونی ئەویان بەترسی خۆیان دەزانی.

ئەم حالّەتە یەك دوو چرکە زیاتری نەخایاند و دەست بەجێ نیکی رۆشتە پێش و قۆڵی شوومای گرت و وتی: چیت هێناوە کە دەتوت بارەکەت قورسە؟

من لەرێگادا بووم بەلاّم دەنگی وتووێژی ئەوانم بەجوانی دەبیست.

مەشکە ئاوەکە قورس بوو سەرم سوڕمابو کە شووما چۆن ئەوبارە قورسەی هەڵگرتوە کە من نەمدەتوانی

شووما پرسی:

ئێستا زیاتر لەهەرشتێك پێویستیتان بەچیە؟

ئەمانۆ ئاخێکی هەڵکێشاو وتی:

ئاو، ئاو.... گیانم گری گرتووە.... دەڵێی لەناو سینەمدا ئاگریان کردۆتەوە.

نیکی بەبیستنی ناوی ئاو ئیتر نەیتوانی بوەستێت. پاڵی بەدارەکەوەداو چاوەکانی بەست.

شووما وتی:

من بۆ ئێوە ئاوێکی فێنکم هێناوە کە وەك ئەو لەچاوگەکانی باکوری پەرستگاش دەستان ناکەوێت.

نیکی رایکردە پێش و وتی:

ئاو، ئاوت هێناوە؟ چیت وت؟

شووما بۆ وەڵامدانەوەی دەرفەتی پێویستی نەبو چونکە سەروکەلەی من بەمەشکەی ئاوەکەوە دەرکەوت. خۆیان لێ نزیك کردەوە و بەزمان دەیان لێسایەوە تاکەمێك فێنك ببنەوە.

یوریش ئاگادار بوو لەولای سەنگەر پەیوەستمان بو.

ئەو لەبینینی شووما سەری سوڕنەما بەڵام کەئاوەکەی بینی، چاوەکانی بڕیەمن و وتی:

ئاو..... ئاوت لەکوێ هێنا؟ بەڕاستی سەیرە..... من لەبەدەست هێنانی ئاو بەتەواوی هیوا بڕواو ببوم.

وەڵامی یوریم نەدایەوە.... شووما پەڕیە ناو قسەو وتی:

ئێستا کاتی ئەم قسانە نیە سەرۆك. دواتر هەموو شتێکتان بۆ دەگێڕمەوە. ئێستا کەمێك ئاو بخۆنەوەو ئامادەی بەرگری کردن بن.

سەری مەشکەکەم کردەوە. سەرەتا نیکی رایکردە پێش، دوو دەستی گرتەوە و چەند قومێك ئاوەی خواردەوە. دەواتر ئەمانۆ و سەرئەنجام من و یوریش تینویەتیمان شکاند.

ئاه...... چ چێژێکمان برد. ئەو ئاوە چەندە خۆش و فێنك بو.. تەنیا کەسێك

دەتوانێت بەخۆشحاڵی ئێمە بزانێت کە دوای چەند رۆژ تینویەتی بەئاو گەشتبێت. بێ زێدەڕۆیی نیوەی مەشکەی ئاوەکە یوری خواردیەوە. دوای ئەوە بەئاسوودەیی هەناسەیەکی هەڵکێشاو پاڵی بەدارەکەوەدا قاچەکانی درێژکردو ڕەشاشەکەی خستە سەرسینە.

لەکاتێکدا چاوەکانی نیوەکراوە بوو، ڕوویکردە شووما و وتی:

تۆ لەکوێ بویت. چۆن زانیت ئێمە تینووین.

شووما وتی:

من لەهۆز بووم شائکی و تاقمێك لەپیاوان بەدواتانا هاتن.

یوری پرسی:

ئێمەیان نەدۆزیەوەو گەڕانەوە. دەیانویست بمانکوژن. ئێمە خۆ خراپەمان لەگەڵدا نەکردوون.

شووما بەسەرسوڕمانەوە وتی:

کێ بەئێوەی وت شائکی دەیەوێت بتانکوژێت. ئەو هاوڕێی ئێوەیە، ئەو مەبەستی ئەوەبو کە لەشوێنە مەترسیدارەکان بێ ڕوبەڕو بوونەوە لەگەڵ هۆزە وەحشیەکان تێپەڕن. دوێنێکە گەڕایەوە بۆهۆز و وتی کە ئێوەی لەکاتی خەودا لە قامیشەڵان بینیوە. شائکی کاتێك دڵنیابوو لەمەترسیە سەرەتاییەکان تێپەڕبوون بەئاسوودەیی گەڕایەوە بۆ هۆز.

یوری لەناکاو لەشوێنەکەی بەرزبوویەوە. چاوەکانی کرایەوە. منیش لەسەرسوڕماندا نزیك بوو شێت ببم. نیشانەکەی ڕاست بو. ئێمە لەقامیشەڵان خەوتبووین و ئەوان ئێمەیان بینیوە. کەواتە شائکی مەبەستی کوشتنی ئێمەی نەبووە و نیەتی !

شووما بێ گوێدان بەسەرسوڕمانی ئێمە درێژەی دا لەگەڵ ئاگادار بوونی ڕێگاکەتان.... بەڕێکەوتم و بەتەنیایی خۆم گەیاندە ئێرە... ئەمڕۆ بەیانی گەشتمە ئەم شوێنە شەڕێکی قورس دەستی پێکردبو من بەهیچ شێوەیەك نەمدتوانی نزیك ببمەوە. یەکەم شت هەستم پێکرد ئەوەبو کەزانیم ئێوە تینوون و وەحشیەکان ڕێگەی ئاویان لەسەر داخستوون. دەست بەکار بووم. مەشکەیەکی خاڵیم لێ دزین. کاتێك هەوا تاریك بو وەك ڕیوری لەناو گیاکان ڕۆشتمە سەر کانیاوەکەو پرم کرد. چەند جارێك وەحشیەکان بەدەنگی خشە خشی گیاکان تووشی گوومان بوون، گەڕان بەڵام منیان نەدۆزییەوە. نازانن چەندە زەحمەتم کێشا تا گەیاندمە ئێرە. هەستم بەخاڵێکی تریش

کرد و ئەویش ئەویە تا شائکی فریاتان نەکەوێت ناتوانن لەم گەمارۆیە دەرباز بن.

یوری وتی:

شائکی لەکوێیە؟ چۆن دەتوانین ئاگاداری بکەینەوە؟ جیاواز لەوەش تا ئەوبگاتە ئێمە گەشتووینەتە جەهەنەم.

شووما وتی:

دڵنابن تا بەیانی دەیهێنمە ئەم دەوروبەرە. ئێستا بەرێدەکەوم و بەیانی زۆر زوو دەگەڕێمەوە.

بەسەرسوڕمانەوە وتم:

چۆن شتی وا ئەگەری هەیە؟

خەیاڵتان ئاسوودە بێت. ئێوە کەدەنگی تەپڵەکانی ئێمە دەناسن. لەگەڵ ئەوەی دەنگی تەپڵی شەو هەستا، هێرش بکەن. ئەوان بۆئەوەی لە نزیك بوونەوەی، پیاوانی ئێمە رێگری بکەن، گەمارۆکە دەشکێنن. لەم کاتەدا دەتوانن رابکەن و تاکۆتایی شەو مەودایەکی دوور و درێژ لێرە دوور بکەونەوە.

یوری وتی:

بیرۆکەیەکی خراپ نیە بەڵام ئەگەر تۆ بتوانی تا بەرەبەیان شائکی بێنیتە ئێرە !

بەدڵنیاییەوە ئەم کارە دەکەم.

لەگەڵ شوومادا بەم جۆرە بڕیارماندا تا دەنگی تەپڵی شەو بەرز بوویەوە ئێمە بۆ شکاندنی ئاڵقەی گەمارۆ هێرش بکەین و رابکەین.

شووما بزەیەکی تایبەتی بەنیشانەی رەزامەندی لەسەر لێو بو. دەتوت لەم گیانبازیە و خزمەتێك کە بەئێمەی دەکات شادمانە. بەبزەوە لەشوێنەکەی هەستا ماڵئاوایی کردو رۆشت.

چەند هەنگاو ئەولاتر ئاوڕی دایەوەو رویکردە من و وتی:

سەرۆك ئێوە گیانی منتان لەمردن رزگار کرد. هێشتا قەرزاری ئێوەم و قەرزەکەم نەدراوەتەوە ئەگەر لەم گەمارۆیە رزگارتان بوو من ئاسوودە دەبم و ئەوسا ئەگەر نەمانتوانی یەك ببینین بۆ هەمیشە ماڵئاواییمان کردوە. دەمەوێت هەمیشە منت لەبیربێت. کاتێك ئێوە بڕۆن من ئیتر کەسم نیە و نازانم بۆ دەبێت بژیم.

شووما قسەکەی تەواو نەکرد قوڵپی گریان قورگی گرت و نەیهێشت قسەکەی تەواو بکات. بەخێرایی لەوێ دوور کەوتەوە و لەتاریکی شەو لەچاو ون بو. قسەکانی

لەگوێچکەمدا دەزرنگایەوە. دەنگدانەوەی دەنگی ئەوم لەرۆحی خۆمدا دەبیست. ئەو وشانەی لەدەمی ئەو دەهاتنەدەر لەسەر دڵم قورسایی دەکرد. بەهەرحاڵ شووما رۆشت. هیوادار بووم بتوانم دووبارە بیبینمەوە و بیّ ئاگا لەوەی چارەنووس نەخشی سەیر دروست دەکات و رۆحی پاك و بێگەردی ئەو منالە روداوەکان باشتر لەمن پێش بینی دەکات. دوای رۆشتنی شووما هەرکام خزاینە سووچێك و چاودێری دەوروبەرمان دەکرد.

نیکی و ئەمانۆ لەیەك نزیك بوون و قسەیان دەکرد. با لەلای دژەوە هەڵیکردبوو من دەنگی ئەوانم دەبیست. بەڵام نەمدەتوانی بەجوانی تێبگەم کەچی دەڵێن و لەبارەی چی قسە دەکەن.

زۆر بەکەمی روویدەدا ئەوان بەگەرم و گوڕی قسە لەگەڵ یەکدا بکەن لەبەرئەمە سەرم سوڕمابو تا ئەوەی چەند خولەك دواتر هەردووکیان هەستاو راستەوخۆ هاتنە لای من و ئەمانۆ وتی: خەنجەرەکەت بدە بەمن.

پرسیم: خەنجەرەکەت بۆچی دەوێت.

نیکی وتی: منیش خەنجەری یوری وەردەگرم.

دووبارە وتم: ئاخر بۆچی..... دەتانەوێت چی بکەن......؟

ئەوان نەیانوت بەڵام بەهۆی پێداگریم پلانەکەی خۆیان ئاشکراکرد. نیکی وتی:

هەست دەکەم ئەم شەو وەحشیەکانی شامبرا بەهێرشێکی گەورە کارمان تەواو دەکەن...

لەم شێوەشدا ئەگەر من و ئەمانۆ گرفتار بین دەست درێژیمان دەکەنە سەر و قێزەونترین کردەوە ناشرینەکان بەرانبەرمان دەکەن. خەنجەرەکەمان بۆ ئەوە دەوێت لەئەگەری شکەست خۆمان دەکوژین. من ئەمانۆ دەکوژم و ئەمانۆش من. یانی هەردووکمان خەنجەر لەدڵی یەکدا رۆدەکەین. ئەوانم دڵنیا کردەوە کە ئاوا رووداوێك روونادات و ئەوان ناتوانن ئێمە بکوژن بەڵام لەهەمان کات خەنجەرەکەی خۆمدا بەنیکی. ئەمانۆش یەکێك لەخەنجەرەکانی یوری وەرگرت.

من ویوری چەند خەنجەرێکمان بو. کاتێك ئەوان گەڕانەوە شوێنی خۆیان، بیری سەیر سەیر رویانتێکردم. دڵم بەتووندی لێیدەدا. پەرێشان وشڵەژابووم. دەوروبەری ئێمە وەحشیەکان هات و چۆیان دەکردو جم و جووڵی ئەوان پەرێشانی ناخمی زیاتر دەکرد.

تازە دوو کاتژمێر لەڕۆشتنی شووما تێپەڕیبو کەهێرشی گشتی وەحشیەکان دەستی پێکرد و سەیر بو کەهێرشەکە لەنزیکەوە یانی لەسی هەنگاوی ئێمەدا دەستی پێکرد.

وا دیار بوو ئەوان لەتاریکی شەودا بەخزان لەسەر سك تا نزیکی سەنگەرەکانی ئێمە هاتوون و لەوێوە هێرشیان دەست پێکرد تا دڵنیابن.

بەهەرحاڵ شەڕێکی ترس ئەنگێز روویدا. ڕەشاشەکەی ئێمە بەردەوام تەقەیان دەکردو ژمارەیەکی زۆری لە وەحشیەکان دەخست بەڵام ژمارەیان ئەوەندە زۆر بو هەرچەندەمان دەکوشت ژمارەیەکی تر جێگەیان دەگرتنەوە، دەتوت لەجێگەی ئەوان سەوز دەبن یان لەزەوی هەڵەقوڵن.

چەند خولەك تێپەڕی من ویوری بەرانبەرمان پاراستبو بەڵام دوو لاکەی ترمان یانی چەپ و راست بێ بەرگری بو و هەرکاتێك تاقمێك لەسەنگەرەکانی ئێمە نزیك دەبوونەوە لەو دوولاوە بوون نیکی لەلایەك و ئەمانۆ لەلایەکیتر وەستا بوون چەند کەسیشیان بەخەنجەر دەکوشت نەمزانی چی بو کەدەنگێکم لەپشت سەری خۆم بیست... نیکی دەیوت: نەیەیتە پێش...... سینەت کوون دەکەم.

ئەوەندەم دەرفەت نەبوو ئاوڕ بەمەوە و سەیری دواوە بکەم.... چرکەیەك بێ ئاگایی دەبووە هۆی ئەوەی وەحشیەکان برژێنە ناو سەنگەرەکەو تیکە تیکەمان بکەن.

چارەیەکم نەبو بەپەلە وەك دز سەیرێکی دواوەم کرد و بەوپەڕی سەرسوڕمان بینیم یەکێك وەستاوە، نیکی بەرگری لەمن دەکرد و جۆرێك جێگەی گرتبوو کەوەحشی ئاماژە پێدراو نەتوانێت لەدواوە هێرش بکاتە سەرم و هەڕەشەی لێدەکرێت کە نەیەتە پێش.

ئەو دیانە گەورەکانی خۆی نیشانی نیکی دەدا بەڵام نەیدەتوانی رابکات چونکە نیکی وەك مێچکە شێر دەینەڕاند و کەمینی کردبو کە لە دەرفەتێکدا خەنجەرەکەی تا دەسك لەسینەیدا جێگە بکاتەوە.

کاتێك لەبەرگری کردن ئاسوودە بووم ویستم بیکوژم. بەڵام نیکی وتی:

مەیکوژە...... مەیکوژە...... ئەمە بەشی منە.

دەستخۆشیم لەچاو نەترسی نیکی کرد بەڵام نیگەران بووم نەکا خوای نەکردە نیکی لەم شەڕەدا بکوژرێت و بۆ هەمیشە ڕەشپۆشم بکات.

هەرچرکەیەك کە تێدەپەڕی دەنگی تەپڵ زیاتر دەبو وەحشی ئامارە پێدراو زیاتر دەترسا.

سەرئەنجام ویستی رابکات بەڵام هەرئەوەندەی ئاوڕی دایەوە نیکی پەلاماری داو

ئازایانە خەنجەرەکی لەسینەیدا چەقاند. ئەو قیژاندی و گیانیدا.

یوری بەڕاکردن هات و وتی:

خێراکەن، گەمارۆ شکاوە..... دەبێت بڕۆین.

هەرکام لەئێمە کۆڵەکەمان هەڵگرت و لەسەنگەرەکە رۆشینە دەر. هەوا تازە روناك دەبو و خۆر هەڵاتی ئاسمان زیو رەنگ کەلەلای باکووری رۆژئاوا خۆمان گەیاندە جەنگەڵ و رامانکرد.

کاتێك هەتاو نوکی بەرزترین لقی دارەکانی روناك کردەوە، بەئەندازەی سی میل لەوێ دوور کەوتبووینەوە.

یوری هیلاك بو وەستاو وتی:بوەستن..... نیو کاتژمێر لێرەدا دەحەسێینەوەو دووبارە دەڕۆینە پێش.

ئەو راستی دەکرد مەترسی وەحشیەکانی شامبرا بەتەواوی نەمابو. یوری لەکاتێکدا ئارەقی ناوچاوی بە قۆڵی کراسەکەی پاك دەکردەوە وتی:

هەستتان بەهیچ کرد؟

پرسیم: چ شتێکی تازەت دۆزیوەتەوە؟

وتی: دەست خۆشی بۆ شووما.... بەڕاستی دەست خۆش.

ئەمانۆ وتی: مەگەر شووما جگە لەهێنانی ئاوەکە کارێکی تری کروە؟

وتی: بەڵێ ئێمەی لەمردن رزگارکرد. هەستان بەوەکرد دەنگی تەپڵ یەکێك بووە. ئەگەر شائکی و هاوڕێکانی هاتبوون بەدڵنیاییەوە بەچەندین تەپڵیان پێبو و لێیان دەدا لەکاتێکدا ئێمە تەنیا یەك دەنگمان دەبیست.

مەبەستت چیە؟

مەبەستم ئەوەیە شووما بەگیانبازێکی تر ئێمەی رزگار کرد. ئەو دەیزانی ئەگەر بڕواتە هۆز و شائکی بێنێت کاتێك بەئێمە دەگەن کە گورگەکان گۆشتی جەستەمانیان خواردوە و رۆشتوون. بۆیە خۆی تەپڵێکی لە وەحشیەکان دزی و بەتەنیا لێیدەدا.

نیکی وتی: لەکوێوە زانیت.

یوری وتی: دواتر دەردەکەوێت لەگوومانەکەی خۆمدا تووشی هەڵە نەبووم و گوومان دەکەم شووما ئەم جارەش گیان بەدەر ببات.

بۆچوونەکەی یوری بۆ ئێمە شیاوی باوەڕ پێکردن نەبو وەك ئەوەی ئێوە لەم ئاسانیە ناتوانن باوەڕ بکەن. ئێمە سیانە ئەم هەموو ئازایەتیە و گیانبازیەی شوومامان

باوەڕنەدەکرد. ئەگەر ڕووداوێکی وا ڕاست بوایە دەبوا فێڵباز و کارزانێك ئەم کارەی کردبێت و ئەگەر بۆنمونە دەیانوت ((بۆفالۆبیل)) یان ((دیوری)) ((کراکت)) قارەمانی مێژووی ئەمریکا ئەم کارەیان کردو بیسەر بەدژواری دەیتوانی باوەڕبکات چ بگات بەوەی کە شووما مێردمنداڵێکی وەحشی.

شانەکانی خۆم بەرزکردەوەو بەم شێوە تێمگەیاند بۆچوونەکەی شیاوی باوەڕ پێکردن نیە. نیکی بۆ ئەوەی کۆتایی بەم وتوێژە بێهۆیە بێنێت وتی:

بەهەرحاڵ ئێمە ڕزگارمان بو. هەرکەس ئەم کارەی کردبێت زۆر سوپاسی دەکەین.

ئێستا بحەسێنەوە و کەبۆ ڕۆشتن ئامادەبین.

یوری ئیتر قسەی نەدەکرد بەڵام دیاربو بیرو ئەندێشە نایەڵن ئاسوودەبن هەندێ کات گوێکانی خۆی قووت دەکردەوەو بەجوانی لەوردەنگانەی دەبیستران گوێی دەگرت و دووبارە چاوی دەبەست خۆی بەخەوتوو نیشان دەدا.

یەکێك لەم جارانە پرسیارم کرد:

یوری بیر لەچی دەکەیتەوە؟ وا هەست دەکەم ئارام نەبیت.

یوری لەجیاتی ئەوەی وەڵامی من بداتەوە لەمنی پرسی:

کاتێك دەنگی تەپڵ بیسترا گوێت گرت....؟

وتم: بەڵێ..... مەبەستت چیە؟ هێشتا بیر لەتەپڵەکە دەکەیتەوە.

وتی: بەڵێ. بیر لەتەپڵەکە دەکەمەوە. گرنگە.... دەمویست لەتۆ بپرسم کە.....

قسەکەیم بڕی و پرسیم:

چ گرنگیەکی هەیە؟ دەتویست چی بپرسیت؟

دەمەوێت بزانم دەنگی تەپڵ لەکام لاوە دەبیسترا.

وتم: لەهەر لایەکەوە دەبیسترا و سەرئەنجام وەحشیەکانی شامبرا ڕۆشتن و بەئاسوودە جێیان هێشتین.

یوری بیری کردەوەو وتی: وەحشیەکان بەپەلە بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆشتن و گوومان دەکەم دەنگی تەپڵ لەڕۆژئاواوە دەبیسترا. هۆی ئەوەی گوومانم ئەوەیە کە شووما بەتەنیا تەپڵەکەی لێداوە ئەویە کە دەنگ لەلایەن ڕۆژهەڵاتەوە بەرزبوویەوە لەکاتێکدا ئەگەر شائکی و هاوڕێکانی دەهاتن دەبوا لەڕۆژهەڵاتەوە لێمان نزیك ببنەوە.

وام دەزانی نیکی خەوتووە، لەم کاتەدا نیکی بێ ئەوەی چاوەکانی بکاتەوە وەڵامی پرسیارەکەی یوری دایەوە وتی:

دەنگی تەپڵ لە رۆژئاواوە بەرز بوویەوە، گوێی ئێمە هەڵە ناکات ئەگەر باوەڕناکەن لەئەمانۆش بپرسن.

یوری هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو وتی:

حەیف..... حەیف..... دەترسم بەلایەك بەسەر ئەم منالەدا هاتبێت..... ئەگەر دەنگە کە لەرۆژئاواوە بیسترا دەبێت شووما لەم نزیکانە بێت.

وتوێژی ئێمە لەمبارەوە زۆری نەخایاند و بێدەنگ بوین، خەو هەرچوارمانی بردەوە، نەمزانی چەند کاتژمێر تێپەڕی. خەو وەك مردنە.... بەهەمان شێوە کەمرۆڤ لەمردندا هەست بەهیچ ناکات لەخەویشدا لەخەم و پەژارە بەدوورە.

لەناکاو گوومانێکی دڵگیرم لەسەر روخساری خۆم هەست پێکردو لەخەو راچەنیم. شڵەژاو هەستامە سەر پێ و سەیری دەورووبەرم کرد. ترسێکی کەم وێنە سەرتاپامی داگرتبو ، بەنیگا کردنێك زانیم هەمووومان سلامەتین. سەیری ئاسمانم کردو بینیم هەتاو تازە هەلاتووە... ئاشکرابو کە شەو و رۆژێك خەوتووم.

یوری و نیکی و ئەمانۆش هەستان و لەوەلامی پرسیارەکەی مندا وتیان.

بەڵێ ئێمە شەو ورۆژێکە لێرەین.

ئەوان هەستا بوون بەلام من لەهەمووی ئەم ماوەدا خەوتبووم. هیلاك نەبووین و هێز و وزەی پێویستمان بو تەنیا برسیەتی ئازاری دەداین. یوری وتی:

خێراکەن..... هەرچی زووتر دەبێت بڕۆین. شەو ورۆژێك حەساونەتەوە لەجیاتی ئەوە دەبێت چەند رۆژ بەدوای یەکدا بڕۆین.

بار و بنەمان هەڵگرت و بەڕێکەوتین. یوری لەپێش و من لەدواوە بووم، نیکی و ئەمانۆش لەناوەڕاستی ئێمەو هەندێ کات دەڕۆشتە لای یەك قسەیان دەکرد.

سێ کاتژمێر زیاتر یان کەمتر رۆشتین. کەم کەم برسیەتی زۆری بۆ هێناین. من لەدواوە بەیوریم وت:

یوری بوەستە، باڵندەیەك راوبکەین زۆر برسیمانە.

یوری وتی:

خۆ راگرین، تەقەکردن هێشتا لەبەرژەوندیمان نیە. دەنگی تەقە ئەوان بۆلای ئێمە رادەکێشێت. ئیتر قسەمان نەکرد بەلام یوری خۆشی لەبرسانا لێوی خوارەوەی دەکرۆژت و ئاوی دەمی وشك بووی خۆی کۆدەکردەوەو قووتی دەدا. لەکاتی رۆشتن چاوی لەدارەکانی جەنگەڵ هەڵنەدەگرت بەلام بەداخەوە شتێك کەشیاوی خواردن بێت

دەست نەدەکەوت چونکە دارەکانی ئەوناوچەیە لەدارە بیّ بەرەکان بوون سەرئەنجام برسیەتی کاری خۆی کردو یەکەم کەس کە خۆراگری لەدەستدا نیکی بو کەدانیشت و لەوەلاّمی من کەپرسیم: بۆ دانیشتوویت؟ چی بووە؟ وتی:

ئەژنۆکانم توانای رۆشتنی نیە.... من لێرە دەمێنمەوە.... ئێوە برۆن.... برسیمە.... لەگەڵ برسیەتی گاڵتە ناکرێت.

ئەمانۆش کەڵکی لەبارودۆخ وەرگرت و لای نیکی دانیشت و کۆڵەبارەکەی فرێداو وتی:

دەزانن چیە.... من نزیکە بمرم.... دڵم بەیەکدا دێت.... لەبرسانا پەرێشانم. دەمەوێت لەگیاکان ئەگەر ژاراوی و مەترسیداریشن بخۆم رەنگە زووتر ئاسوودە بم.

کاتێك یوری ئەمەی بینی، کۆڵەکەی لەپشت کردەوەو داینا. ئەوەندە شادمان ببووم کەدەمویست سەما بکەم.

من لەچەند کاتژمێر پێشتر، یانی لەوساتەی چاوم لەخەوی قورسی بیست و چوار کاتژمێر. هەڵهێنا، برسی بووم. هێزو وزەم لەدەست دابو و دەمویست پێش ئەوان دانیشم بەلاّم بۆ من کەپیاو بووم کارێك قێزەونتر لەوە نەبو. بەسەر سەختی خۆراگریم دەکرد. خوێنی دڵم دەخوارد بەخۆشحاڵیەوە چەند خولەك پێش ئەوەی لەپیّ بکەوم نیکی و ئەمانۆ دانیشتن.

یوری وتی:

دەبێت بەتەناف و دەست راو بکەین. تەقەکردن کەمتەر خەمیە چونکە هێشتا لەسنوورەکانی هۆزی شامبرا دوور نەکەوتینەتەوە.

یوری ئەمەی وت و تەنافی هەڵگرت و ئیشارەی لەمن کرد لەگەڵیا برۆم. پێش رۆشتن بەنیکی و ئەمانۆی وت لەو شوێنەی دانیشتوون نەجووڵێن و لەیەك دوور نەکەونەوە.

لەناو دارەکان دەرۆشتینە پێش و سەیری چەپ و راستمان دەکرد رەنگە ئاژەڵێك بدۆزینەوە و راوی بکەین دەخولەك دواتر یوری وەستاو بەپەنجە زەوی نیشانداو کەلێی نزیك بوومەوە وتی:

ئەم شوێن پێیە دەناسیت؟

لەسەر خاکی نمدار شوێن پێی ئاژەڵێك دەبینرا کەزۆر ئاشنا بو. کەمێك وورد بوومەوە وتم:

گوومان دەکەم ورچ بێت.

یوری پێکەنی و وتی:

بەڵێ شوێن پێی ورچە. راستت وت و ئەمەش نیشاندەدا هۆزێك لەم دەوروبەرەدایە. ورچەکان هەمیشە نزیك شوێنی ژیانی مرۆڤ دەژین بەتایبەت ورچە زەرد رەنگەکانی ئامازۆن زیاد لەرادە وشیارن و جووڵە پێکەنیناویان هەیە کە ئەگەر مرۆڤ تاقەتی سەیرکردنی هەبێت ناخۆش نیە.

قسەکەیم بڕی وتم:

گۆشیتان چۆنە؟ دەتوانین بیخۆین.

یوری وتی:

بۆ پیاوی برسی تاشە بەردەکانی یالومیر لە لەفە ناودارەکانی سویس بەتامترە. ئەمە چ پرسیارێکە ئەگەر ئێستا لەگۆشتی گورگ کەبابت بۆ ئامادە بکەم نایخۆیت؟

بێ درەنگ وتم:

گورگ کوڕە مامی سەگە و من گۆشتی هەردوو کوڕە ئامۆزا لەم ساتەدا دەخۆم.

یوری بەگاڵتەکەی من دەستی بەپێکەنین کردو وتی:

لەگەڵما وەرە، ورچێك بۆ لەناوبردنی برسیەتی دە دۆزینەوە.... بێ خەم بە.

گۆشتی ورچی زەرد وەك گۆشتی ورچی سپی دەخورێت.

دووبارە بەڕێکەوتین. هەرچەند مەترێك، شوێن پێمان لەورچ دەبینی بەڵام سەیربو چونکە چەند خولەك دواتر شوێن پێکان زیاتر و زیاتر بوون و بوونە هۆی ترسانی ئێمە.

یوری وتی:

ژمارەی ورچەکان زۆرە. سەیرکە. شوێن پێی گەورە و بچووکەکان وەك ئەوە وایە کە دەستەیەك ورچ لێرە دەژین.

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبو کەدەنگی بەریەك کەوتنی گەڵا و لقی دارەکانی سەرسەرمان بەگوێ گەشت و سەرنجی هەردوکمانی بێ ئیرادە بۆسەر دارەکە راکێشرا.

یوری وتی:

سەیرکە. ئەم هەموو لاشخۆرە لێرە چی دەکەن. ئەم ئاژەڵانە تەنیا لەگۆشتی مرداربو دەخۆن. یانی چی؟

لەسەر ئاسمان کەبەشێکی لەلابەلای گەڵاو لقەکانەوە دەبینرا دەستەیەك لاشخۆرە هەڵدەفڕین و ژماریەکیان ئەوەندە لەزەوی نزیك ببوونەوە کە باڵیان بەرلقی دارەکان دەکەوت و دووبارە بەرز دەبوونەوە و هەڵدەفڕین.

یوری دەستی منی راکێشاو هەردووکمان بەڕاکردن بەرەو شوێنێك کەلاشخۆرەکان لەسەر کۆببونەوە و هەڵدەفڕین، ڕۆشتین. چەند چرکەیەك زیاتر لەرێگادا نەبووین.

یوری کەپێشتر لەمن بو دەستەیەك لە گەلاپانەکانی دارێکی کورتی گەرمەسێری کەلەسەر رێگا کەماندا بوون لابرد و دەست بەجێ قیژاندی و شڵەژاو ئاوڕی دایەوە و روخساری لەنێوان دوو دەستیدا داشارد.

دەرفەت ئەوەندە کەم بو کەنەمتوانی شتێك ببینم. سەرم سوڕمابو.

ئەخلاقی یوریم باش دەناسی و باش دەمزانی کەمتر دیمەنە دڵتەزێنەکان کاریگەی لەسەر دادەنێت و ناڕەحەتی دەکات، چی بو کەتا ئەم رادەیە پەرێشان بو؟ چی بینی.

قۆڵیم گرت و وتم:

یوری، چی بوە بۆ وات لێهات !

منیش گێژببووم و لەوەی نەمدەتوانی هەنگاوێك بڕۆمە پێش و هەرچی هەیە ببینم، کۆنترۆڵی خۆم لەدەست دابو لەجیاتی هەرکارێکیتر پرسیارم لەیوری دەکرد.

ئەو روخساری لەناو دەسیتدا شاردبوویەوە بەلام جوان دەمبینی شانەکانی دەلەرێتەوە و ئەمە نیشانی دەدا کە دەگریت.

یوری دەگریت !؟ دەتوانم سوێند بخۆم لەمەرگی ئازیزترین کەسەکانی خۆی نەدەگریا، ئەی چی بووە کە تا ئەم رادەیە ناڕەحەت بووە.

لەجیاتی وەلامم بداتەوە بەهەمان شێوە کەڕوخساری لەنێوان دەستیدا داشاردبو لەسەر زەوی دانیشت و سەری خستە سەر ئەژنۆ.

نەمدەتوانی گوومان بۆ هیچ شتێك ببەم. توانای بیرکردنەوەم لەو کاتەدا کاری نەدەکرد چونکە ئیتر توانام نەبو بێ ترس لەبەرانبەر یوری تێپەڕیم و بەدەست گەلاکانم لادا. ئاخ چ دیمەنێك؟

قیژاندم و بەخێرایی ڕۆشتمەدواوە. دەلەرزیم، ئارەقێکی سارد و بێزارکەر سەراپای تەرکردو زمان لەدەممدا وشك ببوو دنیا لەبەرچاوما لێڵ و ڕەش ببو، قوڵپی گریان قوڕگمی فشار دەدا.

دەمویست بگریم بەلام کانی فرمێسکی من وشك ببو کەتەنانەت یەك دڵۆپ فرمێسکیش چاوی تەڕ نەکردم.

جنێوم دەدا ونەمدەزانی جنێو بەکێ دەدەم. ئێستا ئێوە دەپرسن چی بووە؟ مافی خۆتانە بەلام پێم ناخۆشە خەمبار بن.

یەك دوو خولەك منیش ناڕەحەت بووم کەبابەتەکەم زانی بەتەواوی تێك چووم. ئێستا نۆرەی ئێوەیە کە لەکاتی خوێندنەوەی ئەم دێڕانە لەخۆتان بپرسن:

چی بووە؟

ناچارم دیمەنێك کەبینیم بۆتانی باس بکەم. دڵنیام دەبێتە هۆی ناڕەحەتی و خەمباری ئێوە بەڵام چار نیە و بەشێکە لەداستانی سەفەرەکەی ئێمە کەدەبێت بووترێت و بنوسرێت.

لەشوێنێك کە بە بەراوردی شوێنەکانی دەوروبەر داری کەمتری لێ بو مرۆڤێکیان لەت لەت کردبوو هەر لەتێکیان بەدارێکەوە هەڵواسیبو.

ئەم مرۆڤە کێ بو تا ئەو رادە بوەهۆی ناڕەحەتی ئێمە.

هەمووومان دەیناسین. مرۆڤێکی گیانبازو چاونەترس مرۆڤێکی وەحشی بەڵام مرۆڤێکی راستەقینە کە لەبەرانبەر ئەو چاکەی ئێمە لەگەڵمان کرد گەورەترین گیانبازی بۆ کردین و سەرئەنجام گیانی شیرینی خۆی لەسەر ئەم کارە دانا.

ئەو خۆی بەقەرزاری ئێمە دەزانی. قەرزێکی ئەخلاقی و لەگەڵ ئەوەی چەندین جار منی لەمردن رزگارکرد و لەدوایین جار لەگۆڕەپانی خوێناوی شەو تێپەڕی و ئێمە چوارکەس لەتینویەتی و مەرگی هێواش رزگارکرد و. دووبارە کارێکی مەترسیدارتری کردو لەئەنجامدا گرفتاری دوژمن بو کوژرا.

ئەم بوونەوەرە گیانبازو ئەم مرۆڤە راستەقینە شوومای منداڵ بو.

تەپڵەکەی لەخوار دارەکەوە دەبینرا. ئەو بەدەنگی ئەم تەپڵە وەحشیەکانی شامبرای ترساندبوو لە دەوروبەری ئێمە بلاوەی پێکردبون.

دیار نەبو چۆن لەلایەن شەڕکەرانی هۆزی شامبڕاوە دەستگیرکرابو بەڵام ئەوەی دەبینرا ئەوەبو کە وەحشیانەترین سزاکانیان لەسەر ئەنجامدابو و لەناوەڕاستەوە کردبویان بەدوو کەرت.

نزیکەی چارەکە کاتژمێرێك من و یوری گریاین. سەرئەنجام یوری وتی:

دەبێت بیخەینە ژێر گڵ. گورگ دەیخوات. حەیف منداڵێکی وەك شووما ببێتە خواردنی لاشخۆر. دەست بەجێ دەست بەکاربووین و جەستەی دووتیکەی شوومای بێ تاوان و میهرەبانمان بەدڵێکی خوێناوی و رۆحێکی پەڕێشان و سینەیەك سەر رێژ لەرق و هەستی تۆڵە سەندنەوە خستە لای یەك و لەوێدا بەخاکمان سپارد. دواتر خواردنمان خوارد کەمێك هەنگوین و برسیەتی کاتی ئێمەی نەهێشت دووبارە بەڕێکەوتین. کەمێك

ئەولاتر قرقاوڵێکی گەورەو پیرمان راوکرد و کە گەشتینە لای ئاگر سفرەمان راخست و ئاگرمان کردەوە. گۆشتی بەتامی قرقاوڵ ئەوەندە بەتام بوو وەسف کردنی ئەگەری نیە. ئێوە کەهیچ کات برسیەتیتان نەکێشاوە، حاڵی ئێمە لەوکاتەدا بێنە بەرچاوی خۆتان و چێژێك کەلەخواردنی گۆشتی قرقاوڵ بردمان، هەست پێبکەن. من توانای نوسینی ئەو چێژەم نیە چونکە بەداخەوە تەکنیکی نوسین نازانم.....

یوری بۆچوونی وابو کەلەوێ بەدواوە دەورانی ئاسایشی ئێمە دەست پێدەکات و سەفەری ئێمە بێ مەترسی دەبێت. ئەو راستی دەکرد بەگوومانی ئەو هۆزێکی وەحشی کە ببێتە ئەرك بۆمان ئیتر نەبو...

من بیرم چوبوەوە کەپێش گەشتن بەئامازۆن بەڵێنی هاوسەرێتیم بەکچێکی جوانی وەحشی دابو... یوری کەئاگای لەهەموو شتێك بو وتی:

رەنگە هاوسەری سێیەمت چاوەڕێت بێت.

بەسەرسوڕمانەوە وتم:

هاوسەری سێیەم کێیە؟

یوری پێکەنی و وتی:

هانا.... کچی سەرۆکی هۆزێك کەتۆ لەلەی کورەکەی بویت. هانا کچێك کە براکەی مەیمونێکی کردە کەباب خواردی و تۆ چارەسەرت کرد. هۆزی ئەوان نزیکە و بەم زوانە پێی دەگەین.

بەیوریم وت:

ئیتر سەبارەت بەژن و ئەو رووداوانەی بوونی ژن دروستی دەکات قسە مەکە. ئەمانۆ و نیکی ئەوەندە ئازاریان داوم کەڕقم لەهەرچی ژنە دەبێتەوە و لێیان بێزارم. جیاواز لەویش لای ئەوان باسی ژنی سێیەم مەکە چونکە ئەوەندە حەسوودن دوورنیە یەك بگرن و بمکوژن.

یوری پێکەنی. من بەسەرسوڕمانەوە وتم:

بۆ پێدەکەنیت؟ پێکەنینی ناوێت. ئایا ئەم جۆرە روداوانە لەدنیادا رویان نەداوە؟ زۆرن ئەو ژنانەی دەستیان خستۆتە ناو دەستی یەك و پیاوێك کە زۆر خۆشیان ویستووە، کوشتویانەو لەناویای بردوە.

یوری دووبارە پێکەنی و بۆ کۆتایی هێنان بەم باسە وتی:

ئەم کارانە تایبەتە بەژنانی دنیای پێشکەوتووە. ژنانی وەك ئەمانۆ و نیکی بەهەمان

شێوە کە بەرواڵەت پاك و بێگەردن لەناخیش دا بەهەمان شێوەن. نیکی و ئەمانۆ بێ ڕیا تۆیان خۆش دەوێت و لەئێستاوە نابێت چاو وگوێیان بەم قسانە پڕ بکەیت.

بەهەمان رادە روداوەکان سەفەری ئێمە کەم دەبوویەوە دەگەشتینە ناوچە ئارام و دڵگیرەکانی جەنگەڵ، کێشەی نێوان ئەمانۆو نیکی لەسەر من زیاتر دەبو.

ئەمانۆش بەڕاستی وابو، نیکی بەچاوێکی تایبەتەوە سەیر دەکرد و هەندێ کات چاوەڕوانی خزمەت کردنیش بو.

روداوەکانی دواتر کەرویان دا هەموویان بەڵگەیی بەهێزن بۆ ئەم قسانەی ئێستام.

ئەو شەوە گەشتینە ئەستێڵکی دڵ ئەنگێز، سەرەتا گوومانم کرد زۆنگاوێکی مەترسیدار لەبەر دەممانداییە و بۆیە پێشنیارم بەیوری کرد کەشەو بمێنینەوە و بەیانی کە هەوا رووناك بوویەوە بەئارامی لە ناو قامیشەلان ولەناوەڕاستی زۆنگاوەکە تێپەڕین.

هیچ کام نەماندەتوانی گوومان بکەین و بەزانست و دڵنیاییەوە پێش بینی ئەوە بکەین کە ئەوێ چۆن شوێنێکە. زۆنگاوە؟ یان ئەستێڵکی بێ مەترسیە؟ قامیشەلانێکە کەلەناویدا شێری دڕندە و ماری مەترسیدار هێلانەیان کردوە؟

یوری بۆچوونی وابو ئەو لای قامیشەلان بۆ حەوانەوە هەڵبژێرین بەڵام چونکە هەوا تاریك بو ئەویش بەپێشنیارەکەی من رازی بو کۆڵەکەی لەپشت کردەوەو بەم شێوە رایگەیاند لەوشوێنەی کە کۆڵەکەی خستۆتە سەر زەوی دەبێت بمێنینەوە.

ئەمانۆ و نیکی دەست بەکار بوون و راخەرێکی ڕەش رەنگ کەپێمان بو، رایان خست و لەچواردەوریدا بەردیان دانا کە لەئەگەری هەڵکردنی با راخەرەکە تەکان نەخوات. نیکی بۆ دۆزینەوەی جێگا رۆشت و دەستی بەگەڕان کرد. یوریش بۆ دۆزینەوەی خواردن هەوڵیدەدا. کاتژمێرێك دواتر نیکی و ئەمانۆ هاتن و وتوێژی من و ئەمانۆ کۆتایی پێهات.

یوری چەند میوەیەکی ناوکداری وەك گوێزی هێنابو. تام و چێژێکی دڵگیری بو، بەئیشتیاوە خواردمان و بۆ خەو ئامادە بووین.

نیکی پێشتر بۆ خۆی و من لەگیا وشك و نەرمەکان جێگەی ئامادە کردبو ولەناوچەند دارێك کە بەشێوەی بازنەی خوار لای یەك روابوون، رای خستبو.

ئەمانۆ لەژێر چاوەوە چاودێری جووڵەکانی نیکی دەکرد و بۆیەك ساتیش چاوی لێ هەڵنەدەگرت. حەسوودی زیاتر وشیاورو وردبینی کردبو بەیارمەتی ئەم تایبەتمەندیانە، نیکی و من پەیوەندیەکانی نێوانمانی کۆنترۆڵ دەکرد.

بەئینگلیزی بابەتەکەم بەیوری وت. ئەو پێکەنی و وتی:

لەمەودوا نەشەو خەوت دەبێت و نەرۆژ ئارامش ! هەموو کاتەکانی تۆ بۆ رازی کردن و بێدەنگ کردنی ئەمانۆو نیکی بەسەر دەبەیت.

پێم وت:

خۆم دەزانم چ بەلایەکم بەسەردا هاتووە، انشاالله ئەگەر گەشتمە ئەمریکا بەخێرایی پاڵ بەیەکێکیانەوە دەنێم یان شێوازێك دەگرمە بەر کە نەتوانن ببنە هۆی ئازارو نیگەرانیم. ئێستا بڵێ چیان لێ بکەم و ئەم شەو لەگەڵ ئەم دووانە چی بکەم. دەبینی کە نیکی جێگای راخستووە و ئەمانۆش پێشتر پێی وتوم.

یوری دووبارە پێکەنی و سەرئەنجام وتی:

بوەستە ئێستا پلانێك دادەڕێژم. ئەو کات زیادی کرد:

هیلاك بووین و دەبێت بخەوین. یەك لەئێوە دووانە ئەم شەو و ئەویتریان سبەی شەو پاسەوانی دەدات. لەشەوکانی دواتر کەهیلاکی ئێمە رەویەوە دووبارە نۆرەی حەوانەوەی ئێوە دەگات و تا هەفتەیەك ئاسوودە دەبن.

نیکی و ئەمانۆ هەردوکیان شادمان بوون چونکە هەرکام گوومانیان دەکرد ئەویتر لەگۆرەپان دەچێتە دەرو سەرقاڵی پاسەوانی دەبێت.

نیکی دەیوت ئەمانۆ بۆ ئەم کارانە چالاکترەو ئەمانۆ باوەڕی وابو کەنیکی تەقەکردن بەتفەنگ فێر بووە و باشتر دەتوانێت ئەرکەکەی ئەنجام بدات.

یوری کۆتایی بەم باسە هێناو ئەمانۆی بۆ شەو نەخەوتن هەڵبژاردو ناردیە سەر دارەکە. ئەمانۆ لەتووڕەیدا دەلەرزی، وەك شێرێکی بریندار دەینەڕاند و لێوی خواروی بەدیان دەگەست بەڵام چونکە لەیوری دەترسا بێ چەند وچوون بەفەرمانەکەی رازی بو لەدارەکە رۆشتە سەر. دیار بوو ئەمانۆ لەوێ دەخەوێت، یوری پاڵی بەدارەکەوە داو قاچی درێژ کرد، سیلاحەکەی خستە سەر کۆشی و بەهەمان شێوە بەدانیشتنانەوە خەوی لێکەوت.

ئەو شەوە بەم شێویە بەسەر چوو.

بەیانی ئەمانۆ بەچاوی خەواڵو لەدارەکە هاتە خوار. بەتووڕەیی و رقەوە سەیرێکی نیکی کرد کەسەرقاڵی جوانکردنی قژی خۆی بو و دواتر لەمنی ڕوانی و بزەیەکی تاڵی هێنایە سەر لێو بەرەو ئاوەکە رۆشت و دوور کەوتەوە. چەند خولەك دواتر منیش بەرەو ئاوەکە رۆشتم. تازە زانیم کەشەومان لەچ شوێنێکی دڵگیر بەسەربردوە. ئەوێ

ئەستێڵکێکی جوان کەدارەکانیان سەریان لەیەك دابوو پڕبو لەگوڵی وەحشی بۆن خۆش.

لەلایەکی ئاوەکە ئەوەندە گووڵی وەحشی روابو کە زەوی وەك فەرشێکی پڕ نەخش و نیگار دەردەکەوت چاوی مرۆڤ لەسەیرکردنی ئەو هەموو جوانیە سروشتیە و لووتی لە هەڵمژینی بۆنی دڵ ئەنگێزی گووڵە رەنگاورەنگەکان تێر نەدەبو. هەرچی زیاتر دەمڕوانی چێژم دەبرد و زیاتر مەست دەبووم. خۆزگەم دەخواست بتوانم لەوێدا ماڵێك دروست بکەم و لەگەڵ نیکی و ئەمانۆ هەمیشە و هەموو تەمەنم لەوێدا بەسەر ببەم. بەیانیەکی دڵگیر بو. یوری بۆ راو رۆشتبووە ئەولای ئەستێڵك نیکی سەرقاڵی پاك و خاوێنی بو ئەمانۆش لەشوێنێکدا کە من نەمدەبینی دانیشتبوو بیری دەکردەوە.

دواتر خۆی پێی وتم کە ئەو رۆژە ئەوەندە تووڕە بووم چەند جارێك بڕیارمدا نیکی بکوژم و خۆم لەبوونی ئەو کە جگە لەناڕەحەتی هیچ شتێکی پێ نەبەخشیوم رزگار بکەم.

لەم کاتەدا کەسەیری دەورووبەرم دەکرد لەناکاو دەنگی پێیەك سەرنجی بۆلای دارەکانی روبەڕو راکێشام. دەتوت کەسێك لەسەر گیا وشکەکان بەرێگادا دەڕوات.

گوومانم دەکرد نیکی یان ئەمانۆ و یان یوری بەرەو لای من دێن بەڵام لەگوومانەکەمدا بەهەڵەدا چووم.... ئەوان سەرقاڵی کاری خۆیان بوون و کەسێك کەبەرەو لای ئاوەکە دەهات ژنێکی زۆر جوان و گەنج بو.

بەسەرسوڕمانێکی زیاد لەرادە لەشوێنەکەی خۆم بەرز بوومەوە ! بوونی ئەو نیشانەی بوونی هۆزێك لەو دەورووبەرەدا بو ئەمە زیاتر منی ناڕەحەت دەکرد کە نەکات ئەو هۆزە وەحشی مەترسیدار بن و ئێستا کە لە رووداوە ترسێنەرەکانی شەش ساڵە رزگارمان بووە، هێرشمان بکەنە سەرو بمانکوژن.

تەنیا چەند چرکە بەگوومانەوە سەرقاڵ بووم و لەگەڵ ئەوەی کچە جوانەکە گەشتە چەند هەنگاوی من هەموو دنیا، مەگەر خۆم و ئەوم لەبیرکرد.

کچەکە قژی خۆی لەپشتەوە بەستبوو، پێستی جەستەی هاوشێوەی پێستی ژنانی مەکسیك و ئیسپانیا بو بەڵام بەهۆی هەتاوەوە سووتابو ببوە خورمایی. لەگەڵ ئەمەشدا ئەوەندە دڵرفێن بو ئارەزووم دەکرد هەرچیم هەیە بیدەم تا ببمە خاوەنی.

کچە وەحشیە جوانەکە منی نەبینی و لەچەند هەنگاوی من تێپەڕی و بەدەفرێکی گڵێنی قورس کە لە دەستیابو بۆ هەڵگرتنی ئاو بەرەو ئەستێڵکەکە دەڕۆشت.

چاوم لێ هەڵگرت، دڵم بەتووندی لێدەدا. نەمدەزانی چیبکەم. وەك کەسێك کە خەوی

خۆش دەبینێت و دەترسێت لەخەو هەستێت منیش دەترسام خۆم نیشان بدەم و ئەو لەمن رابکات و بڕوات و ئیتر نەیبینم.

زۆر لەسەرخۆ پاڵم بە ئەنیشکمەوە داو خۆم کەمێك کێشایە دواوە.

ئەو لای ئاوەکەوە رۆشت.... بەشیرینی و نازێکی ژنانە، دەفرە گڵینەکەی لەئاودا شۆردو دواتر پڕی کرد.

هێشتا گۆزەکەی لەئاو نەکێشابووە دەر کە دەنگێکی تر بەگوێم گەشت و سەرنجی راکێشام. ئەم جارە دەتوت کەسێك لەناو دارەکانەوە تێپەڕ دەبێت و لەقەکانی ژێر قاچی دەنگیان دێت بەخێرایی خۆم کێشایە دواوەو سەیری دەوروبەرم کرد.

گوومانەکەم راست بوو چونکە بوونەوەرێکی سەیرم بەسەر دارەکانەوە بینی کە ئەگەر کۆنترۆڵی دەمارەکانم نەبوایە لەترسا دەمقیژاندو دەبوورامەوە.

سەیره...... ئەمە کێیە. پیاوێکی ڕەش پێست.... بەهێزو ئازا..... بەماسوولکەی دەرپەڕیوو بەهێزە.....لەپێستی پڵنگ لەسەر لقی دارەکە چەمابوویەوە و بەچاوی لێوانلێو لەحەسرەت لە کچەکەی دەڕوانی.

دڵم بەتووندی کەوتە لێدان بە جۆرێك دەنگی لێدانی دڵی خۆمم بیست. بەدبەختانە سیلاحەکەم پێ نەبوو. ئەگەر وەك هەمیشە ڕەشاشەکەم پێدەبوو بێ درەنگ دەمکوشت و ئەو کچە جوانەم لەمەترسی رزگار دەکرد.

دەمویست بڕۆم و سیلاحەکەم بێنم بەڵام دەترسام دەرفەت لەدەست بڕوات و بەئامادە نەبوونی من کچەکە پەلاماری بکرێتە سەر.

پیاوێك کەپێستی پڵنگی لەبەرکردبوو روخساری خۆی بەشتێك وەك تۆر داپشیبو لەسەر ئەم لق دەپەڕییە سەر ئەولقی تر و بێ گوێدان بەوەی کەدەنگی لقەکان ئەگەری هەیە نێچیرەکەی لەمەترسی ئاگادار بکاتەوە، دەڕۆشت و لەکچەکە نزیك دەبویەوە. نەمدەزانی چی بکەم پیاوی ئاماژە پێدراو لەدووری پێنج شەش مەتری لەزەوی دەستی بردو لقێکی پێچ پێچی ئەستوور کە هەڵواسرابون گرتی و دوای ئەوەی لەبەهێزیەکەی دڵنیابو، خۆی پێ هەڵواسی و لەهەوادا کەوتە جووڵە.

لەچاو تروکانێکدا و پێش ئەوەی من بتوانم کارێك بکەم، ڕەش پێست خۆی گەیاندە کچەکە، دەمی گرت و بەجوولەیەکی خێرا خستیە سەرشان و بەڕاکردن لەناو دارەکانی جەنگەڵ لەچاو ون بو.

ئەم رووداوە خەم بزوێنە ئەوەندە بەخێرایی رویدا کەنە کچەکە توانی بقیژێنێت و

نەمن توانیم بەرگری لێ بکەم. ئەو وەك هەڵۆیەك کە کەڕوێشکێکی راو کردبێت، شارەزاو لێهاتووانە هێرشی کردە سەرو لە قووڵایی جەنگەڵدا رۆچو.

تا چەند خولەك گێژ و وڕبووم. بیرو گوومانی سەیر سەیر بەمێشکمدا دەهات. چونکە بەپێچەوانەی گوومانی خۆمان هێشتا لەسنووری هۆز نیوە وەحشی مەترسیدارەکانی جەنگەڵ دوور نەکەوتبووینەوە. دەبوا دووبارە روبەڕوی کێشە ودژواریەکان ببینەوە.

کتو پڕ بیرکردنەو نابەجێکانی من بەدەنگێك کە لەناو دارەکانەوە بەرزبوویەوە، پچڕا. دووبارە خۆم کۆکردەوەو لەپشت دارێك خۆم داشارد.

سەرەتا دوو سێبەر بینران و دوای چەند سات هەیکەلی دو پیرێژنی وەحشی دەرکەوت.

لەپشت سەریانەوە چەند کچێکی جوان بوون. هەرکام دەفرێکی بچووکی لەگوڵی یاس وەحشیان لەسەردا بو.

پیرێژنەکان هەرکام گۆزەیەکیان بەدەست گرتبوو ئاوازێکی تایبەتیان دەخوێند و گۆزەکانیان بۆ چەپ و راست دەجووڵاند.

بەتەواوی سەرم سوڕما بو مانای ئەم جووڵە و کارانەم نەدەزانی. بەخۆمم وت:

ئەو داماوانە نازانن کەیەکێك لەکچەکانی هۆزەکەیان رفێندراوە.... ئەگەر بزانن دەست دەکەن بە گریان و شین و رۆ رۆ و قەربالغی دروست دەبێت.....

ژنەکان گەشتنە شوێنێك کە گۆزەی بەبێ خاوەنی کچە رفێندراوەکە، لەوێدا بو. یەکێك لەوان ئاوی گۆزەکەی مشت مشت کردە سەرخاك و بەدەوروبەریدا پرژاندی و یەکیتریان گۆزەکەی فڕدایە ناو ئاوەکە. گۆزەکە سووڕێکی خواردو رۆشت و لەجێگاکەی چەن بلقێك لەسەر ئاوەکە دەرکەوت.

پیرێژنەکانت رۆشتنە دواوە. کچەکان کە دەفری گوڵی یاسیان پێبوو رۆشتنە پێش و گووڵەکانیان بەئاوازێکی تایبەت لەوێدا بلاّو کردەوەو هاوڕێ لەگەڵ پیرێژنەکان رۆشتن من کردەوەکانی ئەوانم لای خۆم بەپرسە داناو هەربۆیە دڵم سووتاو، دەتوت قوڕگم دەگوشن و دەیانەوێت بمخنکێنن.

پیرێژن و کچەکان رۆشتن بەلاّم من هێشتا لەوێ بووم و نەمدەزانی چی بکەم.....

بیرێك وەك بروسکە بەمێشکمدا هات و نەمزانی چی بو بەهەمان خێرایی بڕیارم گرت و بێ راوێژ کردن لەگەڵ یوری بەوکارە مەترسیدارە هەستام. بەخۆمم وت:

من دەبێت ئەو کچە رزگار بکەم. ئەو ڕەش پێستە کچەکەی بەدڵنیاییەوە بۆ رابواردن

رفاندوە و چونکە ئەم کارە لەهەموو شوێنێکی جەنگەڵدا دەکرێت، بۆ رێگەیەکی دوور نەچووە و لەم دەوروبەرەدایە. تا یوری شتێك بۆ خواردن راودەکات نیکی و ئەمانۆ لەئاودا مەلە دەکەن منیش بۆ دۆزینەوەی کچەکە یەك دوو میلێك بۆ دەوروبەر دەڕۆم و دو سێ کاتژمێری تر دەگەڕێمەوە....

بە پەلەکردنێکی ناعەقلانی لە شوێنەکەم هەستام و رۆشتمە لای کوڵەکانمان.... دەمانچەکە، ڕەشاش و بڕێك فیشەکم هەڵگرت، کلاوێکی سەوەتەیی کە نیکی بۆی دروست کردبووم، لەسەرم کردو تا هەتاو چاوم ناڕەحەت نەکات. لەشوێنێك کەشەوی پێش لێی خەوتبووین کەسی لێ نەبوو.

کەس نەیبینیم، شادمان بووم کە بەخۆنواندنی خۆم سەرسوڕماویان دەکەم و بە خۆمم دەوت:

کاتێك یوری بزانێت لەکاتی راوکردنی ئەو من چ کارێکی گرنگم ئەنجامداوە و چۆن کچێکی جوان و بێ گووناح لەدەست پیاوێکی هەوەسباز و خوێنخۆر رزگار کردوە. دەستخۆشی لەچاو نەترسی و توانایی و بیرو عەقڵی من دەکات. ئەمانۆ و نیکیش شانازی دەکەن کە عاشقێکی چاو نەترس و ئازایان هەیە.

ئەم بیرانە وا گەرمیان کردبووم کە هەستم بەهیچ شتێکی تر نەدەکرد. چاوی عەقڵی من کوێر ببو. بیرم نەدەکردەوە کە بەمن چی....؟ بۆ دەبێت هاوڕێکانم لای هۆزێکی نەناسراو بەجێ بێڵم و بێ ئاگادار کردنەوەیان بڕۆم.

بەهەرحاڵ جۆرێك ئازایەتی درۆینە لەمن دا دروست ببو بەهەنگاوە بەرزەکانم خۆم گەیاندە لای ئەستێڵکەکە و لەوێوە خۆم گەیاندە ئەوبەر ئاو و بەدوای کچ و پیاوەکەدا رۆشتم.

کاتێك گەشتمە ناوەڕاستی ئاوەکە دەنگێکی ئاشنام بیست کەمن بەناو بانگ دەکات. ئاوڕم دایەوە..... نیکیم بینی لەولای ئاوەکە وەستاوە و لەکاتێکدا قژە تەرەکانی خۆی دەگوشێت تا وشك ببێتەوە دەیوت:

بۆ کوێ دەڕۆیت. بوەستە..... تەنیا مەڕۆ، چ کارێکت لەوێ هەیە؟

وەڵامی پرسیارەکەیم نەدایەوە بەڵام بێ ئیرادە وتم:

نیگەران مەبن بەدوای راودا دەڕۆم. لەوێ بمێننەوە تا دەگەڕێمەوە و ئەگەر شوێنەکەتان گۆڕی لەسەر دارەکە نیشانە دابنێن تا شوێنەکەتان بدۆزمەوە.

هەرچی بو، من وتم و رۆشتم. رێگایەك کە پیاوەکە کچە جوانەکەی بردبو، دیار بو

چونکە لە بەستێنی چەپی ئەستێلک ڕێگەیەکی تر مەگەر ئەوەی کەمن دەڕۆشتم و کاتژمێرێك پێشتر ئەوان ڕۆشتبوون، نەبو.

ئەو ڕێگا تایبەتیەش بەهۆی زۆری هاتوچۆی دانیشتوان دروست ببو ودیار بو هەندێك لە دارەکانیان تازە بڕیوەتەوە تا ڕێگەی جەنگەڵ بەرفراوانتر و هاتوچۆ ئاسانتر بێت.

هێشتا سەد هەنگاو نەڕۆشتبووم کەچاوم بەگوڵێکی سپی ناوڕێگا کەوت، دەست بەجێ چەمامەوە گوڵەکەم هەڵگرت و لە لووتم نزیك کردەوەو بۆنم کرد.

چ بۆنێکی دڵگیر بو، بۆنێك کە لەبازارەکانی فەرەنسا دەست ناکەوێت. گوڵی وەحشی جوانیەی سەر سوڕهێنەری بو شێوەو بۆنەکەی بێ وێنەبو لەدنیای پێشکەوتو هیچ گوڵێك وەك ئەوە بوونی نیە.

کاتێك زانیم گوڵەکە بەقژی کچە وەحشیەکەوە بو، بەحەزو تامەزرۆیەکی زیاترەوە بۆنم کرد. سەیرە !

بەڕاستی پیاوێکی خراپ بووم. ڕەنگە بەهەمان ڕادە خراپ و لەبەرانبەر هەواو هەوەس بێ ئیرادە لای ڕەگەزی ناسکی ژن بێ هێزو کەم دەسەلآت بم.

ئێستا گوومان دەکەم گۆرانکاریم تیادروست بووە وەك جاران لەبەرانبەر ژنان سست نیم و دەتوانم خۆراگریم بەلآم دەبێت ئەم خاڵە لە ژنان بپرسن.

بۆئەوەی گوڵەکە نەژاکێت دام لەکلآوە حەسیرییەکەم و بەخێراییەکی زیاتر بەڕێکەوتم.

شوێن پێی پیاوەکەم لەسەر زەوی نمداری جەنگەڵ کە کەمتر نووری هەتاوی دەدی، بینی و بەیارمەتی ئەم شوێن پێیە دەڕۆشتمە پێش. بەم دڵنیاییە کە بەزووی ئەو هۆزەکەی دەدۆزمەوە و کچەکە ڕزگار دەکەم.

نزیکەی کیلۆمەترێك ئەولاتر گەشتمە قامیشەلآنێکی گەورە و لەوشوێنەی کە قامیشەلآن چڕو پڕ بو شوێن پێی ئەوم ون کرد.

خەم و پەژارەیەکی زیاد لەڕادە دڵی داگرتم. وەك پیاوێکی بازرگان کە دەیان پاپۆڕی لەدەریادا گیرۆدەی تۆفان و نوقم بوبێت لەناو ئەندێشەیەکی خەماویدا ڕۆچووم.

بڕیارمدا لەقامیشەلآن تێپەڕم. کارێکی زۆر مەترسیدار بو.

بەدڵنیاییەوە دەمزانی ئەگەر بڕۆمە ناو قامیشەلآن لەزیانی شێر و مار لەئەماندا نابم. لەگەڵ ئەوەشدا چونکە نەمدەتوانی فەرمانی دڵم جێ بەجێ نەکەم ڕۆشتمە ناو

قامیشەڵان دەستم بەپێشڕەوی کرد. هێشتا سەد هەنگاو نەڕۆشتبووم کە دەنگی نەڕەی شێر لەچەند هەنگاوی من بەگوێ گەشت.

بۆکردنەوەی ڕێگا ناچار قامیشەکانم دەشکاند و شکاندنی قامیشەکان دەنگێکی لێوە دەهات کە سوڵتانی جەنگەڵ باشی دەناسی.

نەڕەی ترس ئەنگێزی شێر وەك دەنگدانەوەی قورسی مەرگ گیرۆدەی ترسی کردم و بێ ئیرادە دانیشتم بەڵام کاتێك دووبارە دەنگی نەڕەی شێر بەرزبوویەوە هەستم بەوەکرد لەگەڵ ئەو ئاژەڵە دڕندە دا زۆر دوورنیم. هیچ ڕێگایەك بۆ رزگاری نەبو.

ئێستا شێربو کەبەدوای سزا دەگەڕا.

دەنگی خشە خشی قاچیم دەبیست کەلەسەر قامیشەکان دەڕوات و دێتە پێش. شێر شوێنی منی دۆزیەوە و راستەوخۆ لەو شوێنەی کە من دانیشتبووم نزیك دەبوویەوە. لەترسا نزیك بوو شێت بم. سەد جار لەعنەتم لەخۆم کرد کە بۆ چاو و گوێ بەستراو گیانی خۆم خستۆتە مەترسیەوە و لەهاوڕێکانم جیابوومەتەوە.

ئەوەندە ترسابووم هەستم بەتێپەڕبوونی کات نەکرد و نەمزانی چەند خولەك تێپەڕی کە کتوپڕ قامیشەکانی بەرانبەڕم تەکانی خوارد و سەری شێر بەو گەورەییە و ئەو دیانە خوێناوی و زەرد رەنگەی ئەو چاوە قووڵانەی لەبەرانبەر مندا دەرکەوت.

مەرگ نزیك بوویەوە.....

توانایی ئەوەم نەبو سیلاحەکەم بەکاربێبەم.... وەك دار وشك و بێ جووڵە بووم و چاوەرێی مەرگم دەکرد بەڵام لەناکاو موعجیزەیەك روویدا.... موعجیزیەکی سەیرو باوەڕ پێنەکراو.

شێر چەند جارێك سەیری کردم. پێڵوەکانی چاوی لەیەك داو سەری کێشایە دواوەو دووبارە لەناو قامیشەکاندا لەبەرچاوی من ون بوو.

من وەك مردویەك کە دووبارە گیانی گرتبێت دەست و پێی وشك وساردی خۆم جووڵاندو هێواش هێواش خۆم کێشایە دواوە.

چەند هەنگاوێك رۆشتمە دواوە و سەرئەنجام لەشوێنەکەم هەستام و بەخێراییەکی نەشیاو بێ گوومان لەقامیشەڵان رامکردە دەر و لەپشت دارە چرەکانی جەنگەڵ خۆم داشارد.

نزیکەی چارەکە کاتژمێرێك پاڵم بەدارێکەوە دا تا هاتمە خۆم و لەرێگایەکیترەوە دەستم بەپێشڕەوەی کرد ئەم رووداوە و رزگاربوونە موعجیزە ئاسایی خۆم بەخاڵی باش

گرت و شادمان بووم.

بەڕێکەوت چەند هەنگاو ئەولاتر لەناو سەر سەوزیەکی سروشتی کەخاکی نێوان دارەکانی وەك مەنجەڵێکی خەوتو و بەئاگا سەوزو دڵرفێن کردبو، سێیەم گوڵی قژی کچەکەم دۆزیەوەو تازە تێگەشتم رێگەی قامیشەلاّن هەڵەبو رێکەوت منی بۆ رێگایەکی سەرەکی کە ئەوان رۆشتبوون، رێنوێنی کردوە. شوێنێکی دڵ ئەنگێز بو. دەتوت سروشت باخەوانی کردوەو دارەکانی بەدوورەیکی تایبەت لە خاکدا رواندوەو چیمەنی لەناو دارەکاندا چاندوە. یاسی سپی و وەحشی لێرەو لەوێ لەناوەڕاستی فەرشی سەوز رەنگی چیمەن روابوون و دەتوت دەستی رۆژگار مشتێك مرواری سپی گەورەی لەسەر مەخمەڵی سەوز بەشێویەکی نارێك پرژاندوە.

چیمەن بەهەمان شێوە و بەهەمان جوانی درێژەی بو.

ئەولاتر شتێك سەرنجی راکێشام و کەڕۆشتمە پێش بەوپەڕی سەرسوڕمان پارچەیەکی پەمەیی رەنگ کە کچەکە لەناوچاوی خۆی بەستبو، لەسەر چیمەنەکە دۆزیەوە.

زانیم ئەوان لەو نزیکەدان.

دۆزینەوەی ئەو پارچە گەرمی منی زیاد کردو بەخێرایی هەنگاوەکانی خۆم زیاد کرد.... بیست هەنگاو ئەولاتر پێستی پڵنگ ئەو پێستەی کە وەحشیەکە لەبەری کردبو، دۆزیەوە.

لەوێ بەدواوە لەسەر خۆی دەڕۆشتمە پێش، یەك یەك دارەکانم پشت سەرنا تا شوێنێك دەنگی قسەکانیانم بیست و وەستام.... ژن و پیاوێك پێکەوە قسەیان دەکرد بەلاّم لەزمانەکەیان حاڵی نەدەبووم. زەختم لەخۆم و یادگەم کرد رەنگە شتێك لەقسەکانیان بگرم بەلاّم بێ ئەنجام بو...

خولەکێك تێپەڕی لەناکاو کچەکە قاقایەکی لێداو لقی دارە کورتەکانی من تەکانی خوارد و ئەو دەرکەوت خۆم داشارد. ئەویش منی نەبینی و بەڕاکردن بەرەو لایەکیتر رۆشت.

پیاوی وەحشی بەدوای ئەودا رایدەکرد و بەئیشارەی دەست داوای وەستانی لێدەکرد.

بێ بیرکردنەوە لەئەنجامی کار سیلاحم خستە سەر دەست و دوای تەقاندنی دوو فیشەك خۆم بەوان گەیاند. ئێستا ئەگەر کەسێك لەمنی دەپرسی لەوکاتەدا لەسەر چ

حسابێك ئەو کارەم کرد خۆشم نازانم و ناتوانم وەڵامێکی راست و قەناعەت پێکەر بدەمەوە.

هەردووکیان سەرسوڕماو سەیری منیان دەکرد. کچەکە سەیرێکی سەراپامی کردو رەنگە لەخۆی دەپرسی من کێم و لەوێ چی دەکەم، چ کارێکم بەوان هەیەو بۆ بوومەتە ئەرك بۆیان.

لای خۆم واگوومانم دەکرد کچەکە لەوەی لەچنگالی ئەو پیاوە وەحشیە رزگاری دەبێت سوپاسی من دەکات و خۆشەویستی منی لەدڵدا دروست دەبێت و لەکاتێکدا راستی شتێکی تربو کاتێك بابەتەکەم بۆ روون بوویەوە زانیم چ هەڵەیەکی گەورەم کردوە.

ڕەش پێستی چوارشانە سەرەتا واقی وڕمابو کەمێك رۆشتەدواوە بەڵام دواتر هەنگاوێك هاتە پێش و بەدەست کێشای بەسینەمدا.

دیاربو کەسیلاحەکەی من ناناسێت و لێی ناترسێت چونکە بێ ترس پەلاماری دام تا لەدەستم رزگاری بێت.

دەستی کچەکەم بەرداو ئەو وەك منالێکی گوێڕایەڵ رۆشتە سووچێك و چوار ئەژنۆ لەسەر گیانداندارەکان دانیشت.

شەڕی ئێمە بۆ ئەو سەرنج راکێش بو دەیویست شەڕێك کەلەسەر ئەو دەستمان پێکردوە توندو تیژتر و مەترسیدارتر بێت.

توانای ئەوەم لەخۆمدا نەدەبینی لەگەڵ ئەو ڕەش پێستەدا دەستەویەخەبم. ئەو بەمشتێك ئێسقانی سینەمی وورد دەکرد و ئەگەر ئەندامێکی جەستەم بەردەستی بکەوتایە ئەوەندەی دەگووشی کەخوێنی جەستەمی دەمردو شوێنەکەی شێن دەبوویەوە.

بۆئەوەی توانای تفەنگەکەمی نشان بدەم چەند هەنگاوێك رۆشتمە دواوەو بەخێرایی لقەکانی سەر سەرم نیشانەگرت و تەقەم کرد. لەسەرتا لەدەنگی ڕەشاشەکە ترسا و چەند هەنگاوێك رۆشتە دواوە و دوای ئەوەی لقی دارەکان شکاو رژایە سەر سەری، ئەنجامی کاری خۆی زانی و قیافەیەکی داماوی بەخۆی گرت و چەند هەنگاو دوورتر لەکچەکە بەسەر سوورمانەوە سەیری ڕەشاشەکەی منی دەکرد.

ئیرادی کار لەوەدابو نەئەوان لەقسەکانی من حاڵی دەبوون و نە من لەزمانی ئەوانم دەزانی. بەهەرحاڵ گوومانم کرد دەبێت دەستی ببەستمەوەو لەگەڵ کچەکە بەرەو هۆزی

ئەوان بڕۆم.

بەخێرایی ئەم گوومانەم خستە قۆناغی جێ بەجێ کردنەوە و بەتەنافێك کە لەجیاتی کەمەر بەند بەکەمەرم بەستبوو، دەستی ڕەشە تووڕەکەم لەپشتەوە بەست و بەئیشارەی دەست تێمگەیاند لەگەڵمان بێت. بابەتی سەرنج ڕاکێش ئەوەبو کە کچەکە لم ڕووداوە ناڕازی نەدەهاتە بەرچاو هەندێ کات وەك خۆڕایی دەستی کەوتبێت بەچێژو غرووریەکی تایبەتەوە سەیری دەکردم.

لەنیگاکانی ئەو هیچ حاڵی نەدەبووم و زیاتر سەرنجم لای پیاوەکە بو کەبەدەستی بەستراو مەك مەڕێك کەلەکاتی ئاوابوونی خۆر بەرەو ئاخۆڕ دەڕوات، لەپێشەوە دەڕۆشت و تەنانەت پشتە سەری خۆی یانی سەیری من و کچەکەی نەدەکرد.

من نەمدەزانی دواتر چی پێش دێت بەڵام ئەوان لەئەنجامی ئەو ڕووداوە کە بەهۆی لەخۆڕازی بوونی من دەستی پێکردبو، ئاگادار بوون. بۆیە یەکەمیان زیاد لەرادە تورە و ئەویتریان زیاد لەڕادە رازی دەهاتە بەرچاو. لەنیوەی ڕێگا پیاوی ڕەش پێست کە زۆر لەپێش ئێمەوە دەڕۆشت لەچاوو ون بو. دەمویست بەدوایدا بڕۆم و بیوەستێنم بەڵام کچە جوان و پێست قاوەییەکە ڕێگەی لێگرتم و بەئیشارە تێی گەیاندم کە ڕۆشتنی ئەو لەپێشەوە گرنگ نیە.

لەو شوێنە کەنزیکەی ڕێگاکەمان بڕیبو، کچەکە دانیشت.

ئەو بەتەواوی هیلاك ببوو.

چەند ساتێك چاوەکانی خۆی بەنازو غرووری ژنانە بەست، دواتر سەیری منی کردو بەدەست ئیشارەی کرد کە لای دانیشم.

ئەو کچێکی وەحشی بو. پێستێکی قاوەیی و قژی ڕەش و لوول بو. کاتێ پێدەکەنی دیانە سپیەکانی دیمەنێکی سەرنج ڕاکێشیان بەڕوخساری دەدا.

ئیشارەی کرد لای دانیشم. منیش بێ درەنگ کردن لەپاڵیدا جێگیر بووم و پێش هەر کارێك بە ئیشارە ناویم پرسی:

نازانم هیچ کات گیرۆدەی زمانی حاڵی نەبوون بوون؟ کاتێك دوو کەس زمانی یەك نازانن، ئاو، نان، خەو،خواردن، جل و بەرگ دەتوانن بەئیشارە لەیەك حاڵی بکەن بەڵام پرسینی ناو کارێکی دژوارە.

نیو کاتژمێر زیاتری خایاند تاتێگەشت کەناوی دەپرسم. کاتێك مەبەستەکەی منی زانی قاقای لێداو بەشێوەیەکی شیاوی تێگەشتن وتی:

یامی لوما.... لوما

زانیم ناوی لومایە و یامی بەمانای ناوی منە.... ئەویش ناوی منی پرسی بەڵام هەرچی دووبارەم کردەوە نەیتوانی جوان بیڵێت و سەرئەنجام هیلاك بوو پەشیمان بوویەوە.

هەستاین و بەڕێکەوتین.

لەقەراغ باکووری ئەستێلك لوما چەند گوڵێکی وەحشی جوانی لەلای راستی خۆیداو بەدوای من هاتە ناو ئاوەکە.

من رێگام بەرەو شوێنێك کەیوری و ئەمانۆو نیکیم لێ بەجێهێشتبوو، خوارکرد بەڵام بەوپەڕی سەرسوڕمان ئەوێم بەچۆڵی بینی. بیرم کردەوە کەبڕیاربو شوێنی تازە لەسەر دارەکە نشانە بکەن.

دەستم بەگەڕان کرد و زۆر خێرا دارێك کەیوری ئەم چەند وشەی لەسەر هەڵکەندبوو، دۆزیمەوە، یوری نوسیبووی:

ئێمە رۆشتووینەتە هۆزێك لەم دەوروبەرەدا. ئەوان خەڵکێکی بێ ئازارەو تاڕادەیەك شارستانین.

هۆزی نزیك هۆزەکەی لومابو. زیاد لەڕادە شادمان بووم بەڵام لەروبەڕوبوونەوەی لە ئەمانۆو نیکی دەترسام. ئەوان حەسوودیان لەیەك دەکردو ئێستا کەژنی سێیەم دەرکەوتبوو و ئەویان لای من دەدی، چۆن دەیانتوانی ئارام بن.

کچەکەش منی بەرەو هۆز رێنوێنی کرد و رازی بو کەبێ خۆڕاگری لەگەڵیدا دەڕۆم.

چەند هەنگاو ئەولاتر لوما وەستا. دەستی لەدەوری دەمی ئاڵقەکرد و دەنگێکی هاوشێوەیی شەمەندەفەر لەقوورگ دەرکردو بێدەنگی ئەو بەشەی جەنگەڵی شکاند.

دوای ئەم دەنگە من بەڕێکەوتم، بەڵام ئەو ئیشارەی کردو تێیگەیاندم دەبێت بوەستم و لەو شوێنەدا چاوەڕێ بکەم. لوما دەستی تەکان دەدا و من وام هەست کرد کەدەڵێت تاقمێك بۆ بردنی ئێمە دێن.

یانی چی؟

ئەگەر ئەوەی من لەجووڵەکانی دەستی هەستم پێکردبێت بۆ دەبێت تاقمێك بێنە ئێرە.

چارەیەکم جگە لەلایەنگری کردن لە لوما نەبو. لەو یەك دوو کاتژمێرەدا پەیوەندیەکی نزیك لەنێوانماندا دروست ببو. ئەو جۆرێك هەڵس و کەوتی دەکرد وەك

بڵێی ژنێکی وەفادار خۆشەویستی بۆ هاوسەرەکەی دەردەبڕێت.

لوما لەشوێنەکەی بەشادمانیەوە هەستاو دەستی بەسەماو هەڵپەڕکێ کرد.

مانای کردەوەکانی ئەوم نەدەزانی و هەرچەندە زەختم لەمێشکی خۆم دەکرد ولەو زانیاریانەی پێشتر هەمبو کەڵکم وەردەگرت نەمدەتوانی هەست بکەم هۆکاری شادی و سەماکردنەکەی چیە.

دەنگی های هوو و گامب گامبی تەپڵەکان سات بەسات نزیکتر دەبو. ئەوەندەی نەخایاند لق و گەڵاکان تەکانیان خوارد و چەند ڕەش پێستی چەکدار کە یوری لەناویاندا بو دەرکەوتن.

سەرەتا رەنگ بەروخسارمەوە نەما و بەگوومانی ئەوەی ئەوان یوریان دەستگیر کردوە و دەیانەوێت منیش بگرن زیاد لەرادە ترسام بەڵام روخساری پێکەنیناوی و چاوە درەوشاوەکانی یوری هەموو گوومانەکانی منی پوچەڵ کردەوە.

وەحشیەکان لەدەوروبەری من و لوما دەستیان بەسەماکردن کرد و یوری لەکاتێکدا بزەیەکی گاڵتە ئامێزی لەسەر لێو بو بەرەو لام هات و وتی:

سەرۆک دووبارە دەستە گوڵت بەئاودا. ئەمە چ کارێك بو کردت..... بۆ ژن و مێردێکی گەنجت لەیەك جیاکردەوە.

وتم:

مەگەر چی بووە..... جیاواز لەوە ئەوان ژن و مێرد نەبوون. بەچاوی خۆم بینیم پیاوێکی چەکدار کەپێستی پڵنگی لەبەردابو ئەم کچەی لای ئەستێڵکەکە رفاندو لەگەڵ خۆیدا بردیە جەنگەڵ.

یوری سەری خۆی تەکانداو وتی:

هەموو ئەمانەی تۆ دەیڵێیت راستە بەڵام ئەوەی تۆ بینیت دیمەنێکی دەسکردو تەشریفاتیە لەئاهەنگی بووك و زاوا.

لەم هۆزەدا رەسم وایە کەزاوا بووك بڕفێنێت و لەگەڵ خۆیدا بیباتە جەنگەڵ و تایەك مانگ ئەوان مافی گەڕانەوەیان بۆ ناو هۆز نیە.

من کەتازە هەستم بەڕاستی رووداوکە کردبو گوڵ پرژاندنی پیرێژنەکان و عەشقبازی و پێکەنینی ئەوانم بیرکەوتەوە، شەرمەزار بووم و بۆئەوەی بەڕوی خۆمدا نەهێنابێت وتم:

ئێستا کارەکەی من خراپە، بەڵام ئەمانە بۆ بەدەوری ئێمەدا سەمادەکەن.... ئەم

کارانە چ مانایەکیان هەیە.....

یوری ئەم جارەش سەری بەداخەوە تەکانداو وتی:

ئێستا تۆ بوویتە زاوا.

بەسەرسوڕمانەوە وتم:

من...... چی دەڵێت..... باوەڕناکەم.

یوری پێکەنی و درێژەی دا.

باوەڕبکەن چونکە رەسم وایە ئەگەر کچکە خوازبینیکەری تری هەبێت لەماوەی ئەو یەك مانگەدا کە بووك و زاوا دەڕۆنە جەنگەڵ دەتوانێت شوێنەکەیان بدۆزێتەوەو کچە خۆشەویستەکەی خۆی لە مێردەکەی برفێنێت. لەم بگرەوبێنەدا هەرپیاوێك سەرکەوت کەچکەی هی ئەوەو تۆ چونکە ئێستا مێردی ئەم کچەیت شکەست داوە و دەستیت بەستۆتەوە، بەرەسمی مێردی ئەویت و بەهیچ بیانویەك ناتوانیت لەم هاوسەرگیریە پەشیمان ببیتەوە. ئەوان ئێمەیان بەرێزو خۆشەویستیەوە بۆدتەوە هۆزەکەی خۆیان و ئێمەش ناچارین یاسا نێوخۆییەکانی ئەوان جێ بەجێ بکەین. ئێستا ئێوە زاوان و ئەم سەماکردنەش لەبەر جەژنی زاوایەتی ئێوەیە، فەرموون..... ئەمانۆ و نیکی وەك دوو مێچکە شێری درەندەو خوێنخۆر چاوەڕێتان دەکەن کە پاداشتی ئەم هەموو هەوەسبازیەتان بدەنەوە.

یوری ئەمەی وت و لەگەڵ سەرۆکەکانی هۆزدەستی بەقسەکردن کرد و پێی راگەیاند کەزاوا بۆ بەسەر بردنی شەوی بوکێنی ئامادەیە.

دەتوت دنیایان کرۆتە خەم و پەژارە و لەناو دڵی مندا دایان ناوە ئیتر سەرنجم لای لومان و جوانیەکانی ئەو نەبو و زانیم چ کارێکی قێزەونم کردوە بۆیە دەمویست هەڵەی ئەنجامدراو قەرەبو بکەمەوە.

کاتێك گەشتینە هۆز ئاژاوەیەکی سەیر دروست ببو.

کۆمەڵێك ئاگریان هەڵگیرساندبوو لەدەوری کۆببوونەوە و لەناو قەرەباڵغی رێگەی ئێمە لای ئاگرەکەوە تێپەڕ دەبو و من لەکاتی تێپەڕین ملم کێشاو سەیری ناو قەرەباڵغیم کرد.

دیمەنی ناڕەحەتکەرم بینی..... ئەو پیاوە ڕەش پێستە، یانی هاوسەرەکەی لوما بەدەست بەستراوی لای ئاگرەکە بینی و کەدەیانویست داغی بکەن.

بەڕاکردن خۆم گەیاندە لای یوری و قۆڵیم گرت و وتم:

بۆ لەمن دوور دەکەویتەوە؟ ئەمە چ کارێکە؟ من زمانیان نازانم تۆش ناتەوێت قسەکانی من بۆ ئەوان وەرگێڕێتەوە. ئەوان گوومان دەکەن من بەڕاستی پێشتر لومام خۆش ویستووە و بۆ بەدەست هێنانی ئەم کارەم کردوە. ئەگەر تێبگەن روداوەکە بەهۆی هەڵەیەکەوە ئەنجامدراوە هەموو شتێك کۆتایی پێدێت و منیش ئاسوودە دەبم. ئەگەر ئەم شەو من لەگەڵ لوما تەنیا جێ بێڵن بەیانی نیکی و ئەمانۆ رادەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ هۆزەکەی خۆیان و چونکە ناتوانن ئەم رێگایە ببڕن دەکوژرێن. بۆ نەیاری دەکەیت؟ بوەستە و قسەکانم بۆ ئەوان وەرگێڕە.

یوری بەبێزاریەوە وەستاو وتی:

سەرۆك چ قسەیەکتان هەیە......؟ کار تەواو بووەو دانەوەی ئەم کچە بەهیچ جۆرێك ئەگەری نیە.

بەتووڕەییەوە وتم:

مێردەکەی بۆ ئەشکەنجە دەدەن.

یوری بەپەنجە یەکێك لەڕەش پێستەکانی نیشاندام و وتی:

سەیرکە..... ئەوە دەبینی؟ لەسەر ناوچاوی نیشانەیەکی تایبەتە کەنیشانەی نەشیاوی و دەست و پێ سپیەتی ئەوە. ئەو پیاوە کەناوچاویان داغ کردوە لەدەستەی ئەو پیاوانەیە کەلەماوەی یەك مانگەکەدا ژنەکەی تەسلیم بە رکەبەرەکەی کردوە.

هەرکەس گیرۆدەی ئاوا چارەنوسێك ببێت ناوچاوی داغ دەکەن. ئەنجامێك کەلەم داغ کردنە بەدەستی دێنێت ئەوەیە بۆهەتا هەتایە بێ ژن دەمێنێتەوە و هیچ بێوەژنێك یان کچی ناشرینیش ئامادە نابن شووی پێبکەن. کەسانێك کە ئەم شوێن داغە لەسەر ناوچاویانە بەناتەواوترین کەسەکانی هۆز دەژمێردرێن. ئێستا دەیانەوێت هاوسەرەکەی لوما داغ بکەن.

بەبیستنی ئەم رستانە نزیك بو شێت ببم. ویژدانم لەئازاردا بو وخۆم بەلێپرسراوی بەدبەختی مرۆڤێکی زیندو دەزانی. ئەوان نەیاندەزانی من بەهۆی ڕەشاشەکەی خۆم ئەوم بەزاندوە. کێ دەیزانی؟ هەمووان گوومانیان وابو من بەهێزی بازوو شەڕی دەستەو یەخە ئەوم شکەست داوە. دووبارە داوای یارمەتیم لە یوری کرد، ئەو بۆئەوەی منی تەمێ کردبێت بەهیچ جۆرێك ئامادەی هاوکاری کردن نەبو و هەر جارەو بیانویەکی دەهێنایەوە و بەڵگەیەکی نەشیاو بۆ رازی بوون نیشاندەدا، سەرئەنجام لێی بێ هیوا بووم و بەخێرایی لەریزی پێشوازیکەران جیابوومەوە بەرەو ئەو قەرەباڵغیە لەدەوری

ئاگرەکە کۆببوونەوە رامکرد.

تاقمێك لەرەشەکانم بەدەست پاڵ پێوەنا تا سەرئەنجام خۆم گەیاندە هاوسەرەکەی لوما. کاتێك گەشتم کەدەیانویست ئاسنە سوورەبووەکە لەسەر ناوچای دابنێن.

من ئەم کارەم بەوەحشیانە دەزانی و خۆم بەلێپرسراوی دەناسی. ئەگەر لەوکاتەدا جارێکیتر یوری رێگری لێ دەگرتم و یان قۆڵی دەگرتم و بیویستایە لەم کارە پەشیمانم بکاتەوە بەمشت لەدەمیم دەداو رسواییەکی ترم دروست دەکرد.

کاتێك کە پەریمە ناوە قەرەباڵغیەکە هەموان بەچاوی سەرسوڕمان سەیریان دەکردم بەڵام کارەکەی خۆیان نەوەستاند.

سەیر ئەوەبو کە هاوسەرەکەی لوما بەسەبرو تاقەت و بەنارەحەتیەوە ئەم لاوازیەی قبووڵ دەکرد و خۆی بەدەستی ئەوان دابو کەهەرچیان دەوێت بیکەن. نەقیژەیەك، نەخۆڕاگریەك، نەپەلە قاژەیەك..... هیچ، وەك مەرێك دانیشتبوو و دەستەکانی بەرزکردبوویەوە.

دانیشتوانی هۆزیش بۆ ئەنجامدانی رێورەسمی تایبەتە ئاسنیان سورکردبوویەوە و دەیانەویست ناوچاوی داخ بکەن و بۆتەمەنێك بەداماوی و تەنیایی مەحکومی بکەن.

یوری و یەکێك لەگەورەکانی هۆز بەدوای مندا دەست بەجێ هاتنە ئەوێ، لوماش بەناوچاوی مۆن و تاڵ لەگەڵیانا هات.

ئەو نەیدەویست روداوێك کەڕویدابوو، تێك بچێت. بەدڵنیاییەوە منی زیاتر خۆش دەویست چونکە بە بەراورد لەگەڵ هاوسەرەکەی چەندین ئیمتیازی لەمندا دەبینی کە لەودا نەبو. من دەستی کەسێك کەئاسنەکەی سورکردبوویەوە و دەیویست ناوچاوی هاوسەرەکەی لوما داغ بکات گرتم و گووشیم. ئەو مانای ئەو کارەی منی نەدەزانی و بەگوومانی ئەوەی بۆشەڕی دەست و یەخە بانگێشتی دەکەم ئاسنەکەی فرێداو خەنجەرەکەی لەکەمەر کێشاو پەلاماری دام.

چاوەڕێی ئەم پەچە کردارەم نەبو. گوومان دەکرا لەمەبەستەکەم دەگەن و گوێ لەقسەکانم دەگرن و لەئەنجامدا بێ ئەوەی روداوێکی ناخۆش روبدات هاوسەرەکەی لوما بەردەدەن بەڵام بەپێچەوانەی گوومانی نم بارودۆخ زیاتر خراپ بو.

دەوروبەری من و ئەو بەخێرایی چۆڵ بو، هاوسەرەکەی لومایان بەقاچی بەستراو بردە دواوەو ئاگرەکەشیان کوژاندەوە

دواتر زانیم بەپێی رەسم هەر کات ئاوا بارودۆخێك بێتە پێش دەبێت شەڕو پێکدادان

ئەنجام بدرێت. بۆیە سەرۆکی هۆز یەکێك لە وەحشیەکانی نارد تالەجیاتی من لەگەڵ ئەو وەحشیەدا شەربکات.

کەسێك کەلە شەڕەکەدا ببوە جێگری من، ئێسقانێکی کردبوە لوتی و سەرو ملی بە پەڕی رازاوە رازاندبوویەوە. بازووی ماسوولکەیی وسینەیەکی پان و ملێکی درێژو ئەستووری بو لەسەریەك زۆر بەهێز دەهاتە بەرچاو.

کاتێك ئەو پەڕیە ناو گۆڕەپانی شەڕ، یوری لەدوورەوە بانگی کردم و تابڕۆمە لای. من نەمدەویست گۆڕەپانەکە چۆڵ بکەم سەرئەنجام لوما هات و دەستی منی گرت وبردمی.

شەڕێکی قورس لەنێوان ئەو دووانەدا دەستی پێکردو چاو نەترسانە پەلاماری یەکیان دەدا. سەرەتا گوومانم کرد شەڕەکەیان تەشریفاتی بۆ نمایشە و یەکتر بریندار یان ناکوژن بەڵام چەند خولەك دواتر لەیەك ئاڵان و لەخاکدا تلان زانیم شەڕەکەیان بەڕاستەو دەبێت یەکێك لەو دووانە بکوژرێت.

بەهەنگاوێکی بەرز خۆم بەیوری گەیاندو وتم:

هەمووی ئەم روداوانە تۆ دروست کردو ئێستا وەستاویت و سەیر دەکەیت..... تۆ کەوتووی بەقینا. ئەم کارانە چ مانایەکیان هەیە..... بۆ راستی بەسەرۆکی هۆز ناڵێیت..... ئاخر تۆش کارێك بکە... ئەگەر ئەوان راستیەکان نەزانن نیکی و ئەمانۆ دەتۆرێن و یەکێك لەم دوانەش دەبێت بکوژرێن.

من تووڕە ببوم، خوێن رژابووە روخسارم و چاوەکانم سوڕ ببو.... لەتوڕەییدا دیانەکانم لەیەك گیر دەکردو قاچم لەزەوی دەکوتا و لەگەڵ یوریدا قسەم دەکرد.

نیکی و ئەمانۆ لەوێ نەبوون. لەوکاتەوەی زانیبویان من بەدوای لومادا رۆشتم دوژمنایەتی و حەسوودیان لابردبو ببونە هاوڕێ. ئەوان دەیانویست لەئەگەرێکدا شوکردنەکەی لوما بەمن ببێتە راستی بڕۆن وبەجێمان بێڵن. ئەوان نەیاندەتوانی بەرگەی بوونی ژنی سێیەم لەژیانی خۆیاندا بگرن.

یوری کەمنی تووڕە بینی بزەیەکی لێداو بێ ئەوەی وەڵام بداتەوە بەرەو لای سەرۆکی هۆز رۆشت و دەستی بەقسەکردن کرد. ئەو قسەی دەکردو سەرۆکی هۆز سەری وەك پشت راست کردنەوەی قسەکانی تەکان دەدا.

زۆر جوان جووڵەکانی ئەوانم لەژێر چاودا بو چاوەرێی ئەنجامی کاربووم. لەناکاو دەنگێکم بیست.... دەنگێکی سەیر... دەتوت مانگایەکیان بۆ قوربانی کردن لەزەوی

دابێت. ئاوڕم دایەوە و سەیری گۆڕەپانی شەڕەکەم کرد.

کەسێك کە لەجیاتی من شەڕی دەکرد ئەویتری لەسەر دەست بەرزکردبوویەوە و کێشابووی بەزەویدا... ئێستا دەیویست بیکوژێت. ئەوانیتر چەپڵەیان لێدەداو سەمایان دەکردو شادی.... دەتوت لەوەی یەکێك لەهاوڕەگەزەکانیان دەکوژرێت شادمانن.

بۆ ئەوان جیاوازی نەبو کام لەم دووانە سەردەکەوتن... شادمانی گشتی هەروابو. بەڵام من خەریك بو شێت ببم. تووڕەبووم ولەهەمان کات نەمدەزانی چی بکەم.

بەباوەڕی من کەسێك کە خەنجەری کێشابوو منی بانگێشتی شەڕکرد، تاوانی بو بەڵام سزاکەی ئەوەندە بو سەری لەجەستەی جیابکرێتەوە و هەرئەوەندەی پشتی لەزەوی درابو دەستەکانی بەنیشانەی ناتەوانی بەرزکردبوویەوە، بەس بو وسەرکەوتوانە دەبوا وازی لیٚ بێنێت و لەسەر سینەی هەستێت. چەند جارێك قیژاندم و فەرمانم پێدا کە هەستێت بەڵام نەدەنگی منی دەبیست و نەگوێشی پیٚ دەدا. ئەو سەرقاڵی کاری خۆی بو و دەیویست سەری بەزاو لەجەستەی جیابکاتەوە. بەڕاکردن رۆشتمە لای یوری بەڵام ئەو وتی:

چارەیەك نیە. دەبێت یەکێك لەو دووانە بکوژرێت. رەسمی هۆزەکە وایە. دوای شەش ساڵ هێشتا عادەتت نەکردوە کەڕێز لەیاسای هۆزەکان بگریت. مافی ئێمە نیە خۆ لەکاری ئەوان هەڵقورتێنین. هەر ئەوەندەی تۆ لەمردن رزگارت بووە بەسە. بەئێمە چی ئەو دەکوژرێت یان یەکیتر. یوری قسەی دەکرد بەڵام هەرچی زیاتری دەوت، زیاتر تووڕە دەبووم. دەمویست بەبەرد بکێشم بەسەریدا. لە دڵڕەقی و بیٚ بەزەیی ئەو دوای چەندین ساڵ هاورێیەتی سەرم سوڕمابو، لەم کاتەدا دەنگی قیژە بەگوێم گەشت و کەئاوڕم دایەوە دەستی پیاوی بەزیوم خوێناوی و خەنجەری سەرکەوتووم سوڕ رەنگ بینی.

ئیتر نەمزانی چی بو، دنیا بەدەوری سەرمدا دەسوڕا... شێت ببووم و دەمویست هەموو دانیشتوانی هۆز بەڕەشاش بکوژم.

ئەگەر یەك خولەك.... نا تەنیا یەك چرکەیتر درەنگم بکردایە، ئەو پیاوە داماوە دەکوژرا. کەسی سەرکەوتو بەخەنجەر بەشێك لەملی هەڵدڕیبو و دەیویست ئەویتریشی هەڵدڕێت و سەری جیابکاتەوە.

بەدەست پاڵم نا بەو کەسانەی لەروبەڕومدا بوون و جارێکیتر خۆم گەیاندە گۆڕەپانەکە... سەرەتا دەمویست تەقە بکەم بەڵام ترسام تەقەکردن روداوێکی تری لێبکەوێتەوە بۆیە تفەنگەکەی یوریم سەرەو خوار گرتە سەردەست و بەرەو لایان

رامکرد.

یەك دوو كەس بەدوامدا قیژاندیان. دەنگی یوریشم بیست كە چەند جارێك بەدوای یەك دا وتی:

مەڕۆ..... مەڕۆ...... بوەستە.

بەڵام من گوێم نەدا وەك شێت رامدەكرد. دووری من و شوێنێك كەئەوان كەوتبوون، زۆر نەبو لەچەند چركەیەكدا بڕیم... كاتێك گەشتمە سەر سەریان سەركەوتو دەیویست خەنجەرەكە بەملیدا بێنێت و بەتەواوی بیكوژێت بەڵام دەرفەتی ئەم كارەی دەست نەكەوت.

لولەی تفەنگەكەم بەرزكردەوەو بەقۆناغەكە كێشام بەسەریدا بەشێویەك وەك گورگێكی تێر خواردو بەرز بوویەوەو دوو سێ هەنگاو رایكردو دواتر كەوت. لوما خۆی گەیاندە ئەوێ و لەبەرزكردنەوەی بریندارەكە یارمەتیدام.

ریزی تماشاچیەكان شێوا، تاقمێك بەرەولای ئەو هاتن و تاقمێكیش بەرەولای ئێمە هاتن و بریندارەكەیان لەسەر دەست بەرزكردەوە.

بەم شێوەیە بەشێوەیەكی كاتی ئەم ئاژاوەیە بێدەنگ بو هاوسەرەكەی لوماش لەداغ كران رزگاری بو. یوری خۆی بەمن گەیاندو بەشێوەیەكی تایبەت كە عادەتی بو وتی:

دەترسم ئەم كارەی تۆ ئاژاوەیەكی تازە دروست بكات. بەهەرحاڵ وەرە.... وەرە بڕۆینە لای نیكی و ئەمانۆ. نیكی و ئەمانۆ لەناو ژوورێكدا دانیشتبوون و دەرگاكەیان داخستبوو یوری لە دەرگایدا بەڵام وەڵام نەدرایەوە.... منیش لەدەرگامدا بێ وەڵام مامەوە.

دیاربو كە زیاد لەڕادە تووڕەن. لەناكاو ئەم بیرە بەمێشكمدا هات كە ئەوان لەئامادە نەبوونی ئێمە كەڵكیان وەرگرتووە وڕۆشتوون. قۆڵی یوریم گرت و وتم:

نەكا ئەوان رۆشتبێتن؟

یوری شانەكانی بەرز كردەوەو وتی:

نا...... بۆ هیچ شوێنێك ناڕۆن. لێرەن.

دواتر خۆی رۆشتە پێش و لەدەرگای دا..... چەند جارێك بەهێزی لەدەرگایدا و سەرئەنجام وتی:

گوێ بگرن. نیكی، ئەمانۆ، هەمووشتێك تەواوبو. لومامان گەڕانەوە بۆ هاوسەرەكەی. من و یوری بێدەنگ بووین لەبەرئەمە چپە چپی ئەوانمان لەپشت دەرگاكەوە

دەبیست. نیکی و ئەمانۆ راوێژیان دەکرد. باوەڕیان نەدەکرد لوما رۆشتبێت. خولەکێك زیاتر تێپەڕی و ئەوکات دەنگی کرانەوەی دەرگاکە بەگوێ گەشت و ساتێك دواتر روخساری فرمێسکاوی هەردوو ژنە جوانەکەی من لەناو چوارچێوەی دەرگاکە دەرکەوت.

بەم شێوەیە نیکی و ئەمانۆ لەگەڵ مندا ئاشت بوونەوەو بەبزەوە پێشوازیان لێکردم لەگەڵ ئەوەشدا قسەیان لەگەڵ نەدەکردم.

یەکێك لەوان لەم لاو ئەویتریان لەولا دانیشتبوون، یوری وتی:

هەستە، دڵیان بەرەوە.

بەڵام من ورەی ئەم کارەم نەبو.

ئەگەر سەرەتا دەڕۆشتمە لای نیکی ئەمانۆ دەتۆرا وئەگەر پێشتر دڵی ئەمانۆم دەدایەوە نیکی حەسوودی دەکرد. ناچار ئەم کارەم بۆ کاتێکی تردانا کە هەردوکیان لای خۆم بن و بەشێوەیەکی یەکسان و عادیلانە بتوانم دڵدانەوەیان بکەم.

کاتژمێرێك دواتر لەلایەن سەرۆکی هۆزەوە ئاگاداریان کردین کە دانیشتنێك بۆ دادگایی کردنی من سازدراوە و دەبێت بۆ رونکردنەوە بڕۆمە لایان.

من زمانی ئەوانم نەدەزانی بۆیە هاوڕێ لەگەڵ یوری بەرەو ژوورێك کەسەرۆکەکانی هۆز چاوەڕێیان دەکردم رۆشتم. جگە لەمن و یوری لوماو هاوسەرەکەی و پیاوە بریندارەکەو ئەوکەسەی من بەتفەنگ لێم دابو لەوێ ئامادەبوون.

وتوێژ درێژەی بو کەئێمە رۆشتینە ناو.

یەکێك لەپیرەپیاوەکان لەیوری پرسی:

ئەم پیاوە بۆ بەدوای لوماو هاوسەرەکەیدا رۆشت و لومای لەو جیاکردەوە ولەگەڵ خۆیدا بردی....

لوما بەچاوە ڕەشەکانی خۆی سەیری دەکردم. چاوەڕێ بو من خۆم بەعاشقی ئەو بناسێنم و بڵێم لەبەر خۆشەویستیەك کەبەرانبەر بەلوما هەمبو، ئەو کارەم کردوە ئەگەر ئەم وەڵامەم بدایەتەوە ناچار دەبووم لوما بکەمە هاوسەری خۆم و لەو هۆزەدا بمێنمەوە.

یوری پرسیارەکەی بۆ وەرگێڕامەوە بێ ئەوەی قسەبکەم دەستی بەبەرگری کردن کرد و لەسەرەتاوە تاکۆتایی هەرچی بو دەیزانی و پێویست بو وتی:

هەرسات کە تێدەپەڕی روخساری مۆن و تاڵی سەرۆکەکان زیاتر دەکرایەوە و دیاربو کەقسەکانی یوری کاریگەری لەسەر دانابوون و وردە وردە بۆچوونی ئەوان بەرانبەر

بەمن دەگۆڕا.

لەم ناوەدا چەند جارێکیتر پرسیارمان لەیەك کرد و لەئەنجامدا دەستیان بەراوێژکرد. تا بڕیاری کۆتایی دەرکەن.

لوما لەوەلامێك کەیوری دایەوە، ئازاری دەهاتە بەرچاو وسەری داخستبو وسەیری منی نەدەکرد. خولەکێك دواتر بڕیاری دادگای وەحشیەکان بۆ ئازاد بوونی من دەرکراو دانیشتنەکە کۆتایی پێهات. لەگەڵ ئەوەشدا بە یوریان راگەیاند کە بۆشەو جەژنێکی گەورە رێك دەخرێت و ئێمەش دەبێت بەشداری تیابکەین.

من ویوری شادمان گەڕاینەوە لای نیکی و ئەمانۆ.

بەم شێوە بابەتی لوماو مێردەکەی و ئەو روداوەی بەهۆی نائاگایی و لەخۆرازی بوونی من دەروست ببو، کۆتایی هات و لەوکاتژمێرەوە خۆمان بۆ بەشداری کردن لەجەژنەکەی شەودا ئامادەکرد.

ئەوان هەم خواردنی باشیان خواردبوو هەم حەسابوونەوە بەلاّم من برسی بووم و چاوەکانم قورس ببو دەمویست بخەوم. بەنیکیم وت:

من دەخەوم ئاگادار بە ئەمانۆ لەخەو هەڵم نەستێنێت.

کاتێك نیکی رۆشت بەئەمانۆم وت:

ئازیزەکەم دەخەوم ئاگادار بە نیکی لەخەوم نەکات.

لەوێوە بەدواوە حاڵی من لەگەڵ ئەواندا بەم شێوە بو. بەڵێنم بەهەردووکیان دەداو هەرکامیان هەستی دەکرد پەیوەندی من لەگەڵ ئەویتریاندا گەرم و گورترە. بەلاّم ئەگەر لەخۆمیان دەپرسی نەمدەتوانی جیاوازی لەنێوانیاندا بکەم. ئەمانۆ ژنێکی جوان بوو ئەو بەشێوەیەکی سەیر کاریگەری لەسەر مرۆڤ دادەنا بەلاّم نیکی نازو عیشوەی دڵڕفێنی بو.

بەهۆی هیلاکی زۆر خەوم لێکەوت و زۆر خێرا خەوێکی خۆش منی بردەوە کاتێك لەخەو هەستام کەس لەژوورەکەدا نەبو، هەواتاریك ببو چاوم هیچ شوێنێکی نەدەدی. بیرم نەبو لەکوێم شڵەژاو بەرزبوومەوە و سەرەتا دەستم درێژکرد و تفەنگەکەم هەڵگرت سەیرێکی دەوروبەرم کردو تازە زانیم لەکوێم. چەند جارێك نیکی و ئەمانۆم بەناو بانگ کرد بەلاّم وەلاّمم نەبیست..... دەنگی گامب گامبی تەپڵ لەدوورەوە دەبیسترا. دەنگی قەرەباڵغی بەگوێ دەگەشت دەتوت تاقمێك لەدوورەوە سەما دەکەن و گۆرانی دەخوێنن، هێشتا بەرەو دەرگا نەڕۆشتبووم کە منالێکی دە دوانزە ساڵە هاتە ژوور. تاچاوم پێی

کەوت بێ ئیرادە بیرەوەری شووماو گیانبازی ئەوم بیرکەوتەوەو فرمێسك لەچاوەکانمدا کۆبوویەوە......

مناڵەکە مەشخەڵێکی لەدەستدا بو و لەبەرئەوەی زمانیم نەدەزانی بەئیشارەی دەست رێنوێنی دەکردو دەیویست من لەگەڵ خۆیدا ببات.

زانیم کەنیکی و ئەمانۆ یان یوری رایانسپاردوە. لەگەڵیدا رۆشتم و منی بردە شوێنێك کە سەرۆکەکانی هۆز دانیشتبوون.

جەژن رەوتی ئاسایی خۆی گرتبووە بەر و ژنان وپیاوان سەمایان دەکرد. یوری لەولای سفرەکە دانیشتبوو کەمنی بینی بەدەست سلاوی کرد. هەستم کرد زۆر سەرحاڵە بەلام نەمدەزانی بۆ چاوەکانی خۆمارو پێڵوەکانی قورس ببو. ئەم حاڵەتە تەنیا لەکاتی مەستیدا لەو دروست دەبو. بەئیشارەی سەر لێم پرسی کەنیکی و ئەمانۆ لەکوێن؟ ئەو سەری تەکانداو وتی کەئاگادار نیە.

هێشتا خولەکێك تێنەپەڕیبو کەنیکی و ئەمانۆ لەگەڵ لومادا هاتن وهەرسێکیان دەستیان بە سەماکردن کرد. ئەوانیتر گۆڕەپانیان بۆچۆڵ کردن و رۆشتن.

هەر سێکیان یەك جۆر جل وبەرگیان لەبەرکردبوو یەك جۆر خۆیان رازاندبوویەوە بەلام جەستەی لوما ڕەشتر بو، ئەوان سەمایان دەکردو کەیەکێك لەسەرۆکەکانی هۆز دەفرێکی بچووکی گڵی لە شلەمەنیەکی ڕەش رەنگ پرکردبو دایەدەستم.

سەرقاڵی خواردنی گۆشت بووم. میوەی زۆری لێ بو بەلام نەمدەزانی گۆشتێك کەدەیخۆم هی چ ئاژەڵێکە ! سەرەتا گوومانم کرد شلەمەنی ناو دەفرەکە شەڕبەت یان ئاوی میوەیە بەلام هەرئەوەندی قومێکم لێ خوارد هۆکاری خوماری چاوەکانی یوریم زانی و هەستم کرد شەڕبەتەکە جۆرێك شەڕابی سروشتیە.

یوری هەمووکات لە هەموو شوێنێك توانای سەیری خۆی نیشانی من دەدا. لەشەڕ، لە رێگە رۆشتن، لەخۆراگری لەبەرانبەر کێشەکان ولەئەنجامدا لەخواردنەوەی شەڕاب. یەك دوو قومیترم لەو شەڕبەتە خواردو دواتر چاوەکانم ڕەش بوو دنیا بەدەوری سەرمدا سوڕایەوە. حاڵێکی سەیرم بوو نەمەست بووم نەوشیار. دەمویست هەستم و سەما بکەم بەلام هەر ئەوەندەی تەکانم دەخوارد دەکەوتم.

شادمان بووم بەلام توانای قسەکردنم نەبو.

نەکا فێڵێك لەکاردا بێت. ئەگەر ئێمەیان ژاراوی کردبێت چی بکەین ! لەکوێوە باوەڕمان بە هاوڕێیەتی ئەم پیاوانە هەیە کە شەڕابەکەیان دەخۆینەوە.

ئیتر نەمزانی چی بو چی روویدا و لەهۆش چووم. دیار نەبو چەند کاتژمێر لەوحاڵەدا ماومەتەوە کاتێك چاوم کردەوە نیکی و ئەمانۆ لەم لاولای من دانیشتبوون و بەچاوی پر فرمێسکەوە سەیریان دەکردم.

وایان دەزانی من مردوم و یوری هەرچی دەوت باوەڕیان پیّ نەدەکرد کاتێك هاتمە هۆش پێش هەرشتێك پرسیاری یوریم کرد وتیان:

رۆشتۆتە دەر تائامادەکاری بۆ رۆشتنمان بکات وهەنووکە دەگەڕێتەوە.

بەیارمەتی ئەوان لەشوێنەکەم هەستام و لەگەڵ ئەوەی گێژبووم رۆشتمە ناو ژوورەکە و دەستم بەرێگا رۆشتن کرد.

بارەکانمان لەسووچێکی ژوورەکەدا دەبینران. وادیار بو یوری هەمووشتێکی ئامادە کردوەو تەنیا چاوەڕیّ بوە من بەهۆش بێمەوە بەرێکەوین.

چەند خولەك دواتر یوری هات و تامنی بینی قاقا پێکەنی و وتی:

گۆزەیەك شەڕابیشم لێوەرگرتوون.

وتم:

ئەم گۆزە لەرێگادا دەشکێنم.

یوری پێکەنی و وتی:

گۆزەیەك کەمن هەڵمبژاردوە. کولەکەیەکە کەناوەکەی خاڵی و لەهەتاودا وشکیان کردوە. من ئەم شەڕابەم بۆ میوان دەوێت نەك بۆخۆمان.... نەکا بیر لەخواردنی بکەیتەوە؟

بەسەرسوڕمانەوە وتم:

ئێمە میوانمان نیە !

یوری لەکاتێکدا تفەنگەکەی هەڵەگرت وتی:

پەلە مەکە دەبینی لەکویّ میوانمان بۆ دەگات. چاوەڕیّ بە.

ئەمەی وت و دەستی بەهەڵگرتنی بارەکان کردو دەستووری بەنیکی و ئەمانۆدا کەبۆ رۆشتن ئامادە بن.

تاقمێك لەدانیشتوانی ئەو هۆزە تا ئاوابوونی هەتاوی ئەو رۆژە هاوڕێیەتیان کردین و دواتر رێگەیان نیشانداو خۆیان گەڕانەوە.

ئێمە شەومان لەشوێنێکی بەرزدا بەسەر بردو لەخواردنێك کەهێنابوومان خواردمان.

یوری سوربو کەیەك دوو کەس لەدانیشتوانی هۆز لەگەڵمانا بێن بەڵام ئەوان رازی

نەبوون و بەیوریان وتبو لەسەر ئەو تەپۆڵکەی ئێمەی لەسەر وەستابووین ناتوانن ئەولاتر بێن، و بەم شێوەش لەوێدا ئێمەیان بەجێ هێشت و ڕۆشتن، شەو بەخۆشی گوزەرا نیکی و ئەمانۆ لای ئاگرێك کە بۆ گەرم کردنەوەی گۆشتی برژاو هەڵمانکردبو، گۆرانیان دەخوێند. چ گۆرانیەکی دڵگیر ! جوان بیرمە کە مووناك ئەم گۆرانیەی بەتەنیایی بۆ دەخوێندم. نیکی و ئەمانۆ شێوەیەکیتر دەیانخوێند. و بەئاهەنگ وریتمە تایبەتەکەی سەریان تەکان دەدا ئەم ئاوازە ئەوەندە کاریگەری لەسەر دانام کەناتوانم وەسفی بکەم. هەموو بیرەوەریە تاڵ و شیرینەکانی رابردووی لەمندا زیندوو کردەوە. خۆشیەکی کەم وێنە لە ڕۆحمدا دروست بو.

نیکی و ئەمانۆ کەزۆر هیلاك بوون بەخێرایی خەویان لێکەوت و چونکە تەپۆڵکەکە هەوایەکی فێنك و دڵگیری بو بۆ یەکەم جار شتێکم پیادان تا سەرمایان نەبێت.

دوای خەوی ئەوان من و یوری نزیکەی کاتژمێرێك قسەمان کرد. لێم پرسی:

نازانی لەکوێین و یان لەگەڵ قەراغی جەنگەڵ و کوێستانی سەیرو مەترسیدار کەشەش ساڵ پێش لێوەی تێپەڕبووین، چەندە دوورین.

یوری شانەکانی بەرزکردەوەو وتی:

نازانم بەڵام وادیارە دەبێت بیست ڕۆژی تر بەڕێگادا بڕۆین.

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم:

بیست ڕۆژ؟

بەڵێ ئەگەر ڕێگا هەڵە نەڕۆین وەك جاری پێشو کەلەگەڵ لئۆنا بووین و دووبارە لای هۆزی ئامازۆن سەرمان دەرهێنایەوە.

یوری ئەمەی وت و سەری خستە سەر یەکێك لەبارەکان و خەوی لێکەوت.

من ماوەیەك سەیری ئەستێرەکانم کردو دواتر خەوتم:

لەگەڵ ئەوەی درەنگتر لەهەموویان خەوتم زووتر لەهەموویان خەبەرم بوویەوە. بەیانی زوو خەبەرم بوویەوە و لەگەڵ ئەوە چاوم کردەوە، شێواوی بارودۆخ سەرنجی راکێشام.

شڵەژاو لەشوێنەکەم هەستام و سەیری دەورووبەرم کرد.

بەخۆشحاڵیەوە هەموویان سلامەت و زیندوو بوون بەڵام سەیربو کە شت و کەل و پەلەکانی ئێمە بڵاو ببویەوەو هەرکامیان بۆ شوێنێك فرێدابو.

یوری بەخێرایی دەستی بەکۆکردنەوە کردو لەهەمان ساتەکانی یەکەم دەرکەوت

کەیەکێك لە ڕەشاشەکانی ئێمە ون بووە.

فیشەکەکانی یوری لەخوار تەپۆڵکەکە کەوتبو. کۆڵە پشتەکەی ژێر سەرم کەمێك ئەولاتر لەناو گیاکاندا داشاردرابو و بەندەکانیان کردبوویەوە بەڵام هیچی لێ کەم نەببوویەوە.

بەشادمانیەوە ئەو کۆڵە پشتەی خاك و زێرو جەواهیرەکانمانی تیابو بەهۆی قورسی کێشەکەی لەشوێنەکەی خۆیدا بو دەستی لێ نەدرابو.

یوری وتی:

بگەڕێ .... دەبێت ڕەشاشەکە بدۆزینەوە.

پێم وت:

بردویانە. بەدڵنیاییەوە هۆزێك لەم نزیکانە دایە کەدانیشتوانەکەی شەوانە هێرشیان کردۆتە سەرمان وڕەشاشەکەیان بردوە.

یوری بەتووڕەییەوە وتی:

چی دەڵێیت.... هۆزی چی.... مەیموونەکان هێرشیان کردوینە سەر.... خێراکە..... دەبێت ڕەشاشەکە وەربگرینەوە.

مەیموونەکان...... یانی چی....؟ چۆن ئەگەری هەیە مەیموونەکان هێرش بکەن. باوەڕم نەدەکرد بەڵام ئەو ڕۆژە تانزیك نیوەڕۆ کاتمان تەرخان کرد تا ڕەشاشەکەمان کەمەیموونە بچووکەکان بردبویانە سەردار، دۆزیەوە.

لەگەڵ ئەوەی چاوم بەمەیموونەکان کەوت. بیرەوەریەکان لەزەینمدا دووبارە بوونەوە و لەژێر لێوەوە وتم:

ئەم ناوچەیە ئەو شوێنەیە کە ئەو کورە بچووکە یانی براکەی هانا و کوری سەرۆك هۆزکە یەکیانی بەتیروکەوان راوکرد و کەبابی کردو خواردی و نەخۆش کەوت.

بەڵام باوەڕم نەدەکرد بەم زووانە گەشتبێتینە ئەوێ و لەبەر ئەمە ولەترسی ئەوەی نەکا یوری گاڵتەم پێبکات هیچم بەکەس نەوت ولەگەڵ یوریدا باسم نەکرد.

هەنگاوم بۆ هەرشوێنێك دەبرد ئاشنابوو. چەندین هەفتە من و براکەی هانا کەببومە مامۆستاو پەرستاری لەم شوێنانەی جەنگەڵ راومان دەکردو دەگەڕاین.... هەموو شوێنێکم بینیبوو ئەو ڕۆژەش دار و رووبار پێچ و پەناکانی جەنگەڵم بەئاشنا هاتە بەرچاو.

بێ ئیرادە بەیوریم وت:

لەم نزیکانە رووبارێك هەیە کە زۆربەی کاتەکان هەڵەچێت.

یوری پێکەنی و وتی:

لەکەیەوە تائێستا غەیب گوویی دەکەیت.....؟

ئەو گاڵتەی پێدەکردم بەڵام من دەمویست بۆچوونەکەی خۆم بسەلمێنم کە خۆشبەختانە کاتژمێرێك دواتر گەشتینە رووبارو لەقەراغیدا دەستمان بە پیاسەکردن کرد.

دەمویست لەگەڵ یوریدا قسە بکەم و پێی بڵێم گەشتووینەتە قەراغ جەنگەڵ بەڵام دووبارە دەترسام نەکا بەهەڵەدا چووبێتم. دەزانن زۆربەی شوێنەکانی جەنگەڵ ئەوەندە هاوشێوەی یەکترن کە ئەگەر نیشانەمان دانەنابێت بەهەڵەدا دەچین و دوور نیە کەمنیش بەهەڵەدا چوبێتم.

نزیك نیوەڕۆ لەشوێنێکدا وەستاین نان بخۆین. یوری چەند مەلێکی راوکرد. ئەمانۆ سەرقاڵی کەباب کردنی مەلەکان بو و نیکی بۆقامیش رۆشتبوویە قامیشەلانی قەراغ رووبار. بەڵام هێشتا چەند خولەك تێنەپەڕیبو کەبەڕاکردن لەکاتێکدا تفەنگێکی ژەنگ هەڵهێناوی لەدەستدا بو، گەڕایەوەو خستیە بەردەم من و یوری و وتی:

سەیرکە.... ئەم تفەنگە لە قامیشەلانەدا دۆزیەوە.

تفەنگەکەم هەڵگرت و دواتر دام بەیوری. جۆرێك ژەنگی هەڵهێنابو کە کەڵکی لێ وەرنەدەگیرا بەڵام یوری لەیەکەم نیگادا وتی:

ئەم تفەنگە هی منە.

ئێستا نۆرەی من بو گاڵتەی پێبکەم:

بەدەنگی بەرز پێکەنیم و وتم:

لەکەیەوە تائێستا بوویت بەغەیب گوو؟

یوری تووڕە بو وتی:

سەیرکە ئەمە نیشانەی تفەنگەکەی منە. ئەم بووتی زیوەم خۆم لەسەری کوتا. چۆن ئەگەری هەیە دوو تفەنگ لەدنیادا هاوشێوەی یەك بن.

ئێمە سەرقاڵی قسەکردن بووین کەنیکی رۆشت و دوای چەند خولەك بەکۆڵە پشتیەك گەڕایەوە کە تفەنگێکی لەناودابو.

کۆڵەپشتیەکە بەهۆی بارانەوە رزابو و تفەنگەکەی ناویشی ژەنگی هەڵهێنابو بەڵام شتەکانیتری ساغ بوون.

کاتێك نیکی کۆڵەپشتەکەی دانا، یوری قیژاندی وتی:

سەرۆك ئەمە کۆڵە پشتەکەی ئێوەیە.... سەیرکە.... بوەستە تا بیکەمەوە... ئەمە خەنجەری منەو ئەویش کامێراکەی ئێوەیە.

راستی دەوت. ئەگەر خوێنەران بیریان بێت شەش ساڵ پێش رووبار هەڵچوو من و یوری لەیەك جیابووینەوە. کەل وپەلەکانم درا بەدەم ئاو و رۆشت و خۆم گیرۆدەی ئەومناڵەو راهێنەرەکەی بووم کەسەرئەنجام ئەوم کوشت و لەگەڵ مناڵەکە رۆشتمە هۆزەکەیان. دیاربو کەئاو و کۆڵەپشت و تفەنگەکانی بردۆتە قامیشەلاَن ولەویَ لەناو قامیشەکاندال گیریان کردوەو لەم شەش ساڵەدا ماونەتەوە. یوری دوای ئەوەی بەوردی سەیری هەموو شتێکی کرد بزەیەکی لێداو وتی:

راست دەکەیت. لەقەراغ جەنگەڵ نزیك بووینەتەوە. ئێستا دەبێت خۆمان بۆ روبەڕوبونەوەی لەگەڵ سینگوالا و مێردە خوێنخۆرەکەی و دزە کوێستانیەکانی بەرازیل ئامادە بکەین.

بینینی ئەو شتانە بۆ ئێمە دووانە زۆر سەرنج راکێش بو. لەتفەنگەکان نەماندەتوانی کەڵك وەربگرین بەلاَم کامێراو شتەکانیتر بەکار دەهاتن.

یوری لەکاتێکدا یاری بەبەندی کامێراکەی من دەکرد دەیوت:

ئاه.... شەش ساڵ لەو مێژووە دەگوزەرێت. شەش ساڵ لەتەمەنمان بەسەر چو. ئەم رۆژانە گوومانم نەدەکرد ئەم سەفەرە تا ئەم رادەیە دوورو درێژ بێت و یەك دوومانگمان بەتەواوی دەزانی. لەمەش گرنگتر بوونی ئەمانۆ و نیکیە.

یوری لێرەدا پێکەنی و درێژەی دا.

ئەو رۆژە کەتۆفان و هەڵچوونی ئاو من و تۆی لێك جیاکردەوە هەرگیز لەبیری گیانی خۆمدا نەبووم ولەبارەی خۆمەوە نیگەران نەبووم. گوومانم دەکرد ئێوە کەم ئەزموونن و بەزووی لەروداوە مەترسیدارەکاندا لەناو دەچن. بەخۆشحاڵیەوە ئێوە زیندوومان و ئێستا دوو کەسیتریشمان لەگەڵ خۆماندا هێناوە.

بەبیستنی قسەکانی یوری بیرەوەرەیەکانم زیندوو بوونەوەو بیَ ئیرادە بیری کالوویی تاوانبارو سینگوالا لەمێشکمدا زیندوو بوویەوە، بەیوریم وت:

کالوویی لەئێمە زۆر تووڕەبو ئەگەر دووبارە بمانبینێت بەدڵنیاییەوە رق و تووڕەیی بێدەنگ بووی لەناخیدا بڵێسە دەسەنێتەوەو دووبارە ئاژاوەکەی رابردوو دروست دەبێتەوە.

یوری وتی:

بەهەڵەدا چوویت. ئەم جۆرە کەسانە تەمەنیان کورتە. بەڵێن دەدەم کە ئەویان کوشتووە پۆلیس بەردەوام بەدوایاندا و گریمان ئەگەر کالوییان گرفتار کردبێت لەدادگا دادگایی دەکرێت و بەتاوانی تاوانەکانی ئیعدام دەکرێت. جیاواز لەوەش ئێستا سیلاحی پێویستمان هەیە و بەرەشاش دەتوانین ئەو و هاوڕێکانی وەك بێژنگ کوون کوون بکەین. خۆت بەم گومانانەوە سەرقاڵ مەکە.

نیکی و ئەمانۆ لەم نزیکانە ئاویان دۆزیبوویەوەو بێ ئاگاداری ئێمە رۆشتبوون بۆ مەلەکردن. ئەوێ شوێنی ژیانی مەیموونەکان بو چونکە نیکی و ئەمانۆ مەیموونیان نەبینیبوو لەکارە وشیارانەکان و بێزارکەرەکانی ئەو ئاژەڵانە ئاگادار نەبوون و بەوپەڕی بێ ئاگایی جلەکانیان داکەندبوو بەمەلەکردن دوور کەتبوونەوە.

کاتێك هەستم کرد کەدەنگی قیژەی نیکیم بیست کە دەیوت:

ئەی وای ئەم ئاژەڵە جلەکانی بردم تابیخوات.

زانیم مەبەستی نیکی لەئاژەڵ چیە. بەڕاکردن خۆم گەیاندە ئەوێ.

یەکم دەستە لەو مەیموونە بچووکانە کەبراکەی هانا یەکێکیانی خواردبو، لەبێ ئاگایی نیکی و ئەمانۆ کەڵکیان وەرگرتبوو جلەکانیان بردبوون ورۆشتبوونە سەردارەکان.

کاتێك گەشتمە قەراغ رووبار کەمەیموونەکان لەبەر چاو ون ببون و نیکی وئەمانۆ بەمەلەکردن بەرەو قەراغی رووبار دەهاتن تا بەدوایانا بڕۆن.

یوریش چەند چرکە دواتر گەشت.

نیکی بەپەنجە شوێنێکی نیشانداو وتی:

لەوێوە رۆشتن. بیانگرن.

وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا لەجەنگەڵی باران مەیموون زۆرە بەڵام بەگشتی لەقەراغ جەنگەڵدا دەژین و لەشوێنێك کەسنووری هۆزی ئامازۆنە یەك مەیموونیش بۆ نموونە دەست ناکەوێت. لەبەرئەمە نیکی و ئەمانۆ زۆربەی ژنانی ئامازۆن مەیمونیان نەبینیبوو وەنایناسن.

نیکی گومانی دەکرد مەیموونەکان جلەکانیان بردوە تابیخۆن.

یوریش بەدوای مندا رایکرد بەڵام لەنیوەی رێگادا وەك ئەوەی بیرێکی تازەی لادروست بوبێت گەڕایەوە و بەپەلە رۆشت.

من دواتر هۆکارەکەم لێ پرسی. یوری وتی:

ترسام مەیموونەکان لەئامادەنەبوونی ئێمە کەڵك وەربگرن و خۆڵی زێرو جەواهیرەکانمان بەرن و بیبەنە شوێنێك کە بەدەست هێنانیان دووبارە ئەگەری نەبێت.

بەتەنیایی بەدوای مەیموونەکاندا رۆشتم بەلاَم هەرچەندە زیاتر رامدەکرد کەمتر ئەوانم دەدۆزیەوە. سەرئەنجام هیلاك بووم و بەروخسارێکی مۆن و تاڵ گەڕامەوە.

بیرم کردەوە کەئێستا نیکی و ئەمانۆ رووتن و بەم شێوەیە دەبێت چیبکەین و چۆن لەجەنگەڵ بڕۆینە دەر.

تازە کەمێك لەرێگای رۆشتوو گەڕامەوە کە تاکێك لەپیلاوەکانی ئەمانۆم دۆزیەوە هەڵم گرت و کە سەیری سەرەوەم کرد لەپێکەنین وتووڕەیی روخسارم سووڕ ببوویەوە چونکە یەکێك لە مەیموونەکان جلی ئەمانۆی لەبەرکردبو لەسەر دارەکە دانیشتبو !

بەبینینی ئەم دیمەنە هەم پێدەکەنیم وهەم تووڕە دەبووم لەگەڵ ئەوەشدا هیچم پێ نەدەکرا چونکە لەگەڵ ئەوەی دەڕۆشتمە پێش مەیموونی لاسایی کەرەوە رای دەکردو لەناو لقی دارەکان لەچاو ون دەبو. لەکتێبە کۆنەکان خوێندبووم کەمەیموون ئاژەڵێکی لاسایی کەرەوەیە و لەهیندستان کە کەسەرکەوتن لەداری نارگیل کارێکی دژوارو بێزارکەرە لەهەستی لاسایی کردنەوەی مەیموون کەڵك وەردەگیرێت و ئەو ئاژەڵە ناچار بەهەڵکەندنی نارگیل دەکەن.

ئەم کارە بەم شێوەیە ئەنجام دەدرێت کە مەیموون لەدارەکە دەڕواتە سەرو چەند کەس لەخوارەوە دەوەستن و بەردی تێدەگرن. مەیموونیش بۆ روبەڕوبوونەوە و دژایەتی کردنی بەرانبەر چونکە هیچی لەبەردەستدا نیە نارگیل لێدەکاتەوەو فڕێیدەداتە خوار.

من ئەم بابەتەم چەندین ساڵ پێش لەسەفەرنامەیەکی ئنگلیزیدا خوێندبوو لە بیرم مابو. کاتێك لە هەموو شتێك هیوابڕاو بووم ویستم لەهەستی لاسایکردنەوەی مەیموون کەڵك وەربگرم و لەگەڵ ئەوەشدا راستی رستەکانی ئەو کتێبە تاقی بکەمەوە. بەخێرایی دەست بەکار بووم و دەستم بەداکەندنی جلەکانی خۆم کرد. ئەم کارەم بەشێوەیەك ئەنجامدەدا کە ئەو ئاژەڵە بەجوانی بمبینێت.

سەرەتا شەڕواڵەکەم دەرهێناو بەجۆرێك بۆم هاویشت کە بەلقەکە نەگەشت و دووبارە کەوتە خوارو مەیموون دەستی بەقاوەقیژ کرد. یەك دووجار ئەم لاولای کردو دەست بەجێ کراسەکەی ئەمانۆی دەرهێناو بۆی هاویشتم. کراسەکە کەوتە بەردەمم.

بەخێرایی هەڵم گرت.

مەیموون زانی کەفێڵی لێکراوە و بەشێك لە دەستکەوتەکانی لەدەستداوە، لەوێ رایکردو جل و بەرگەکانی تری لەگەڵ خۆی برد. دواتر چەند گەڕام هیچم دەست نەکەوت. نیکی و ئەمانۆ کراسێکیان بو و جوتێك پێڵاو لەو پێڵاوانەی ئامازۆنیەکان لەپێی دەکەن. بەپەلە بەرەو رووبار گەڕامەوە و نیکی وئەمانۆم دۆزیەوە. ئەوان لەناو گەڵای دارەکان خۆیان داشاردبو و نەیاندەوێرا بێنەدەر.

لەسەر لەبەرکردنی ئەو دەستە جلە لەنێوان ئەو دووانەدا شەڕێکی قورس دەستی پێکرد، لەو شەڕانەی کە هەمیشە دەیانکردو سەرو روخساری یەکیان برینداری خوێناوی کرد.

نیکی دەیوت:

کراسەکە دەبێت من لەبەری بکەم.

بەڵام ئەمانۆ بۆچوونی وابو:

کراسەکە هی منەو دەبێت خۆم کەڵکی لێ ببەم.

بە هیچ جۆرێك نەمدەتوانی ئارامیان بکەمەوە. کاتێك پەلاماری یەکیان دەدا و قژو روخساری یەکیان بەدیان و چنگ هەڵەکەند من لەژێر دەست و پێیاند بووم هەندێ کات گازو نقوچکیان لێ دەگرتم.

جارێك نیکی پەنجەگەورەی منی گازگرت و بەڕادەیەك لەناو دیانەکانی فشاریدا کە لەشوێنەکەیەوە خوێن هاتەدەرو دڵم لەسەر خۆ چو، ئازارەکەی زیاد لەرادە زۆر بوو لەسەر زەوی دانیشتم.

نیکی گوومانی دەکرد پەنجەی ئەمانۆی گازگرتووە و کەڕاستیەکەی زانی زیاتر تووڕەبو دووبارە پەلاماری ئەمانۆی داو بۆ قەرەبو کردنەوەی هەڵەکەی گازێکی وای لەچەناگەی گرت کە دیانەکانی لەپێستی ناسکی ئەمانۆدا چەقی.

لەدەنگی قاوەقیژی ئەوان و هاوارەکانی منیش یوری ئاگادار بوویەوە و بەڕاکردن خۆی گەیاندە ئەوێ. نیکی و ئەمانۆ هێشتا شەڕیان دەکرد ومن بۆ کۆتایی هێنان بەم بارودۆخە رۆشتمە لای یوری و راوێژم لەگەڵدا کرد و داوای رێگە چارەم لێکرد.

یوری بەم شێوەیە چارەسەری روداوەکەی کردو وتی:

لەو کراسە دووان دروست دەکەین کە هەرکام یەکیان لەبەربکەن و بەم شێویە لە کەمەر بە باڵایان دادەپۆشرێت و لەکەمەر بەرەو خواریان بەشەڕواڵەزیادەکانی ئێمە دەتوانن داپۆشن.

ئەم ڕێگاچارە جێبەجێ نەکرا. بەڵام بووە هۆی دۆزینەوەی ڕێگایەکی تر. من کەوتمە بیری کۆڵە پشتەکەی خۆم و وتم:

راستی یوری..... لەو کۆڵە پشتەی دوای شەش ساڵ ئەمڕۆ دۆزرایەوە، من چەندین کراس و چەندین شەڕواڵ و یەك دوو جووت پێڵاوی قورس و سوکم هەیە. لەکوێیە. برۆ بیهێنە.

یوری بۆ هێنانی رۆشت. من گەڕامەوە لای نیکی و ئەمانۆ و کۆتاییم بە شەڕەکەیان هێنا. بەخۆشحاڵیەوە جلەکانی من لە زیانی باو باران و رزان پارێزرابوون و کراس و شەڕواڵەکان کە چەند رۆژ پێش شەفەرەکەم کریبووم تازە و ساغ بوون.

ئەمانۆو نیکی ئیرادی کەم و باش زۆریان بو. گەورەترین ئیرادیان ئەوەبو کە هێشتا کەمێك خوی وەحشیگەریان هەبو و من هیوادار بووم لەدنیای پێشکەوتو بەتێپەڕبوونی رۆژگار و تەرخان کردنی کات لەگەڵ شارستانیەتدا ئاشنایان بکەم.

بەڵام باشی زۆریان بو. رۆحیان وەك ئاوێنە پاك و بێگەرد بو. رقیان لەدڵدا هەڵنەدەگرت ئەو رۆژە لەگەڵ ئەوەی زۆریان لەیەك دابو و یەکتریان بریندار کردبو، بەبینینی کراس و شەڕواڵەکە لەگەڵ یەکدا ئاشت بوونەوە، دەتوت هیچ رووداوێك روونەداوە و دەستیان بەقسەکردن کرد. هەرکام لەوان کراسێك و شەڕواڵێکی پیاوانەی لەبەرکرد کراسەکان بەئەندازەی خۆیان بو بەڵام شەڕواڵەکەی من بۆ نیکی کەمێك گەورەبو ناچار بووین دەرەقولەکانی کورت بکەینەوە تابۆی گونجاو بێت.

یوری رۆشت و من خۆم جلەکانم لەبەرکردن. دەمتوانی چی بکەم.... هەردووکیانم خۆش دەویست..... نەمدەتوانی چاو لەهیچیان بپۆشم. هەم ئەمانۆو هەم نیکیم خۆش دەویست.

هەردووك لەجل و بەرگی پیاوانەدا جوانتر ببوون.

بەجۆرێك کاتێك یوری ئەوانی لەوجلانەدا بینی بێ ئیرادە وتی:

جێگەی دەرهێنەرەکانی سینەمان خاڵی.... ئەگەر وێنەی ئەم دووانە لەناو گۆڤارەکاندا بڵاو ببێتەوە بە دڵنیاییەوە دەلاڵەکانی سینەمان سەردانمان دەکەن.

ماوەیەك لەم بارەوە قسەمان کردو پێکەنیین ونزیك نیوەرۆ رومان کردە ڕێگاو بەرەو رۆژئاوا بەڕێکەوتین.

شەو گەشتینە چەند تەپۆڵکەیەکی نزم وبڕیارماندا شەو لەوێ بەسەر بەرین و رۆژ درێژە بە ڕێ پێوانەکەمان بدەین. تاریکی شەو ڕێکر بو لەوەی دەوروبەری خۆمان ببینین

بەڵام هەستم لەئاوا بوونی هەتاو بەدواوە لە چری دارەکانی جەنگەڵ کەم دەبێتەوە. هەندێ کات ڕێگاکەمان لەزەویە بێ دارەکان و پڕ هەورازو نشێوەکان تێپەڕ دەبو.

ئەو شەوەمان بەخۆشی بەسەر برد.

کاتژمێرێك دواتر یوری لەکاتێکدا کەڵەکێویەکی راوکردبو بەئارەق رشتن وبەردەم هەناسکە برکێوە هات.

نیکی دەستی بەپێست داماڵینی نێچیرو ئەمانۆ سەرقاڵی کەباب بو.

جەنگەڵ لەدوورەوە دەبینراو ئەمانۆ ونیکی کەهەموو ژیانیان لەجەنگەڵ بەسەر بردبو لەبینینی کێو و دەشت و دەرو دیمەنەکانی دەوروبەر چێژیان دەبردو سەرسوڕمانی خۆیان دەردەبڕی.

ئەمانۆ دەیوت: چۆن هۆزەکەی ئێوە لەشوێنێك کەدارو سێبەری لێ نیە، دەژیت ئەم بەرزاییانە جوانە بەڵام شوێنی ژیان نیە. ئاژەڵیان نیە راوی بکەن. لێرە پڵنگ و بەوری لێ نیە. ئەی ئێوە ماڵەکانی خۆتان بە پێستی کام ئاژەڵە فەرش دەکەن.

من ویوری بەبیستنی ئەم قسانە پێکەنین.

گوومانم دەکرد دنیای پێشکەوتو بەو هەموو گەورەییە وئەو هەموو پێشکەوتنانەو گەشەسەندنی زانست و تەکنۆلۆژیا بۆ ئەوان چەندە سەرسوڕهێنەر دەبێت؟

نیکی و ئەمانۆ هێشتا ئێمەیان وەك خۆیان بەوەحشی و جەنگەڵ نشین دەزانی و وایان بیردەکردەوە کە ئێمەش لەماڵی حەسیریدا دەژین و یان وەك خۆیان لەراوی ئاژەڵە وەحشیەکان یان لەمیوەی دارەکان خواردن ئامادە دەکەین.

من چەند جارێك بۆ مووناك کە لەسەریەك رۆژگارێکی ئارامترمان پێکەوە بەسەربرد باسی فرۆکەو ترۆمبێل و شتی ترم کردبو بەڵام زۆر بەدژواری دەیتوانی باوەڕ بەقسەکانم بکات. نیکی و ئەمانۆ کەمتر لەمووناك لەزمانی منەوە شتیان بیستبوو هەر بۆیە زیاتر لەو سەریان سوڕدەما ئەو رۆژە کاتێك پێم وتن: (( لەهۆزو شارەکەی ئێمەدا ماڵی وا هەیە کە چەند هەزار ژووری هەیە و ئەگەر کەسێك بیەوێت نووکەکەی ببینێت یان بەپشتا دەکەوێت و یان ملی ژان دەکات.......))

ئەوان روخساریان بەدوو دەست داپۆشی و قیژاندیان.

جارێکیش وتم: لەشاری ئێمەدا ژووری واهەیە کەلەژێرو سەر لەسەر زەوی دەڕوات، چەند کەسێکی تیا دادەنیشێت و لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر سەفەر دەکەن.

بۆ ئەودووانە بیستنی ئەم بابەتە سەرنج راکێش بو بۆیە هەرکاتێك دەرفەتێکیان

دەسکەوتایە منیان بۆ گێرانەوەی ئەم چیرۆکانە ناچار دەکرد.

ئەو رۆژە یەك دوو کاتژمێر دوا کەوتین. ئێستا لەجەنگەڵ رۆشتبووینەدەرو دەبوا ماوەیەك لەکوێستاندا درێژە بەرێگاکەمان بدەین.

وەك وتم لەوێ جەنگەڵی لێ نەبو بەڵام هەندێ کات دەگەشتینە شوێنی وا کەداری زۆری لێ بو ئەم دارانە بەگشتی لەقووڵایی دۆڵەکاندا بوون و شوێن و نشینگەی ئاژەڵ و خشۆکە مەترسیدارەکانی کوێستان بوون.

نیکی و ئەمانۆ هەرشوێنێك داری زۆریان دەبینی، رایان دەکرد. ئەوان وەك ماسی وابوون کە لە ئاو دوور کەوتبێتەوە.

دوای نیوەرۆ من هیلاك ببووم. هەتاوێکی تیژو سووتێنەر بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەسەر سەرمانی دەدا و لەو گەرما وشك و کوشندەدا بەشوێنێکی فێنك و دڵگیر کەدارو سەرچاوەی ئاوی لێ بێت، پێویستیمان بو.

لەلایەکیتر چەندین ساڵ لەژێر هەتاوی توندی ناوچە کوێستانیەکان ژیانمان نەکردبو. بەدڵنیاییەوە لەجەنگەڵیش هەتاو بو بەڵام بەهۆی چری دارەکان تیشکی هەتاو بەزەوی نەدەگەشت و یان ئەگەر لەناو گەڵاو لقەکان دەگەشتە سەر زەوی، کەم و بێ کەڵك بو.

یوری وەك کیوری سەهۆڵ بەرگەی گەرمای دەگرت و هەرچی زیاتر ئارەقی دەکردەوە خۆراگریەکی زیاتر دەبو. بەڵام من و نیکی و ئەمانۆ توانامان لەدەست دابو دەمانویست لەشوێنێکی فێنکدا بحەسێینەوە.

دوای نیوەرۆ بو کە گەشتینە ناوچەیەکی پر دار.

ئێمە لەکەمەری کێوکەدا بووین و شوێنی ئاماژەپێدراو لەخوار و کۆتایی دۆڵەکەدا بو.

نیکی کە وەك منالێ هەرچەند کاتژمێر جارێك خۆی لووس دەکرد، لەوێ دانیشت ولەکاتێکدا بەپەنجە ئەوێی نیشاندەدا وتی:

من ئیتر یەك هەنگاو هەڵناگرم. با برۆمە ناو ئاو مەلەبکەم وبگەرێمەوە. ئەگەر ئێوە ناتانەوێت بێنە خوار لێرە دانیشن و چاوەرێی من بکەن.

ئەمانۆش بێ درەنگ لاسایی کردەوەو لەسەر بەردێك دانیشت و قاچەکانی درێژکرد بەڵام هیچی نەوت. یوری سەیری منی کردو وتی:

دژایەتی کردنم لەبەرئەوەیە کەلەم ناوچەدا ئاژەڵە گازگرەکان زۆرە.... ئێمە تائێرە

هاتووین ئەگەر کەمێك خۆراگربین دەگەینە ئاواییەکی بەرازیل و لەشوێنێکی دڵنیا ئاو دەخۆین ومەلە دەکەین و دەخەوین.

منیش زیاتر لەوان حەزم دەکرد کاتژمێرێك لەقەراغ ئاوەکە و لەژێر دارەکاندا بحەسێمەوە بەڵام بیَ ئەوەی رێگە بدەم یوری تێبگات منیش لەگەڵ ئەواندا وتم:

رەنگە لەو ئاژەڵانە زۆری لێبێت. من هەمیشە وەسفی زانیاریەکانی تۆم کردوە بەڵام هەرچی من لەماری ئاناکندا ی مایلا و ئەورانگوتانی سوور رەنگ کەلەئامازۆندا بینیمان، مەترسیدارترنین. دەڵێی هەرچی زیاتر لەدنیای پێشکەوتو نزیك دبینەوە ورەو بوێری ئێمە کەم دەبێتەوە. تلیسمی چاو نەترسی ئێمە تەنیا لەجەنگەڵدا بەهای بو ولەدەرەوە سنووری ئامازۆن پووچەڵ دەبێتەوە....

وانیە؟

یوری لەوەڵامی مندا هیچی نەوت. سەری تەکاندا کە هەزاران مانای بو و دەست بەجیَ کۆڵە پشتەکەی هەڵگرت و بەرێکەوت.

هەڵبەتە ئەم جارەیان بەرەو خوار دەڕۆشت و دیاربو دەیەوێت لەقەراغ ئاو لەژێر دارەکان بحەسێتەوە. ئێمە سیانە شادمان بەدوایدا بەرێکەوتین.

نیکی و ئەمانۆ بەدژواری لەکەلێنی بەردو تاشەبەردەکان دەڕۆشتنە خوار و من ناچار بووم هەندیَ کات یارمەتی ئەمیان و هەندیَ کات یارمەتی ئەویان بدەم. لەرێگادا بەئەمانۆم وت: ئەگەر لێرەدا ئاو نەبێت یوری گاڵتەمان پیَ دەکات و ئەوەندە بۆڵە بۆڵ دەکات کە لەژیان تێردەبین.

هێشتا لەوێوە دورر بووین بەڵام ئەمانۆ وەستا. چەند جارێك سینەی خۆی لەهەوان پرکردو خاڵی کردەوە ئەوکات وەك کەسێك کەتامی خواردن دەکات تارادەیی سوێری و ترشیەکەی بچێژێت و بزانێت، دەمی خۆی بەدەنگێکی تایبەت تەکانداو سەرکەوتوانە وتی: ئاوی لێیە.... دڵنیابە ئازیزم. ئێمە هەرگیز هەڵە ناکەین. لەم شوێنەدا ئاوی زۆری لێیەو بەپێچەوانەی شوێنەکانی تر ئاژەڵی تۆپیوو لاشەی بۆگەنی و پیسی لیَ نیە و لەسەریەك شوێنێکی باشە.

ئەگەر یوریش رازی بێت شەو لێرە دەمێنینەوە.

ئەمانۆ بەسووچی چاو ئیشارەیەکی شیرینی لیَ کردم لە نیکی و یوری کەلەپێش ئێمەوە دەڕۆشتن ڕوانی وتی:

بڕیارنەبو تۆ لەبەر نیکی من لەبیر بکەیت.... من دڵنیام تۆمنت زیاتر لەنیکی خۆش

دەویت. ئەگەر جیاواز لەمە بێت لەپەرستگا منت بەجێ دەهێشت و نیکیت لەگەڵ خۆت دەهێنا. کەواتە دەبێت حسێبی من و ئەو روونکەیتەوە، ئازیزم.... تێدەگەیت چی دەڵێم، ئەمانۆ وەك لەسەرەتای ناسینی ئاماژەم پێدا، چاوی شەهلایی و جوان بو. چاوەکانی وەك چاوی مار بینەری داگیرو بێ ئیرادە دەکرد و من شێتی نیگای چاوەکانی بووم.

لەم کاتەدا نیکی ویوری کەلەپێشەوە دەڕۆشتن گەشتنە ناوچەی پر داری قووڵایی دۆڵ و چەند خولەك دواتر ئێمەش پەیوەستیان بووین. یەکەم شت کە پرسیم ئەوەبو کە ئاو هەیە یان نە.

یوری قەدی بن دارەکانی نیشانداو وتی: لێرە ئاو زۆرە. سەیرکە. دەڵێی هەرچەند جارێك ئاو هەلەچێت و بن دارەکان دادەپۆشێت.

ئەمانۆ بەڕاکردن وەك پشیلەیەك کە بە بۆنکردنی بۆنی گۆشت، شوێنەکەی بدۆزێتەوە، بەرەو ئاوەکە رۆشت و چەند خولەك دواتر دەنگی دەبیسترا کە دەیقیژاند و دەیوت: هێی...... هێی......... وەرە بۆ ئێرە....... ئاو. ئاو.

لەناو چەند ریز لەدارەکانی کوێستان تێپەرِیتین و گەشتینە شوێنێك کەئاو بو. چ شوێنێکی دڵگیر.....!

ئاو لەسکی کێوکە دەهاتەدەر و لەبەرزایی نیو مەتریەوە دەرژایە سەر زەوی. لەخوار تاشەبەردەکە چاڵێك دروست ببو کەئاو لەوێدا کۆ دەبوویەوە و دواتر لەچەند جۆگەلەیەکی باریك و بچووك بۆ دەوروبەر دەڕۆشت. دەتوت دەستی سروشت ئەو جۆگانەی بۆ ئاودانی دارەکان دروست کردوە.

یوری کەمێك ئاوی خواردەوە و دواتر تفەنگەکەی هەڵگرت و بۆ راوکردن رۆشتە دەوروبەر. نیکی و ئەمانۆ بەپێداگرتنی زۆر منیشیان بردە ناو ئاوەکە و بەدەم قاقاوە سەریان لەژێر ئاوەکە راگرتم و کاتێك هەناسەم سوار دەبو سەریان دەردەهێنام. دەنگی چەند گولەیەك لەتفەنگەکەی یوری بیسترا و کاتژمێرێك دواتر بەچوار مەل گەڕایەوە. نیکی و ئەمانۆ خواردنیان دروست کردو خواردمان و ئەوکات یوری پێشنیازی رۆشتنی دا.

( ٢١ )

ئاوا بوونی خۆر بوو. ئەمانۆ دژایەتی دەکرد بەڵام نیکی فێڵباز بۆئەوەی پلانەکەی ئەمانۆ بشێوێنێت رەزامەندی خۆی لەگەڵ یوریدا دەربڕی. من و ئەمانۆ لەلایەك و نیکی و یوری لەلایەکیتر لەڕۆشتن و مانەوەدا پێداگریمان دەکرد کەلەناکاو دەنگی پێی گایەلێك بزنەکیوری بیسترا کە بەخێرایی تەواو بەرەو ئاو خۆرەکە دەهاتن. بزنەکێویەکان بێ ئەوەی لەبوونی ئێمە لەوێ ئاگادار بن راستەوخۆ گەشتنە لای ئاوخۆرەکە. جێگەی درەنگ کردن نەبوو وە من بەیەکەم گولە بزنێکی نێری گەورەم کوست. ئەوانیتر رایان کردبێ ئەوەی یوری دەرفەتی تەقەکردنی هەبێت. ئەمانۆ بەڕاکردن خۆی گەیاندە نێچیرەکە و بەخەنجەر سەری بڕی. یوری بەنیگەرانیەوە سەیری دەورروبەری دەکرد. من بەگوومانی ئەوەی چاوەڕێی گەڕانەوەی بزنەکانە وتم:

رایان کردو رۆشتن و تاچەند رۆژی تر بۆخواردنەوەی ئاویش نایەنە ئێرە.

یوری وتی:

بەهەڵەدا چوویت. من لەچاوەڕوانی بزنەکاندا نیم. ئەم نێچیرە بۆ دوو رۆژی ئێمە بەسە. بابەتی گرنگ ئەوەیە ئەم بزنانە لەکاتی راکردن رەم کردندا بوون وە لەگەڵ ئەوەی هاتنە ئێرە، زانیم کە کەسێك یان کەسانێك بەدوایانەوەن.

پرسیم:

مەبەستت چیە؟

وەڵامی دایەوە:

مەبەستم ئەوەیە کەلەم دەورروبەرەدا کەسانێك دەژین وە یان تاقمێك بۆ راو تا ئەم نزیکانە هاتوون.

شانەکانم بەرزکردەوەو وتم:

سەرئەنجام دەورانی دنیای ئێمە کۆتایی دێت و بەخەڵك و دێهاتی سەر رێگا و دواتر بەشارەکان و شوێنە قەرەباڵغەکان دەگەین. جیاوازی چیە، یەك دوو رۆژ زووتر بۆ ئێمە گرنگ نیە. تۆ بیری خۆت بەم بابەتە ناگرنگانەوە سەرقاڵ دەکەیت. وەرە با کەباب بخۆین.

بەم شێوەیە بڕیاردا شەو لەوشوێنەدا بمێنینەوە و نیکی و ئەمانۆ پێستەکانیان ڕاخست و دەورو بەریان بەلق و گەڵای دارەکان گسک داو خاوێن کردەوە.

شەو کەبابمان خوارد و بەهۆی هیلاکی زۆر یەك یەك خەومان لێ کەوت. نەم زانی چەند کاتژمێر تێپەڕی کە لەناکاو بەهۆی تەکانی دەستێك بەئاگا هاتمەوە بەڵام کاتێك ویستم هەستم قسەبکەم و پرسیار بکەم کە چ کەسێك تەکانی داوم و لەتاریکیدا هەڵیساندووم، دەستێکی بچووك دەمی گرتم و دواتری دەنگی نیکی دەبیستر اکەدەیوت:

وس.... بێدەنگ.... دوو پیاو لێرەن و پێکەوە قسە دەکەن. من دەنگیان دەبیستم بەڵام لەزمانیان ناگەم.

بەهێواشی وتم:

یوری هەستێنە.

نیکی بەهەمان شێوە یوریشی لەخەو هەستان و وە من و ئەو تفەنگمان هەڵگرتوو بەپێ خاوسی لەناو دارەکان بەرەو دەنگەکە بەرێ کەوتین.

مانگە شەوێکی جوان بوو. مانگ لەناوەڕاستی ئاسماندا دەدرەوشایەوە وێنەی کەوتبوویە ناو ئاوەکە. کەم تا زۆر هەیکەل و روخساری ئەو دووکەسە دەبینراو دەنگیان بەجوانی دەبیسترا.

من ویوری خۆمان لەپشت دارەکان داشاردو بەجوانی گوێمان گرت.

ئەوان لای ئاوەکە دانیشتبوون و قسەیان دەکرد. شتێك کەلەهەمان نیگای یەکەم سەرنجی ئێمەی ڕاکێشا ئەوەبو کەئەوان دووان بوون بەڵام سێ ئەسپی زین کراویان پێ بوو. من بێ درەنگ وتم:

سێیەم کەس دەبێت لەم دەوروبەرەدا بێت یان ئەو دووانە کوشتبێتیان.

یوری بەئیشارەی سەر قسەکەی پشت ڕاست کردمەوە و پەنجەی لەسەر لێو دانا تا بێدەنگ بم.

یەك خولەك دواتر یەکێك لەوان شقارتەی لێداو جگەرەکەی داگیرساند. ئەم ڕووناکیە دوو کاریگەری بو یەکەم ئەوەی بەهۆی ڕووناکی قیافەی ئەو دووانەمان بەجوانی بینی و بەزەینمان سپارد و دووەم ئەوەی بیرەوەری سیگار لە ڕۆح و گیانی ئێمەدا زیندوو بویەوە.

لەم ناوەدا یەکێکیان وتی:

ئەگەلرفرانچی بپرسێت چی دەڵێیت؟

ئەویتریان کە قیافەیەکی مەترسیدارو سمێڵێکی ئەستووری بو وتی:

هیچ، چی وەڵام دەدەمەوە؟ دەڵێم نەمبینیوە و کاتێك ئێمە بەڕێکەوتین(( کیمی )) لەگەڵ ئێمەدا نەبووە و فەرسەخێك ئەولاتر پەیوەستمان بوو کەس نازانێت کە ئێمە ئەومان کوشتووە.

بە بیستنی وشەی کوشتن من و یوری سەیرێکی یەکترمان کرد.

یوری سەری خۆی هێنایە پەنا گوێی من و وتی:

ئەم دووانە یەکێکیان کوشتووە و لەم شوێنەدا چاڵیان کردوە و ئێستا دەیانەوێت بگەڕێنەوە گوومان دەکەم لەدەستەی دزەکان و ڕێگرەکانی ئەم ناوچەبن و فرانچی کەدەڵێن سەرۆکیانە.

یوری بەتەواوی سەرنجی لای وتەو کردەوەکانی ئەو دووانە بوو من شەش دانکی هەستەکانم کۆکردبوویەوە تا لەیەکەم دەرفەتدا قوتوی سیگارەکەیان بدزم.

بەڵام ورەی ئەم کارەم نەبوو و کاتێك ئەوان باوێشکیان دەدا چەند جارێك لەشوێنەکەم هەستام تا بڕۆم قوتوی جگەرەکان بێنم.

ئەوەندەی بەسەر نەچوو یەکێك لەوان وتی:

راستی نەتزانی دەنگی تەقە لەکام لاوەبو؟ من بەگوێی خۆم دەنگی گولەم بیست و دڵنیام بەهەڵەدا نەچووم.

ئەویتر چاوە خەواڵوەکانی خۆی کردەوەو بەدەنگێکی بۆڕ وتی:

منش دەنگێکم بیست بەڵام گوومان ناکەم لەم ناوچەدا کەسی لێ بێت. ئاخر ئێرە ڕێگەی تری نیە ئەولا جەنگەڵ و ئەم لاش سوارەکانی ئێمە بڵاو بوونەتەوە و ئەگەر باڵندە لەئاسماندا باڵ لێبدات دەبینرێت.

دووبارە سەیری یوریم کرد. شوێنێك کەئەوان باسیان دەکرد ڕێگەیەك بو کەدەبوا ئێمە لێی تێپەڕ بوینایە و خۆمان بگەیاندایەتە یەکێك لەشارە نزیکەکان.

کەسی ئاماژەپێدراو بەم شێوە درێژەی بەقسەکانی خۆیدا.

رەنگە یەکێك لەتاشەبەردەکان کەوتبێت و دەنگی کەوتن وەك دەنگی گولە بەگوێی ئێمە گەشتبێت.

یەکەم پرسی:

کەی بەرێکەوین.

وتی:

بەرەبەیان..... لەگەڵ ئەوەی هەوا رووناك بوویەوە بەرێدەکەوین و بۆئەوەی تا هەوا رووناك نەبێتەوە بگەینە ئوردو.

ئیتر قسەمان نەکرد. لەناوەرۆکی قسەکانی ئەوان زۆر شتمان زانیبو. سەرەتا دەرکەوت کە ئەوان لەو نزیکانە ئوردویان هەیە دووەم ئەوەی ژمارەیەك سوار لەدەوروبەری ئێمە لەکوێستانەکانی دوور و نزیك بلاّو بوونەتەوە و ئاگایان لەهەموو شتێکە. سێیەم ئەوەی سەرۆکەکەیان کەسێکە بەناوی فرانچی کە هەمووان لێی دەترسن و گوێرایەڵی فەرمانەکانی ئەون.

بەخێرایی دەنگی مرخە مرخی ئەوان بەرزبوویەوە.

یەکێك لەوان بەشێوەیەکی وا لەخەودا دەنگە دەنگی دەکرد کەدەتوت مرۆڤ لای قەفەسی پڵنگ وەستاوە و پڵنگ بۆ تۆقاندنی سەیرکەیان دەنەڕێنێت.

دیاربو کەهەردووکیان خەوتوون. من لەم دەرفەتە کەڵکم وەرگرت و دەست بەداوێنی یوری بووم و وتم:

یوری رۆحم بۆ جگەرە هەڵەفڕێت. ئەم کارە لەتۆ بەردێت. بەهەر شێویەك دەزانی جگەرەیەکم بۆ بێنە.... بڕوانە قوتوی سیگاری یەکەم لای دەستیەتی و ئەگەر بڕۆینە پێش هەستی پیّ ناکات. یوری بزەیەکی لێداو لەشوێنەکەی هەستا. سەرەتا پێلاّوەکانی خۆی داکەندو بە پێی پەتی بەڕێکەوت و رۆشت. دڵم بەتووندی لێیدەدا و بەرزو نزم دەبوویەوە. گوێچکەم دەزرنگایەوە. گوومانم برد کەئەوان بە ئاگابن و بەگوومانی ئەوەی یوری بۆکوشتنی ئەوان دەڕوات تەقە دەکەن و رەنگە بیکوژن.

یوری کەم کەم لێیان نزیك بوویەوە. وەك ئاژەڵێك کە بۆ خواردنی تریّ لەکوونی ئاو دەڕواتە ناو باخ یوریش لەناو دارەکان چوار دەست وپیّ دەڕۆشت وخۆی لەوان نزیك دەکردەوە، سەرئەنجام لەیەك هەنگاوی ئەواندا وەستاو هێواش هێواش دەستی خۆی درێژکردو قوتوی سیگارەکەی هەڵگرت. لەتاریکیدا چاوەکانم جوان نەیدەدی و نەمدەزانی چی دەکات.

یەك دوو خولەك بەنیگەرانی و پەرێشانی بەسەر برد تائەوەی یوری بەهەمان شێوە کەڕۆشتبوو، گەڕایەوە و بەخۆشحاڵی و لەکاتێکدا پێدەکەنی و دەنگی پێکەنینی لەدەمی دا زیندانی دەکرد سیّ جگەرەی خستە بەر دەم من و وتی:

بگرە...... ئەمەش جگەرە...... ئیتر چیت دەوێت؟

بەخێرایی یەکێك لەجگەرەکانم هەڵگرت و دامگیرساند. ئێمە شقارتەو چەرخ و شتی

تری لەم جۆرەمان پێ نەبو. کەرەستەی ئاگرکردنەوەی ئێمە وەك دانشتوانی جەنگەڵ بەردی چەخماخ و ریشەی یەکێك لەگیاکانی جەنگەڵ هاوشێوەی یەمە بو.

جگەرەکەم داگیرساندو یەك دوو مژم بەحەزەوە لێداو هاوڕێ لەگەڵ یوری بۆ شوێنێك کەنیکی و ئەمانۆ خەوتبوون، گەڕاینەوە.

ئەمانۆ لەخەودا بوو بەڵام نیکی چاوەڕوانی منی دەکردو لەگەڵ ئەوەی دەنگی خشە خشی گیاکانی ژێر قاچمانی بیست لەشوێنەکەی هەستاو دانیشت.

نیکی زەق زەق سەیری من و دەمی دەکردم و لەناکاو بەرەو لای من پەڕی و بەترسەوە دەستمی گرتم و وتی:

ئەی هاوار.... بۆ لەقوڕگی تۆ ئاگر دێتەدەر. یوری فریای کەوە جەرگی ئاگری گرتووە. بەم شێوەیە دەیویست سیگارەکەم لەدەست دەربێنێت و فڕیدات بەڵام من رێگریم لێکرد، یوری دەستی گرت و دانیشاند و وتی:

چاوەڕێ بە..... مەترسە...... ئەمە جگەرەیە. هەموو دانشتوانی شاری ئێمە و شارەکانی تر ئەم کارە دەکەن بێهۆ مەترسە. جەرگی ئەو ئاگری نەگرتووە.

بەم روونکردنەوەیە نیکی کەمێك ئارام بوویەوە.

نیکی لەبۆنی سیگارەکە خۆشی هاتبوو یوری بەهێواشی بەگوێمدا چرپاندی:

نەکا نیکی سکی هەبێت.

بەسەرسوڕمانەوە وتم:

لەکوێوە زانیت؟

وتی:

ئاخر حەزی لەبۆنی جگەرەکەیە ئەم حاڵەتە تەنیا لەژنانی سك پڕدا دەردەکەوێت.......

پێکەنیم و وتم:

نا....... انشاالله کەوانیە، ئەگەر سکی هەبوایە خۆی زووتر دەیزانی و دەیوت.....

بێدەنگی دووبارە بوو بەفەرمانڕەوا و نیکی و ئەمانۆ سەریان لەسەر زەوی دانا کەبخەون بەڵام هێشتا نە خەوتبوون کەیوری دەستی کرد بە باخەڵیا و جزدانێکی گەورەی دەرهێناو وتی:

ئەمەشم لەوان دزی.....

بەسەرسوڕمانەوە وتم:

چی دەڵێیت.... ئەم جزدانەت لەوان دزی....؟ کارێکی خراپت کرد....؟ ئەگەر تێبگەن بە دواماندا دێن و شەڕ دەست پێدەکات، ڕەنگە بمانکوژن.

یوری قاقایەکی گاڵتە ئامێزی گرت و وتی:

ئێمە کەڕەشاشمان پێیە و دەتوانین لەساتێکدا ژمارەیەکی زۆریان وەك گەڵای دار هەڵوەرێنین. تۆ چەندە ترسنۆك بوویت؟

ئەمەی وت و لەرووناکی زیو رەنگی مانگە شەو ناوەرۆکی جزدانەکەی پشکنی. کەمێك پارە، چەند سکەیەکی زیو، دەستەیەك نامەو وەرەقەو چەند وێنەیەك....

لەروی ناوەوەی جزدانەکە چوارگۆشەیەکی بچووك بو کەخاوەنی جزدانەکە ناو و ناوی بچووك و وێنەکەی خۆی لەوێدا دانابو. خێرا پڵێتەکەم رۆشن کرد تاوێنەکە ببینم.

نیکی و ئەمانۆ جارێکیتر هەستان و دانیشتن و بەسەرسوڕمانەوە چاویان بڕیە جزدانەکە و ناوەرۆکەکەی ناوی. لێرە بەدواوە هەرچیان دەبینی بۆ ئەوان سەرنج راکێش بوو لەهەرساتێکدا بزوێنەرێکی تازەیان بۆسەرسوڕمان لادروست دەبو.

من پڵێتەکەم رۆشن کرد و یوری جزدانەکەی کردەوە، سەری هەرچوارمان بۆ سەیرکردن هاتە پێش. من ویوری دەمانویست ناوی خاوەن جزدانەکە بزانین و قیافەی ببینین بەڵام کاتێك نیگای نیکی و ئەمانۆ کەوتە سەر رەسمەکە، هەناسەیەکیان هەڵکێشاو سەری خۆیان بردە دواوە. لەچاوی هەردووکیان ترسێکی بێ وێنە دیاربو. دەلەرزین ولەترسی ئەوەی نەکا بقیژێنن دەمی خۆیان گرتبو. ئەمانۆ بەپەنجە جزدانەکەی نشانداو شتێکی وت بەڵام چونکە توند دەمی گرتبو تێنەگەشتم چی دەڵێت. من کەهۆکارێکم بۆ ترسی ئەوان نەدەبینی وتم:

قسەبکە.... چی بوە لەچی دەترسیت؟ ئایا ئەم کەسەت پێشتر بینیوە و دەیناسیت؟

ئەمانۆ بەدژواری وبەترس و لەرزەوە ئاوەی دەمی قووت داو وتی:

نا بەڵام کەسێك لەم کوونەوە سەیری دەکردین و پێدەکەنی.

من ویوری بێ ئیرادە دەستمان بەپێکەنین کرد.

ئەمانۆ پێکەنینەکەی ئێمەی بێ هۆ دەزانی دووبارە وتی:

سەیرکەن..... درۆناکەم. کەسێك سەیرمان دەکات و پێدەکەنێت. ئەم جزدانە جادوکراوە یوری وێنەکەی لەناو جزدانەکە دەرهێناو دای بەدەست ئەمانۆو وتی:

ئەمە وێنەیە.... کاتێك بگەینە شار، وێنەی تۆو نیکیش دەگرین. هەرکەس دەتوانێت بەدانی چەند سکە لەم پارانە ژمارەیەك وێنەی لەخۆی بگرێت.

یوری وتی:

ئەم جزدانەم لەناو خورجینی یەکێك لەئەسپەکان هەڵگرت و رەنگە ئەو دووانە هێشتا لەبوونی ئاگادار نەبن.

پرسیم:

مەگەر ئەم جزدانە هی یەکێك لەو دووانە نیە؟

وەڵامی دایەوە:

نا خاوەنی ئەم جزدانە هیچ کام لەو دووانە نین.

(( مارچلو )) ئەو پیاوە کوژراوەیە. ئەمانە ئەویان کوشتووە و دەیانەوێت بەخەیاڵێکی ئاسوودە شتەکانی هەڵگرن و بڕۆن بەدوای کاری خۆیاندا... بێ ئاگا لەوەی جزدان و پارەکانی پێش ئەوەی دەستی ئەوان بکەوێت، بەئێمە برا.

وتم:

تۆ گرنگی زۆر بەم جزدانە دەدەیت.... دەڵێی گەنجت دۆزیوەتەوە... فرێیدە کەی بەکەڵکی ئێمە دێت.

یوری شانەکانی بەرزکردەوە، جزدانەکەی خستەوە باخەڵی و لەکاتێکدا قاچەکانی درێژ دەکرد وخۆی بۆ خەوتن ئامادە دەکرد وتی:

عەقڵت پێی ناشکێت.... دواتر دەبینی ئەم جزدانە چەندە بەکەڵکمان دێت. تەنیا شتێك کە ئێستا پێویستە ئەوەیە قیافەی ئەو دووانە لەبیر نەکەین.

وتم:

یەکێك لەوانم جوان بینی و ئەگەر لەناو هەزار کەس دابێت دەیدۆزمەوە.

یوری وتی:

ئەویتریشیان من..... ئێستا بخەوە تابەیانی.

ئەمەی وت و چاوەکانی بەست و خەوت.

شەو بەهەر شێوەیەك بو تێپەڕی. بەرەبەیان بەدەنگی سمی ئەسپەکان لەخەو هەستاین وئەوانمان لە گەردەنەدا بینی کە سەردەکەون و لەپشت پێچی کێوەکە لەچاو ون بوون.

دوای رۆشتنی ئەوان بەخەیاڵی ئاسوودە هەستاین و دەستمان بەگەڕان کردو شوێنێك کە ئەو کەسەیان کوشتبوو چاڵیان کردبو، دۆزیمانەوە و نیشانەمان دانا.

کاتژمێرێك دوای رۆشتنی ئەوان ئێمەش ملی رێگامان گرتەبەر بەخێرایی دەستمان

بەپێشرەوی کرد. بە درێژایی رۆژ رێگامان لە کوێستاندا بو تەنانەت یەك جاریش نەکەوتینە دەشت ودەر. ئەم ریّ پێوانە بۆ نیکی و ئەمانۆ کە بەوشێوە کوێستانیان نەبینیبو، بێزارکەر بو هەرکاتژمێر جارێك دادەنیشتن و لەهیلاکیدا دەیان نالأند.

نزیك ئاوابوونی خۆر گەشتینە دۆڵێك کە دیمەنێکی سەرنج راکێشی بو. شوێنێکی خۆشی ئاو هەوا بو کە یوری پێشنیاری کرد لەویّ بمێنینەوە و بەیانی درێژە بەرێگا بدەین.

نیکی و ئەمانۆ ئەو شەوە زۆر شادمان بوون سفرەیەکی باشیان بۆ خەو خواردن راخست. هەندیّ کات پێکەوە شەڕیان دەکردو هەندیّ کات پێکەوە ئاشت بوون وەك دوو خوشك دەستیان دەخستە ناو دەستی یەك و پێدەکەنین.

شەو کەبابمان خوارد و تازە سەرقاڵی گفتوگۆ و وتوێژ بووین کە دەنگی گیتار بیسترا.

چەند کەسێك قسەیان دەکردو گۆرانیان دەخوێند و گیتاریان لیّ دەدا و هەندیّ کاتیش دەیان نەڕاند. یوری لەشوێنەکەی هەستاو سیلاحی هەڵگرت و بەدوای دەنگەکەدا رۆشت.

نیکی و ئەمانۆ لەترسا خۆیان لەپشت من داشاردبو و دەلەرزین. یوری بەدوای دەنگەکە رۆشت و دوای چارەکە کاتژمێرێك گەڕایەوە وتی:

تاقمێك ژن و پیاو سەرقاڵی خواردن و خواردنەوەو سەماکردنن. ئەم هەواڵە هەم بووە هۆی شادمانی و هەم نیگەرانی و پەرێشانی.... شادمان بووین لەوەی گەشتووینەتە ئاوەدانی و شوێنە شارستانیەکانی دنیا و نیگەران و پەرێشان بووین لەوەی تازە، روبەڕوی دزە ناودارەکانی سەحرای بەرازیل دەبینەوە و هەزار رووداوی مەترسیدارتر لەرووداوەکانی کالوویی وسینگوالامان بۆ پێش دێت.

یوری دانیشت و دەست و قاچی لەهیلاکیدا درێژکردو دوای ساتێك بیرکردنەوە وتی:

دەزانن چیە... بیرێکم بەزەیندا هاتووە.

پرسیم: چ بیرێك...

وتی: بیر لەنیکی و ئەمانۆ دەکەمەوە. ئەوان دژواری زۆرمان بۆ دروست دەکەن. نیکی سەرقاڵی شانەکردنی سەری ئەمانۆ بوو و ئەم کارەی بەحەزێکی سەیرەوە ئەنجام دەدا چونکە تا ئەو رۆژە شانەی نەبینیبوو. راستی بیرم چو بیڵێم لەجزدانە دزراوەکەی یوری شانەیەکی پیاوانە بو. من ئەو شانەم دا بەنیکی و نیکی وەریگرت و سەیری کردو دواتر

فرێیدا چونکە نەیدەزانی بەکەڵکی چی دێت.

دووبارە شانەکەم هەڵگرت و سەری خۆم پێ داهێنا وتم:

ئەمە بۆ داهێنانی قژە سەرە و لەشاری ئێمە لەم شانە زۆرو هەرزانە.

نیکی دوای ئەوەی زانی شانە بەکەڵکی چی دێت هەڵیگرت و قژی خۆی پێ داهێناو دواتر قژە خورمایی رەنگ هەوریشمەکانی ئەمانۆی داهێنا.

بەهەرحاڵ ئەگەر ئەوان سەرنجیان لای ئێمە دەبو، تێدەگەشتن ئێمە چی دەڵێین. لەوڵامی یوریدا وتم:

چ ئەرك و دژواریەکیان هەیە. گریمان بەئەرکیش بن دەتوانین چی بکەین؟

ئایا رەوایە بیانگەڕێنینەوە....؟

یوری وتی:

نا..... مەبەستم ئەوە نیە. مەبەستم ئەوانە کە چ گوومانێکیان بۆ ژنە جوانەکانی ئامازۆن هەیە.

هێشتا جگە لەمن و تۆ کەس نەڕۆشتۆتە ئەوێ و قاچی هیچ ژنێکی ئامازۆن نەگەشتۆتە دەرەوەی جەنگەڵ. بەم بارودۆخەش ئەگەر دزەکانی بەرازیل تێبگەن نیکی و ئەمانۆ لەژنانی ئامازۆنن گیانمان دەکەوێتە مەترسیەوە.

بێ لەخۆ رازی بوون بەبۆچوونەکەی یوری رازی بووم. مافی خۆی بو و راستی دەوت چونکە منیش پێش رۆشتنە ناو جەنگەڵ یانی شەش ساڵ پێش ئەگەر ژنێکی ئامازۆنیم بدیایە وەك شێت دەمویست داگیری بکەم.

سەرم بەنیشانەی پشت راست کردنەوەی بۆچوونەکەی یوری تەکاندا و وتم:

ئەمە راستە بەڵام چارە چیە..... بەباوەڕی تۆ دەبێت چی بکەین... ئایا دەتوانین دایانشارین؟ یوری لێوی بەدیان گرت و رۆشتە ناو دەریای بیرکردنەوە. هەرکات یوری دەیویست بیربکاتەوەو بڕیار بگرێت ئەم کارەی دەکردو من نیگەران دەبووم.

خولەکێك دواتر وتی:

تەنیا کارێك کە دەتوانین بیکەین ئەویە کە ئەم نهێنیە داشارین و بڵێین بۆ راو رۆشتووینە جەنگەڵ و ئێستا دەگەڕێینەوە. نیکی و ئەمانۆش وەك هاوسەری خۆمان دەناسێنین.

وتم:

خراپ نیە بەڵام بۆ ئەوەی رسوا نەبین دەبێت بێ وەستان درێژە بەڕێگای خۆمان

بدەین و لەهیچ شوێنێکدا نەوەستین چونکە شێوەی قسەکردن و هەڵس و کەوتی وەحشیانەی ئەوان کە لەهەر شتێکی بچووك دەترسن دەبێتە هۆی ئاشکرابوونی راستیەکان.

نیکی کەسەری ئەمانۆی داهێنابوو لەدواوە بەپەتێك بەستبووی، لەم کاتەدا ئاوڕی دایەوەو وتی:

چی دەڵێن... من لەپڵنگی ڕەشیش ناترسم چۆن ئەگەری هەیە لەهەرشتێکی بچووك بترسم....

یوری ئەو دووانەی بانگ کردو بەزمانێکی سادەو شیاوی تێگەشتن تێیگەیاندن کەهیچ کەس نابێت لە رەچەڵەکی ئەوان ئاگادار بێت و ئەگەر تێبگەن ئەوان ئامازۆنین، گیانمان دەکەوێـە مەترسیەوە. چەند دەستوورێکی پێدان تا وەك دوو ژنی پەروەردەکرداو و شارستانی هەڵس و کەوت بکەن بەڵام دیاربو کە ئەوان لە ئەستۆی ئەم کارانە نایەن.

بەهەرحاڵ شەو بەئارامی تێپەڕی. شوێنێك کە نشینگەی ئێمەبوو دوایین خاڵی کوێستان دەژمێردرا و لەپشتیەوە سەحرایەکی تاڕادەیەك گەورە بو و لەکۆتاییەکەیدا دووبارە رشتە کێوێکی قاوەیی رەنگی سەر بەئاسمان کێشراو تا ئاسۆ درێژەی بو.

بەرەبەیان یوری منی هەستاندو وتی:

بڕوانە ئێمە دەبێت لەو دەشتەپان و بەرینە تێپەڕین وبگەینە ئەو بەشەی کوێستان. دوای تێپەڕین لەو کێوە و تێپەڕین لەچەند ئاوایی بچووك و دێهات و قەڵای کەم دانشتوان بگەینە شاری (( سانسالوادۆر )) و دواتر بە شەمەندەفەر بەرەو (( ڕۆدیۆجانیرۆ )) بەڕێکەوین. من سەیرێکی دەشتەکەی روبەڕووم کرد کەهەموو شوێنێکی بەکاکتووسی گەورەو بچووك داپۆشرابو.

وتم:

دەتوانین لەیەك کاتژمێردا ئەم دەشتە ببڕین ئەمە کەگرنگ نیە.

یوری بەگاڵتەوە پێکەنی و وتی:

چەندە ساویلکەیت، کێشەی کاری ئێمە لەمەدایە کەلەم سەحرایە تێپەڕین. بەباوەڕی تۆ تەنیا کاتژمێرێك بەسە بۆئەوەی لەم سەحرا پڕ کاکتۆسە تێپەڕین؟ زۆر باشە ئەمەش بۆخۆی لەخۆیدا بۆچوونێکە بەڵام دەبێت پێت رابگەیەنم ئەگەر بتوانین لەماوەی سێ رۆژدا لەم سەحرایەدا دەربازببین بەڕاستی کارێکی شازمان ئەنجامداوە چونکە لانی کەم

دەبێت هەشتا کیلۆمەتر ببرین تا بگەینە کێوە قاوەیی ڕەنگەکانی روبەڕوو. شانسمان لەوەدایە کەلەم دەشتەدا کاکتوس زۆرەو دەتوانین خۆمانی لەناودا حەشاربدەین بەڵام بەهەرحاڵ ئەگەر لەشوێنێکدا روبەڕوی دزەکانی بەرازیل ببینەوە لەم سەحرایەدا دەبێت.

کاتژمێرێك دواتر لەگەڵ ئەوەی زۆر هەستمان بەبرسیەتی دەکرد ڕۆشتینە ناو دەشتەکە، نیکی و ئەمانۆ بەبینینی کاکتوسە دڕکاویەکان دەترسان و بەراستیش سەیرو پێکەنیناوی بو. ئەوان کە کاکتۆسیان نەبینیبو و جیاواز لەوەش گوومانیان دەکرد هەموو شوێنێك جەنگەڵی ئامازۆنە، بۆیە لە دڕکی کاکتوس و هەتاوی گەرم و سووتێنەر کەڕاستەوخۆ لەسەریانی دەدا بێزار ببوون و بۆڵە بۆڵیان دەکرد.

نیوەڕۆی بو بەشەو و پەڵە هەورێك هەتاوی داپۆشی. یوری ناو سەرو خواری پەسەندکرد و وتی:

لێرەدا دەمێنینەوە تا شتێك بۆ خواردن ئامادە بکەین. لەم ناوچەدا ئاسك زۆرە.

ڕۆشتینە ناو سەرو خوار یەکە و بەوپەڕی سەرسوڕمان بینیمان کەلەوێوە کێوەکانی ئەم لاولامان نابینرێت و لەبەرئەمەش لەدەوروبەرە ئێمە نابینرێین.

یوری تفەنگەکەی هەڵگرت و ڕۆشت و بەوهیوای نێچیر یان باڵندەیەکی دەست کەوێت. نیکی وئەمانۆش دەستیان بەبڵاوکردنەوەی سفرە کرد و بەچەند لقێکی دار کوچکاوریان دروست کردو ئاگریان داگیرساند.

ئەو روداوە گەورانەی چاوەڕێیان دەکردین لێرەوە دەستی پێکرد کە ئاگرمان داگیرساند لەکاتێکدا شتێك بۆ خواردن نەبوو پێویستمان بەئاگر نەبو. تەنیا شتێك کەبیرم لێ نەدەکردەوە ئەوەبو کە دووکەڵی ئاگر لە دوورەوە دەبینرێت و سەرنجی کەسەکان رادەکێشێت.

کاتژمێرێك تێپەڕی. بیرم کەوتەوە کە کەمێك ناوکی بایەمی وەحشی جەنگەڵم پێیە. لە جەنگەڵی ئامازۆن جۆرە دارێکی کاژ هەیە کە بەپێچەوانەی کاژ گەڵای پانی هەیە. ئەم دارە میوەیەکی هاو شێوەی بایەمی هەیە کەوەحشیەکان لەناوکەکەی جۆرێك بایەم دروست دەکەن. لە ئامازۆن لەناوکی بایەمی وەحشی ڕۆن دەگرن و جەستەی خۆیانی پێ چەور دەکەن. نیکی چەند کیلۆیەکی لەم بایەمەی لەپەرستگادا هەبو، کەم کەم لێمان دەخوارد و ئەویتریمان کاتی بەڕێکەوتن هەڵگرت. من بێ ئەوەی شتێکیان پێ بڵێم و بایەمەکانیان بیربخەمەوە. هەستام و تاوەیەکی ژەنگاوی کە دوای شەش ساڵ لای ئەستێڵکەکە دۆزیبوومەوە خستمە سەر ئاگر تاکەمێك لەبایەمەکان ببرژێنم.

هێشتا دەست بەکار نەببووم و کیسەکەم نەکردبوویەوە کە دەنگی ترس ئەنگێزی نیکی و ئەمانۆم بیست ئەوان دەیانقیژاند و خۆیان لەپشت سەری من و لە پشت کاکتوسێکی گەورەدا داشارد. لەترسا روخساریان لەناو دەستیاندا گرتبوو تەنانەت نەیاندەوێرا سەر بەرزبکەنەوە و وەڵامی من بدەنەوە.

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم:

ئاخر چی بووە؟ بۆ شێت بوون؟ ئەمە چ کارێکە؟ مەگەر بەڵێنتان نەدا بێ هۆ نەترسن؟ ئەوان قسەیان نەدەکرد بەڵام بۆ رێگرتن لەتووڕەیی ئەمانۆ بەپەنجە روبەڕوی نیشاندا و دووبارە دەستی بەروخساریەوە گرت تا ئەوێ نەبینێت.

گوومانم کرد رەنگە ئاژەڵێکی دڕندە لێمان نزیک دەبێتەوە بۆیە بڕیارمدا تاوەکە فڕێدەم و تفەنگەکەم هەڵگرم بەڵام هێشتا ئەم کارەم ئەنجام نەدابو کەدەنگی پێ و وتوێژی چەند کەسم بیست و کاتێك سەرم هەڵبڕی خۆم لەگەڵ سێ بەرازیل بەهەمان قیافەو هەمان کڵاوە لێوداره بەرزەکان روبەڕو بینی.

یەکێك لەوان لاغرو ئەویتریان قەڵەو بو. ئاسکێك کەیەکەمی بەتفەنگەکەی خۆی راوی کردبو، لەسەر شانی بو. هەرسێکیان تفەنگیان پێبوو و سیلاحێکیش لەدەستی پیاوە قەڵەوەکەدا بو.

دەتوت ئەوان نیکی و ئەمانۆیان نەبینیوە وچونکە راستەوخۆ سەیری منیان دەکردو کاتێك نزیك بوونەوە سلاویان کرد.

پیاوی لاغر ئەندام وتی:

سلاو بەرێز چی دەخۆن؟ دەڵێی گۆشتی تازەتان پێ نیە. ئێمە ئاسکێکی قەڵەومان راوکردوە، ئەگەر رێگە بدەن ئێوە لەگۆشت و ئێمەش لەتاوەو ئاگرو خوێ کەی ئێوە کەڵك وەربگرین.

من لەم خولق کردنەی ئەوان و بینینی ئاسك و کەهێشتا خوێن لەقوڕگیەوە دڵۆپەی دەکردە سەر پێلاوەکان زیاد لەرادە شادمان بووم و بەروگەشیەوە رازی بووم وتم:

فەرموون دانیشن ! ئێمە راوچین و بۆ باخی وەحشی ئەرجەنتین کار دەکەین.

ئیشتیای من بە بینینی ئاسکەکە بزوێندرابو و بەردەوام دەم پردەبو لەئاو. خۆزگەم دەخواست ئاسکەکەم خۆمان راومان بکردایە و بێ شەرم کردن و خولق کردن پێستەکەیم داماڵیایە و بۆ نیکی و ئەمانۆ کەبابم دروست بکردایە تا برسیەتیان بشکێت.

پیاوی قەڵەو بەدژواری ئاسکەکەی لەپشت ملیەوە دەخستە سەر زەوی وبێ ئەوەی

قسەیکات خەنجەری کێشاو دەستی بەپێست داماڵین کرد. پێش هەرکارێك کەمێك چەوری لەناو سکی ئاسکەکە دەرهێناو رویکردە من، وەك کەسێك کە هاوڕێیەتی چەندین ساڵەمان هەبێت وتی:

تاوەکە بێنەرە پێش و ئەم چەوریە گەرم کە تاگۆشتی کەبابتان پێ بدەم. من دەست بەجێ تاوەکەم بردەپێش و چەوریەکەم خستە سەر ئاگر تا گەرم بێت. لەم کاتەشدا لەگەڵ هاوڕێکەی قسەم دەکرد و لەژێر چاو ئاگام لەجوولەکانی نیکی و ئەمانۆ بو و لەکردەوەکانی ئەوان هەم پێکەنینم دەهات و هەم تووڕە بووم. دەمویست پێیان بڵێم بێنە پێش بەڵام دەترسام نەکارێکی پێچەوانە بکەن و زیاتر ببنە هۆی تووڕە بوونی من درۆیەك کەوتووە ئێمە راوچین بسەلمێنن.

ئەو لەمنی پرسی:

نەتانتوانی شتێك راوبکەن.... دەڵێی بەدەستی خاڵی گەڕاونەتەوە.

لەوەڵامدا وتم:

نا چەند ماری ئاناکنداماں راوکرد و هاوڕێکانمان پێشتر بردیان. ئێمە بۆ گرتنی چەند توتی ئامازۆنی ماینەوە بەڵام ئەمساڵ توتیەکان کۆچیان کردبو، هۆی کۆچی توتیەکان هێرشی دەستەیەك شاهینی سپی رەنگە. بوونی ئەم باڵندانە بووە هۆی کۆچ کردنی توتیەکان و کارەکەمانی شێواند.

بۆ ئەوەی لەمبارەوە قسەنەکرێت و ناچار بەدرۆکردن نەبم، قسەکەم گۆڕی و وتم:

ئێوە خەڵکی کوێن و ئێرە بۆچی هاتوون؟

وتی:

ئێمە دزین.

دواتر وتی:

من ناوم (( ئالواییە ) و هاوڕێکەم (( کالوادۆر )). هەردووك لەدەستەی فرانچی کاردەکەین.

لەم کاتەدا سەیرێکی کالوادۆری کردو وتی:

ئەحمەق پلێك لەگۆشتی ران ببڕەو بیهێنە ! بۆ وەستاویت. ریخۆڵەکانم وشك بوون.

دواتر درێژەی بەقسەکانی خۆیداو وتی:

بەڵێ. چەند رۆژێکە کە مارچلۆ برازاکەی فرانچی سەرۆکی دەستەکەمان وون بووە و هەرچی بە دوایدا دەگەڕێین ناتوانین بیدۆزینەوە.

بەبیستنی ئەم قسانە گوێچکەکانم زرنگایەوەو سەرم گەرم بو. چونکە تەنیا من و یوری دەمانزانی چ بەڵایەکیان بەسەر مارچلۆ دەرهێناوە و بکوژەکانی ئەویشمان بینیبوو ئەگەر دووبارە بماندینایە، دەماننناسینەوە.

ئەو دووبارە لەگەڵ کالوادۆر قسەی کردو کە گۆشتەکە ئامادە بو ئالوایی خۆی هەستاو دەستی بە برژاندن و کەباب کردنی کرد.

هێشتا نیکی و ئەمانۆ لەپشت کاکتوسەکە خۆیان داشاردبو بەڵام کاتێك من هەستام ئەوانیش هاتنە پێش.

ئالوایی و کالوادۆر تا ئەوساتە ئەوانیان نەدیبو بەسەرسوڕمانەوە نیگایەکیان ئاڵ و گۆڕکردو لە شوێنەکەیان هەستان و سڵاویان کرد. بەڵام نیکی و ئەمانۆ نەیاندەتوانی وەڵامی بدەنەوە نەیاساکانی هەڵس و کەوتیان دەزانی ولەئەنجامدا گێژو ور سەیری ئەو دوانەیان دەکرد.

من لەوەڵامی ئەواندا وتم:

ببورن، ژنەکانی ئێمە زمانی پورتوگالی نازانن.

دەست بەجێ قەرەباڵغیم دروست کرد تاسەریان قاڵ بکەم.

سەرنجی ئەو دووانە بۆلای نیکی و ئەمانۆ راکێشرابو و لەژێر چاوەوە سەیریان دەکردن. کردەوە و جووڵەکانی ئەوانیش جۆرێك بو کەسەرنجی هەربینەرێکی رادەکێشا.

نیکی و ئەمانۆ هەردوکیان وەستابوون وەك بڵێی دوو ئاژەڵی جەنگەڵیان بینیووە و سەیری دەکەن و هەر خوولەك و هەنگاوێك نزیك دەبوونەوە. زیاتر لەهەر شتێك کڵاوەکانی ئەوان سەرنجی رادەکێشان و بەتایبەت نیکی کەخۆی شەیتان و دەست نەسرەوت بو دەیویست کڵاوەکەیان هەڵگرێت و بیکاتە سەری خۆی....

بۆئەوەی کۆتایی بەم بارودۆخە بێنم ڕەشاشەکەم هەڵگرت و سێ گولەم بەدوای یەکدا تەقاند.

ئالوایی ترساو لەشوێنەکەی بەرزبوویەوەو دەستی گرتم و وتی:

چی دەکەیت....! بۆ تەقە دەکەیت؟ بۆ نایەڵیت ئاسوودە بین.

پرسیم:

چ ئیرادێکی هەیە.... دەمەوێت هاوڕێکەم ئاگادار بکەمەوە تا بۆخواردن بێت.

ئالوایی وتی:

کارێکی خراپتان کرد. ئەگەر فرانچی دەنگی گوولە ببیستێت سوار دەبێت و بەپەلە خۆی دەگەیەنێتە ئێرە، کاتژمێرێك ئاسوودەیی و حەوانەوەی ئێمە تێك دەچێت.

دواتر بەروخسارێکی مۆن درێژەی بە برژاندنی گۆشت کرد. چەند خولەك تێپەڕی یوری بەپاکردن خۆی گەیاندە ئەویٚ و کاتێك ئەو دووانەی بینی زیاد لەرادە سەری سوڕماو لەهەمان کات نیگەران بو. شوێنەواری نیگەرانی لەچاوەکانی دیاربو و من کەباش ئاشنای ئەخلاقی یوری بووم هەستم پێکرد.

ئاشنایی یوری و ئەو دوو دزە بەرازیلیە زۆر خێرا سەری گرت و یوریش بۆ گۆشتی برژاو ئیشتیایی تێرو ۆخی ئامادەکرد. من لەوانم پرسی:

پێشتر لەم ناوچەدا کالوویی دەژیاو هاوسەرێکی بەناوی سینگوالا بو. ئەو چی لێهات و ئێستا چی دەکات کالوادۆر بەسکی زل و ورگنەکەی خۆی وەك گایەك کەپژمە بکات پێکەنی و لەهەمان کات کە جەرگی ئاسکەکە بۆ برژاندن دەدا لەدارە ناسکەکان وتی:

ئاها..... ئەو لەحکومەتی ئەم ناوچەیە لابڕاو بەدەست فرانچی زیندانی کرا.

هاوسەرەکەی ئێستا دەزگیرانی ناشەڕعی سەرۆکی ئێمە فرانچیە.

ئالوایی زیرەکانە پرسی:

ئێوە لەکەیەوە لێرەوە تێپەڕ بوون کە کالوویتان بینیوە و دەیناسن. شەش ساڵ پێش ئەو لەفرانچی شکەستی خوارد. شەش ساڵ لەو مێژووە تێدەپەڕێت. لەم ماوەدا ئێوە لەجەنگەڵ بوون؟ راستی لەژنانی ئامازۆن هەواڵتان هەیە. ئایا ئێوەیان بینیوە؟ راست دەکەن کە لەئامازۆن هۆزێکە لە ژنە جوانەکان دەژین؟

نەمدەزنی چی وەڵام بدەمەوە... کار گەشتبووە شوێنێك کە ئێستا لێیان دەترسام و لەسەرەتاوە خۆمان دەپاراست کە لەمبارەوە قسە نەکرێت و باسی ئامازۆن و ژنانی ئامازۆن نەیەتە پێش.

یوری لەژێر چاوەوە سەیری کردم ومنیش بەهەمان شێوە وەڵامم دایەوەو بۆئەوەی وەڵامێکمان بەقەستی ئەوان دابێتەوە، یوری کەلەم کارانە شارەزایی زیاتری بو وتی:

ئێمە گەشتینە نزیك هۆزی ژنانی ئامازۆن بەڵام بەهۆی بوونی چەند هۆزێکی مەترسیدار لە وەحشیەکان کە لەو دەورووبەرەدا دەژیان نەمانتوانی لەهۆزی ژنان نزیك ببینەوە و لەترسی گرفتاری و کوژران شەوانە رامان کرد و خۆمان گەیاندە شوێنێکی ئەمن.

یوری پلیٚ گۆشتی خستە دەمیەوە و لەژێر چاوەوە بەجوانی سەیری ئەوانی دەکرد کە گوێیان لێگرتبو و وتی:

بەڵیٚ..... ڕۆشتن بۆ ئەو هۆزە لەبەرژەوەندیدا نەبوچونکە ئێمە دوژنمان لەگەڵدا بو لەبەرئەوەی ژنانی ئامازۆن نەیاری رەگەزی ژنن و ئەم بابەتە پێشتر هۆزەکانیتر پێیان وتبووین، گەڕاینەوە.....

ئەگەر جارێکیتر بگەینە ئەم شوێنە، ژنەکانی خۆمان ناهێنین تا بتوانین چەند ژنێکی ئامازۆنی راوبکەین.

کاتێك قسەی دەکرد چەند جارێك چاوی ئەوان کەوتە سەر قژو هەیکەل و ئەندام و حاڵەتە وەحشیانەکانی نیکی و ئەمانۆ و دووبارە سەرقاڵی خواردن بوون. ئەمە ئەنجامێکی دا بەدەستمەوە کە ئەوان هەستیان بەراستیەکان کردوەو ئەگەر کالوادۆر تێنەگەشتبێت ئالوایی بەدڵنیاییەوە هەستی پێکردوەکە نیکی و ئەمانۆ ئامازۆنین....

من کارێکی گرنگترم کرد و ئەویش ئەوەبو لەکاتی قسەکردن بەزمانی ئامازۆنی لەنیکی و ئەمانۆ گەیاندە کە ئێمە ئەوانمان بەهاوسەری خۆمان ناساندوە و نابێت کارێك بکەن گوومانیان ببزوێنرێت. خواردن بەخێرایی تەواو بو من کەماوەیەك بو گۆشتی ئاسکم نەخواردبو دەستم بۆ گیرفانم برد تایەکێك لە جگەرە دزیەکان دەربێنم و دووکەڵی بکەم.

ئەم کارە کەمتەرخەمیەکی گەورەو مەترسیداربو چونکە جگەرەکانم لەجزدانی باخەڵیەکەی مارچلۆ دانابو و ئەگەر دەرم دەهێنا ئەوان جزدانەکەیان دەناسیەوە و ئێمەیان بەکوشتنی ئەو گەنجە کە برازای سەرۆکە خوێنخۆرەکەیان بو تاوانبار دەکرد.

ئەم جارەش یوری شارەزایانە فریام کەوت وەك زۆر جار ئاماژەم پێداوە یوری پیاوێکی وشیاربو رەنگە بتوانم بڵێم کە هۆشی ئەو لەدنیا کەم وێنە بو. لەگەڵ ئەوەی پاڵم بەکاکتوسەکەوەدا دەستم بۆ گیرفانم برد زانی کەدەمەوێت جگەرە دەربێنم. بۆیە رەنگ لە روخساری پەڕی و بەترس و نیگەرانی چاوە ڕەشەکانی خۆی بڕیە من و بەئامازۆنی وتی:

چی دەکەیت...... جگەرە نەکێشیت.

بەداخەوە لەزمانی ئامازۆنی وشەیەك بۆ جگەرە نەبو لەجیاتی ئەوە یوری شتێکی تری وت و منیش دەست بەجیٚ تێگەشتم کەمەبەستی جگەرەیە و بەداخەوە دەستم دەرهێناو وتم:

نا...... بەڵام باش بو بیرت خستمەوە...

یوری وتی:

تۆ سەرئەنجام رسوامان دەکەیت.... لێرەوە لەیەك جیادەبینەوە. ئێمە لەم لاوە دەڕۆین و ئەوان بەدوای کاری خۆیان بەجێ دێڵین. خێرا بارەکان کۆکەنەوە.

نیکی و ئەمانۆ سەرقاڵی کۆکردنەوەی بارەکان بوون و من و یوری خۆمان ئامادە دەکرد تا درێژە بەڕێگاکەمان بدەین.

ئالوایی سەرسوڕماو وتی:

بۆ کوێ دەڕۆن؟ بۆ بەم خێراییە.... ئایا ناتانەوێت هیلاکی قاچتان بڕەوێتەوە؟

یوری وتی:

بەداخەوە کاتی پێویستمان نیە هەرچی زووتر دەبێت خۆمان بگەیەنینە سان سالوادور و لەهاوڕێکانمان کەقەفەسی ئاژەڵەکانیان بردوە هەواڵ بگرین. بەدڵنیاییەوە لەم ماوەدا نامەو بروسکەی زۆرمان بۆهاتووە و داوای شتی تازەیان لێکردووین کە دەبێت یان دووبارە بگەڕێینەوە بۆ ئێرە یان رێگای جەنگەڵەکانی ئەفریقا بگرینە بەر و بۆئەوی سەری ئەوان بەقسە گەرم بکات درێژەی دا.

راوچی نەشارەزا ناتوانێت ببێتە راوچی کارامە.... کاتژمێرێك لەژیانمان هۆی خۆمان نیەو بۆ ئەوەی لەماڵی خۆمان دوورنەبین هاوسەرەکانیشمان لەگەڵ خۆمان دەهێنین تا خیاڵمان بەتەواوی ئاسوودەبێت... ئەگەری هەیە ئەمڕۆ داوای چەند شێری ئەفریقاییان لێ کردبێتین. بۆ راوی شێری زیندوو دەبێت بۆ جەنگەڵەکانی ئەو قارە سەفەر بکەین.

هێشتا قسەکانی یوری و درۆ شاخدارو سەیرەکانی تەواو نەببو کە لەناکاو کالوادۆر بەورگە زلەی خۆی لەشوێنەکەی هەستاو ترساو بەئالوایی هاوڕێی وت:

دەنگی سمی ئەسپ دێت.... دەبیستیت...؟ بەدڵنیاییەوە کۆڕەکان بەرەو ئێرە دێن. ئالواییش لەشوێنەکەی هەستاو کەمەر بەندەکەی توند بەست و چونکە لەوچاڵەوە دوروبەر نەدەبینرا چەند هەنگاوێك رۆشتە سەرو سەیری ئەم لاولای کرد وتی:

دوو سوار بەرەو ئێرە دێن..... لەخۆمانن.

یوری سەری خۆی بەداخ و نیگەرانیەوە تەکانداو بەم شێوە تێیگەیاندم کە کارەکەمان دژوار بوە... دیار نەبوو چی دەبێت و چ رووداوێك روودەدات... هەموو هەوڵەکانمان بۆئەوەبو کەلەم رێگادا روبەڕووی دزەکان و فرانچی نەبینەوە.

دزانی بەرازیل بەتایبەت ئەوانەی لەو ناوچەتایبەتەی نزیك جەنگەڵ دەژین بە مەترسیدارترین دزو ڕێگرەکانی دنیا دەژمێردرێن...

گەورەترینی ئەوان سەرۆك و فەرمانڕەوای ئەوانیترە و چەندین دەستە لەشوێنەکانیتر لەبەرژەوەندی ئەودا کاردەکەن، سوڵتانی بێ تاج و تەختی سەحرایە.... هەرکارێکی بوێت دەتوانێت بیکات و لەهیچ دەسەلاتێك ناترسێت..... لەحکومەتی ناوەندی و سەربازان و سوارەکانی ناترسێت و فەرمان لەهیچ کەسێك نابات.....

سیلاح لەدەستیا دەسووڕێت و لوولەکەی رویکردە سینەی هەرکەسێك سینەی کوون دەکات. مرۆڤێك بە هەموو هیواو ئارەزووەکانی دەکوژرێت و ئەو وەك ئەوەی کەمتیارێکی کوشتبێت سیلاحەکەی هەڵەگرێت و دەڕوات.

ئەمەیە مانای فرانچی... ترسی ئێمە لەمە بو کە نەکا روبەڕوی ئەو ببینەوە چونکە لەگەڵ بینینی نیکی و ئەمانۆ چاوی تەماحی تێ دەبڕین و بۆئەوەی بێ دەردەسەر داگیریان بکات پلانی کوشتنی من و یوری دادەڕێژێت.

کاتێك ئەو دووسوارە گەشتن رەنگم پێوە نەمابو و دڵم وەك کۆترێك کە گرفتار بو بێت لێی دەدا. ئەوەندە تووڕە و ناڕەحەت بووم کە حسێبی هەمووشتێك و هەموو کارێکم لای خۆم کردو بەیوریم وت:

دەزانی چیە؟ ناتوانم ببینم دەستی کەس بەنیکی و ئەمانۆ بگات، ئەگەر بگاتە ئەوێ من بەڕەشاش روبەڕویان دەبمەوەو هەموویان پاك دەکەمەوە. بەخوا ئەگەر سەد کەس بن هەموویان دەکوژم.

یوری بەبیستنی قسەکانی من وەك ئەوەی بیرێکی تازەی بەمێشکدا هاتبێت وتی:

ئەوان هێشتا سەرنجیان بۆلای سیلاحەکانی ئێمە رانەکێشراوە.... هێشتا نەیانزانیوە ئێمە ڕەشاشمان پێیە، بەخێرایی دەبێت لەناو بارەکاندا دایشارین و لەو تفەنگە کۆنانە کەڵك وەربگرین. ئەوان ئەوەندە حەزیان لەڕەشاشە کەمناڵ بە بووکەڵەو نوقڵ و شیرینی... خێراکە. خۆی بەپەلە ڕەشاشەکەی لەپێستی پڵنگەوە پێچاو توندی کرد. منیش ئەم کارەم کردو بۆئەوەی سەرنجمان رانەکێشرابێت ڕەشاشەکانمان دابەدەست نیکی و ئەمانۆ.

لەم کاتەدا سوارەکان لەبەرانبەر هاورێکانی خۆیان ئاڵوایی و کاڵوادۆر لەئەسپ دابەزین و دەستیان بەگفتوگۆ کرد. چەند هەنگاوێك زیاتر دووریمان نەبو لەگەڵ ئەوەشدا دەنگی ئەوانمان نەبیست و نەمانزانی چی دەڵێن و چی دەبیستن.

کاتێك گفتوگۆی ئەوان تەواو بو سوارەکان بەدەست سلاٌویان لێکردین و یەکێك لەوان کە دەمانچەیەکی بەکەمەردا هەڵواسیبو هاتە پێش و وتی:

بەرێزان بۆ ناوچەکەی ئێمە بەخێر بێن، ئەم شەو ئێمە جەژنێکی بەشکۆمان هەیەو فرانچی لە بینینی ئێوە شادمان دەبێت. ئەو پیاوێکی میوان دۆست و بەرێزو تایبەت رێز لەراوچییەکان دەگرێت.

یوری سوپاسی کردن. من هیچم نەوت بەلاٌم وەلاٌمی (( نا )) مان پێ نەدان چونە ئەنجامی نەبو بە هیچ شێوەیەك لەبەلاٌی میوانداری مەترسیداری ئەوان ئاسوودە نەدەبووین.

چارەیەك جگە لەرازی بوون نیە. ناچار یوری بزەیەکی هێنایە سەر لێو و وتی:

ئێمە هەرچی دەبێت زووتر بگەینە شاری سان سالوادور و کاری ناردنی راوەکان رێك بخەین و لەگەڵ ئەوەش لەبەرەئەوە زیاد لەرادە تامەزرۆی بینینی فرانیچین و ناویمان زۆر بیستووە بەوپەڕی رەزامەندیەوە لەگەڵتانا دێین.

ئەو دوو سوارە شادمان بوون و بۆئەوەی خولقی خۆیان تەواوبکەن، ئەسپەکانیان هێنایە پێش و یەکێك لەوان وتی:

خاتوونەکان باسواری ئەسپەکان بن. ئەوان ناتوانن بەپێ بڕۆن. لە ئەدەب و رێزەوە دوورە ئێمە سوڕابین و ئەوان پیادە.

نیکی و ئەمانۆ وەك مشکێك کەلەبینینی پشیلە ترسابێتن بەبینینی ئەسپەکان پەرێشان بوون... رەنگ بەروخساریانەوە نەدەبینرا و من باش دەمزانی تاچەندە ترساون و تا چەندە رێگە لە قیژەی خۆیان دەگرن.

یوری وتی:

زۆر سوپاس. ئەوان بەپیادە رەوی عادەتیان هەیە. ئەوان شەو و رۆژی خۆیان لەگەڵ ئێمەدا لەجەنگەڵ بەسەر بردوە و لەهیلاکی ناترسن. فەرموون ئێوە خۆتان سوارین و لەپێشەوە بڕۆن ئێمە لەدواوە دێین.

ئەوان دووبارە خولقیان کرد بەلاٌم سەرئەنجام تەسلیم بوون پەڕینە سەر ئەسپەکان و رۆشتن. لەکاتی رۆشتن یەکێك لەوان گەڕایەوە و ئیشارەیەکی لەئالۆوایی کرد کە ماناو ناوەرۆکی دیاربو. مەبەستی ئەوەبو ئاگایان لێمان بێت نەکا رابکەین و لەکێوەکانی ئەولا لەچاو ون ببین. هەرچەندە گوومانی راکردن بۆ ئێمە ئەگەری نەبوو بۆ هەرشوێنێك دەڕۆشتین گرفتار دەبوین بەلاٌم ئەو دوو سوارە وایان بیردەکردەوە و بۆ دڵنیایی

هاوڕێکانی خۆیان راسپارد ئاگایان لێمان بێت.

ڕێگا ئەوەندە دوور نەبو. نزیك ئێوارە گەشتینە دۆڵێکی سەر سەوز کەسەدان کانی و داری زۆری لێ بو.

هەوای ئەوێ فێنك و دڵ ئەنگێز بو نیکی و ئەمانۆ لەچەند ڕۆژ پێش دارو ئاویان نەدیبوو بەبینینی دارو ئاو هەڵبەزو دابەزو شادمانیان دەکرد.

کەمێك ئەولاتر فرانچی بەدوو جین ژنەوە بەپێشوازیمان هات. دیار بو کەپێشتر پێی وتراوە کە دوو ژنی جوانمان لەگەڵدایە و بەم شێوە سەرنجی ئەویان راکێشابوو.

فرانچی لەناو دەستەیەك ژنی جوان کەهەموویان دەزگیرانی ئەو بوون لێمان نزیك بوویەوەو خۆی ناساند و وتی:

من فرانچی ژواکین فەرمانڕەوانی دەشت و کێوەکانی ئەم ناوچەم. بەبینینی ئێوە شادمانم.

ئەو دەستی ئێمەی گووشی و ئێمەش تەوقەمان لەگەڵداکرد. بەلام دواتر فرانچی دەستی خۆی بۆلای نیکی و ئەمانۆ درێژکرد.

نیکی بەترسەوە دەستی خۆی کێشایەدواوەو سەیری منی کرد. یوری بەزمانی ئامازۆنی فەرانی پێداو وتی:

دەستی بگرەو بیگوشە.

نیکی بەخێرایی دەستی بردو دەستی فرانچی گرت و چەند جار بەخێرایی سەختی تەکانی دا بە جۆرێك فرانچی نەیتوانی رێگە لەپێکەنینی خۆی بگرێت.

قاقایەکی لێداو دواتر دەستی بۆلای ئەمانۆ درێژ کرد. ئەمانۆ کە پێکەنینی فرانچی بینیبو بەوشیاری خۆی تێگەشت کەنابێت دەستی تەکان بدات بۆیە بەنەرمی زەختی لێکردو بەریدا بەلام کاتێك دەستی لەدەستی فرانچی دەرهێنا لەپشتی خۆیدا شاردیەوە.

تائیرە تاڕادەیەك بەخێر گوزەرابو بەلام لەسەریەك ئەوان ئێمەیان رسواکردبو و فرانچی ئەگەر زۆر کەم هۆشیش بوایە تێدەگەشت کەژنانی ئێمە شارستانی و پەروەردەکراو نین.

فرانچی گەنجێکی بالا بەرز و خۆش قیافە بو. ئەندامی گەورەو شانی پان و ملی کێشراو و پێستی برۆنزی رەنگی بو. جل و بەرگی هاوشێوەی بەرازیلیەکان بو و شالێکی سوور رەنگی لەسەر کەمەر بەندەکەی ئالاندبو. زەرق و برقی جلەکانی سەرنجی

نیکی و ئەمانۆی رادەکێشاو بەحەزەوە سەیریان دەکرد.

جل و بەرگی ژنانیش بۆ ئەو دووانە سەرنج راکێش بو، تەنوورەی فش و رەنگاو رەنگ پرچین بلوزی یەخەکراوە زینەتیەزۆرەکان کە لەمل و گەردن هەڵیان واسیبو. ئەمانە سەرنجی نیکی و ئەمانۆیان رادەکێشا و چاویان لەسەر سینەی ژنان هەڵنەدەگرت.

فرانچی ژواکین بەرێزێکی تایبەتەوە ژێر قۆڵی گرتین لەکاتێکدا لەبیناکان نزیك دەبووینەوە وتی:

نا بەرێزان.... دزەکانیش ئەوەندە خراپ نین. بەتایبەت فرانچی ژواکین گەنجێکی بەئەدەبە. خەڵك بێ هۆ نەفرینمان دەکەن.

ژنان و دەزگیرانەکانی فرانچی دەوروبەری نیکی و ئەمنۆیان گرت بەڵام دەترسام کە نەکات یەکێك لەوان کارێك بکات کە ئەو تۆزە ئابرووەشمان بڕوات و رسوایی دروست بێت. فرانچی قسەی دەکرد بەڵام من بەردەوام ئاوڕم دەدایەوە، دەمویست نیکی و ئەمانۆ ببینم و رێگربم لە خراپەکاری ئەوان.

نزیك بیناکان دەرفەتێك دەسکەوت و گەڕامەوە سەیرم کردن. نیکی دەستی ژنێکی لە دەست گرتبو و بەحەزێکی منالآنەوە یاری بەئەنگوستیلەو دەستبەندەکانی دەستی دەکرد.

ڕەشاشەکەی دابو بەئەمانۆ بەڵام ئەویش بەدوای دەرفەتدا دەگەرا تا داینێت و بەگەردن بەندی یەکێك لەژنەکان خۆی سەرقاڵ بکات.

هەر خولەك کەتێدەپەڕی کارخراپتر دەبو.

فرانچی لەبەرانبەر ماڵێکدا وەستا تانیکی و ئەمانۆ گەشتن. سەرەتا ئەوان و دواتر ئێمە رۆشتینە ژوور.

لەوێوە کارە سەیروسەمەرەکانی نیکی و کردەوە سەرسوڕهێنەرکانی ئەمانۆ دەسی پێکرد چونکە ئەو دووانە تا ئەوسات جگە لەماڵی گڵی ووەحشیان نەدیبوو لەبینینی سەریان سوڕمابو وەك شێت گێژببوون و بەدەوری خۆیاندا دەسووڕان. لەوەش خراپتر کاتێك چاویان بەچراکەوت نزیك بو لەشادمانیدا بقیژێنن.

نیکی رایکردو تا لولە چراکە بەدەست بگرێت و ئەگەر قیژەی من ئەوی نەوەستاندایە رەنگە لولەی گەرمی چراکەی بەدەست دەگرت و پەنجەکانی دەسووتا.

من بۆئەوەی سەرنجی فرانچی بۆ شوێنێکی تر راکێشم سەیرێکی دەوروبەری

ژوورەکەم کرد، چاوم کەوتە سەر بڵاوکراوەیەك کەبەدیوارەکەیان هەڵواسیبو.

لەبڵاو کراوەکەدا وێنەی فرانچی دەبینراو لەژێرەکەیدا نویسیبویان کەسەری بڕاوی فرانچی ژواکین بۆ نیشاندانی گشتی نمایش دەکرێت.....

بەسەرسوڕمانەوە وتم:

ئەمە چ مانایەکی هەیە.....؟ سەری بڕاوەی ئێوە......؟

ئەو پێکەنی و وتی:

بەڵێ.... کەسێکیتر کە لەمن دەچو کەوتە چنگی سەربازەکان، ئەوان ئەویان کوشت و سەریان لەجیاتی من نمایش کرد.... ئەو داماوە هیچ گوناهێکی نەبو جگە لەوەی لەمن دەچوو. فرانچی لەهەمان کات کەقسەی لەگەڵ مندا دەکرد ئاگای لەجووڵەکان و کردەوەکانی نیکی و ئەمانۆ بوو هەندێ کات قاقای لێ دەداو بێ ئێرادە پێدەکەنی.....

من لەکارەکانی نیکی و ئەمانۆ خوێنی دڵم دەخوارد. رەنگ بەرەنگ دەبووم و حاڵم پەرێشان ببو بەڵام قسەم نەدەکرد و هیچم نەدەوت چونکە لەوکاتەدا هەرکارێك بۆ ئارام کردنەوەی ئەو دووانە زیاتر دەبووە هۆی رسوایی ئێمە و ئەو درۆیانەی پێشتر وتبومان ئاشکرا دەکرد.

ئێمە وتبومان ئەوان هاوسەرمانن. هاوسەری دوو راوچی ئەمریکایی دەبێت دوو ژنی پەروەردەکراو و شارستانی بن لەکاتێکدا ئەوان وەك وەحشیەکان کە لەقەفەس رایان کردبێت هەڵس و کەوتیان دەکرد. ئەگەر منیش بێگانە بوومایە نەمدەتوانی رێگە لە پێکەنینی خۆم بگرم.

ژواکین درێژەی بەقسەکانی خۆیداو وتی:

ئەوان بەدوای ئێمەوەن. گوومان نەکەن شەڕکردن لەگەڵ ژواکین کارێکی ئاسانە؟ یەکێك لە گەورەترین کێشەکان ئەوەیە کە کەسێك بتوانێت ژواکین دەستگیر بکات.

ژواکین زۆر ئامارژەی پێدەدان. بەڵام نەماندەزانی ئەوان کێن. دواتر دەرکەوت کە دوژمنانی فرانچی ژواکین هەموویان بە (( ئەوان )) ناودەبرێن و ئەو بەتایبەت سەربازان و لێپرسراوانی دەوڵەت بەم ناوە دەبات و هیچ کات ناوی کەسی نەدەهێنایە سەرزمان.

لەم کاتەدا وتی:

ببوورن..... لەبیرم چوو.

بێ ئەوەی قسە بکات بەرەو دەرگای ژوورەکە رۆشت و قیژاندی و وتی:

ئاهای وەرن.

دەنگی پێی دوو کەس بیسترا کە بەراکردن خۆیان گەیاندە ئەوێ. ساتێك دواتر وتی:
خێرا خواردن بێنن. لەو ویسکیەی ئەمڕۆ هێناومانە.... ئامادە بکەن.

دەست بەجێ گەڕایەوە لای ئێمە و داوای لێکردین دانیشین. من و یوری دانیشتین بەڵام نیکی و ئەمانۆ نەیاندەزانی لەسەر کورسی دانیشن. فرانچی پێدەکەنی و نیشانی دەدا هەستی بەراسیتەکان کردوە. ئێمە زیاتر لەهەرشتێك لەوە دەترساین نەکا فرانچی لە رەگەزو رەچەڵەکی ئەوان ئاگادار بێت و دیانی تەماحی تیژ بێت. هەرچەندە هەمیشە تاقمێك ژنی جوانی لەدەوروبەریدا دەبینران.

ئێمە هەر لەسەرەتاوە هەستمان بەم بابەتە کرد بەڵامە بەگشتی پیاوانی هەوەسباز و بەتایبەت کەسێکی وەك فرانچی کە هەموو شتێك تەنانەت یاساو ئەخلاقیشی فڕێداوە بۆ تێرکردنی حەزەکانی خۆی وەحشیانەترین هەڵس و کەوت دەکات. یوری کە بارودۆخی بینی دەستی کرد بەقسەکردن لەگەڵیا و هەوڵیدا سەری قاڵ بکات. من لەم دەرفەتە کە یوری دروستی کردبوو کەڵکم وەرگرت و بەزمانی ئامازۆنی بەنیکیم وت:

مەگەر چیم بەئێوە وت....؟ بیرتە؟ بۆ وادەکەن. هەرچی دەبینن ئارام بن. خێرا وەك من لەسەر کورسیەکە دانیشن. لەگەڵ تۆمە نیکی سەیرکە ئەمانۆ.... چۆن ئێمە دانشتووین ئێوەش دانیشن. هەوڵ بدەن ئارام و خوێنسارد بن خێرا لەسەر کورسیەکان جێگیر بن.

لەم کاتەدا نیکی بوێنەیەك کەلە ژواکین بەدیوارەکەوە هەڵواسرابو، بەسەرسوڕمانەوە سەیری دەکرد. گێژ ببوو کە چۆن روخساری مرۆڤێکیان بەدیوارەوە لکاندوە. دەستی لێدەداو چونکە هچ بەرزو نزمیەکی نەدەبینی زیاتر سەری سوڕما و لەچەپ وراست و سەرو خوار سەری دەسووڕاند و لەوێنەکەی دەڕوانی.

فەرمانەکەی من بۆ دانیشتن لەسەر کورسی ئەوی لەبلاوکراوەکە دوورکردەوە. هەردووك بۆ دانیشتن هاتنە پێش بەڵام نەیاندەوێرا دانیشن و لەترسی ئەوەی بکەون هەنگاوێك دادەنیشتن بەڵام دەگەڕانەوە.

روانینی پڕ رق و تووڕەیی من ئەوانی تۆقاند و سەرئەنجام ئەمانۆ کە عاقڵتر لەنیکی بو لەخۆ بووردوویی زۆر رۆشتە پێش و لەسەر کورسیەکە دانیشت. رەنگی سپی ببو، دەستی بەکورسیەکەوە گرتبوو توند قاچی لەزەوی گیرکردبوو لەهەمان کات بەسەرسوڕمانەوە سەیری ئێمەی دەکرد و لەوەی دەیبینی بەو پەڕی ئاسوودەیی لەسەر کورسیەکە دانیشتووین سەری سوڕمابو.

تا ئێرە بەخێر گوزەرابو من کەنیگەران و ناڕەحەت بووم بەردەوام بەتەکاندانی سەر قسەکانی فرانچی و یوریم پشت راست دەکردەوەو لەژێر چاوەوە سەیری نیکیم دەکرد تا دانیشێت.

ئەگەر نیکیش لەسەر کورسیەکە دادەنیشت ترسیان دەرەویەوەو ئەم تاقیکردنەوە مەترسیدارە کۆتایی دەهات و جارێکیتر دانیشتنی ئەوان بەبێ دەردەسەر ئەنجام دەدرا.

بەڵام نیکی شەیتانم دەناسی ئەو ژنێك نەبو بەبێ گاڵتەو قەشمەری کارێك ئەنجام بدات.

بەچاوە جوانەکانی سەیری دەکردم و بەنیگا دەپاڕایەوە و داوای هاوکاری لێدەکردم. دەتوت نیگای زمانی هەیەو بەمن دەڵێت.

چۆن شتی وادەکرێت کەنیکی لەسەر زەوی دانیشێت؟ بەسەر ئیشارەم لێکرد و تێمگەیاند جگە لەدانیشتن لەسەر کورسی چارەیەکی تری نیە.

لەم کاتەدا نیکی لەپشت کورسی ئەمانۆ وەستابو، سەیرێکی ئەوی کرد. ئەمانۆ تازە ئارام ببوو دەستی لە کورسیەکە جیاکردبوویەوە و رێك دانیشتبوو. نیکی بۆ تاقیکردنەوە و بۆئەوەی تێیبگات دانیشتن لەپشت کورسی هیچ مەترسیەکی نیە، پشتی کورسیەکەی ئەمانۆی گرت و تەکانیدا. ئەم کارە بووە هۆی ترسی ئەمانۆ. قیژاندی.

یوری کەسەرقاڵی قسەکردن بو بەدەنگی قیژەی ئەمانۆ هەستا و وەستا. بارودۆخێکی سەیر بو من زیاتر لەهەرشتێك لە پێکەنینە بەردەوام و قاقا مەستانەکانی فرانچی تووڕە ببوم فرانچی بەرادەی پێویست پێکەنی و دواتر دەسەسڕە حەریریەکی خۆی دەرهێناو روخساری خۆی پاك کردەوە، چاوەکانی کەلە فرمێسکدا تەڕ ببوو وشکی کردەوە وتی:

کۆتایی بەم ناڕەحەتیانە بێنن.... با راستیتان پێ بڵێم.

دواتر ئیشارەی لەمن و یوری کرد کەلای دانیشین.

یوری دانیشت و فرانچی رویکردە من و وتی:

وازیان لێ بێنن چۆنیان پێ خۆشە دانیشن، بۆ ناڕەحەتیان دەکەن.

ئیتر جێگەی قسەکردن نەبو. چەند جار دەمی خۆم کردەوە تاقسەبکەم بەڵام دەنگ لەقوڕگم نەدەهاتەدەر. ئاخر دەمتوانی چی بڵێم.....؟

فرانچی درێژەی دا:

بەڵێ..... ئێوە وتتان کە راوچین و ئەم دووژنە وەحشیە جوانە هاوسەری ئێوەن. زۆر

باشه... منیش رازیم بەڵام زۆر پێشتر لەوەی گوومانی دەکەن زانیم کە ئەم دووانە لە ژنانی ئامازۆنن.

یوری دەیویست قسە بکات بەڵام فرانچی بەئیشارەی دەست بێدەنگی کردو وتی:

بەمن چی کە ئەوان ئامازۆنین یان ئەمریکایی. بۆ دەیشارنەوە؟ ئایا لەوە دەترسن نەکا چاوی تەماحم لەوان هەبێت.....؟ زۆر ساویلکەن یەکەم ئەوەی من لەژن تێرم. جوانترین ژنانی ئەم وڵاتە بەقاچی خۆیان دێنە ئێرەو دەگەڕێنەوە. دووەم ئەوەی ئەگەر رازی دەبووم ئەوان ئەمریکاین رێگردەبو لەوەی گوومانی خراپم بەرانبەریان هەبێت ! خەیاڵتان ئاسوودە بێت و من بەڵێنی شەرەفتان پێ دەدەم لەگەڵ ئەم دوو ژنە وەك دوو خوشکی خۆم هەڵس و کەوت بکەم. من و یوری کەلەتاو ناڕەحەتی و نیگەرانی لەئارەقدا خوسابووین، هەناسەیەکمان بەئاسوودەیی هەڵکێشا. بەڕاستی دەتوت بارێکی قورسیان لەسەر شانمان هەڵگرتبێت.

ئەو گێلاسەکەی خۆی لە لێو نزیك کردەوە وتی:

بەڵێ.... دەبێت دان بەوەدابنێم پێش بینینی ئێوە گوومانم دەکرد دوو پۆلیس خۆیان بەشێوەی راوچی دەرهێناوەو دەیانەوێت بمکوژن. لەسەر ئەم گوومانە دەوری ئێوەمان گەمارۆدا و دەستوورم دا لەهەموو شوێنێك ئاگایان لە جووڵەو کردەوەکانی ئێوە بێت.

یوری بەسەرسوڕمانەوە پرسی:

کەواتە ئێوە پێشتر لەبوونی ئێمە ئاگادار بوون... فرانچی وەڵامی دایەوە:

نە زۆریش. تەنیا لە دوو شەو پێش بەمنیان راگەیاند کە دوو راوچی چەکدار بەرەو ئێرە دێن. رێگەم بدەن راستیەکتان بۆ بدرکێنم.

من ویوری سەرسوڕماو سەیری یەکمان دەکرد. قسەکانی ئەو ئێمەی گێژکردبو بەڕاستی لەوەی لەچنگاڵی مردن رزگارما ببو، شادمان بووین.

فرانچی وتی:

ئەو راستیە ئەویە ئەگەر ئەم دووژنە ئەمریکایی و بەتایبەت بەرازیلی بوونایە بەهیچ جۆرێك نەتاندەتوانی رازیم بکەن کە پۆلیس نین و .... و...... و........ و ئاشکرایە کەدەست بەجێ دەکوژران. ئێستا لەم دوو ژنە سوپاسگوزارین کە بوونە هۆی رزگار بوونی ئێوە. پێکەنینی من لەبەرئەوەبو کە دەمبینی لەشاردنەوەی رەچەڵەکی ئەوان پێدادەگرن. بەهەرحاڵ ئەگەر پۆلیس بوونایە هەوڵتان دەدا من گومڕا بکەن.

بەنیگایەکی لێوانلێو لەسوپاس و پێزانین سەیری ئەمانۆ و نیکیم کرد. ئێستا بەپێچەوانەوە هەوڵم دەدا کە فرانچی ئەوان بەئامازۆنی بزانێت. سەیرە ژیان چەندە پر روداوو پر ئەزموونە. لەسەر ئەمە، ڕێگەم دا هەرجۆرێك دەیانەوێت هەڵس و کەوت بکەن.

نیکی بەبیستنی قسەکانی من هەڵبەزو دابەزی کرد وەك ئاسکێك کە لەتەڵە رزگاری بوبێت شادمان بەم لاولادا دەڕۆشت. ئێستا لەبینینی قاپی چینی و کاردو چەقۆو چەتاڵ سەریان سوڕدەما و کاتێك کەوچکم بۆ دەمم دەبرد سەیریان دەکردم و دەیانویست تێبگەن کەوچکی کانزایی چۆن دەڕواتە دەمم و دێتە دەر.

فرانچی لەپێکەنیندا پچڕابو پرسی:

دەنگ و باسی ئامازۆن.... بۆم باس بکەن.... بیستنی گەشتی ئێوە سەرنج راکێشە چونکە ئەگەر هەڵەم نەکردبێت یەکەم کەسانێکن بەزیندوویی لەوێ دەگەڕێنەوە.

یوری وتی:

بەڵێ ئێمە شەش ساڵ لەئامازۆندا بووین. هاوڕێکەم هاوسەری سەرۆك هۆز بوو لەو بویە خاوەنی کچێك بەڵام بەداخەوە هاوسەرو کچەکەی لەروداوێکی خوێناویدا کوژران.

فرانچی وەك منداڵێك کەلە بیستنی چیرۆکی دایەگەورەی چێژ دەبات چاوی لەدەمی یوری هەڵنەدەگرت و هەموو گیانی ببوە گوێچکە.

نیکی و ئەمانۆ هەرکام کەمێك خواردنیان هەڵگرت و لەسووچێکی ژوورەکەدا دانیشتن و سەرقاڵی خواردن بوون. هێشتا لەکورسی دەترسان.

دوای خواردن فرانچی هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی:

بەڵێ.... بەڕاستی سەفەرەکی ئێوە شیرینە. منیش برازایەکم بو کە بە مارچلۆ ناویان دەبرد.

ئەو باشترین هاوڕێ و پارێزەری گیانی من بو.

مارچلۆ ئارەزوی بو گەشتێك بۆ ئامازۆن بکات و چونکە ئێمە لەگەڵ جەنگەڵی باران دراوسێین چەند جارێك تا دەوروبەری جەنگەڵ ڕۆشت بەڵام ئەم جارە نەگەڕایەوە و تەنیا دوو سێ رۆژ پێش ئەسپە بێ خاوەنەکەی گەڕایەوە و زانیم کە کوشتویانە. خوا شایەتە ئەگەر بکوژەکەی بدۆزمەوە بەچنگ و دیانی خۆم جەستەکەی تیکە تیکە دەکەم و سکی بەخەنجەر هەڵدەدڕم و گەچی تێدەکەم.

روخساری فرانچی لەتووڕەیدا سووربوویەوە و لەچاوەکانی بلێسەی رق وتووڕەیی دەباری. من ویوری لە رووداوی کوشتنەکەی ئاگادار بووین سەیری یەکمان کرد بەڵام

یوری ئیشارەی کرد کە نابێت ئەم نهێنیە ئاشکرا بکەین.

دوای خواردن فرانچی خۆی ئێمەی بۆ یەکێک لە ژوورەکانی ئەو بینایە رێنوێنی کردو شەو باشی لێکردین و رۆشت.

کاتی شەو یوری وتی:

سوپاس بۆ خوا ئەم بابەتە بەخۆشی تەواو بو. تێگەشتم کە فرانچی بەرانبەر بەئێمە و نیکی و ئەمانۆ گوومانی خراپی نیە بەڵام نابێت لەجەواهیرو خۆڵی زێر ئاگادار بێتەوە.... هەرچی بێت ئەو دزە، دزێکیش زیاتر لەهەرشتێک ئارەزوومەندی زێرو جەواهیرە.

بەڵێنم دا ئەم نهێنیە نەدرکێنم.

بۆ دوایین جار بارەکانمان پشکنی و دڵنیابووم کە هەموو شتێک لەشوێنی خۆیەتی. کیسەیەک کە خۆڵی زێرمان تێکردبو نزیک بو کون بێت بەڵام یوری بەپەت بەستیەوە.

جەواهیرەکانیش لەشوێنی خۆیدابو. سیلاحەکانمان لەناو جلەکۆنەکانی نیکی و ئەمانۆ داشاردبو دوای ئەم کارانە خۆمان بۆ خەوتن ئامادەکرد.

من بەهۆی بەبیرو خەیاڵ لەگەڵ ئەو هەموو هیلاکی و ناڕەحەتیەی هەمبو، نەمتوانی بخەوم. هەرسات بیرێکی تازە بەمێشکمدا دەهات. بیرم لەداهاتوو دەکردەوە. گوومانم دەکرد دوای شەش ساڵ ئێستا کە دەمانەوێت بگەڕێینەوە بۆ دنیای پێشکەوتو چیمان هەیە. ئایا ئەم جەواهیرو زێرەی پێمانە بەختەوەری و ژیانی داهاتووی ئێمە دابین دەکات....

گرنگتر لەوانەش نەمدەتوانی لەگەڵ نیکی و ئەمانۆدا بژیم. لەئەنجامدا یەکێکیان بەرەسمی دەبێتە هی من و هاوسەری من. لەم شێوەشدا ئەی ئەویتریان. ئەگەر یاسا بزانێت من دوو ژنم هەیە سزا دەدرێم.

جارێکیتر خەیاڵ منی بۆ ئەویێ و بۆلای فرانچی ژواکین بردو بەخۆمم وت:

سەیرە ! ئەم پیاوە لەگەڵ ئەوەی دزە چەند روکەش و زمان شیرینە؟ سینگوالا دەزگیرانی فرانچیە و کالوویش لەزینداندایە.

لەم کاتەدا بو پێڵوەکانی چاوم قورس بو ئیتر نەمزانی چی بو چی رویدا. خەوێکی خۆش منی بردەوە کاتێک چاوم کردەوە هەوا رووناک و هەتاو هەڵاتبو.

لەشوێنەکەمدا هەستام. کەس لەژوورەکەدا نەدەبینرا.

نیکی و ئەمانۆ لەژوورەکەدا نەبوون و یوریش کەبەیانیان زو لەخەوهەلەستا،

بەدڵنیاییەوە زۆر خێراتر لەمن هەستابو.

لەژوورەکەی تەنیشت دەنگی پێکەنین دەبیسترا. دەتوت چەند ژنێك پێکەوە کۆبوونەتەوە قسە دەکەن. پەنجەرەکەم کردەوە و بەرەو دەرگای ژوورەکە رۆشتم بەلآم پێش ئەوەی دەستگیرەی دەرگاکە بسوڕێنم دەرگاکە کرایەوەو نیکی بەقیافەیەکی تازە لەکاتێکدا پێدەکەنی، هاتە ژوور.

ئەو جل و بەرگی ژنانی بەرازیلی لەبەرکردبوو بەشێوەی ئەوان قژە جوانەکانی رازاندبوویەوەو گوڵێکی سپی لەلای چەپی قژی دابو کەسەد بەرانبەر جوانیەکەی زیادی دەکرد.

من لەبینینی ئەو سەرەتا سەرم سوڕما بەلآم دەرفەتی پێنەدام وخۆی خستە نا باوەشم و وتی:

جوان بووم....؟ جوان سەیرکە وەك کچەکانی هۆزی ئێوەم یان نە......؟

هێشتا وەلآمم نەدابوویەوە کە سەروکەلەی ئەمانۆش دەرکەوت و دەزگیرانەکانی فرانچیش بەدوایانا هاتن و دیاربو کە لەکارەکانی ئەوان و حەزیان بەرانبەر بەمن سەریان سوڕماوە.

ئەو رۆژە نیکی و ئەمانۆ پۆشتەو پەرداخی دەستی ئەوان بوون. هەرکام لەوان باشترین جلەکانی خۆیان دەرهێنابو و سەرقاڵی رازاندنەوەی ئەوان بوون و بۆ ئەو کاتژمێرەی من لەخەو هەلەستام ئامادەیان کردبوون تا بەو شێوەیە پێشوازیم لێ بکەن.

لەم کاتەشدا یوری هات و کەمنی لەو حاڵەدا بینی پێکەنی و وتی:

خۆت ئامادە بکە ئەمڕۆ لەگەڵ فرانچی دەڕۆینە راو. ئەو ئێمەی بۆ راوەی کەرگەدەن میوان کردوە.

پرسیم:

مەگەر بڕیارە لێرە بمێنینەوە....؟

وتی:

نا..... بۆ هەمیشە لێرە نامێنینەوە بەلآم فرانچی بۆیەك هەفتە ئێمەی میوان کردوە و باش نیە میوانیەکی قبووڵ نەکەین.

لە یوریم پرسی:

فرانچی لەکوێیە؟

وتی:

دوێ شەو دوای خەوتنی ئێمە سواربووە و هاوڕێ لەگەڵ تاقمێك لەهاوڕێکانی بۆ لێدانی بڕۆمبیلێك هەڵگری پارەی بانق رۆشتووە.

بەسەرسوڕمانەوە وتم:

سەیرە..... ئەو دوێ شەو نەخەوتووە. ئەمڕۆش دەیەوێت بێتە سەحرا. ئەمە چۆن مرۆڤێکە ئەوەندە لەبەرانبە بێ خەویدا خۆڕاگرە.

یوری وتی:

بەڵێ. بەو جۆرە کەم بیستوومە ئەو هەرچەند رۆژ جارێك دەخەوێت و بۆ خەویش لێرە دوور دەکەوێتەوە و دەڕواتە شوێنێك کە کەس نازانێت کوێیە؟

لەیوریم پرسی:

تەنیا ئەم سیانە دەڕۆینە راو؟

وتی:

بەدڵنیاییەوە نا. راوی کەرگەدەن کارێکی مەترسیدارە و بەکۆمەڵ ئەنجام دەدرێت بەڵام من هێشتا نازانم کێن کە لەگەڵمانا دێن.

ناشتاییمان خواردو من ویوری لەبیناکە رۆشتینە دەر. کاتی رۆژ دارەکانی دەوروبەری ماڵەکە زۆر دڵگیربو. کوێستانی سەر بەئاسمان کێشراو درێژەی بو و دارە سەر سەوزەکان لەداوێنی دۆڵەکەدا رووابوون و لەخوارەوە وا دەهاتە بەرچاو کە قەدی دارێك لەسەر لقەکانی تر جێگیرە لەسەر یەك دیمەنێکی جوان و دڵگیربو و فرانچی لەهەڵبژاردنی شوێنی ژیانی خۆی حەزو زەوقێکی تایبەتی بەکار بردبو.

تاقمێك لەبەردەم ئێمەدا هاتوچۆیان دەکردو سەرقاڵی کاری خۆیان بوون. لەناکاو یوری بەئەنیشك لە کەلەکەمی کوتاو وتی:

بڕوانە.... سەیری ئەو دووانە بکە.

بەرەو لایەك کە یوری بەسووچی چاو ئاماژەی پێدەدا، ئاوڕم دایەوەو دوان لەدزە چەکدارەکانم بینی کەبەدەم قسەکردنەوە دەڕۆشتن.

یوری وتی:

ئەم دووانە دەناسیت...؟ ئەمانە ئەو دووانەن کە مارچلو برازاکەی فرانچیان کوشتووە، تەنیا من و تۆ لەم نهێنیە ئاگادارین بەڵام....

بەڵام..... بەڵام چی؟ قسەکەت بکە.

یوری وتی:

ئەم بابەتە بەو سادەییەی من و تۆ بیری لێ دەکەینەوە نیە. مارچلۆ کەسێك نەبو بێ هۆ بکوژرێت ئەویان بە ئامادەکاری پێشتر و بەپلانەوە کوشتووە و مەرگی ئەو دەسپێکی رووداوی ترە و رەنگە ژواکین لێی بێ ئاگابێت، کێ دەزانێت رەنگە بزانێت و بەرووی خۆیدا نەهێنێت بەهەرحاڵ دواتر هەموو شتێك دەردەکەوێت.

زۆر باشە ئەگەر ئەم شتە روون ببێتەوە من هەموو دیپلۆمەکانی خۆم بەتۆ دەدەم و تەنانەت سەرم لەگەڵ تۆدا دەگۆڕمەوە.

بەدوای ئەم قسە هەردوکمان پێکەنین و بەڕێکەوتین. هێشتا چەند هەنگاو نەڕۆشتبووین کەدەنگی ژنێك لەپشت سەرمانەوە بیسترا و ئێمەی لەشوێنی خۆماندا وشك کرد. چونکە ئەو هەردوکمانی بەناو بانگ کرد.

بەسەرسوڕمانی زیاد لەرادە ئاوڕمان دایەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوی سەیری دواوەم کرد خاوەنی دەنگەکەم ناسیەوە کە ژنێکی زۆر جوان و بەژن و باڵا رێك بو.

سینگوالا..... سینگوالا.

بەڵێ ژنێکی جوان کە بەنازو عیشوە بەدوامانا دەهات و بزەیەکی شیرینی لەسەر لێو بو، سینگوالا دەزگیرانەکەی کالوویی و فرانچی بو. پێش ئەوەی سینگوالا بەئێمە بگات و دەنگمان ببیستێت یوری بە هێواشی وتی:

ئەم ژنە زۆر مەترسیدارە، دەبێت لێی بترسین. پەیوەندی لەگەڵ ئێمەدا باش نیە. رووی خۆشی پشان مەدەو پەیوەندی لەگەڵدا دروست مەکە.

سینگوالا نزیك بوویەوەو بەگەرمی دەستی من و یوری گوشی و وتی:

ئێوەن. زۆر لەبینینتان شادمانم.

دواتر پێکەنینێکی مەستانەو پرعیشوەی کردو وتی:

ئەو ژنانەی لەئامازۆنەوە هێناوتانە، بینیم. جوانن بەڵام ژیان لەگەڵ ئەم جۆرە کچانەدا وەك ئەوەیە کە مرۆڤ مارێکی سەرما بردو لەناو کراسەکەیدا بگرێت. هەرئەوەندەی مار گەرم ببێتەوە تەکان دەخوات مرۆڤ دەگەزێت.

ئەمانەش کاتێك چۆنیەتی ژیان لەناو خەڵکی شارستانیەتدا فێربوون چاو و گوێیان دەکرێتەوە و هەڵەچن و ئەوکاتەیە کە ئێوە بەجێدەهێڵن و دەڕۆن.

سینگوالا ژنێکی فێڵبازبو و لەسەر حساب قسەی دەکرد. دەیویست دڵی من لەنیکی و ئەمانۆ سارد بکاتەوە و دووبارە سەرنجم راکێشێت بەڵام ئەم جارە لەگەڵ جاری پێشوودا جیاواز بو.

شەش ساڵ پێش کە ئەوم بینی، دڵێکی چۆڵ لەخۆشەویستیم هەبو و لەبەئەمە خێرا عاشقی بووم بەڵام ئەم جارەیان نیکی و ئەمانۆ هەرکام بەشێك لەدڵ و رۆحی منیان داگیرکردبو و شوێنێك نەبو کەسینگوالا بتوانێت بەنازو عیشوەکانی خۆی داگیری بکات. لەبەرئەمە کاتێك خوێنساردی و بێدەنگی ئێمەی بینی بەتوورەیی وتی:

خواحافیز... لەشکارەکە یەك دەبینینەوە.

من و یوری بێ ئیرادە پێکەنیین. ئەو کەکلاّو جلی پیاوانەی لەبەردابو، بێ درەنگ رێگەی خۆی گرت و رۆشت.

زۆری نەخایاند فرانچی هات و کەل و پەل ئامادەبو. من و یوری دوو سەر ئەسپی باشمان هەڵبژارد سوار بووین. فرانچی زۆر گەرم و گور هەڵس و کەوتی لەگەڵدا دەکردین بەڵام سینگوالاتووڕە و ناڕەحەت بو. تاقمێکی دە کەس لەدزەکان هاوڕێمان بوون کە لەناویاندا دوو بکوژەکەی مارچلو دەبینرا.

یوری لەسەرەتاوە وتی:

دەبێت زۆر ئاگامان لەخۆمان بێت چونکە سینگوالا بەئاسانی وازمان لێ ناهێنێت. من دەبێت چاوو گوێی فرانچی بکەمەوە بەڵام بۆ ئەم کارە دەبێت چاوەڕوانی دەرفەتێکی گوونجاو بین.

دواتر کەمێك بێدەنگ بو و دووبارە وتی:

تەنیا کارێك کە تۆ دەتوانیت بیکەیت ئەوەیە لەگەڵ سینگوالا قسەنەکەیت و پەیوەندی لەگەڵدا نەبەستی و جۆرێك هەڵس و کەوت بکەیت گوومانی فرانچی نەبزوێنی. جارێکیتر دەیڵێمەوە ڕووداوەکان نزیکن. لەم ناوچە بەم زووانە خوێن دەڕژێت و تاقمێکی زۆر دەکوژرێن کەواتە چوار کەس ئاسایشمان نیە. ئاگاداری هەڵس و کەوتی خۆت بە کە ڕووداوەکان زووتر لەکاتی خۆی ڕوونەدەن.

من نەمدەویست ونەمدەتوانی بەقسەکانی یوری رازی بم. رابردو بۆ من وانەیەکی باش بو. ئێوەش دەتوانن بیری بێننەوە هەرکاتێك من گوێم لەقسەکانی یوری نەدەگرت ڕوبەڕوی زەرەرو زیان و مەترسی گیان دەبوومەوە.

ئەم جارەش یوری هەمان یوری هەمیشە بو، لەگەڵ مندا هاوڕێ بو و بەرژەوەندی منی لەبەرچاو گرتبو بەڵام سروشتی سەرسەختی من رێگای نەدەدا بە قسەکانی رازی بم وهەرچەندە بەنزیکی و دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ سینگوالا ئارەزوومەند نەبووم بەڵام لەوێوە کەنەمدەویست قسەکانی یوریم قبووڵ کردبێت دەمویست لەگەڵ سینگوالا

ئەوەندە هەوەسباز و مەترسیدارە کەببوە دوژمنمان، پەیوەندی دروست بکەم. ئەسپەکان بەخێرایی دەڕۆشتنە پێش و هەرکاتێك ئەسپەکەم دوا دەکەوت هەستم دەکرد یوری بە ئەنقەست جڵەوەی هەوسارەکەی خۆی دەگرێت و تا ئەو شوێنەی دەکرێت لەخێرایی ئەسپەکە کەم دەکاتەوە.

ئەم کارەی یوری زۆر سەیر نەبو چونکە یوری عادەتی بو پارێزەری گیانی من بێت و دەبوا لەپشت سەری منەوە بڕوات تا باشتر بمپارێزێت. لەسەر ئەم حساب گوێم پێ نەدا بەڵام چەند خولەك دواتر کە زیاتر وردبوومەوە تێگەشتم نەتەنیا ئاگای لەگیانی من نیە بەڵکو هەر نامبینێت و سەرنجم پێ نادات لەهەمان کاتەوە هەستەکانم بەئاگا هاتنەوەو بەوشیاری سەیری دەورو بەرم کرد.

یوری چاودێری دزەکانی دەکرد و بەوردیەکی زیاد لەرادە یەك یەکی ئەوکەسانەی بەدوا فرانچی دا ئەسپیان غاردەدا، سەیری دەکردن و جووڵەو کارەکانیانی خستبووە ژێر چاودێریەوە.

یوری لەئاستی خۆیدا پشکنەرێکی بەتوانا دەژمێردرا. هەستی بەهێزو زیرەکی و وشیاری زیاد لەرادە تایبەتی بو. بە روانینێك کەسەکانی دەناسی و کەچاوی دەبریە چاوی کەسێك نهێنیەکانی دڵی دەخوێندەوە و بەراشکاوی راستیەکانی بەمن دەوت.

ئەو ئەم جارەش لەگەڵ مندا قسەی کردو ئەوەی دەیزانی پێی وتم بەڵام من نەمدەویست قبوڵی بکەم تا ئەوەی وشیار بوومەوە دەستم بەلێکۆڵینەوە کرد.

فرانچی لەپێش هەمووانەوە ئەسپی غار دەداو وەك منالێك کە بووکەڵەیەکی جوان هەستەکانی پێ لەدەست دابێت جگە لەراوی کەرگەدەن بیری لەهیچ شتێکی تر نەدەکردەوە.

فرانچی ئەسپی لە گەردەنەیەکەوە تێپەڕاند و بەرەو دۆڵێك سەرو خوار بوویەوە.

ئەم دوایین بەشی کوێستان بوو چارەکە کاتژمێرێك دواتر لەولای دۆڵەکە دەرچووین و گەشتینە دەشتێك کە کەرگەدەنی مەترسیداری بو.

ئێمەش بەدوای ئەو بەهەمان خێرایی دەڕۆشتین.

لەدەرفەتێکی گونجاو خۆم بەیوری گەیاندو وتم:

یوری..... دەڵێی بارودۆخ نائاساییە و ئەو کەسانەی لەگەڵمانن خۆیان بۆ کارێکی تر جگە لەراوکردن ئامادەکردوە.

یوری بزەیەکی گرت و وتی:

چۆن هەستت پێکرد....

وتم:

سینگوالا بەهێواشی شتێکی بەگوێی یەکێك لەبکوژەکانی مارچلۆدا وت و ئەو دەسەسڕی سپی خۆی دەرهێناو ملی بەست.

پێم وایە دەسەسڕی سپی نیشانەیەکە کە خۆیان ماناکە دەزانن...

یوری هیچی نەوت و دەستی بەکۆکە کردن کرد.

چونکە لەم کاتەدا کە دەیویست وەڵامی من بداتەوە یەکێك لەسوارەکان لەخێرایی ئەسپەکەی کەم کردەوەو ئێمەی پێ گەشتین.

بەم شێوەیە گفتوگۆی ئێمە پچڕا تائەوەی دووبارە لەنێوان من و یوری و ئەوانیتر کەلە پێش و دوواوە بون دووری دروست بو. یوری سەیرێکی پێش و پشتەوەی خۆی کردو بەهێواشی وتی:

ئاگادار بە لەگەڵ ئەوەی دەسەسڕەکە لەملی خۆی بکاتەوە تەقەکردن لەفرانچی دەست پێدەکات من کە لەترسا ڕەنگ و ڕوی خۆم دۆڕاندبو وتم:

گوومان ناکەم ئەمانە دوژمنی فرانچی بن....

یوری وتی:

ئەگەر هەموویان دوژمنی نەبن ژمارەی هاوڕێکانی زۆر کەمەو ڕەنگە لەیەك دوو کەس زیاتر تێنەپەڕێت من و تۆش دەبێت ببینە دەستەی فرانچی چونکە ئەگەر سینگوالا و کالوویی کە ئێستا لە زینداندایە سەرکەون کارمان تەواو دەکەن و بەزیندوویی لەئاگردا دەمانسووتێنن، لەلایەکیتر....

قسەکانی یوری بەهۆی ڕۆشتنی ئەسپەکان و کەم و زۆری دوری ئێمە و ئەوانیتر دەپچڕا و لێرەدا کە جادەی کوێستانی باریك دەبوویەوە و ئەسپەکانمان بەدوای یەکدا ڕیز بوون، ئیتر نەمانتوانی قسە بکەین بیرو ئەندێشەی سەیرو نامۆ هێرشیان کرد بۆسەر مێشکم. بیرو خەیاڵ نەیاندەهێشت ئاسوودە بم و پێش هەرشتێك نیگەرانی نیکی و ئەمانۆ بووم. بەخۆمم وت:

ئەگەر شەڕ دەست پێ بکات ئەوانەی لەئوردوەکە ماونەتەوە نیکی و ئەمانۆ دەستگیر دەکەن و وەك بارمتە لای خۆیان ڕایدەگرن. ئەوکاتە چی بکەین....؟ دەتوانین چی بکەین.....؟ چ بارودۆخێکی ناسازگار هاتۆتە پێش......؟ خۆزگە ڕێگا بەهەڵە دەڕۆشتین و ڕوبەڕوی ئەم شێتانە نەدەبووینەوە ژیان لەگەڵ مرۆڤخۆرەکانی جەنگەڵ باشترە لە

روبەڕوبوونەوەی ئەم دزانە. راستی نیکی و ئەمانۆی ئازیزی من چی دەکەن... سەیرە....

نوقمی ئەم گوومانانە بووم کە بێ ئاگا چاوم کەوتە سەر تاشەبەردێکی سەرکێو و سێبەری پیاوێکم لەسەر بەردەکە بەچاوی خۆم بینی.

ئەوەی دەمبینی سێبەری مرۆڤێك بو کەتفەنگی لەسەر شان بو. بەهەڵەدا نەچووم. دووبارە وردبوومەوە و سەرئەنجام تێگەشتم کە ژمارەیەك لە نەیارانی فرانچی لەپشت بەردو تاشە بەردەکانەوە خۆیان داشاردوە. و چاوەڕێی دەرکردنی هێرشن. بەبینینی ئەم دیمەنە ترس و لەرز سەد بەرابەر بوو بە تەواوی دەستم لەگیان شۆرد.

بەڵام یوری پیاوێك نەبو بەئاسانی تەسلیمی روداوەکان بێت. ئەو بەهەمان رادە کەمن ترسابووم ورەی بەرزبببوویەوە و بۆ رێگرتن لەمەترسی پلانێکی بەرفراوانی دارشتبو. من نەتەنیا ئاگام لەپلانەکەی نەبو بەڵکو نەمدەزانی بەهیوای چیەو بیر لەچی دەکاتەوە.

خاڵێکی تریش ئاشکرابو ئەویش ئەوەبو کەتەنیا لەوپیاوە کە دەسەسرەکەی لەملدا بو فەرمان دەبەن و چاوەڕێی فەرمانی ئەون.

یوری ئەم نهێنی یەی بۆ من ئاشکراکرد لەکاتێکدا من سەرنجم لای ئەم بابەتە سادەو ساکارە نەبو. چەند خولەك دواتر گەشتینە دوایین رێگای کوێستان. فرانچی لەناو دوو لەهاوڕێ وەفادارەکانی خۆی دەڕۆشت کە لەناکاو دەنگی گولە بەرزبوویەوە و یەکێك لەسوارەکان لەسەر ئەسپ کەوت.

کەس چاوەڕوانی ئەم رووداوە نەبو....

هەموو جڵەوی ئەسپەکانیان کێشاو ترساو وەستان. کەسێك لەسەر ئەسپ کەوت ئەوپیاوەبو کەدەیویست بەکردنەوەی دەسە سرەکەی فەرمانی هێرش دەربکات.

گوولە لەدواوە مێشکی کوون کردبو لەناوچاویەوە دەرچوبوو.... بەڵام کەس نەیدەزانی بکوژەکە کێیە....؟ هەموان ترساو سەیری یەکیان دەکرد. فرانچی کە بەگوومانی خۆی یەکێك لەهاوڕێ وەفادارەکانی لەدەست داوە، قیژاندی و وتی:

کام سەگی گلاو (( ویانیکی )) کوشت؟

هەموان بێدەنگ بوون و سەیری یەکیان دەکرد. فرانچی دڵنیابو بکوژەکە هەکەڕسێك بێت خۆی ناناسێنێت و دەبێت بەبۆنی لولەی تفەنگەکەی بکوژەکە بدۆزێتەوە. لەسەر ئەم بڕیارە دووبارە قیژادنی و وتی:

من بکوژ....

بەڵام فرانچی قسەکەی خۆی تەواو نەکرد چونکە لەم کاتەدا دەنگێک بیسترا کەوتی:

فرانچی من ئەوم کوشت..... پەلە مەکە. مەقیژێنە. خۆم دانی پیا دەنێم و دەبێت سوپاسگوزارم بیت.

فرانچی دەبێت بکوژی ویانکی لێرەدا بکوژێت.

لەئارەقدا خوسابووم چونکە کەسێك خۆی بە بکوژی ویانکی ناساند هاوڕێ وەفادارەکەی من یوری بو.

ئەی هاوار.... یوری ئەوی کوشت....

چ کارێکی مەترسیدارە.....! چ کارێکی نەزانانە ! یوری پیاوێکی وشیاربو و هیچ کات هەڵەی نەدەکرد. چۆن بو ئەم جارە بەهەڵەدا رۆشت و بەپێچەوانەی عەقڵ و دوور ئەندێشی بەم کارە هەستا. بەم پرسیارە تەنیا یوری دەیتوانی وەڵام بداتەوە.

سینگوالا بەئیشارەی دەست هەمووانی دژی یوری هانداو خۆشی وتی:

ئەو مافی کوشتنی یەکێك لە هاوڕێکانی ئێمەی نەبو.

وادیارە ئەو دەیویست فرانچی بکوژێت و تیرەکەی بەهەڵەدا رۆشتووە، ویانکی داماو بۆتە قوربانی سەرۆکەکەی. ئەم قسانە بەس بو کەفرانچی بۆ کوشتنی یوری ناچار بکات و بەڵام شتێك کەسەیر بو ئەوەبو فرانچی بەپێچەوانەی گوومان، روخسارێکی ئارام و نیگایەکی لێوان لێو لە رەزامەندی بوو ئەم چەند جارەش بەدەسکرد قیژاندی وبەرواڵەت خۆی بەتووڕەو نارەحەت نیشان دەدا.

رەنگە ئەم نهێنیە کەس نەیدەتوانی هەستی پێبکات من هەستم پێکرد و بەرێکەوتیش فرانچی هەستی پێکرد کە حاڵم گۆڕاوە. کتوپڕ نارەحەتی رۆحم لەناوچوو و ترس و لەرزێك کەهەموو گیانمی داگرتبوو نەماو خۆی بەدڵەراوکێیەکی راستەقینەدا کەزادە چاوەڕوانی بو.

یوری بەو پەڕی خوێنساردی وتی:

من لەدەنگە دەنگی ئێو ناترسم. بێ هۆش مەقیژێنن و تۆ فرانچی گوێ بگرە.... ئەمانەی کە دەیانبینی دوژمنانی تۆن و ئەمڕۆ دەیانویست بەپیلانێك تۆ بکوژن. ویانکی ئەم دەسەسرەی وەك نیشانە لەگەردنی خۆی بەست....

سینگوالا دەستی بەرزکردەوە وتی:

بێدەنگ بە تاوانباری ئەحمەق....

چۆن تۆ لەرێگاوە گەشتوویت بوویتە هاوڕێی فرانچی، بەڵام ئەمانە کە چەندین ساڵە

هاوڕێی ئەون بوون بەدوژمن. بێدەنگ بە بەدبەختی چارە ڕەش. یوری پێکەنی و وتی:

ئەم ویانیکیە بەڕاستی هاوڕێی فرانچی بو و ئەوی لەقوولایی دڵەوە خۆش دەویست بۆیە مارچلۆی برازای کوشت.

لێرەدا بو کەچاوەکانی فرانچی درەوشایەوە، هێواش لەئەسپەکە دابەزی و لەکاتێکدا بەرەو یوری دەڕۆشت وتی:

ئایا بەڵگەت هەیە.....

یوری بەخوێنساردی وتی:

چۆن مرۆڤێکی عاقڵ بێ بەڵگە قسە دەکات؟ فەرموون..... ئەمە جزدانەکەی مارچلۆ و ئەمەش نامەیەکە کە ویانکی بۆی نوسیوە و بەنهێنی بانگی کردۆتە قەراغ جەنگەڵ تا چاوی بەسینگوالا بکەوێت بەڵێ سینگوالا و ویانکی و کەسێکیتر کە لەناو ئێوەدایە پیلانیان داناو مارچلۆیان کوشت. تا بەئاسوودەیی فرانچی بکوژن.

یوری ئەمەی وت و جزدان و نامەکەی بۆ فرانچی هاویشت.

فرانچی جزدانەکەی لەهەوا داگرت و سەیرێکی نامەکەی کردو بەیەك نیگا هەستی بەهەموو شتێك کرد. چونکە خەت و واژۆکەی جوان دەناسیەوە.

سینگوالا وتی:

ئەگەر ویانکی ئەوی کوشتووە، جزدانەکە لای تۆ چی دەکات. کەواتە ئاشکرایە کەخۆت بکوژی مارچلۆیت یوری هێشتا قسەی دەکرد کەدەنگی گولە بیسترا و یوری بەخێرایییەکی نەشیاو بۆ گوومان لەسەر زینی ئەسپەکە چەمایەوە.

قەرەباڵغی دروست بو و ئەسپەکان کە بەدەنگی گوولە رەمیان کردبو لەسەر دەست بەرزبوونەوەو حیلاندیان.

ئەگەر بەڕێکەوت ئەسپەکان رەمیان نەکردایە من و یوری و فرانچی و سێ هاوڕێکەی دەکوژراین ریز بەستن دەستی پێکرد و من بەخێرایی خۆم گەیاندە لای فرانچی کەوەستابو. یوری گولەی بەرکەوتبو قۆڵی چەپی کاری نەدەکرد. بەڵام بەدەستێك جڵەوی ئەسپەکەی گرتبوو بەهەمان دەست تەقەشی دەکرد.

فرانچی کەپیادەبو خۆی خستە پشت تاشەبەردێك و ئێمەش دابەزین و لەداوێنی چەپی دۆڵەکەدا خۆمان داشارد.

ئێمە پێنج کەس بووین بەڵام ژمارەی ئەوان زیاتر بو.

سێ چوار کەس کە لەناو کێوەکە خۆیان داشاردبو لەوێوە یوریان بریندارکرد

پەیوەستی یاخی بوەکان بوون و هێزێکی شیاوی سەرنجیان دروست کرد.

سینگوالاش وەك پیاوێکی شەڕکەر تفەنگی بەدەست گرتبو تەقەی دەکرد وەك مەلێك لەپشت ئەم بەردەوە دەڕۆشتە پشت بەردێکی ترو سەنگەرەکەی دەگۆڕی.

یوری لەدەرفەتێکی کورتدا بەمنی وت:

وەرە قۆڵم ببەستە تا خوێن بەربوونی وشك بێت.

بەخێرایی بەتەنافی زینی ئەسپەکە قۆڵیم بەست. کاتێك خەیاڵی لەخوێن بەربوونی بەردەوام ئاسوودە بو وتی:

لەخورجینی پشت ئەسپەکەی من دوو ڕەشاشەکەم پێیە.... من دەمزانی چی دەبێت بۆیە ڕەشاشەکانم هێنا. خێراکە لەوانەیە ئەسپەکان ڕەم بکەن و ڕەشاشەکان بەرنە لای ئەوان.

فرانچی هەنگاوێك پێشتر لەئێمە لەسەر زەوی کەوتبوو تەقەی دەکرد و بەشادمانی گەڕایەوە وتی:

ڕەشاشتان پێیە...... دەستخۆش..... دەستخۆش.

ئەو دەرفەتی پێنەدام ئەسپەکە بگرم و خۆی بەپەلە ڕۆشت و هەردوو ڕەشاشەکەی لەپشت ئەسپەکە هێنا.

تائێرە سەرکەوتن بەوان بو هەرسات کە تێدەپەڕی مەترسی گەمارۆ زیاتر دەبو. سینگوالا خۆی فەرمانی دەدا و تاقمێکی لەدەوروبەرماندا بلاّم کردبوویەوە تاگەمارۆمان بدەن و بمانکوژن.

ئەوان لەسەر کەوتنی خۆیان دڵنیابوون چونکە یەکێك لەئێمە بریندار ببو توانای شەڕکردنی نەبو چوار کەسەکەی تریشمان لەبارودۆخێکدا بووین کەنەماندەتوانی سەرکەوین.

فرانچی بەهێواشی وتی:

تەقە مەکەن..... چاوەڕێی ئیشارەی من بن.

ئێمە لەسەنگەرەکەی خۆماندا ماینەوە وتەقە کردنمان وەستاند فرانچی ژواکین خۆی بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئەوان بەدووری نادیار چەند جارێك قیژاندی.

ئەوان گوومانیان دەکرد لانی کەم دوان لەئێمە گولەی بەرکەوتووە، دڵنیابوون ئێمە تەسلیم دەبین بۆیە چاو نەترسانە لەسەنگەرەکانیان هاتنەدەرو هێرشیان بۆ بردین کەلەناکاو فرانچی ئیشارەی کردو من ئەو پەنجەمان لەسەر پەلەپتکەی ڕەشاشە فشاردا.

چەند ریز گولە چواریانی کوشت و ئەوانیتر ترساو رایان کرد. ڕەشاش..... ڕەشاش شتێك کە دزەکان ئارەزویانە لێی دەترسن.

دەنگی ڕەشاش بەمن بوو بۆئەوەی ئەوان رابکەن و هەرواشی لێهات. سینگوالاو شەش کەسیتر پەڕینە سەر ئەسپەکانیان و رایان کرد.

فرانچی وتی:

خێراکەن.... دەبێت پێش ئەوان بگەینە ئوردو..... من رێگەی قەوبر شارەزام یوری سواری ئەسپەکەی بکەن..... خێراکەن.

دواتر بۆئەوەی کارەکان زوتر ئەنجام بدرێت هاتە پێش و خۆی برینەکی قۆڵی یوری بەست و لەگەڵ ئەم کارەشدا قسەی لەگەڵ ئێمە دەکرد و دەیوت:

من دەمزانی ئەوان ئەم مەبەستەیان هەیە. کاتێك لێرە نزیك بووینەوە دوو کەسم لەسەر کێوکە بینی کەئێمەیان نیشانە گرتبو بەڵام بەرژەوەندیمان لەوەدابو خۆم لە گێلی بدەم.

پرسیارم کرد:

سینگوالا پلانەکەی دارشتووە؟ ئەو ژنێکی مەترسیدارە و جارێکیش دەیویست ئێمە بە کوشتن بدات.

فرانچی پێکەنی، شانەکانی بەرزکردەوە وتی:

سینگوالا...... سینگوالا.... نا بەهەڵەدا چوون. ئەم کارە لەوبەرنایەت.

هەڵبەت لە هەڵخەڵەتاندن و لەرێ دەربوونی هاوڕێکانی من کاریگەر بوو زۆر زوو کەسانی بەروخساری جوانی خۆی هەلەخەڵەتاند بەڵام خۆی ئەم پلانەی دانەرشتوە بەڵکو کەسێکیترە.

بێ ئەوەی خۆی بەشداربێت لەشوێنێکی ترەوە ئەم پلانە رێبەری دەکات و ئەوکەسە جگە لەکالوویی نیە. کالوویی لەزینداندایە. تا ئێستا چەند جارێك دەمویست بیکوژم بەڵام سینگوالا بەگریان و پاڕانەوە منی پەشیمان دەکردەوە.

بەڵام سەرکەوتنی کۆتایی بەئێمەیە و تائەمڕۆ ئێوارە کارەکان....

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو کەدەنگی هاوڕێك بیسترا و سەرنجی ئێمەی بۆ جادەی کوێستانەکە راکێشا. بەستنی برینەکەی یوریش کۆتایی هاتبو، فرانچی ئاوڕی دایەوە وتی:

کەسێك بەرەو ئێرە دێت..... لەهاوڕێکانی خۆمانە.

ئەو راستی دەکرد چونکە چەند خولەك دواتر دەنگی سمی ئەسپ بەجوانی دەبیسترا و سەرەئەنجام سوارێکی خوێناوی و هیلاك لەجادەکە دەرکەوت. فرانچی چەند هەنگاوێك بەپیریەوە چوو جڵەوی ئەسپەکەی گرت. سوار هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو بەپشتی دەست ئارەقی ناوچاوی سڕی و وتی:

سەرۆك..... دەرگای زیندانیان شکاند.... هەموویان رایانکرد.... کالوویی.... ئەوانیتریش. رایانکرد. تەقەیان لەمنیش کرد بەڵام لەبەر ئەوەی بەپەلە بوون گولەکەیان بەفیڕۆ چوو من زیندوو مام. خێراکەن.

چاوەڕێ بووین فرانچی بەبیستنی ئەم هەواڵە ناڕەحەت بێت و لەراکردن بەرەو ئوردو پەلەبکات بەڵام لەو پەڕی سەرسوڕماندا بینیم کە ئەو خوێنساردە ئەو هەموو هەواڵە تۆقێنەرەکانی دەبیست بەڵام گۆرانکاری تیا دروست نەدەبو.

سوارەکە ئیتر نەیدەتوانی لەسەر زین دانیشێت، چەمایەوەو بەیارمەتی فرانچی لەزین هاتەخوارو لەپاڵی تاشەبەردێك قاچەکانی خۆی درێژکردو حەسایەوە فرانچی پێی وت:

زۆر باشە..... تۆ لێرەدا بمێنەرەوەو بحەسێرەوە. ئەگەر بارودۆخ گەڕایەوە دۆخی ئاسایی خۆم کەسێك دەنێرم بەدواتا بەڵام ئەگەر کوژرام یان هەواڵێك لەئێمە نەگەشت بڕۆ بەدوای کاری خۆتا. ئەگەر کالوویی بەنەمانی من روبەڕوی ئێوە ببێتەوە گۆشتی جەستەتان بەدیان دەپچڕێت و چاوتان دەردێنێت.... ئاسوودە بە ئەمڕۆ دوایین رۆژی ژیانی یەکێك لەئێمە دوانەیە. یان ئەو دەکوژرێت یان من. ئەمەی وت و ئیشارەی لەئێمە کرد. مەبەستی لەو ئیشارە ئەوەبو سواربین و بەڕێکەوین.

چەند خولەك دواتر من و یوری و فرانچی و دووان لەهاوڕێکانی بەرەو ئوردو رۆشتین. بەڵام من ئارام و قەرارم لێبڕابو لەهەمان کات شەرمم دەکرد کەناڕەحەتی رۆحی خۆم لەگەڵ یوری وفرانچیدا باس بکەم. بۆ ئەمانۆو نیکی نیگەران بووم.

کەمێك کە لەو سوارە دوور کەوتینەوە تازە بیرم کەوتەوە کەباش بو ئەگەر حاڵی نیکی و ئەمانۆم لێدەپرسی دەبوا بمپرسیایە ئەوان لەچ بارودۆخێکدان وچی دەکەن؟

بەداخەوە دەرفەت لەدەست رۆشتبوو من ناچار بووم تا گەشتن بەوێ ناڕەحەت و پەرێشان بم ولەهەمان کات ئەم نیگەرانی و ناڕەحەتیە لەدڵی خۆمدا رابگرم. بەخۆمم وت:

ئەی هاوار..... سینگوالا لەگەڵ ئەمانۆ و نیکی چی دەکات؟ ئەم ژنە رقاویە کەبێ مەیلی بەرانبەر کراوە، چ تۆڵەیەکی مەترسیدار لەوان دەستێنێتەوە؟

داماو نیکی ! بێ گووناح ئەمانۆ ! ئەوان چ گووناحێکیان هەیە. شەش ساڵ پێش من و سینگوالا پەیوەندیمانی هەبو و دواتر کەڕامانکرد ئەم پەیوەندیانە پچڕان. کالوویش ئەگەر بزانێت من و یوری ئەو دوو گەشتیارەی شەش ساڵ پێشین، بەیادی رابردوو هەوەسی ئازاری ئێمە دەکات. ئاخ. بەڕاستی بارودۆخ مەترسیدار بوو...

یوری کەهەمیشە و هەرکات ئاگای لەم وگۆرانکاریەکانی روخسار بو هەستی کرد کە بۆنیکی و ئەمانۆ نیگەرانم بەڵام چونکە لەکاتی غاردانی ئەسپ نەیدەتوانی قسەبکات، بێدەنگ بوو هیچی نەوت تەنیا هەوڵی دەدا سەرنجی من بۆ دەشت و دەر دیمەنەکانی کێو رابکێشێت و رشتەی ئەندێشەکانم بپچڕێنێت هەرچی زیاتر لەبیناکان نزیک دەبووینەوە، نیگەرانی و دڵەراوکێی من زیاتر دەبو. شڵەژاو و پەرێشان بووم و بۆئارام راگرتنی خۆم دیانەکانم لەیەك گیردەکردو گازم لەلێوم دەگرت.

هەرچی دەبێت بابێت، نیگەرانی من بێ هۆ بو. هەمان چەند خولەك قسەکردنی ئێمە بووە هۆی ئەوەی سینگوالاو هاوەڵانی زووتر لەئێمە بگەن. لەگەڵ زیندانیان دەست بەتالان کردنی ئەو شوێنە بکەن. پاسەوانەکان و هاورێ وەفادارەکانی فرانچی ژواکین کەلەوێ لەچەند شوێنێکی کوێستان پارێزگاری و پاسەوانیان دەکرد، هەموویان کوژرابوو. تەنانەت یەك کەسیشیان بەزیندوویی لەو دەوروبەرەدا نەدەبینرا. کەلەبارەی نیکی و ئەمانۆ چۆنیەتی چالاکی کالوویی زانیاریمان پێبدات.

بیناکان چۆڵ. هەموو شوێنێك چۆڵ و بێدەنگ بو، دیمەنێکی ترس ئەنگێزو ناڕەحەت کەری بو. لەبن دارەکەی ماڵی فرانچی کە لەیەکەم خولەکی گەشتنی ئێمە فرانچی روبەڕومان بوویەوە و تەوقەی لەگەڵدا کردین، کەسێکیان بەشێوەیەکی وەحشیانە و دڵتەزێن کوشتبوو.... مێشکی بەهۆی بەرکەوتنی یەك یان دوو گولە پرژابو و بەدارەکەوە لکابو.

لەوێوە ویستم نیکی و ئەمانۆ بدۆزمەوە و لەحاڵیان بپرسم بۆیە قیژاندم و یەك دوو جار ناویانم هێنایە سەر زمان.

ئەمانۆ....... هی...... ئەمانۆ، نیکی لەکوێن......؟ ئەمانۆ بۆ وەڵام نادەنەوە.

دەنگم پچڕا و لەوەڵامدا بێدەنگیەکی قورس و بەردەوام فەرمانڕەوابو..... بێدەنگی و بێدەنگی، ئەمە تەنیا شتێك بو کەهەستی پێدەکرا.

زانیم کە نیکی و ئەمانۆ لەوێ نین.

چ رووداوێکی دڵتەزێن..... ئەوانیان بۆ کوێ بردوە، چ بەڵایەکیان بەسەردا هێناون.

ئایا لەئەنجامی خۆراگریدا کوژراون.

فرانچی بەگشتی سەیرێکی دەوروبەری کرد و کاتێك رۆشتە ناوژووری خەوەکەی خۆی، پاسەوانە باوەڕ پێکراوەکەی بەکوژراو ماڵ و خەزێنەکەی خۆی بەتاڵانکراوی بینی.

سینگوالا لەشوێنی پارەو جەواهیرەکانی فرانچی ئاگادار بو. هەردە دوانزە رۆژ جارێك سینگوالا ئەم شانازیەی پێدەبرا کە لەبەیانیەوە لەگەڵ فرانچی رابوێرێت... لەم ماوەدا سینگوالا نەتەنیا زانیبووی فرانچی خەزێنەی هەیە بەڵکوی لەگەڵ بوونی خۆی پاسەوانە تایبەتەکەی شوێنی خەزێنەکەی دۆزیبوویەوە و بەکالوویی وتبو.

کالوویی لەگەڵ ئەوەشدا دەیویست بارودۆخی کۆن دووبارە بکاتەوە و خۆی تەنیا دزی بێ رکەبەری ناوچەکە بێت. بەم وەسفە من و فرانچی لەپرێکدا بوین و هەردووك شتە گرانباییەکانی خۆمان کە ئەنجامی چەند ساڵ هەوەڵ و تێکۆشانی بو، لەدەست دابو.

منیش بەڕاکردن رۆشتمە ناو ژوورەکان و هەموو شوێنێك گەڕام بەڵام شوێنەوارێکم لەنیکی و ئەمانۆ بەدەست نەهێناو بەحاڵەتێکی نەشیاو بۆ وەسف کردن گەڕامەوە.

فرانچیش بەشەلە شەل بەرەو لای ئێمە دەهات.

ئەویش وەك من رەنگ بەروخساریەوە نەمابو. ناوچاوانی لەئارەقدا خوسابو و پەڕدەیەك لە فرمێسك چاوە ڕەشەکانی دادەپۆشی. من رواڵەت و روخساری خۆم نەدەدی بەڵام دیاربوو لەپەرێشان و دڵەراوکێی روکەش و ناخ دەستەکەمێکم لەفرانچی نیە.

لەم ناوەدا تەنیا یوری خوێنسارد دەهاتە بەرچاو چونکە هیچی لەدەست نەدابو و لەگەڵ ئەوەشدا ئارەزوومەندو عاشقی هیچ شتێك نەبو کە گوومانی لەدەست دانی ناڕەحەتی بکات. ئەژنۆکانم وەك مەحکوومێك کەلەترۆپکی گەنجیدا بۆ بەردەم دار رادەکێشرێت، دەلەرزین بەڵام دڵم بەپێچەوانەوە خاو ببو بەهێواشی لێی دەدا.... دەتوت دەیەوێت لەکاربکەوێت. فرانچی لەکاتێکدا سووچێکی لێوی بەدیان دەگەست و بیرمەند دەهاتە بەرچاو، دەستێکی بەدارەکەوە گرت و بۆچەند چرکە سەیری سووچێکی کیوری کردو بیری کردەوە.

من کەتوانای وەستانم نەبو، سەرەتا پاڵم بەدارەکەوەدا و دواتر ئەژنۆکانم سست بوون تائەوەی کەوتمە سەر زەوی و دانیشتم..... ئەنجامێك کەلەبیرکردنەوەی فرانچی

بەدەست دەهات چارەنووسی من و یوری رەنگە نیکی و ئەمانۆ رۆشن دەکردەوە.

چەند چرکە، رەنگە یەك خولەك زیاتر یان کەمتر تێپەڕی. فرانچی بێدەنگی شکاندو بەدەنگێك کە لەخەمی زۆر بۆر ببوو رویکردە یەکێك لەهاوڕێکانی خۆی کە لەوەفادارترینیان بو وتی:

من سوێندم خواردوە کە کالوویی نەکوژم.

بۆ من سەیربو ئەم وتە لەزمانی کەسێکی وەك فرانچی ژواکین، دزی دڵ رەقی ناودار ببیستم و پێی رازی بم. رەنگە خۆشی هەستی بەمە کردو ئاوڕی بۆلای من یوری دایەوە وتی:

بەڵێ..... رەنگە سەرتان سوڕمابێت بەلام دەبێت پێتان رابگەیەنم کەزیاد لەرادە رێز لەسوێند و باوەڕە مەزهەبیەکان دەگرم و پابەندی ئەخلاقم. سینگوالا سوێندی داوم کە کالوویی نەکوژم و لەسەر ئەم باوەڕە کەدەزانن من رێز لەسوێنەکەی خۆم دەگرم بەم کارە هەستاون..... گرنگ نیە.

دواتر رویکردە هەمان کەسی یەکەم و وتی:

بەڵێ..... من کالوویی ناکوژم، بەلام ناتوانم هەروا وازی لێ بێنم...... ئێستا کاتی ئەوە هاتووە لەدوژمن بۆ لەناو بردنی دوژمنێکی تر کەڵك وەربگیرێت.

ئەو پێکەنینێکی دەسکردی کردو لەیوری پرسی:

وانیە بەرێز.... لەکۆنترین رۆژگارەوە باوکانی ئێمە وتویانە نوسیویانە کە دوژمنی مەترسیدار دەبێت بەهۆی دوژمنێکی تر لەناو ببرێت.

ئەو سات وەك فەرمانێك کەبڕیارێکی گرنگی گرتبێت وەستاو دەستەکانی پێکەوە گرت و وتی:

سواربە..... هەرچی زووتر خۆت بگەیەنەرە سان سالوادۆر و بەهۆی تەلەفۆن پۆلیس ئاگادار بکەرەوە کە کالوویی و هاوڕێکانی بۆ برینی شەمەندەفەری هەڵگری پارەی بانك هاتوونەتە نزیك شار.

شەمەندەفەر رۆژی دووشەمە لەهێڵی نزیك شار تێدەپەڕێت. کالوویش بۆ ئەوەی لەهێرشی من پارێزراو بێت تا ئەو شوێنەی بکرێت لەشار نزیك دەبێتەوە کە بەگوومانی خۆی من نەتوانم بەدوایاندا بڕۆم. تۆ ئەگەر خێرا بڕۆیت بەیانی بەیانیەکەی دەگەیتە شار و ئەوان شەوی دوو شەمە بۆ کوشتنی کالوویی لە دەوروبەری هێڵی ئاسن بلاو دەبنەوە.

کەسی ئاماژە پێدراو بەخێرایی پەڕیە سەر ئەسپەکەی و دەستی وەك ماڵئاوای تەکانداو ڕۆشت. دوای ڕۆشتنی ئەو ژمارەمان بووبە چوار کەس..... فرانچی بزەیەکی گرت و وتی:

زۆر باشە..... دەبێت هاوکاری بکەین تا لاشەکان بەهۆی ئەسپەوە لێرە دوور بکەینەوە وبیانخەینە چاڵ من تاقەتی ئەم کارانەم نەبو، یوریش بریندارو نەخۆش بو بەڵام ئەگەر لاشەکانمان کۆنەکردایەتەوە بۆگەینان دەکردو لەهەوا گەرمەدا دەبوونە هۆی نەخۆش کەوتنی ئێمە.

لەسەر ئەم بنەمایە بەبێ مەیلەوە دەستمان بەکارکرد. یەك یەك لاشەکانمان رووت دەکردەوە. جلەکانمان دەردەهێناو گیرفانەکانمان خاڵی دەکرد، دواتر دەمانخستنە سەر ئەسپ و دەماندایە دەست هاوڕێکەی فرانچی. ئەویش لاشەکانی دەبردو لەدووری کەمتر لەچارەکە کاتژمێرێك ڕێ پێوان دەیخستنە ناوچاڵێکی قووڵ و دەگەڕایەوە.

لە دووەم یان سێیەم جار کە ئەو ڕۆشت و گەڕایەوە لەناکاو فرانچی بەرزبوویەوەو کەبەشادمانیەوە دەیوت:

وەرن...... خێراکەن..... هەواڵێکی گرنگ.

هەرسێکمان بەرەو دەنگەکە ڕۆشتین، فرانچیمان لە ڕێرەوی یەکێك لەماڵەکاندا دۆزیەوە و، کەلای لاشەیەك دانیشتبوو کاغەزێکی لەدەستدابو. لەگەڵ ئەوەی ئێمەی بینی کاغەزە گرۆمۆڵە کراوەکەی نیشانداو وتی:

بڕوانن..... ئەم هاوڕێیەمان پێش مردنی یاداشتێکی بۆ من نوسیووە و لەناو پەنجەکانی خۆی دایناوە..... ئەم کاغەزەم لەدەستی ئەودا دۆزیەوە. بڕوانن.

دەست بەجێ کاغەزەکەی دا بەدەستی من و وتی:

بیخوێنەرەوە...... بیخوێنەرەوە بزانە چی نووسیوە.

سەیری کاغەزەکەم کرد خەتێکی خوارو گێڕی بو لەگەڵ ئەوەشدا بەدژواری دەخوێندرایەوە و من توانیم بیخوێنمەوە.....

کالوویی پاسەوانی زیندانی کوشت، دەرگای شکاند و زیندانیانی رزگارکرد. کاتێك ئاگادار بووین کە ئەوان سیلاحیان بەدەست هێنابو، سەرۆك خیانەتیان لێکردین.....دەبێت تۆڵە لە خیانەتکار بسێنیتەوە...... تۆڵەی من..... تۆڵەی ئەوانیتر..... ئێوە دەبێت تۆڵە بستێننەوە..... ئەو دوو ژنە ئامازۆنیەیان بەزۆر لەگەڵ خۆیاندابرد.

کەمێك توانام هەبوو گوێم لەقسەکانی ئەوان کاتێ دەڕۆشتن گرت تێگەشتم بەرەو قەلاّ وێرانەکە دەڕۆن سینگوالا پێشتر ئەوێی بۆ ژیان ئامادەکردوە و دوای کوشتنی پاسەوانەکان کەمێك کەل و پەل و پێداویستی ژیانیان لەماڵی ئێوەو ئەوانیتر بردوە. لەلای رۆژئاوا جگە لە قەلاّ وێرانەکە شوێنێکی تر نیە ئەوان بتوانن خۆیان داشارن.

لەنامەکەدا چەند وشەو چەند رستەیەکی تریش بەرچاو دەکەوت بەڵام نەدەخوێنرایەوە چونکە دیار بو نووسەرەکەی لەدوایین توانای بۆ نوسینی کەڵکی وەرگرتووە.

روخساری فرانچی بەشێوەیەکی هەست پێکراو کرایەوە. تێگەشتم لەم رووداوە شادمانە و کەسی کوژراو لە دوایین ساتی ژیانی خزمەتێکی گەورەی بەفرانچی کردوە.

فرانچی خۆی لاشەی ئەو پیاوەی خستە سەرشان و لەکوێستان بەپێچەوانەی ئەوانیتر بەخاکی سپاردو سەرگۆڕەکەی بەبەردی بچووك و گەورە رازاندەوەو گەڕایەوە.

لەچەند هەنگاویەوە رایکردو پەڕیە سەر ئەسپەکە وتی:

سواربن...... خێراکەن..... دەبێت پێش تاریك بوونی هەوا بگەینە سنووری قەلاّکەو لەو نزیکانەدا کەمین بگرین تا شەو هێرشیان بکەینە سەر. شانس لەگەڵمانە، ئەم شەو کالوویی و هاوەڵانی دەکوژرێن.

منیش لەشادمانیدا لەپێستەکەم جێگەم نەدەبووەیەوە بەڵام پێش رۆشتن بەفرانچیم وت:

چاوەڕێ بە..... دەبێت فیشەك هەڵبگرین پێویستە.

ئەمەم وت و بەڕاکردن خۆم گەیاندە ژوورەکە نەمزانی مەودای نێوان ئەسپەکەو ژوورەکەم چۆن بڕی چونکە تەنیا کاتێك فرانچی لەسەر ئەسپەکەی دانیشت من کەوتمە بیری خۆڵی زێر و جەواهیرەکانی خۆمان. وەك شێت خۆم گەیاندە ژوورەکە بەڵام بەداخەوە. بارەکانمان نەبینرا. یەکێك لە کۆڵە پشتەکانیان بەخەنجەر دڕیبوو ناوەکەی گەرابوون و هەرچی شتی بەهای تیابو بردبوویان.

بەخۆشحاڵیەوە ئەوەی تالاّم کرابو شتێکی گرنگ نەبو، کەمێك تۆوی گوڵ و گیاو شتی بێ نرخی تربو.

بەخۆمم وت:

بەداخەوە..... جەواهیرو خۆڵی زێر و نیکی و ئەمانۆمان پێکەوە لەدەست دا.

ئارەقێکی سارد لەسەر ناوچاوم دانیشتبوو کە لەناکاو چاوم بە سووچێکی کۆڵەکان

کە لە سنوقی داری سووچی ژوورەکە هاتبوەدەر، کەوت. لەشادیدا قیژاندم و بەرەو ئەویێ رامکرد.

سنووقەکەم لابردو نازانن کاتێك بارەکانم بەدەست لێنەدراوی بینی چەندە شادمان بووم، ئەمانۆ و نیکی بەزیرەکی خۆیان هەستیان کردبوو ئەوەی لەو دوو کۆڵە پشتەدایە بۆئێمە پڕ بەهایە بۆیە دایان شاردبو و دزەکانیش بەهۆی پەلەکردنی خۆیان بۆ دۆزینەوەی کاتیان تەرخان نەکردبو. دووبارە کۆڵەکانم خستە ژێر سندوقەکەو بەچەند دارێکی تر داموپۆشی ودواتر فیشەکی ڕەشاشم هەڵگرت و بەڕێکەوتم:

زۆر خێرا بەڕێکەوتین، لەرێگەیەکی باریك کوێستانمان بڕی و چارەکە کاتژمێرێك دواتر گەشتینە دەشتێکی بەربلاّو کەپڕ بو لەکاکتوسی بەرز.

ئەو سەحرادا ئەوەندە کاکتوسی لیّ بو و کاکتوسەکان ئەوەندە بەرز بوون کە ئەگەر کەسێك لەبست هەنگاویدا دەوەستا نەیدەتوانی ئێمە چوار کەس ببینێت.

فرانچی بەشارەزایی ئەسپی لەناو کاکتوسە درکاویەکان تێپەڕاندو ئێمەش بەدوایدا بەڵام درکی کاکتوس کراسەکەی من و شەڕواڵەکەی یوریان دراند.

بەدرێژایی ئەو رۆژە برسی و تینوو هیلاك بەئەسپ رایگامان بڕی هەندێك کات غارمان دەداو هەندیّ کات بەهێواشی بەڵام لە هیچ شوێنێك زیاتر لەسیّ خولەك وچانمان نەگرت.

باشی کار لەوەدا بو کەفرانچی لاڕێکانی باش دەناسی و بەو جۆرەی بەراوردی کردبو لەخەیاڵیدا بو کاتێك هەتاو لەسەر نووکی کاکتوس بەرزەکان دەلەرزی سات بەسات کەم رەنگتر دەبو، قەلاّ وێرانەکە لە دوورەوە دەرکەوت.

نەماندەزانی ئەویّ کوێیە و هی کێیە تا ئەوەی چاومان بە دێهاتێیەك کەوت کە بەکەڕێکەوە تێدەپەڕی. رۆشتنیە لای و سەبارەت بەقەلاّکە زانیاریمان لێی ویست. ئەو وتی:

ئەم قەلاّ وێرانە زۆر ترس ئەنگێزەو لەسەدەیەك پێش تائێستا چۆڵە و کەس ناوێرێت تیایدا بژی و بەئاوەدانی ئێرە کە زەویەکی بەپیتە، سەرقاڵ بێت.

لەسەدەیەك پێش ئەم قەلاّ هیی پرتوگالیەکان بووە بەڵام ئاشکرانیە لەسەر چ رووداوێکی شووم سەربازەکان، فەرماندەی خۆیان وبنەماڵەکەی یانی خوشك، هاوسەرو پێنج مناڵەکەی دەکوژن و لاشەکانیان دەسووتێنن.

بەهۆی نەبوومی فەرماندە چەند مانگێك لەناویاندا کێشەو شەڕوپێکدادان روودەداو

دەڵێن سەرئەنجام شەوێك رۆحی فەرماندەو خێزانەکەی لەقەڵادا دەردەکەوێت و دەنگی سەیر سەیریان لێ دەبیسترێت کە دەبێتە هۆی ترسی سەربازەکان. هەندێکیان بڕیار دەدەن رابکەن بەڵام بەشێوەیەکی سەیر دەرگای قەڵا ناکرێتەوە و ئەمەش زیاتر دەبێتە هۆی ترساندن و تۆقاندنی سەربازەکان. ئەو شەوە بەناڕەحەتی بەسەر دەبەن بۆ بەیانی نەخۆش و وەبا لەناویاندا بڵاو دەبێتەوە لەماوەی کەمتر لە دە رۆژ لەهەزارو چەندکەس دانیشتووی قەڵاکە تەنیا منداڵێکی حەوت ساڵە و توولە سەگێك دەمێننەوە. لەو رۆژە بەدواوە دەڵێن رۆحی فەرماندەو خێزانەکەی لەقەڵاکەدا سەرگەردانن و لەسەر ئەم پڕوپاگەندە راست یان درۆیە کەس ئامادە نیە لەوێ بژی.

فرانچی بەبیستنی ئەم قسە بیری کردەوەو پێی وتین:

دەبێت لێرەدا بمێنینەوە تا هەوا بەجوانی تاریك ببێت. کاتێك تاریکی هەموو شوێنێکی داگرت پێتان دەڵێم دەبێت چی بکەن.

دەست بەجێ لەئەسپەکەی دابەزی و لەشوێنێك کە لەقەڵاوە نەدەبینراین سەرقاڵی خواردن و حەسانەوە بووین. دەمی ئەسپەکانمان بەست تا نەحیلێنن و رسوامان نەکەن. زیاتر لە هەرشت و هەرکەسێك ئەسپەکان ئەگەری بو رسوامان بکەن.

دەنگی حیلەی ئەسپ لەدوورەوە دەبیسترێت و چونکە ئەوێ بێدەنگ و کپ بو هەرسات ئەگەری ئەوەهەبو ئەسپەکان بحیلێنن و بەمەودایەکی دوور کەلەنێوان ئێمەو دیوارەکانی قەڵا وێرانەکەدا بو دەنگەکە ببیستن و رابکەن.

فرانچی باسی پلانەکەی خۆی نەدەکرد.

ئێمەش قسەمان نەدەکرد. یوری کە لەهەموو تەمەنیدا جگە لەمن فەرمانبەرداری کەسیتری نەکردوە لەو بارودۆخە تایبەتە رێزی لەفرانچی رادەگرت و دەستوورەکانی جێ بەجێ دەکرد. ئەمە بەرساتی بۆ من سەیر بو.

بەرهەرحاڵ رۆژێکی خراپمان بەسەربرد هەموو فکرو بیرم لای نیکی و ئەمانۆ بو. بەخۆمم دەوت ئەوان چی دەکەن.......؟ لەچ حاڵێکدان. کالوویی و سینگوالا چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن؟ ئەم ئەندێشانە بەشێوەیەك رۆح و مێشکی منی سەرقاڵ کردبو کە جێگەیەك بۆ بیرکردنەوەی تر نەدەمایەوە. یوری لەژێر چاو ئاگای لەمن بو و هەرچەند خولەك جارێك قسەی دەکرد و بابەتێکی تازەی باس دەکرد رەنگە سەرنجم بۆ شوێنێکی تر راکێشرێت و زۆر خەم نەخۆم.

فرانچی ژواکین دەستووریدا یەکێك لەهاوڕێکانی ئەسپەکان بەهەمان شێوە بەدەمی

بەستراو بباتە پشت تەپۆڵکەیەکی نزیك و لەوێدا رایانبگرێت. بەڕۆشتنی ئەسپەکان تاڕادەیەك خەیاڵمان ئاسوودە بو چونکە ئەگەری ئەوە نەما یەکیان بحیلێنێت و دوژمن ئاگادار بکاتەوە. رۆژ بەهێواشی تێدەپەڕی و بەڕاستی هەر خولەکێك بۆ من وەك تەمەنێك بو. هەتاوی ئێوارە بەسووری و بەزەردی تێکەڵاو بەیەك، لەسەر دیوارەکانی قەڵا وێرانەکە دیمەنێکی خەم ئەنگێزی دروست کردبو.

ئەوێ لەخۆیدا شوێنێکی شووم و ترس ئەنگێز بو. تەنانەت ئەگەر مرۆڤ زانیاری لەسەر رابردوی ئەو قەڵایەش نەبوایە لەو دیمەنە ناپەسندەی دروست دەبو، دەترسا.

هەوا کەم کەم روی لەتاریك بوون دەکرد و تاریکی لەرۆژهەڵاتی ئاسمانەوە کێشرا تا سەرئەنجام هەموو شوێنێکی سەحرا و قەڵاو دەرەوە و ناوەوەشی داگرت.

فرانچی دەستی بەقسەکردن کردو وتی:

گوێ بگرن. دەرفەتی پێویست بەدەست هاتووە.

هەمووان بەوردی گوێیان لەفرانچی دەگرت و چاویان لەدەمی ئەو بریبو.

یوریش بۆئەوەی رادەی وشیاری و زیرەکی فرانچی تاقی بکاتەوە، ئارەزوومەند بو لەپلانەکەی ئاگادار بێت. بابەتەکە سەرنج راکێش بو چونکە منیش بەخۆم دەوت.

فرانچی چۆن دەیەوێت بەبێ شەڕو خوێن رشتن دوژمن لەپێ بخات.

ئێمە لەپلانەکەی ئەو تەنیا ئەوەمان دەزانی دەیەوێت بێ شەڕو خوێن رشتن بەسەریاندا زاڵ ببێت. فرانچی سەیری دەوروبەری کردو بەم شێوەیە درێژەی بەقسەکانی خۆیدا.

ئاگادار بن، کالوویی ژمارەیەکی زۆری هەڵخەڵەتاندوەو کردویەتیە هاوڕێی خۆی. هاوڕێکانمان هەموویان کوژران و جگە لەچەند کەس کە لەدەوری یەك کۆبووینەتەوە، کەس نیە یارمەتیمان بدات لەم شێوەشدا ئەگەر بمانەوێت لەگەڵ کالوویدا شەڕ بکەین جگە لەشێت شیاوی ناوێکیتر نین.

لەم کاتەدا دەنگی خشە خشی درکەکانی سەحرا دەبیسترا.

نوسیم، ئەو سەحرا جگە لەکاکتوسی بەرز چقڵ و گیای وشکی تری بو کەبەهۆی هەڵکردنی با دەنگیان لێوەدەهات.

فرانچی قسەکانی پچڕاند، سەیرێکی ئاسمانی داپۆشراو لەهەوری کردو دواتر گوێی لەدەنگی هەڵکردنی باو چقڵەکانی سەحرا گرت و وتی:

چ رێکەوتێکی باش، ئەم شەو با هەڵیکردوە و ئەم دەنگە کە بەهۆی هەڵکردنی با

دروست دەبێت زۆر یارمەتیمان دەدات.

یوری وتی:

نەخشە چیە.... خێراتر بیڵێ کات بەفیڕۆ دەڕوات.

فرانچی وتی:

هەرچی درەنگتر باشتر.... بائەوان دڵنیابن کە ئێمە بەدوایانەوە نین و کاتێك بەخەیاڵی ئاسوودە خەوتن دەست بەکار دەبین..... نەخشەکە زۆر سادەیە. ئێرە بەناوبانگە بەوە ئەم قەڵایە نشینگەی رۆحەکانە و بەدڵنیاییەوە بیر لەوە دەکەنەوە رەنگە رۆحەکان دەرکەون و ئازاریان بدەن. هەرکەس هەرچەندە تواناشی هەبێت لەقووڵای رۆحی خۆیدا هەست بەناڕەحەتی دەکات و دەترسێت. ئێمە لەترسی ئەوان کەڵك وەردەگرین. جلی سپی لەبەردەکەین و لەپشت دیوارەکانی قەڵا وەك رۆح دەنگە دەنگ دروست دەکەین.

یوری کەخۆی لەئەژدیهاش نەدەترسا وتی:

رەنگە ئەوان نەترسن.... ئەوکات دەبێت چی بکەین؟

فرانچی وتی:

ئەوکات ڕەشاشەکان بەکاردێنین و چونکە نزیك بووینەتەوە و هەوا هەوری و تۆفانیە بەئاسانی دەتوانین بیانکوژین.

یوری وەك ئەوەی نەخشەکەی فرانچی پەسەند کردبێت وتی:

کەواتە چاوەڕێی چین. نابێت کات بەفیڕۆ بدەین.... جلی سپی لەکوێ ئامادە دەکرێت....؟

فرانچی وتی:

ئێوە لەژێر جلەکانی خۆتان ژێر کراس و ژێر شەڕواڵتان نیە......؟

من ویوری وتمان:

نزیکەی شەش ساڵە جگە لەم جل و بەرگە هیچی ترمان لەبەر نەکردوە. لەجەنگەڵە مەترسیدارەکانی ئامازۆن ژێرکراس و ژێر شەڕواڵی لەکوێ دەست دەکەوێت؟

فرانچی پێکەنی و دەست بەجێ وتی:

زۆر باشە، من بەرادەی پێویست مەلانەی سپیم پێیە. هەرکام مەلانەیکی سپی لەخۆمان دەئاڵێنین و دەڕۆین بەڵام دەبێت ئەم کارە جۆرێك ئەنجام بدرێت تاکۆتایی قەڵا نەمانبینن من و یوری دەست بەکار بووین. بەڵام فرانچی بۆتیگەیاندی هاوڕێکانی خۆی

چەند خولەکێك قسەی بۆکردن تاجوان لەمەبەستەکەی ئەو حاڵی بوون.

سیلاحەکانیش دابەش کرا. یوری تفەنگێکی هەڵگرت. من ڕەشاشێکم بەدەستەوە گرت و فرانچیش بەڕەشاشەکەی ترەوە بەڕێکەوت. ئەوانیتریش هەرکام تفەنگ و دەمانچەیان پێبو.

هێشتا ئەوان لەپشت تاشە بەردەکە بون کەمن و یوری بەڕێکەوتین. هەوا تاریك بو. بایەکی توند هەڵیکردبوو خۆڵی سەحرای بەرزدەکردەوەو لەگوێ و چاوی مرۆڤی ڕۆدەکرد. دەنگی سەیر بەگوێ دەگەشت کە دیار بو زادەی هەڵکردنی باو دەنگدانەوەی لەناو قەدی کاکتوسەکانە. دیواری قەڵا وێرانەکە لەدوورو لەوتاریکیەدا نەدەبینران و ئەگەر رووناکی ئاگری ناو قەڵاکە نەبو رەنگە بەهەڵە دەڕۆشتین و ڕێگای سەرەکیمان ون دەکرد.

نیو کاتژمێر دواتر من و یوری گەشتینە بن دیوارەکان و خۆمان لەچاڵێکدا داشاردو ترسێکی سەیر سەرتاپامی داگرتبو، لەئارەقدا خوسابوم بەڵام هیچم بەیوری نەوت.

دەنگی مەترسیدار بەگوێ دەگەشت کە سات بەسات توندترو ئاشکراتر دەبوون.

یوری دەیوت:

با لەناو قەدی خاڵی کاکتوس دا دەپێچێت و ئەم دەنگانە دروست دەکات.

بەڵام ئەوەی من دەمبیست لەدەنگی با نەدەچوو. دەنگی مناڵ لەدوورەوە بەگوێ دەگەشت. جوان گوێم گرت. شتێك نەبوو بەهەڵەدا بچین مناڵێك بەدەم گریانەوە دەیوت:

دایە...... دایە....... دایە.......

ئیتر توانام نەماو بەیوریم وت:

دەبیستی ! مناڵێك دەگری و بانگی دایکی دەکات.

یوری وەك ورچ شانەکانی بەرزکردەوەو بەوپەڕی بێ هەستی و بەوپەڕی خوێنساردی وتی:

لەوانەیە کاری بەدایکی بێت بەمن وتۆ چی.

بەتووڕەییەوە وتم:

بۆ هەڵیت و پەڵیت دەڵێیت؟ ئەم دەنگە لەرۆحی ئەو مناڵەیە کە سەربازەکان کوشتوویانە.

یوری وتی:

من کەهیچ نابیستم. بیروخەیاڵە. گرنگ نیە. ئێستا کە دەنگی رەکباری ڕەشاش

بەرزبیێتەوە هەموو دەنگەکانی تر دەکوژێنەوە.

دەست بەجێ مەلانە سپیەکەی بەمنداو وتی:

لەبەریکە.... خێراکە..... کات دەڕوات.... سەیرکە..... روونکی ئاگر لەم کەلێنە بەرچاو دەکەوێت. لێرە دیوار قەڵشاوە و من و تۆ کارمان بەوانیتر نیە ولێرەوە دەڕۆینە ناو قەلاّ و خۆمان دەگەیەنینە شوێنێك کە کالوویی و هاوڕێکانی خۆیان مەلاّس داوە. هەرئەوەندەی فرانچی و ئەوانیتر دەنگە دەنگیان دروست کرد من و تۆ لەدەرفەت کەلّك وەردەگرین و نیکی و ئەمانۆ دەڕفێنین. بەئێمە چی ئەوان کێشەیان هەیە.

قسەم نەکرد. گوێچکەم دەزرنگایەوە هەواتاریك بوو گەرنە یوری رەنگ پەڕانی منی دەدی و هەستی بەترس ولەرزی من دەکرد. دڵم وەك دڵی کۆترێك کەلەچنگی شاهیندا بێت لێی دەدا.

قوڕگم وشك ببو لەترسا یەك یەك هەناسەم هەلەکێشا.

یوری دەست بەکاربو. مەلافە سپیەکەی کون کردو کردی بەسەری خۆیدا وبەجۆرێك کونەکە بەردەم و چاو دەمیشی گرت. منیش وەك ئەو مەلافەکەم کون کردو لەسەرم کرد. دواتر هەردوکمان لەچاڵەکە ڕۆشتینەدەرو بەرەو کەلّێنی دیوارەکە ڕۆشتین.

هەرچی زیاتر دەڕۆشتینە پێش زیاتر دەترسام. مرۆڤ دەبێت خۆی ئەوەندە ترسابێت تابتوانێت تێبگات من لەوشەوەدا چەندە ترسام و چ حاڵێکم بو. ئەو حاڵەتەم بەهیچ وشەو رستەیەك ناتوانم وەسفی بکەم.

ئەژنۆکانم بەهەموو هێزیانەوە دەلەرزین و رەنگە یوریش دەنگی شەقە شەقی دیانەکانمی دەبیست بەلاّم یوری ئارام و خوێنساردبو. بێ گوێدان سەیری هەمووشتێکی دەکرد و ئەوەندە خوێنسارد بو کەهەرکەس دەیبینی گوومانی دەکرد بۆ دەورگێران لەشانۆ دەڕوات. کەلّێنی دیوارەکە دەرکەوت رووناکی ئاگر کە لەناو قەلاّکە دایانگیرساندبو هەمووشوێنێکی گرتبوویەوە و لەوێوە رێگای ئێمە رووناك دەکرد وبەردەم خۆمان دەبینی.

بەرێنوێنی ئاگرەکە دەڕۆشتینە پێش. بۆ یەکەم جار سێبەرێك لەبەردەممانەوە تێپەڕی. یوری دەستی منی گرت و رایکێشام و دایشاردم.

سیلاحەکەم ئامادەکردبو لەژێر بالاّ پۆشە سپیەکە رام گرتبو کە لەگەڵ دەرکەوتنی مەترسی تەقە بکەم. ئەو سێبەری کەمێك لەهاوڕێکانی کالوویی بو کەدەتوت لەوێدا ئیشکی دەگرت چونکە خولەکێك دواتر دووبارە گەڕایەوە و سەیرێکی دەورووبەری

دەکرد و دووجار لەوڕێگادا هاتوچۆی دەکرد. ئەم کارەی بەردەوام دووبارە دەکردەوە و هەر جار بێ ئەوەی بمانبینێت لەبەرانبەرمانەوە تێدەپەڕی. شتێك کە سەرنجی منی رادەکێشا ئەوەبو پاسەوانەی ئاماژەپێدراو بەهەمان حاڵی من گیرۆدە ببو و شوێنەواری ترس و نیگەرانی لەجووڵەکانی دەبینرا. لەگەڵ بیستنی بچووکترین دەنگ دەوەستاو سەیری دەورووبەری دەکرد و دووبارە هەنگاوی هەڵەگرت بەڵام هەریەك دوو هەنگاو هەنگاوەکانی سست دەکردو لەناکاو ئاوڕی دەدایەوە و سەیری پشتی خۆی دەکرد و ئەم جارە لەولایتر ئەم کارەی دووبارە دەکردەوە. هەم پێکەنیناوی بو هەم بێزارکەر. پاسەوانێك کە بۆ پاسەوانی دایان نابو دەترسا و منیش کە بۆ کوشتنی ئەو رۆشتبووم دەترسام. سەیرە ! بەڕاستی سەیرە.

دەنگە مەترسیدارەکان دەبیسترا. وردبوومەوە و هەستم بەوەکرد کەپاسەوانی بەدبەخت وەك من ئەو دەنگانە دەبیستێت و ترسی ئەو لەوەیە کەمنی ترساندبو.

دەنگی گریانی منداڵێك کەدایکی بانگ دەکرد و دواتر دەنگە دەنگی چەند کەسێك کە دەیانقیژاند و جنێویان دەدا.

یوری وتی:

ئەم پاسەوانە لێرە تەکان ناخوات. ئێمەش رێگایەکی ترمان نیە مەگەر ئەوەی لەبەرانبەری تێپەڕین.

بەهێواشی وتم:

دەبێت چی بکەین.....؟ بەبۆچوونی من عاقڵانەتر وایە لەم رێگاوە بگەڕێینەوە و لەرێگایەکی ترەوە بڕۆینە ناو قەلاَ.

یوریش بەهەما شێوە بەهێواشی وتی:

نا..... ئەم کارە باش نیە چونکە کالوویی لەسەر هەموورێگاکان پاسەوانی داناوە. هەرجۆرێك بووە دەبێت لەم رێگاوە بڕۆینە ناو تەنانەت ئەگەر ناچاربین ئەم پیاوە بکوژین.

بیرم کردەوە وتم:

کوشتنی ئەو بێ دەنگی گولە ئەگەری نیە و لەم شێوەشدا....

شانم بریندارەو دەستیشم ئازاری هەیە و ناتوانم شەڕی لەگەڵدا بکەم. ئەوە کاری تۆیە کەلەدواوە پەلاماری بدەیت ئەوەندە قوڕگی بگوشیت تابخنکێت.

بەڵام هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبو کەبێدەنگ بو، وەستاو بیریکردەوە و دواتر،

قۆڵە بریندارەکەی تەکانداو دەستی بەشانیداهێناو وتی:

دەزانی چیە؟ دەبێت بەشێوەیەکی باشتر بیکوژین.

پرسیم:

چۆن؟

وتی:

چاوەڕێ بە.

دواتر چەمایەوەو بەردێکی بچووکی لەسەر زەوی هەڵگرت و لەدەستیا رایگرت. نەمدەزانی دەیەوێت چی بکات. کەمێك خۆم کێشایە دواوە تا لەئەگەری رووداني روداو بتوانم باشتر تەقە بکەم. شتێك کە لەلایەکیتر منی ناڕەحەت کردبو ئەوەبو بەو مەلافە سپیانە دابوومان بەسەر خۆماندا نەمدەتوانی تەقەبکەم و لەڕەشاش یان دەمانچەکەی خۆم بەخێرایی کەڵك وەربگرم. بەڵام چارە نەبو. پەنجەم لەسەر پەلەپتکە داناو ئامادە بووم.

یوری شتێك درەنگی کرد تا پاسەوانەکە نزیك بوویەوە. ئەو کات بەخێرایی بەردەکەی بۆهاویشت. نزیك بوو بقیژێنم مەگەر شێت بوویت یوری.....؟ ئەمە چ کارێکە؟ بۆ بەردی بۆ دەهاوی. ئەگەر بەرەو لای ئێمە بێت هەموو شتێك خراپ دەبێت. هەموو شتێك ئاشکرا دەبێت. بەردەکە لەتاریکی شەودا نەدەبینرا بەڵام لەبەردەم پاسەوانەکە دا کەوت و دەنگێکی لێوەهات کەبیسترا.

پاسەوانە کەچاوەڕوانی ئەمەی نەدەکرد. ترسا. بەترسەوە سەیری دەورووبەری خۆی کردو سەری بۆ چەپ وراست سەرو خوار سوڕاند.

یوری دووبارە بەردێکی تری هەڵگرت و بۆ پاسەوانەکەی کالوویی هاویشت.

ئەم جارەیان بەرد بەر سەری کەوت و ئەوپیاوە بەدبەختەی ترساند و کاتێك زانی بەردەکە لەدواوە هاوێژراوە لەو تاریکیەی ئێمە خۆمان تیا حەشاردابو، ڕوانی. بەردی سێیەم یوری دای لەسینەی. ئەم جارەیان پاسەوانەکە تفەنگەکەی ئامادە کرد میلی هێنایەوە و دەستی لەسەر پەلەپتکە دانا بەرەو لای ئێمە هات.

یوری ساف وەستا. منیش بەدوای ئەودا دەستم داخست و بێ جووڵە لە شوێنەکەی خۆمدا وەستام.

پاسەوان بەهەنگاوی لەرزان دەهاتە پێش تا ئەوەی دەهاتە ژوور. سەرەتا چاوی لەتاریکیدا هیچ شوێنێکی نەدەبینی بەڵام یەك دوو چرکە دواتر کەسەیری ئێمەی دەکرد

دوو مۆتەکەی سپی پۆشی وەستاو بینی.

زمانی لەترسا گیرا. چرکە ساتێك بێدەنگ بوو دواتر بەزمانی گیران وتی:

ئێوە.... ئێوە..... رۆح.... ئەرواح..... من..... من..... تۆ...... کالوویی.... سینگوالا....

ئەو داماوە ئەم وشانە شەقلی و بەقلیانەی بێ ئەوەی بزانێت دەیەوێت بڵێت چی، هێنایە سەر زمان لەهەمان کاتیشدا دەلەرزی....

یوری لەناکاو قیژەیەکی مەترسیداری کرد. ئەم قیژە زیاتر بووە هۆی ترساندن و قیژاندنی.

سیلاحەکە لەدەستی کەوت، دەستەکانی لەبەرانبەر خۆیدا گرت و وتی:

من..... من.....

ساتێك دواتر ئەژنۆکانی چەمایەوە وەك دارێك کەلەبن بڕابێت کەوتە سەرزەوی و بێهۆش بو.

تەواو بو.... یوری وتی:

خێراکە. ئەو بێ هۆشە. شان و دەستی من ژان دەکات. تفەنگەکەی هەڵگرەو دەست و قاچی بە تەنافەکەی کەمەری خۆی ببەستەرەوە. ئەوان تەنافیان بەکەمەرەوەیە تا لەکاتی پێویستدا کەڵکی لێوەربگرن.

من بەو تەنافە دەست و قاچیم بەست و لەسووچێکدا فڕمدا. دەمیشیم بەدەستماڵ بەست تا نەتوانێت هاوار بکات.

ئیتر جێگەی درەنگ کردن نەبو، رێگەش کرایەوەو بێ لەمپەڕ دەمانتوانی بڕۆینە ناو قەڵا. پێکەوە بەوجلە سپیە ترس ئەنگێزانە رۆشتینە ناو قەڵاو بەرەو رۆشنایی ئاگر، کە رۆشتنیە پێش. دەنگی دوو قیژەی بەدوای یەك بەگوێی کالوویی و هاوڕێکانی گەشتبو. یەکیان قیژەی یوری و ئەویتریان قیژەی پاسەوانی بەدبەخت.

کالوویی ترسابو ویستی هۆکاری قیژەکان بزانێت بەڵام لەم کاتەدا دەنگی فرانچی و هاوڕێکانی بەرزبوویەوە کەزیاتر دەبووە هۆی ترساندی ئەوان.

ئەوان بەشارەزایانە دەیانقیژاند وەك رۆحە سەرگەردانەکان پێدەکەنین.

من و یوری بەڕاکردن رۆشتینە ناو ڕێڕەوێکی درێژ کەدیار نەبو بەکوێ کۆتایی پێدێت.

بەشێوەیەکی کاتی لەوێدا ماینەوە، لەم کاتەشدا دوو پیاوی چەکدار بەڕاکردن هاتنە

ناو ڕێزەوەکە. من ترسام چونکە گوومانم کرد ئەوان دووانن ناترسن.

ئەوان هێشتا ئێمەیان نەدیبو بۆیە یەکەمیان کە لەپێشەوە بو، سینەی بەسینەی یوری بوویەوە، سەرەتا سەیری کردو چەند هەنگاوێك ڕۆشتە دواوە، دووەم هات...... ئەویش ئێمەی دوانەی لای یەك بینی کەوەستابووین.

جلی سپی، تاریکی شەو، ئەو قەلاّ شوومە.... بەو هەموو چیرۆکە ترس ئەنگێزەی کەبەسەرهاتی ئەوێیان دەگێرایەوە. لەناکاو یەکەم قیژاندی، تفەنگەکەی فرداو ڕۆشت. ئەویتریش بەدوایدا رایکرد. یوری خۆی پێگەیاند دەستی لەسەر شانی دان. ئەو داماوە لەترسا بێهۆش بو. یەکەم کەڕایکردبو لەتاریکی شەودا ون بو بەڵام هاواری دەکردو بەرەو لای کالوویی دەڕۆشت.

دانیشتوانی قەلاّ کە جگە لەکالوویی و پیاوەکانی نەبوون، لەهاوارەکانی ئەو پیاوە ئاگادار بوونەوە. ئەو دوانەی تریش بۆ ئاگادار بوون لەهۆکاری هاوارەکەی هاتبوون کە گیرۆدەی مردووە زیندووەکان بوون و یەکیان بیٚ هۆش بوو ئەویتریان رایکرد.

ئەوانیتریش بەهەمان شێوە ئەم هاوارەیان بیستبوو. لەوەش گرنگتر ئەوەی رایکرد بو هاواری دەکرد و دەیکێشا بەسەری خۆیدا و بەشێوەیەکی هەڕەمەکی وشەی دەهێنیایە سەر زمان کەهیچی لیٚ حاڵی نەدەبووین.

یوری کە ئەم بارودۆخەی بینی وتی:

ڕەشاشەکە ئامادەکە، ئەگەر پێکەوە بێن ئیتر ناترسن و بۆ دەرخستنی راستی هەوڵ دەدەن.

لەهەمان کات کەنەمدەتوانی لەپێکەنینی خۆم ڕێگری بکەم. بارودۆخێکی گونجاو نەبو پێویستی بە پێکەنین بێت. نیکی و ئەمانۆ گرفتار ببوون و هەموو بیرو سەرنجی من لای ئەوان بو و دەترسام نەکا کالوویی هەوەسباز بەهاندانی سینگوالا کە لەمن دڵی خوێنی بو، دەست درێژی بکاتە سەر هەردووکیان یان یەکێکیان و شیرازەی ژیانم تێك بدات.

بەم هەمو ناڕەحەتی فکرو خەیاڵە، لەو جل و بەرگە سەیرەدا، لەو شوێنە ترس ئەنگێزەدا کە لە ناخی من و رەنگە یووریش ترسی دروست دەکرد، هۆکارێك بۆ پێکەنین نەبو بەڵام راکردن و ترسی ئەو دووانە ئەوەندە سەرنج راکێش و سەیربو کەهەرکەسی تریش لەجێگای من بوایە نەیدەتوانی لە قاقاو پێکەنین ڕێگری بکات.

یووریش لەگەڵ ئەوەی وشك و بیٚ هەست بو، دەستی کرد بەپێکەنین بەڵام کەمتر لەمن

پێکەنی تا ئەوەی سپی پۆشێکی تر دەرکەوت. من ماوەیەك نەمتوانی هیچ گوومانێکم هەبێت و دەبێت بڵێم زۆر درەنگ هەستم پێکرد کە رەنگە ئەویش دەستەی خۆمان بێت. لەبەرئەمە ترسام و خۆم خستە پشتی یوری وتم:

یوری.... پێم وابێت ئەمە رۆحێکی راستەقینە بێت.

یوری دووبارە قاقای لێداو وتی:

مەترسە.... ئەویش لەخۆمانە.

کاتێك نزیك بوویەوە زانیم کەیوری راست دەکات. کەسێك کە لەئێمە نزیك دەبوویەوە فرانچی بو و کاتێك گەشتە یەك هەنگاوی وتی:

لەباش رێگایەکەوە هاتنە ژوور.

یوری پرسی:

ئەوان لەکوێن.

فرانچی وتی:

ئاگرەکەیان نابینیت؟ ژمارەیان زۆرەو لەبەرژەوەندیدا نیە ئێمە هێرش بکەین.

یوری وتی:

دەبێت چی بکەین.

فرانچی وتی:

دەبێت چاوەڕێ بین تا ئەوان بەرەو لامان بێن. ئێوە رێگەیەی باشتان هەڵبژاردوە ئێستا ئەو کەسە دەڕوات و هەموو شتێك بۆ کالوویی باس دەکات. من هاوڕێکانی خۆم باش دەناسم. ئەوان لەدزی و پیاو کوشتن زۆر بەتوانان بەڵام بەهەمان ئەندازە خورافاتین و لەگەڵ ئەوەی چیرۆکی دەرکەوتنی رۆحەکان ببیستن یان رادەکەن یان ئەوەندە دەترسن کەتوانای هیچ کارێکیان نامێنێت.

دوای چەند ساتێك بێدەنگی کە سەیری دەوروبەری خۆی کرد درێژەی دا:

ئێوە ئاسوودەبن. روداوەکان بەقازانجی ئێمە دەبێت.

یوری پرسیاری کرد:

ئێستا دوو هاوڕێکەی ترمان لەکوێن؟ چی دەکەن؟

فرانچی وتی:

ئەوانم لەسەر دیوار داناوە کە لەگەڵ دەرکەوتنی مەترسی ئاگایان لەپشت سەرمان بێت.

هاوڕێکانی من عادەتیانە هەمیشە لەپشتە سەرەوە دوژمن لەپێ دەخەن.

هێشتا گفتوگۆی ئێمە تەواو نەببو کە دەنگی پێی چەند کەسێك بەگوێ گەشت. دەنگەکە بەردەوام نزیك دەبوویەوە هەرچی نزیکتر دەبوون دەنگی قاچی ئەوان لەسەر بەردی فەرش کراوی حەوشە وێرانەکە باشتر بەگوێ دەگەشت.

قسەیان دەکردو لەدوورەوە نەماندەزانی چی دەڵێن. هەموویان قسەیان دەکرد و رەنگە خۆشیان نەیاندەزانی چی دەڵێن و چی دەبیستن. قاوە قیژیان بەگەر خستبوو دیاربو کە دەنگە دەنگ دەکەن تا لەرادەی ترسیان کەم ببێتەوە.

فرانچی سەیری دەوروبەری کرد و بارودۆخی هەڵسەنگاندو بەخێرایی وتی:

گوێ بگرن. یەکێك لەئێمە سیانە دەبێت جیاببێتەوە دوور کەوێتەوە. من دەمێنمەوە. لەئێوە دوانەی کامتان خۆبەخشن.

پرسیم:

بۆچی دوور بکەوێتەوە.

چونکە مردوەکان تەقە ناکەن. ئەگەر ئەوان بەرەو لای ئێمە هاتن و یان ویستیان تەقە بکەن ئەوکەسەی لەتاریکیدا خۆی داشاردوە دەبێت بەرگری لەم دوانەی تربکات.

وتم:

من خۆبەخشم. دەبێت چی بکەم؟

فرانچی وتی:

باڵا پۆشە سپیەکەت فڕێدە کە لەتاریکیدا نەبینرێت. لەوێ چەند ژوورێکی لێیە، بڕۆ لەناو ژوورەکاندا خۆت داشارە.

خێرا بەڕاکردن رۆشتمە ناو یەکێك لەژوورەکان.

بەڵام لەدەرگاو دیوارەو تاریکی دەترسام. گوومانم دەکرد رەنگە مردوە راستەقینەکان بێنە سەروەختم بمکوژن. نازانم من ئەوەندە ترسەنۆك بووم یان هەرکەسێکیتر لەجیاتی من بوایە بە هەمان ئەندازە دەترسا.

بەهەرحاڵ لەپشت دەرگاکە خۆم داشارد بەجۆرێك لەگەڵ بوونی تاریکی فرانچی و یوری و ئەو تاقمەی نزیك دەبوونەوە، بەجوانی دەمناسینەوە. ڕەشاشەکەم ئامادە کرد تابەخێرایی بەرگری لە هاوڕێکانم بکەم. ئەوان دەنگە دەنگ دەهاتنە پێش. یەکیان کە لەپێش هەموویانەوە بو، چرایەکی بچووکی لەدەستدا بو کە لولەکەی شکابو و دوکەڵاوی بو بەدژواری روناکیەکی کەمی بەدەوروبەردا بڵاو دەکردەوە و کاتێك گەشتنە

ڕێرەوەکە هەیکەلی هاوڕێ بێ هۆشەکەی خۆیان لەوێدا بینی و لە دەوری کۆبوونەوە.

وادیار بو کەسی ئامازۆ پێدراو تازە هۆش خۆی هاتبو چونکە لەگەڵ ئەوەی دەستیان بەشانیدا هێنا چاوەکانی کردەوەو سەیری دەوروبەرو روخساری هاوڕێکانی کرد و پەنجەی بەرەو ڕێرەوی تاریك و ئەنگوستە چاوەکە بەرزکردەوە وتی:

ئەمە..... لێرە رۆحی فەرماندە لەگەڵ ژن و منالەکانی.... رۆحەکانم بینی... ئەو دووبارە بێ هۆش بوویەوە.

من لەشوێنەکەی خۆمەوە دەنگی کالوویێم بەجوانی ناسیەوە کە دەیوت:

چ پیاوێکی ئەحمەق... مرۆڤ کەدەمرێت. ئیتر زیندو نابێتەوە. ئەم قسە قۆرانە چیە. سەیرکەن چۆن ئەمشەو ئێمەیان کردوە بە گاڵتە جار... ناهێڵن ئەم شەو بگەینە رۆژ و بڕۆینە جەهەنەمێکی تر...

بەڕێکەون... دەزانم چۆن لەگەڵ ئەو رۆحانەدا مامەڵە بکەم کە هیچ کات ئارەزووی هاتنەدەر لەگۆرستان نەکەن...

کەسێك کەچراکەی بەدەست گرتبو لەیەك هەنگاوی ڕێرەوەکەدا وەستاو خۆی پشت سەری ئەوانیتر داشارد کالوویی بەتووڕەییەوە ئاوڕی دایەوە و یەخەی گرت و وتی:

بەدبەخت مەگەر نابینی کە چرا یەك دانەیەو ئەویش لەدەستی تۆدایە....

بۆ دەڕۆیتە دواوە....؟ لەچی دەترسیت....

ئەو قیافەیەکی تایبەتی بەخۆی گرت و بەشێوەی پاڕانەوە وتی:

کالوویی.... بمبوورە.... داوای لێبوردن دەکەم م ژن و منالم هەیە..

کالوویی کە لەترسی ئەو زیاد لەرادە تووڕە ببوو بەمشت کێشای بەسەریدا چراکەی لێگرت و دای بەدەست یەکێکیتر و وتی:

بڕۆ پێش.... دوو هەنگاو لەپێشەوە بڕۆ تا رێگە رووناك ببێتەوە....

ئەوانیتریش بەدوایاندا هاتنە ناو ڕێرەوەکە بەڵام هێشتا چەند هەنگاو نەڕۆشتبوونە پێش کە رووبەروی رۆحەکان بوونەوە.....

ئەی هاوار.... چ دیمەنێك....

کالوویی ئەوەی بیستبووی و گوومانی دەکرد گاڵتەیە.... گوومانی دەکرد ئەوان توشی خەیاڵ و وەهم بوون و بەهۆی زاڵبوونی گوومان و وەهم مۆتەکە و رۆح لەبەردەم خۆیانا دەبینن.

دەوروبەرەکانی تاڕادەیەك باوەڕیان بەقسەی ئەو کردبو و بەڕاستی باوەڕیان بو

کەڕۆح لەئارادا نیەو ترسی ئەوانیتر بێ بنەمایە....

بارودۆخی یەك یەکیان سەیر بو کالوویی وەستا بەچاوی کراوەو نیگا لێوانلێوەکان لەسەرسوڕمان زەق زەق لەهەیکەلی سپی و ئەو کونانەی چاوی فرانچی و یوری لەپشتەوە دەدرەوشایەوە، ڕوانی.

دەمی کراوەبو.... توانای هیچ کارێکی نەبو.... قسەکردنیشی لەبیرچبوویەوە... لەوەش گرنگتر ئەو کەسەی چراکەی بەدەستەوە بو دەستی کرد بەلەرزین. دەستی ئەوەندە دەلەرزی کە چراکەشی تەکان دەدا و رووناکی لەسەر ئەندامی سپی و ترسێنەری فرانچی و یوری سەمای دەکرد و سێبەرێکی تۆقێنەری دەخولقاند.

ئەوانیتر بارودۆخیان خراپتر لەو دووانە بو. لەهەمان ساتی یەکەمی روبەڕو بوونەوە چواریان کە لەریزی دواوە بوون بەپەلە لەرێرەوەکە رۆشتنەدەرو رایان کرد.....

دەنگی قاچیان لەسەر بەردەکانی حەوشە دەبیسترا کە بەخێراییەکی نەشیاو بێ گوومان رایان دەکرد.

چەند چرکە تێپەڕی. یوری و فرانچی وەك بڵێی راهێنانیان کردبێت، شێوازێکی یەکسانیان بوو نەدەجوولاَن.

بێدەنگیەکی سەیر بەسەر ئەو شوێنەدا زاڵ ببوو ئەگەر زێدە رۆیم نەکردبێت لەو بێدەنگیەدا من دەنگی لێدانی دڵی کالوویی و هاورێکانی بەتایبەت ئەو کەسەی چراکەی هەڵگرتبو، دەمبیست.

منیش لەتاریکیدا ئامادەی تەقەکردن بووم چونکە هەرسات چاوەڕوانی ئەوە دەکرا کالوویی ورەیەك بەخۆی بدات و بۆ دۆزینەوەی راستی بڕواتە پێش.

دڵنیابووم کالوویی چونکە کەمتر دەترسێت پەردە لەسەر ئەم نهێنیە لادەبات و بەپەلە بالاَ پۆشە سپیەکەی سەر فرانچی و یوری لادەبات.

ئەم گوومانە چاوەڕوانی من بو بەلاَم فرانچی بۆ ئەوەی زووتر بەم دیمەنە پێکەنیناویە لەهەمان کات ناڕەحەتکەرو ترسێنەرە کۆتایی بێنێت لەناکاو وەك گورگ لوراندی.

لوراندنی فرانچی ئەوەندە سروشتی وچاوەڕوان نەکراو بو کە ئەگەر مرۆڤ لە دوورەوە دەیبیست بێ شك گوومانی دەکرد گورگ دەلورێنێت.

ئەم لوورە بەهەمان ئەندازە کە سروشتی دەهاتە بەرچاو، چاوەڕوان نەکراویش بو. لەگەڵ ئەوەی فرانچی لوراندی کەسێك کەچراکەی لەدەستدا بو رۆشتە دواوە و قیژاندی

و هەردوو دەستی بەرزکردەوە، لەئەنجامدا چراکە تەنیا هۆکاری رووناکی بو لەدەستی کەوت و وردبو، ئەوتەکەی رژاو کوژایەوە....

کەسی چرا بەدەست رایکردو دووان سیانێك لەهاورێیانی کالوویی لەگەڵ خۆی برد کالوویی خۆشی ترسابو ورەنگە لەرزی، بۆ رێگرتن لەترس و راکردن ئەوانیتر چەند مشت و لەقەیکی بۆ ناردن بەڵام لەکوێ مشت و لەقە دەیتوانی لەراکردنیان رێگری بکات کالوویی کاتێك، هاتە خۆی کەلەبەرانبەر دوو رۆحی سپی پۆش تەنیا مابوویەوەو هەموویان رایانکردبو...

چەند هەنگاوێك رۆشتەدواوە و کەگەشتە کۆتایی رێرەوەکە تفەنگەکەی خستە سەردەست کەتەقەیان لێ بکات.

یوری و فرانچی لەسەر باوەڕ بەمن تەکانیان نەخوارد و ئەو ئارامشە بو کەزیاتر بووە هۆی ترساندنی کالوویی....

من خێرا تەقەم لەکالوویی کردو ئەو ئەحمەقە بەگوومانی ئەوەی لەلایەن رۆحەکانەوە تەقەی لێدەکرێت دوو سێ جار قیژاندی و رایکرد.... هەموو ئەم رووداوانە یانی لەهاتنی ئەوان تا راکردنی کالوویی زیاتر لە چوار تا پێنج خولەکی نەخایاند.

کاتێك لەرێرەوەکە دوور کەوتنەوە و دووبارە بێدەنگی فەرمانڕەوا بو، قاقا و پێکەنینی ترس ئەنگێزی یوری و فرانچی دەنگی دایەوە....

ئەو دوانە پێدەکەنین و دەنگی قاقایان بۆ هەموو شوێنێك دەڕۆشت.... من بەخێرایی نزیك بوومەوە و چونکە نیگەرانی نیکی و ئەمانۆ بووم وتم:

بۆ وەستاون و پێدەکەنن.... دەبێت چی بکەین؟

فرانچی وتی:

هەموو شتێك تەواو.... ئەوان یەك ساتی تر لەم قەڵادا نامێننەوە....

هێشتا قسەکەی تەواو نەببوو کەدەنگی گریانی مناڵێك بیسترا.... ئەم جارەیان گاڵتە نەبو. کەس نەیدەویست هەڵمانخەڵەتێنێت.... منیش تەنیا بووم کە بڵێم وەهم و خەیاڵە.... هەرسێکمان دەنگی گریان و لالأنەوەی مناڵێکمان بیست کە دایە دایەی دەکرد و دوای ئەوە دەنگە دەنگێکی ترس ئەنگێزی بەگوێ گەشت.....

فرانچی قۆڵی گرتم و وتی:

بەخۆشحاڵیەوە کاری ئێمەش تەواو بو ئیتر نابێت لێرەدا بمێنینەوە.... ئەم جارەیان گاڵتە نیە...... بابڕۆین....

هەرسێکمان بەرەو رووناکی ئاگرێك کە کالوویی و هاوڕێکانی هەڵیانکردبو بەڕێکەوتین. بۆ هەر شوێنێك دەڕۆشتین دەنگی ناڵەکەدەبیسترا. لەهەموو شوێنێکی قەلاً دەنگی قەرەباڵغی بەگوێ دەگەشت و ترس وەك کارەبا هەموو گیانمی داگرتبوو.

بەڕێکەوت کاتێك گەشتنیە نزیك شوێنی ئەوان کە ئەوان ئەسپەکانیان ئامادەکردبو و دەیانویست لەقەلاً بڕۆنەدەر. دەرگای رۆژئاوای قەلاً وێرانەکە نیوە کراوەبو. سوارەکان بەپەلەو ترسابوون و کالوویی دەبوا یەك یەك سوارەکان لە سەر جسرێکی کۆن تێپەڕینێت.

لەتاریکی ئەنگوستە چاوی شەو ئەوان ئێمەیان نەدەبینی و رەنگە ئەوەندە سەرنجیان نەدەدا تا ئێمە ببینن بەڵام چاوی ئێمە لەهەموو شوێنێك بەدوای ونبووەکانمان دەگەڕا.....

لەپێش هەموویانەوە سینگوالام بینی کەدەستی نیکی و ئەمانۆی بەستبوو و تەنافێکی گەورەو ئەستووری لەقۆڵی ئەوان بەستبوو و خۆی تەنافەکەی بەدەست گرتبو.

من لەبینینی ئەوان بەڕادەیەك دەست و پێی خۆم ون کردو کەبێ ئیرادە قیژاندم:

نیکی.... ئەمانۆ.....

فرانچی لەشوێنەکەی هەستا تا دەمم بگرێت بەڵام بەداخەوە درەنگ ببوو و کالوویی و سینگوالا و ئەوانیتر دەنگی منیان بیستبوو.

بارودۆخ گۆڕا. دزەکان کە لەکاتی راکردندا بوون لەناکاو وەستان و هەستیان کرد کە هەڵخەڵەتاون هەرچەندە ئەگەر من قسەم نەدەکرد ئەوان سوار دەبوون و دەڕۆشتن و لەتاریکیدا ونمان دەکردن بەڵام هەرچی بو کارەکەم هەڵەبو وئەم کارە نەزانانەی من بووە هۆی گۆڕانی بارودۆخ.

کالوویی هەوساری ئەسپەکەی راکێشاو وەستاو رویکردە هاوڕێکانی و وتی:

بینیتان.... بینیتان من هەڵە ناکەم... ئەوان فێڵیان لێکردین. بەڵام هێشتا کات لەدەست نەچووە. خێرا دەمانچەکەی دەرهێناو خۆی خستە پشت تاشە بەردێك...

ئەوانیتریش سەنگەریان گرت و خۆیان بۆ شەڕ ئامادەکرد.

تەقەکردن دەستی پێکرد چونکە تاقمی ئەوان زۆر بو و فیشەك وسیلاحی پێویستیان پێ بوو، دەستیان بەفیشەکەوە نەدەگرت.

سینگوالا بۆ بردنی و داشاردنی نیکی و ئەمانۆ هەوڵی دەدا بەڵام نیکی رەنگە

کەپێشتر تەنافەکەی دەستی شل کردبو بەبیستنی دەنگی من لەناکاو دەستی رزگارکردو چنگی لەروخساری سینگوالا گرت و پەڕیە ناو چاڵی ژێر جسرەکە.

دڵم داکەوت چونکە چاڵەکە قووڵ بو. پێشتر ئەوێیان پر لەئاو دەکرد کە هێرشبەران نەتوانن لەقەڵا نزیك بکەونەوە و شتێکی سروشتیە کەقووڵایی چاڵ لەبەرزای سوارێك بە ئەسپەکەیەوە دەبێت زیاتر بێت.

لای خۆم وام دانا کەدەست و قاچی نیکی دەشکێت. ئەمانۆش دەستی خۆی کردەوەو چونکە کاتێك نیکی دەستی خۆی کردەوە تەنافەکەی دەستیان شل بو و ئەویش توانی گرێکەی دەستی بکاتەوە.

سینگوالا بۆ گرتنی نیکی هەوڵی دەدا کەئەمانۆ رایکردو هاتە لای من. کالوویی لەشوێنەکەی هەستا تا بیگرێت بەڵام ئەمانۆ بەمشت کێشای بەناوچاویدا. کالوویی تفەنگەکەی بەرزکردەوە لەتاریکیدا چەند جارێك تەقەی لێکرد بەڵام خۆشبەختانە هیچیان بەر ئەمانۆ نەکەوت.

سینگوالا نیکی لەناو چاڵەکەدا بەجێهێشت و بەدوای ئەمانۆدا رایکردو نەیتوانی ئەو بگرێت. یەك خولەك دواتر ئەمانۆ وەك قارەمانێکی چاو نەترس لەژێر بارانی گوولە خۆی بەمن گەیاند.

شەڕو پێکدادانێکی سەیر دەستی پێکرد. ئیمە بەڕەشاش و ئەوان بەتفەنگ. گولە وەك ئەستێرەی کلکدار لەئاسماندا دبینران کە بەم لاو لادا دەڕۆشتن.

کالوویی کەبارودۆخی بەخراپ بینی بەشێوازی هەمیشەیی خۆی دەستووریدا لەپشتەوە هێرشمان بکەنە سەر بەڵام یەکێك لەهاوڕێکانی ئێمە کەلەسەر دیواری قەڵاکە خۆی داشاردبو سیانی لەوان کوشت و وپلانەکەی کالوویی پوچەڵ کردەوە.

کالوویی و هاوڕێکانی لەشوێنێکی خراپ گیریان کردبو، نەرێگەی هەڵاتنیان بو نەدەیانوێرا هێرش بکەن.... بەیانی نزیك دەبوویەوە. ئەو خۆی باشتر دەیزانی لە رووناکی رۆژ ئێمە کە ڕەشاشمان پێیە سەر دەکەوین.

هەی..... ئەگەر تەقەکردن رانەگرن..... ئەم کچە ئامازۆنیە دەکوژم... لولەی تفەنگەکەم ئێستا لەسەر ناوچاویەتی.... بەڵام ئەگەر پاشەکشە بکەن و رێگەمان بدەن بڕۆین ئەم کچە لێرەدا بەجێدێڵین و دەڕۆین.

من دەمزانی نیکی لە خەنەکەکەدا خۆی داشاردوە و بەدەست ئەوانەوە نیە، بەفرانیچیم وت و ئەویش لەوەڵامدا وتی:

شتی وا ئەگەری نیە. چارەیەکتان نیە جگە لەوەی تفەنگەکانتان دانێن و دەست بەرزبکەنەوە ورد بەدیوارەوە بوەستن.

کالوویی وتی:

درۆناکەم...... سەیرکەن ئەمە کچە ئامازۆنیەکەیە.... ئەمەش تفەنگەکەی من کەلەسەر ناوچاوی ئەوە.... گیانی بکرنەوەو ریگای رۆشتنمان پێ بدەن.... پیاوانە بەڵێن دەدەم کە بەجێی بێڵین.

کالوویی راستی دەکردو نیکی جوانی من لەدەستی ئەودا گرفتاربوو. نەمدەزانی دەبێت چی بکەین.... دڵنیابووم کالوویی درۆ دەکات لەکوشتنی نیکی ناتوانێت چاو بپۆشێت.

ئەگەر ریگەمان دەدان بەخێرایی سوار دەبوون و دەڕۆشتن. چارەنوسی نیکیش دیاربو ئەویان دەبردو بەگولەیەك مێشکیان دەپرژاند.

فرانچی وتی:

ئەو درۆ دەکات.... نابێت هەڵخەڵەتێین.

یوری وتی:

دەبێت چی بکەین؟

کالوویی بەدەنگی بەرز وتی:

تا بیست ژمارە کاتتان پێ دەدەم.... کاتمان نیە.... خێراکەن و زوتر بڕیار بگرن... لەئێستاوە دەست پێدەکات...

یەك.... دوو.... سێ.... چوار... لێدانی دڵی منیش بەهەمان رادە توندتر دەبو و پەرێشان دەبووم.

ئەو ژمارانەی کالوویی دەیژمارد وەك پیکێکی پۆلایین بەرمێشکم دەکەوت و لەگوێچکەمدا دەزرنگایەوە. وەك بڵێی ناقووی چەند کلێسەیەکی گەورە لەبن گوێمدا لێدەدەن. زمانم وشك ببو، دڵم بۆ نیکی دەسووتا چونکە دڵنیابوم نیکیم لەدەست دەڕوات و چ ریگای هەلاتنیان پێبدەین و چ هێرش و بەرگری بکەین کالوویی ئەو کچە بێ گووناحە ئامازۆنیە بەگوولەیەك دەکوژێت و مێشکی دەپرژێنێت.

لەهەموو دژواریەکانی ژیان، تەنانەت ئەوساتە قەیرانی مەترسیدارانەی لەگەڵ مردن هەنگاوێکمان لەنێواندا بوو، کەمێك هیوا لەدڵما دەمایەوە و دەلاقەیەك لەتاریکی سوچە تاریکەکانی دڵی رۆشن دەکردم بەلام لەوشەوە ترسناك و مەرگ هێنەرە کەنیکی وەك

چۆلەکە گرفتاری چنگی شاهینێکی وەك کالوویی ببو هیچ هیوایەکم بەرزگاری ئەو نەبو.

هۆی ڕەش بینی زیاد لەرادەی من ئەوەبو کە کالوویم دەناسی و بەئەخلاقی رۆحیاتی باش ئاشنا بووم، دزەکان و ڕێگران لەهەموو شوێنێکی دنیا چ لەرۆژهەلات و چ لەرۆژئاوا چ لەولاتە پێشکەوتووەکان و چ لە وەلاتە دواکەوتووەکان ئاسیای رۆژهەلات و باشوور، ئەخلاق و هەڵس و کەوتی هاوشێوەیان هەیە و لەدڵ رەقی و بێ بەزەییدا یەکسانن لەم شێوەشدا چۆن دەمتوانی بەرزگاربوونی نیکی لەچنگی کالوویی خوێنخۆر هیوادار بم. گریمان لەسەر داوای من فرانچیش رازی دەبو رێگەی بۆ هەلاتنی ئەوان دەکردەوە ئایا گوومان دەکەم کالوویی پابەندی بەڵێن و پەیمانی خۆی بێت و نیکی بەربدات؟

چ گوومانێکی پووچ ! ئەو دەیویست فێڵمان لێ بکات و من لەگەڵ ئەوەی خۆم دەمزانی بۆچوونی فرانچیم پرسی، فرانچی وتی:

ئەو درۆ دەکات.... نابێت بەقسەکانی هەڵخەڵەتێین.

هەموو ئەم بیرو ئەندێشانە لەچەند چرکەیەکی کورتدا بەمێشکی منداهات و کاتێك هاتمە خۆم کە کالوویی ژمارە هەشتی بژاردبو.

پێنج..... شەش...... حەوت..... هەشت.... بێدەنگیەکی قورس باڵی بەسەر هەموو شوێنێکدا کێشابو، هەناسەکان لەسینەدا زیندانی و چاوەکان لەکالوویی دەڕوانی.

هەوا کەمێك رووناك ببوویەوە و من لەرووناکی کەم رەنگی بەیانی، روخساری نیکیم باشتر بینی چاوە جوان و شەهلاییەکانی لەمن بڕابو و من لەگەڵ تاریکی رێژەیی هەوا ودووبارە ماوە، پەڕدەیەکی رونی فرمێسك کە چاوە دڵگیرەکانی داپۆشیبو، بینیم.

ئەگەر بڵێم پەڕدەیەکی ناسکی فرمێسکی حەسرەت وبێ هیواییم لەچاویدا بینی درۆم نەوتووە و ئەگەر بڵێم لەزمانی نیگاکانی ئەو دەگەشتم، زێدەرۆییم نەکردوە.... دەتوت نیکی جوان دەیویست لەو ساتە کورتانە ماڵئاواییم لێ بکات.... بەزمانی نیگا هەندێ شتی دەوت کە لەترسی درێژبوونی بابەتەکە ئاماژەیان پێ نادەم و.... ئەویش دەستی لەگیان شۆردبو و بەڕاستی دەیزانی رزگاری ئەو لەدەستی ئێمەدا نیە و تەنیا موعجیزە دەیتوانی ببێتە هۆی رزگار بوونی... ئایا ئەم موعجیزە هیچ کات رووی نەدەدا؟ کێ دەزانێ داهاتوو نیکی بەچ رووداوێك پڕە. لەگەڵ ئەوەی لەوساتە هەستیارانەدا لەوەی رویدەدا ئاگادار نەبووم و تەنانەت گوومانیشم بۆ نەدەبردو بیرم لێ نەدەکردەوە.

( ٢٢ )

کالوویی دەیبژاردو دانە دانە رۆشتە پێش تا گەشتە هەژدەو نۆزدە.

لەم کاتەدا کەسێك وەستاو سەیرێکی رۆژهەڵاتی ئاسمانی کرد، دەتوت دەیەوێت دەرفەتی زیاترمان پێبدات، نۆزدە و بیستی وت:

تا نۆزدەم بژارد... کاتتان نیە. لەگەڵ ئەوەی دوایین ژمارە لەدەمم بێتەدەر، پەنجەم لەسەر پەلەپتکەکە فشار دەدەم ئەمرۆ بۆ نیوەرۆ و شەو خواردنی مێشکی پرژاوی کچێکی جوانی ئامازۆنی ئامادە دەکەم.

سینگوالا بەبیستنی ئەم قسانە قاقای لێدا. دەتوت دەیەوێت بەو قاقا مانادارەی خۆی بکاتە سەر برینەکانم و ئازارم بدات.

کالوویی پێکەنی و وتی:

هەوا روناك دەبێتەوە، دەرفەتتان نیە، دووبارە دەڵێم. هەژدە  نۆزدە... بەڵام هێشتا دوایین وشەی نۆزدە لەلێوی دەرنەچبو کەلەناکاو قیژاندی، بەدەوری خۆیدا سوڕاو سیلاحەکەی لێکەوت و کەس نەیزانی کالوویی چی بەسەر هات و بۆ قیژاندی و بۆ نیکی نەکوشت.

هۆکاری قیژاندنی کالوویی بۆ ئێمە نادیار بو. سەیر بو نەخۆیشی زانی و نەدەورووبەری هەستیان پێکرد و ئێمە کە روبەڕویان وەستابووین ئاشکرابو کە کالوویی برینێکی قورسی بەرکەوتووە بەڵام کەس نەیدەزانی کێ بریندارى کردوە.

رەنگە ئێوە باش دەزانن و لەماوەی داستانی چەندین ساڵەی ژیانی ئێمە هەستتان بەوە کردبێت کە کچانی ئامازۆن بێ ئەندازە زرنگ و وشیارن. رەچەڵەك و شوێن و ژیان و تایبەتمەندیەکانی ژیانی ئەوان وا پێویست دەکات کە هۆش و زیرەکی لەرادە بەدەریان بێت. نیکی و ئەمانۆ لەوان وشیارترو لئۆنا کە کوژرا نمونەیەکی دیاری ژنە وشیارەکانی ئامازۆن بوون. کاتێك باوەڕتان بەمە هەبێت لە بیستنی روداوەکەی خوارەوە زۆر سەرتان سوڕنامێنێت....

هێشتا من و ئەوانیتر نەماندەزانی چی بووە، هەر ئەوەندە زانیمان کالوویی قیژاندی و بەدەوری خۆیدا سوڕاو تفەنگەکەی لێکەوت و ئاوڕی بۆ لای هاوڕێکانی دایەوە،

لەهەمان کات چەمایەوەو بەشێك لە پێشەوەی جەستەی گرت.

ئەوەی ئێمە لەسەرتادا بینیمان ئەمەبو. هێشتا لەسەرسوڕمان نەهاتبووینە دەر کە دەنگی بیگرن بیگرن بەرزبوویەوە و بەدوایدا چەن گوولەیەك تەقێنرا کە بەڕێکەوت یەکیان لەبن گوێی من تێپەڕی.

نیکی لەگەڵ ئەوەی کالوویی لەم بارودۆخەدا بینی خۆی خستە ناو چاڵە قووڵەکەو روبەڕووی لەپشت بەردو چاڵەکان خۆی داشارد.

دەنگی بیگرن بیگرن بۆ نیکی بو.

تاقمێك لەدەوروبەری کالوویی کۆببوونەوە و تاقمێکیش لەگەڵ سینگوالا بەدوای نیکیدا رایان دەکردو تەقەیان دەکرد.

نیکی بەشێوەیەك ئەوانی ناکاو گیرکردبوو رایکردبو کەتەنانەت ئێمەش کەچاومان تێبریبوون نەماندی بۆ کوێ رۆشت و لەکوێدا خۆی داشارد.

دوایین بەشەکانی شەو پشتیویانی لەنیکی کرد و ئەوەی لەناو سینەی خۆیدا شاردەوە. رەنگە ئەگەر یەك خولەکیتر ئەو رووداوە درەنگ دەکەوت، نیکی دەکوژرا. فرانچی کە ئەم بارودۆخەی بینی، قیژاندی و وتی:

مەهێڵن بەدوای نیکیدا برۆن. هێشتا قسەکەی تەواو نەببو کەڕەگباری گولەکانی ئێمە رویتێکردن و یەکەم کەس کە بوێری زیاتری لەخۆی نیشاندابو کوشتمان.

سینگوالا خۆی خستە پشت دیوارە وێرانەکە. ئەو دووانەی تریش لەبەدواداچوونی نیکی دەستیان هەڵگرت و بەڵام ئێمە دڵنیابووین نیکی لەو دەوروبەرەدا خۆی داشاردوە و تا ئەوان نەڕۆن ناتوانێت خۆی نیشانبدات هەربۆیە لەتەقەکردنی زۆر خۆمان بەدوور گرت کە نەکا لەتاریکی گولەکانمان بەر نیکی بکەوێت.

فرانچی وتی:

چاوەڕێ بکەن یەك دوو خولەکیتر هەوا بەتەواوی رووناك دەبێتەوە....

قسەکەی تەواو نەکرد چونکە دەنگی نیکیمان لەپشت سەری خۆمان بیست کەبەدەم بزەوە وتی:

من هاتم....

ئاوڕم دایەوەو لەشادیدا نیکیم لەئامێزکرد چونکە ئەو لەچنگاڵی مەرگ گەرابوویەوە و گیانێکی تازەی بو، فرانچی بەدەست کێشای بەشانی منداو وتی:

زۆر باشە.... سەیرکە.... کالوویی کوژرا..... کە ئاوڕم دایەوە بینیم کالوویيان

لەسەر زەوی راکێشاوەو خەنجەرێك لەژێر پەڕاسوو سەرسکی چەقیوە، هێشتا دەریان نەهێناوە.

یوری سەیری کردو بەسەرسوڕمانەوە وتی:

ئەوە خەنجەرەکەی منە..... دەبینی.... خۆم دەسکەکەیم بەستووە خەنجەری من و دواتر دەستی لەبەرگی خاڵی خەنجەرەکەی داو وتی:

ئەی هاوار.... خەنجەرەکەم نیە... کێ خەنجەرەکەی منی بردۆتە ئەوێ، کێ کالوویی کوشت...

ئێمە بەسەرسوڕمانەوە سەیری یەکمان دەکرد بەڵام ئەم بابەتە زۆر داپۆشراوانە بو چونکە من لەگەڵ ئەوەی چاوم بەئەمانۆ کە لەسەر سەکۆی وێرانەی ژوورێکی بێ سەقف و دیوار کەوتبوو، کە وتی تێگەشتم کەدەستە گوڵی بەئاوداوەو لەوپەڕی خوێنساردی لەوێ دانیشتووە.

پرسیم:

ئەمانۆ..... تۆ....

ئەو بێ درەنگ وتی:

بەڵێ من خەنجەرەکەی یوریم دەرهێناو بەرەو سینەی ئەو پیاوە هاویشتم و چونکە لەم کارەدا بەتوانام ئەو پیاوەم کوشت و نیکیم رزگارکرد. نیکی خۆی ئاگای لەمن بوو دەیزانی دەمەوێت خەنجەرەکە بهاوم بۆیە لەگەڵ بەرکەوتنی خەنجەرەکە رایکردو هاتە لای تۆ....

پێویست بو وتەکانی بۆ فرانچی و ئەوپیاوەی تر وەربگێڕمەوە. فرانچی کاتێك زانی کالوویی بەدەست ئەمانۆ کوژراوە، بێ ئیرادە بەرەو لای رایکردو دەستی گوشی و پیرۆزبایی لێکرد. بەڵام ئەمانۆ لەوەی فرانچی دەستی دەگوشێت و تەکانی دەدات حاڵی نەدەبو و سەری سوڕمابو کە بۆ وادەکات.

ئەمانۆ بەگیانبازی و چاونەترسیەکی بێ وێنە هاوڕێ و رکەبەری عەشقی خۆی رزگارکردبو لەکاتێکدا دەیتوانی ئارام دانیشێت و کاری نەبێت.

بەم هەموو لەخۆ بوردیی و گیانبازیە کەبەرانبەر بەنیکی ئەنجامیدا بو، لە حەسوودیدا نزیك بوو بخنکێت من لەبەر چاوی ئەودا نیکیم لەئامێز گرتبو، دەیویست بگریت و بقیژێنێت.

بەهەرحاڵ من بەنیکی و ئەمانۆ وەسەرقاڵ بووم کەفرانچی بەڕاکردن لەئێمە

جیابوویەوەو دوای ساتێك قیژاندی و وتی:

تەقە بکەن.... خێرابکەن.... ڕۆشتن. من میلی ڕەشاشم هێنایەوەو گەڕامەوە....

ئەوان کالوویان خستبووە سەر ئەسپ و دەیانویست رابکەن.

تەقەکردن دەستی پێکرد. ئەوان بەجوانی تەقەیان دەکردو لەهەمان کات لەسەر ئەسپ غاریان دەداو بەرەو دەرگا وێرانەکەی قەلاّ دەڕۆشتن. ئێمەش هەنگاو بەهەنگاو بەدوایانەوە بووین.

سینگوالا هەوساری ئەسپی هەڵگرت و کالوویی گرتبوو کە لەناکاو قیژاندی و لەسەر زین بەرزبوویەوەو کەوت.

گولەی فرانچی دڵی کون کردو کۆتایی بەژیانی هێنا. فرانچی کاتێك سینگوالای کوشت لە ژێر لێو بۆڵەیەکی کردو وتی:

حەرامزادە.... تۆ لەگەڵما گەرم و گوڕ بوویت تا نهێنیەکانم بدزیت و بەکالوویی رابگەیەنیت....

بەم شێوەیە ژنی کالوویش کوژرا و دزەکان کە فەرماندەکانی خۆیان بەکوژراو بینی. تفەنگەکانیان بەرزکردەوەو لەپشت دەرگاکەوە تەسلیم بوون. هەوا تەواو ڕووناك بوویەوە و چاوی ئێمە تا مەودایەکی دوور هەموو شوێنێکی دەبینی.

لە هاوڕێکانی کالوویی چواردە کەس مابوون و ئەوانیتر کوژرابوون. ئەوان تفەنگەکانیان فڕێداو فرانچی دوای ئەوەی تفەنگەکانی کۆکردەوە دەستووریدا کەخۆیان دەستی خۆیان ببەستنەوە. ئیتر کارێکمان بۆ ئەنجامدان نەبو..... ئەو کەسەش من دەست و دەمیم بەستبو هێشتا لە ژوورەکەدا کەوتبوو دەیناڵاند و ئاگای لەڕووداوەکان نەبو.

یوری رازی نەبو لەبرسیەتی و تینویەتیدا بمرێت. ڕۆشت و هێنایە لای ئەوانیتر. کاتێك هەتاو نوکی بەرزترین دیوارەکانی قەلاّ وێران و شوومەکەی ڕووناك کردەوە هەموان لەوێ دەرچووین و ڕێگای بیناکانی فرانچیمان گرتەبەر.

ئەوەی پارەو زێڕ دزیبوویان، فرانچی وەریگرتەوە. لەڕێگادا یەکێك لە دزەکان خۆی گەیاندە لای فرانچی و لەهەمان کات کەدەستی لەپشتەوە بەسترابو هەوڵیدا دەستی ماچ بکات.

فرانچی پیاوێکی میهرەبان بو. هێشتا گێژو سەرسوڕماو کەپیاوێکی وا بەو هەموو لێبووردییەی بو دەبێت دزبێت...

گوومانی تێدانیە کە شوێنی ناسازگارو ئەو فشارە بێزارکەرانەی زۆری بۆ هێناوە، فرانچی ناچار بەمل ئەستووری کردو، بەڵام فشارە کۆمەڵایەتیەکان هەرچەندە توندو کوشندە بێت پیاوێکی عاقڵ و خوێنەواری و تێگەشتووی وەك فرانچ مافی ئەوەی نیە دژی یاسا کۆمەڵایەتیەکان یاخی ببێت و شەرافەتی خۆی بەدزی و بریندار بڕۆشێنێت.

بەدڵنیاییەوە لەخۆتان دەپرسن فرانچی لەگەڵ هاوڕێ خیانەتکارو پەیمان شکێنەرەکانی خۆی چیکرد؟ ئەوانی بەخشی و لەگووناحەکانیان خۆش بو.

دزەکانیش سوێندیان خوارد کە کالوویی هەڵیخەڵەتاندون. سوێنیشیان بۆ فرانچی خوارد لەمەودوا پێی وەفادارین. هەموو ئەم کارانە لەناو دۆڵەکەدا ئەنجامیان گرت و فرانچی لەگەڵ دژایەتی کردنی من و یوری ئەوانی بەخشی و خۆی دەستی کردنەوەو یەك یەك تفەنگەکانی پێدانەوە و وتی:

هەموو دزەگەورەکانی دنیا بەدەست هاوڕێکانی خۆیان کوژراون. لەهەر سەد دزێکی گەورەو ناوداری مێژوو یەکێك بەدەستی پیاوانی دەوڵەت گرفتار بوەو سزادراوە. منیش دڵنیام بەدەستی ئێوە دەکوژرێم بەڵام بۆ ئەوەی داهاتووان بەناجوامێری تاوانبارم نەکەن دەتانبەخشم و تفەنگەکانتان دەدەمەوە دەست. تەنیا چاوەڕێم لەبەرانبەر ئەم هەموو جوامێریەی من ئێوەش پیاوبن و لەسەر بەڵێنەکەی خۆتان وەفادار بن..... ئەمەش بزانن ئێوە دوای من کەم دەژین. ئەگەر من بکوژرێم ئێوە وەك مشك دەکەونە تەڵەوە. کەواتە لەبەر درێژی تەمەنی خۆتان گیانی من بپارێزن دزەکان ئەوەندە بەقسەکانی فرانچی کاریگەریان لەسەر دانرا کە لەکۆتاییدا چەپڵەیان لێداو هورایان کێشا.... ئێمە لەگەڵ ئەوەی زۆر برسی و هیلاك بووین رێگەی گەڕانەوەمان بەهێواشی بڕی و نزیك نیوەڕۆ گەشتینەوەماڵەکان.

هەرکەس رۆشتە سەر کاری خۆی. پاسەوانەکان وەك جاران دەستیان بەئێشك گرتن کرد و ئوردو قەرەباڵغی جارانی بەدەست هێنایەوە.....

خواردن زۆر زوو ئامادەکردا. مەڕێکیان برژاندو بەشەرابەوە خواردمان. کاتێك خواردن تەواو بو، یوری روی کردە فرانچی و وتی:

زۆرباشە.... لەمیوانداری و رێزگرتنی ئێوە زیاد لەرادە سوپاسگوزارین.... ئێستا ئەگەر رێگەمان بدەن دەمانەوێت درێژە بەرێگای خۆمان بدەین و بگەڕێینەوە بۆ وڵاتی خۆمان.... شەش ساڵە لە ئەمریکا و رووداوەکانی بێ ئاگاین.

فرانچی بەهیچ جۆرێك نەیدەویست بەڕۆشتنی ئێمە رازی بێت... سوربو لەسەر

ئەوەی هەفتەیەکی تر بمێنینەوە تا بۆ قەرەبووکردنەوەی ناخۆشیەکان بڕۆینەراو و کاتێکی خۆش بگوزەرێنین. بەلاّم پێداگرتنی من ویوری بەتایبەت نیگاکانی نیکی و ئەمانۆ کەلەو شوێنە بێزار ببوون بوەهۆی ئەوەی فرانچی رازی بێت.

فرانچی وتی:

ئارەزووی خۆتانە.... ئێستا کە دەتانەوێت بڕۆن رێگەم بدەن بەئەسپ بتانێرم و دووکەس وەك رێنیشاندەر لەگەڵتانا بنێرم تا ئێوە بگەیەننە شاری سان سالوادۆر.

هەڵبەت ئەوان تا نزیکی شار لەگەڵتانا دێن. دواتر ماوەی نێوان سان سالوادۆر تا رۆدیۆجانیرۆ دەتوانن بەشەمەندەفەر بڕن.

ئێمە بەم پێشنیارە رازی بووین. فرانچی دەست بەجێ دووان لەدزەکانی بانگ کردو وتی:

بۆ سەفەری چوارکەس ئەسپ و خواردن و پێداویستیەکانی رێگا ئامادە بکەن.

لۆجیانۆو ساموئیل بۆ رێ نیشاندان دەڕۆن.

لەم ماوەی کەئەوان دەیانویست ئەسپ و خواردن ئامادە بکەن، فرانچی ئێمەی بۆ ژوورە تایبەتەکەی خۆی بردو بۆ هەرکاممان دەستێك جل و بەرگی خاوێن و ئابرومەندانەی دانا.

لەوەرگرتنی ئەم شتانە دوو دڵ بوین بەلاّم جوان نەبو خۆشەویستی فرانچی کە لەو پەڕی پاکیدا دەری دەبڕی، رەد بکەینەوە. من و یوری بەجل و بەرگی کابۆ ئەمریکاییەکان پۆشی، نیکی و ئەمانۆش باشترین جلی ژنانەیان لەبەرکرد.

سەرتان سوڕدەمێنێت کەفرانچی ئەم هەموو جل و بەرگەی لەکوێوە هێناوە.

جێگەی سەرسوڕمان نیە ئەو دزبو، هەرماشینێکی دەدزی جانتای گەشتیارانیشی هەلەگرت. ئەسپ و خواردن زۆر ئامادەبوون وئێمە دوای ماڵئاوایی لەفرانچی و دزەکانیتر سوار بووین و بەڕێنوێنی لۆجیانۆ و ساموئیل بەڕێکەوتین.

( ٢٣ )

بەڵام سەفەرەکەی ئێمە بەم ئاسانیە بەردەوام نەبو. ئەمانۆ و نیکی لەسواربوونی ئەسپ دەترسان و هەرچەندە هەنگاو جارێك دادەبەزین و پێیان باش بو بەپیادە برۆن.

ماوەیەك کە دەڕۆشتن هیلاك دەبوون و دووبارە سواری ئەسپ دەبوونەوە بەڵام هەر ئەوەندەی ئەسپەکان لەسەر چاڵێك دەپەڕینەوە دەیانقیژاندو دووبارە دادەبەزینەوە.

شەو گەشتنیە ئاواییەك و لەشوێنێکی گونجاودا وەستاین. بەیانی پێش ئەوەی دانیشتوان بەئاگا بێنەوە بەڕێکەوتینکە نەکا لۆجیانۆو ساموئیل بناسنەوە.

ئاوابوونی هەتاوی دووەم ڕۆژ گەشتینە دێهاتێکی گەورە. لوجیانۆ لەدوورەوە دێکەی نیشانداو وتی:

ئەم دێیە ئەوەندە گەورەیە دەتوانن وەك شار سەیری بکەن بەڵام بەداخەوە بەهۆی بوونی بازکا من و ساموئیل دەبێت لێتا جیاببینەوە.

یوری پرسی:

لێرەوە تا سان سالوادۆر چەند ڕێگایە؟

لوجیانۆ لەکاتێکدا دەستی بردە گیرفانی وتی:

ئەم شەو لێرەدا دەمێننەوە و بەیانی کە بەڕێکەوت نزیك نیوەڕۆ دەگەنە سان سالوادۆر. سی و پێنج کیلۆمەتر زیاتر ڕێگا نیە.

من و یوری دەستمان بۆ ماڵئاوایی کردن بەرەو لایان درێژکرد بەڵام لوجیانۆ لەجیاتی دەستی خۆی بەستەیەك ئەسکەناسی بەرازیلی خستە دەستم و وتی:

ئێوە هەرگیز بیرتان لەوە نەکردۆتەوە کە بۆگەشتن بە ریۆدیۆجانیرۆ لەوێوە بۆ ڕۆشتن بەئەمریکا پێویستان بەپارەیە. وانیە؟ ڕەنگە ئێوە زۆر شتتان پێ بێت بەڵام پارەنیە و بەدژواری دەبێتە پارە. بۆیە فرانچی ئەم پارەی لای من دانا کەلێرەدا پێشکەش بەئێوەی بکەم.

ئەو ڕاستی دەکرد ئێمە تازە زانیمان بێ پارەبووین. لەبەرازیل خۆڵی زێر و جەواهیرەکان بۆ ئێمە نەدەبوە پارە. پارەکەمان وەرگرت و جیابووینەوە. لەوێوە ڕوداوی تازەمان بۆ پێش هات چونکە هەرچی زیاتر شوێنەواری شارستانیەت دەردەکەوت،

گرفتاریەکانمان لەگەڵ نیکی و ئەمانۆ زیادی دەکرد.

ئێمە راستەوخۆ رۆشتینە میوانخانەیەکی خاوێن و بچووك. ئەسپەکانمان دا بەئاخور و رۆشتنە ناو ساڵۆنەکە. هێشتا هەوا رووناك بو کەدەستوری خواردنمان دا.

تازە دەوریەکانیان لەسەر مێزەکە چنیبو کە خاوەن میوانخانەکە هاتە ژوور و بوونی چەند میوانێکی تازەی بینی شادمان بوو دەستی بەمیوانداری کردو لەیەك سات پلاکی گلۆپەکانی داگیرساندو میوانخانە وەك رۆژ رووناك بوویەوە .

لەناکاو دەنگی قیژەی ئەمانۆ و هاواری جەرگ بڕی نیکی بەرزبوویەوە. من بەڕادەیەك هەستام کە لەشوێنەکەم بەرزبوومەوە و دەستم بۆ دەمانچەکەم برد کە ئەگەر مەترسیەك لەسەر نیکی و ئەمانۆیە نەیهێڵم.

نیکی بەڕاکردن بەرەولای دەرگاکە رۆشت و خۆی لەپشت ئینجانەیەك داشارد و لەوێ وەك پشیلەکەك کە لەترسی سەگ خۆی مەڵاس دابێت، وەستا.

ئەمانۆش بەخێرا خۆی خستە پشت کورسیەکەی یوری و سەری خستە ژێر مێزەکە و لەکاتێکدا دەلەرزی و زمانی کەوتەگیران و بەردەوام قاچی یوری تەکان دەداو دەیوت:

سەیرکە.... بزانە چی بوو..... کێ ئەم کارەی کرد...... ئەم جادوگەرە بکەنە دەر.... من لێی دەترسم.... ئەو جادووم دەکات...

ئێستا کاتی ئەوەیە کەبڵێم شتێك کەبووە هۆی تووڕەبوونی من چی بو.... رەنگە گوومان بکەن چونکە یوری خێراتر لەمن هەستی بەشتەکان دەکرد.

لەناو ئەو هەموو نارەحەتیەدا پێکەنین و قاقای بەردەوامی یوری ئەوەندەی تر تووڕەی کردبووم کە ئەگەر لەبەر هاوڕێیەتی نەبو بەمشت روخساریم خوێناوی دەکرد چەناگەیم بە ئێسقانی تفەنگ دەشکاند کە ئیتر پێنەکەنێت....

خاوەن میوانخانەکە پیاوێکی سك زل و ورگن بو کەسەری تاس و و لووتێکی گەورەی بو.

روخساری لەئاوڵە کون کون ببو و لەسەریەك قیافەی پێکەنیناوی بو بەدڵنیاییەوە لەبینینی کردەوەی نیکی و ئەمانۆ سەری سوڕمابو و قیافەیەکی سەیری بەخۆی گرتبو بەڵام چونکە لەهیچ تێنەگەشت هاتە پێش و وتی:

قوربان..... ئەم خاتوونانە چییان بەسەردێت..... چییان بینیوە؟ لەچی دەترسن. باوەڕ بفەرموون ئێرە مشکی نیە.

ئەمانۆ سەری لەژێر مێزەکە دەرهێنا کەچاوی بەوپیاوە ورگ زلەکەوت خۆی بەقاچی

یوریەوە لکاندو بەپاڕانەوە وتی:

لێرە دوور بکەرەوە..... ئەم جادوگەرە لێرە دووربکەرەوە.... دەترسم.... خەریکە جادووم دەکات... لەچاوەکانی دیارە دەیەوێت شتێك بەسەرمندا بێنێت.

سەرسوڕماو پرسیم:

چی بووە.... چی رویداوە...... جادوگەر کێیە؟

بەڵام کەس وەڵامی نەدامەوە. من کە لەپێکەنینی دوورودرێژی یوری تووڕە ببووم قیژاندم و وتم:

بۆ پێدەکەنیت....؟ ئەم پێکەنینەی تۆ من زیاتر تووڕە دەکات... بۆ کردوتە بەگاڵتە. ئەگەر فلیمی چارلی چاپلنیشت بدیایە ئەوەندە پێنەدەکەنیتیت.....؟ ئاخر چی بووە.....

یوری ئەشکی چاو و ئاوی دەمی بەپشتە دەست پاك کردەوە و بەدژواری کۆتایی بە قاقاکانی خۆی هێناو لەوەڵامدا وتی:

زۆر سەرنج راکێشە.... ئەگەر تۆش بزانیت پێدەکەنیت....

دواتر توند دەستی منی گرت و وتی:

نەت زانی نیکی و ئەمانۆ بۆ ترسان؟

بەسەرسوڕمانەوە وتم:

نا.... سەرقاڵی سەیرکردنی شتی تربووم....

یوری وتی:

ئەوان لەگڵۆپەکان ترسان.... سەیرکە... نیکی لەکوێدا خۆی داشاردوە.... ئەمانۆش ئەم پیاوە بەجادوگەر دەزانێت و سوڕە کە لێرە دەریکەین کە نەکا زیانی پێ بگەیەنێت....

لێرەدا بوو منیش بێ ئیرادە پێکەنیم و بەڵام پێکەنینی من سەرسوڕمانی ئەو پیاوەی زیاتر کرد چونکە بۆ ئەویش سەرسوڕهێنەر بو دوو ژنی بەرواڵەت شارستانی لە گڵۆپی کارەبا بترسن و ئەو بەجادوگەر بزانن.

وەك پێشتر وتم نیکی و ئەمانۆ لەجل وبەرگەکانی سینگوالاو دەزگیرانەکانی تری فرانچیان لەبەرکردبو بەرواڵەت وەك دوو ژنی ئەوروپایی یان ئەمریکایی دەهاتنە بەرچاو.

کاتێك پێکەنین تەواو بو ئاوڕم دایەوە و نیکیم بانگرد. ئەمانۆیشم لەژێر مێزەکەوە هێنایە دەر و بەترس و لەرزی زۆر کەهەیبو لەسەر کورسیەکە لای خۆم دامنیشاند.

بەڕێوبەری میوانخانەکە وتی:

ببورن بەڕێزان... پرسیارێکم هەیە....

یوری قسەکەی بڕی و وتی:

پرسیارەکەی ئێوە دەزانم.... دەتانەوێت بڵێن ئەم دووکچە بۆ لەگڵۆپ دەترسن زۆر سادەیە چونکە ئەوان بەدرێژایی تەمەنیان لەجەنگەڵدا ژیاون و تاچەند رۆژ چرا ئاسایشیان نەبینیبو بۆیە لە رۆشن بوونی لەناکاوی هەموو گڵۆپەکانی ناو ساڵۆنەکە ترسان و و بەیەکێك لەجادوەکانی ئێوەیان زانی.

بەڕێوبەری قەڵەوی میوانخانەکە سەری خۆی بەنیشانەی تێگەشتنی بابەتەکە چەند جارێك لەقاند و وتی:

ئاها..... تێگەشتم..... بەڵام نەتانوت.....

یوری دووبارە قسەکەی بڕی و وتی:

دەتانەوێت بزانن ئەم دوو کچە بۆ لەناو جەنگەڵەدا دەژیان....؟ ئایا ئێوە لەهۆزی ژنانی ئامازۆن هیچتان بیستووە یان هیچ دەزانن.....؟

چاوی بەڕێوبەری میوانخانەکە کرایەوە و وتی:

بەڕێز.... بەڕێز.... باوەڕناکەم.....

ئاخر هۆزی ژنانی ئامازۆن ئەفسانەو درۆیە. من بەدرێژایی تەمەنم نەمبیستووە کەسێك بڕواتە ئەوێ وئەگەر رۆشتبێت زیندوو نەگەڕاوەتەوە.... ئەم چیرۆکانە ئەفسانە خوێنەکان نوسیویانە.....

یوری وتی:

بەڵێ ئێمە رۆشتین بۆ ئەوێ و زیندوو گەڕاینەوە بۆ ئەوەی هەموو خەڵك باوەڕ بەقسەکانمان بکەن ئەم دوو کچە جوانەمان لەگەڵ خۆماندا هێناوە کە ئیتر جیگەی گوومان نەمێنێتەوە.

بەڕێوبەری لە رووی ئارەزوومەندیەوە سەرەتا سەیری نیکی و دواتر سەیری ئەمانۆی کردو وتی:

راست دەڵێن..... پیرۆزباییتان لێ دەکەم.... ئێوە لەشتێکی نامۆو نەزانراو پەردەتا هەڵگرت و راستیەکی گەورەتان رۆشن کردەوە.....

ئەمەی وت و وەك کەسێك کەشتێکی مەترسیداری بینیبێت رۆشتە دواوەو دوای چەند هەنگاو گەڕایەوەو بەخێرایی دوورکەتەوە.....

دوای ڕۆشتنی ئەو وتوێژی ئێمەو نیکی و ئەمانۆ دەستی پێکرد ئەگەر بڵێم ئەو قسە زێدەڕۆییم نەکردوە چونکە ئەوان بەهیچ جۆرێك نەیاندەتوانی باوەڕبکەن کەپیاوە قەڵەوەکە جادوگەر نیەو ئێمەش دەمانویست تێیان بگەیەنین کە کارەبا گڵۆپی کارەبا کامەیە.

یوری دەستی نیکی گرت و و ئەمانۆشی لەگەڵ خۆیدا برد تا گەشتنە ئەولای سالۆنەکە. ئەوکات پلاکەکەی نیشانداو وتی:

سەیرکە..... دەستی لیٚ بدەن و بۆخوارەوە فشار بدەن ! گڵۆپی ئەولا دەکوژێتەوە.....

نیکیش ئەم کارەی کرد و دواتر ئەمانۆ پلاکی گڵۆپێکی تری لێدا. سەرەتا لەم کارە دەترسان و لەسەر خۆ دەستیان لە پلاکەکە دەدا بەڵام دواتر کەترسیان نەما ئەوەندە تامەزرۆی ببوون نەیاندەویست لە پلاکەکان دوور بکەونەوە. بەردەوام گڵۆپەکانیان دەکوژانەوەو دایان دەگیرساند و هەڵبەزو دابەزیان دەکرد کاتێك خواردنیان هێنا، یوری بەدڕواری ئەوانی لەسەر مێزەکە دانیشاند. نیکی سەیرێکی خواردنی کردو وتی:

سەیرە دانیشتوانی ئەم ماڵە دەیانزانی ئێمە دێین.

پرسیم:

بۆ ئەم قسەدەکەیت؟

نیکی وتی:

نابینیت چەند خواردنیان ئامادە کردوە.

دووبارە پێکەنیین و یوری وتی:

ئێرە ماڵ نیە.... میوانخانەیە.... شوێنێکە گەشتیاران لێرە دەمێننەوە و بەدانی پارە دەحەسێنەوە و نان دەخۆن و دواتر دەڕۆن بەدوای کاری خۆیاندا.

ئێستا ئەوان مانای پارەیان نەدەزانی من ناچار پارەکەم دەرهێناو نیشانم دان....

یوری سەرقاڵی ڕوونکردنەوە لەبارەی پارەوە بو کەئەمانۆ چاوی بە پەرداخی ئاو خواردنەوە کەوت. بەسەرسوڕمانەوە هەڵیگرت و سەیر ژێر و ڕوی کردو وتی:

ئەمە چیە..... بۆ ئەوەندە ڕوونە؟ ئەمە چ جۆرە ئاسنێکە....

یوری ناچار تا کۆتایی خواردن لەبارەی شووشەو چۆنیەتی دروست کردنی قسەی کرد بەڵام هەرچەندە زیاتر ڕونیدەکردەوە سەرسوڕمانی ئەوان زیاتر دەبو.

لەم کاتەدا و وردە وردە میوانخانەکە قەرەباڵغ دەبو و شەڕاب خۆرەکان کە بەپێی

عادەتی خۆیان شەوانە لەو شوێنانە کۆدەبنەوە، کۆبوونەوە.

هەموو ئەوانەی دەهاتنە ژوور، ئاژەڵدارو جوتیار بوون جل وبەرگیان نیشانی دەدا چ کارەن. دەستەی موزیك لەسەر سەکۆی تایبەت جێگیر بو لەناکاو لێدانی مۆسیقایان دەست پێکرد.

نیکی و ئەمانۆ بەبیستنی دەنگی موسیقا بەرزبوونەوە کەبڕۆنە لایان گوومانیان دەکرد ئەوێش جەنگەڵە و دەتوانن لەدەوری تەپڵ لێدەرەکان کۆببنەوە و پێکەوە دەست بەگۆرانی و سەما بکەن هەڵبەت رۆشتنی ئەوان بۆ سەر سەکۆکە کێشە نەبو بەڵام کارێکی باش نەبوو سەرنجی خەڵکی رادەکێشاو ئەگەر بۆ پیاوە سەرخۆشەکان کارێك بکەن کە بگاتە شەڕو خوێنرێژی، بۆیە من ویوری بەدژواری نیکی و ئەمانۆمان گەڕانەوە...

ئەوان دانشتن بەڵام لەشادمانیدا لەپێستەکەی خۆیان جیگەیان نەدەبوویەوە و بەدەنگی مۆسیقا هەلەستان و جەستەی خۆیان دەلەراندەوەو دووبارە دادەنیشتنەوە.

یوری وتی:

سەیرکە تاقمێك هەستیان بەجووڵەکانی نیکی و ئەمانۆ کردوە، باشترە زووتر بڕۆینە ژوورەکەی خۆمان.

منیش رازی بووم ویوری کلیلی ژوورەکەی وەرگرت و بەیارمەتی یەکێك لەخزمەتکاران کە ئەویش زۆر بەوردی سەیری نیکی و ئەمانۆی دەکرد لە قادرمەکان رۆشتینە سەر.

نیکی و ئەمانۆ نەیاندەویست لەسەر قەرەوێڵەکە بخەون ناچار لەسەر زەوی جێگەیان راخست و لای یەك خەوتن. ئەو شەوە بەهۆی هیلاکی خۆش خەوم لێکەوت و بەیانی بەدەنگی قەرەباڵغی لەخەو هەستام.

یوری هەرکاتێك شەو دەخەوت عادەتی بوو بەیانی زوو هەستێت. هەوا تاریك و روون بو کەئەو هەستابو جل و بەرگی لەبەرکردبو. دوای یوری نیکی و ئەمانۆ هەستابوون و من وەك هەمیشە کە خەوم قورس بو بەهۆی ئەو دەنگە دەنگ وقەرەباڵغیەی دروست ببو لەخەو هەستام.

گوومانم دەکرد بەتێپەڕبوونی ئەوشەوە روداوە مەترسیدارەکانی شەش ساڵی رابردوو تەواو دەبێت بێ ئاگا لەوەی دەستی چارەنووس هێشتا کتێبی ژیانی ئێمەی لەرووداوەکان پاك نەکردۆتەوە.

لەهەمان حاڵی خەوو بەئاگایی دەنگی یوریم دەبیست کە بەدەم هاوارەوە دەیوت:

ئاه...... ئەم کچە شێتە....... بۆ ڕۆشتە ئەویٚ... بەئێمە.....؟ بۆ ئاخری کارمان دەداتە دەست.

بەدژواری چاوی خۆم کردەوەو کەیوری شانێکی توندی لێدام و کەوتم وبەخێرایی لە دەرگای ژوورەکە ڕۆشتەدەر.

بەدوای ئەویشدا ئەمانۆ رایکرد بەڵام کاتێك گەشتە بەردەم دەرگاکە و منی لەو حاڵەدا بینی ژێر قۆڵی گرتم وتی:

دەستخۆش بۆ ئەم خەوە..... هەستە دووبارە خەوتوویت.... سەیرکە نیکی چی کردوە....

لەدەرەوەی ژوورەکە دەنگی سەیر بەگویٚ دەگەشت و دەمبیست کە دەڵێن:

سزای بدەن.

یەکیتر دەیوت:

ئەو دەزگیرانی قاتڵە..

سێیەمی بۆچوونی وابو.

ئەو لەجیاتی گریمۆند لەداربدەن تاکەسانیتر نەوێرن ئەم کارەبکەن.

من هەمووی ئەم قسانەم دەبیست بەڵام لەهیچ شتێك حاڵی نەدەبوو و پەیوەندیدار بەخۆمانم نەدەبینی. چونکە تەنیا شتێك بەمێشکما نەدەهات ئەوەبو خەڵکی ئەو ناوچە کاریان بەئێمە بێت.

لەئەمانۆم پرسی:

چی بووە؟ بۆ یوری رایکرد؟

ئەمانۆ وتی:

نیکی دەستە گوڵی بەئاوداوە ! ئەمرۆ بەیانی دەیانویست قاتڵێك بەداری روبەڕوی ئەم ژوورە لە داربدەن. نیکی خەنجەرەکەی یوری بۆدارەکە هاویشت و تەنافەکەی پچڕاند و بووە هۆی وەستاندنی لەداردان. ئێستا خەڵك ئەویان گرتووە بەگوومانی ئەوەی دەزگیران و شەریکی قاتڵە دەیانەوێت لەداری بدەن.

ئیتر شوێنی درەنگ کردن نەبو. بەخێراییەك کە لەمن دووربو جل و بەرگم لەبەرکردو پێش هەرشتێك لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەم کرد.

قەرەباڵغی خەڵك ئەوەندە زۆربو کەڕێگەی هاتوچۆ بەسترابو ولەهەر دوولا بڕێکی زۆر

عەرەبانە و پاسکیل و چوار چەرخی ئەسپی ڕاگیرابوون.

خەڵك کۆببوونەوە و دەوری چەند کەسێکیان گرتبو. من ملم کێشاو بەدژواری نیکی ویوریم لەناو خەڵکدا بینی.

بەئەمانۆم وت:

لەگەڵ مندا وەرە...

هەردووك لەژوورەکە ڕۆشتینە دەر، دەرگامان داخست و کلیلەکەم کردە گیرفانم. کاتێك گەشتینە ناو شەقام پۆلیس نیکیان گرتبوو یوریش بۆ بەرگری کردن لەو ڕۆشتبو.

ڕێگەی دایرەی پۆلیسم نەدەزانی بەڵام لەسەر ڕێگا ئەوەندە خەڵك وەستابوون بێ ئەوەی پرسیار لەکەس بکەم ڕۆشتم. ئەمانۆ بەدوامەوە بو تازە لەبەرانبەر ژووری بەرێوبەری پۆلیسەکان کاتێك سەیرم کرد هەستم بەوەکرد وەکو هەمیشە بەپێ خاوسی هاتووە.

لەبینینی قاچی رووتی ئەمانۆ تووڕەبووم بەتووندی وتم:

ئەمە چ کارێکە..... بۆ....

ئەو نەیهێشت قسەکەم تەواو بێت وتی:

چیم کردوە... بۆ من هەرکارێك دەکەم تۆ ئیراد دەگریت....

بەپەنجە قاچیم نیشانداو وتم:

بۆ بەپێ خاوسی هاتوویت.... ئێرە جەنگەڵ نیە، خەڵك گاڵتەمان پێدەکەن و پێمان پێدەکەنن.

ئەمانۆ وەك بڵێی هیچ کارێکی ناشرینی نەکردوە شانەکانی بەرزکردەوەو وتی:

ئەی دەبێت بەبینینی ئێمە بگرین.....؟

هەستم بەوەکرد ئەمانۆ هەست بەم کارە ناشرینەی خۆی ناکات و سەری خستنە سەری جگە لەبەفیڕۆدانی کات ئەنجامێکی تری نیە. لەم کاتەشدا یوری دەرگای کردەوەو ڕۆشتە ژوور، منیش بەدوایدا ڕۆشتم. بەڕوانینێك هەموو شتێکم بینی و هەڵمسەنگاند بەرێوبەری پۆلیس پیاوێکی کەتەو چوار شانەبو. دوو پۆلیس لەم لاولای مێزەکەوە وەستابوون و یەکێکیان پەڕوەندێکی ئەستووری لە بن دەستابو کەمێك ئەم لاتر نزیك سووچی باشووری ژوورەکە ریمۆند دزی قاتڵ کەلە قوڕگی مەرگ هاتبووەدەر و ڕزگاری ببو بەوشیاری وزیرەکی سەیری دەوروبەری دەکرد دەتوت چاوەڕوانی

دەرفەتێکە تا بەدەستی کەلەپچەکراو لەدەست بەڕێوبەرانی حوکم رابکات.

هەنگاوێك دوورتر لەقاتڵ کورسیەك بو کەنیکی لەسەر دەبینرا. ئەو قیافەیەکی غەمگین و خەمباری بو. وادەهاتە بەرچاو لەم گاڵتە نابەجێیەی خۆی پەشیمانە.

لەگەڵ ئەوەی رۆشتینە ژوور نیکی لەشادمانیدا قیژاندی. لەجێگاکەی هەستاو خۆی بۆ لای ئێمە کێشا. یەکێك لەپۆلیسەکان رایکردە پێش و هەیکەلی گەورەی خۆی خستە نێوان ئێمەو ئەو بوە رێگر لەوەی بتوانین یەکیتر ببینین.

بەڵام نیکی وەحشیانە چرنوقی لەدەم و چاوی گرت و قیژەی گەیاندە ئاسمان و روخساری بریندار کرد کاتێك ئاوڕی دایەوە تازە زانی ئەگەر پەنجەی ئەو بەنینۆکە درێژەکانی کەمێك سەروتری گرتبو یەکێك لەچاوەکانی پۆلیسی داماو دەردەهات و بۆیەك تەمەن بینایی لەدەست دەدا. خوا بەزەیی بەو بە ئێمەشدا هاتەوە چونکە جیاوازی لەم شێوە گرفتارێکی گەورەمان بۆ دروست دەبو.

کاتێك پۆلیسە بریندارەکە قیژاندی ئەمانۆ و نیکی بەرەو روی یەك رۆشتن و باوەشیان بەیەکدا کردو چەند جارێك یەکتریان ماچ کرد.

ئەو کات نیکی ئەمانۆی بەردا و بەرەولای من رایکردو دەستەکانی لەملم ئاڵاند و لەم کاتەدا چونکە قاچی لەزەوی دابڕابو، قاچی تەکان داو لەسەر یەك حەرەکی وەحشیانەی دەکرد.

ئەفسەرەکە لەشوێنەکەی هەستاو سەیرێکی پۆلیسە بریندارەو خوێناویەکەی ژێر دەستی خۆی کرد و دواتر بەورگە زلەکەی چەند هەنگاوێك بەرەو لای ئێمە هاتە پێش و وتی:

ئێوە کێن و چ پەیوەندیەکتان لەگەڵ دەزگیرانی ریمۆند دا هەیە....؟

یوری لەم شوێنانەدا دەرفەتی قسەکردنی بەمن نەدەدا چونکە دەترسا نەکا لەپاکی خۆم قسەیەك بکەم کەببێتە دەردەسەر، بۆیە لەوەڵامدا وتی:

ریمۆند کێیە؟ مەعشوق و دەزگیرانی ئەو ناوی چیە....؟ باسی کێ دەکەن؟ ئێمە بۆرزگارکردنی هاوسەری هاورێکەم هاتووین.

ئەفسەری پۆلیس وەك بڵێی روبەڕوی دەستەیەك دزی کارامە بوبێتەوە، دەستەکانی خستە ناو گیرفانی سکە زل و پێکەنیناویەکی خۆی هێنایە پێش، بایکردە هۆی خۆی و قاقای لێدەدا و وتی:

سەیرە.... چەند بەلێهاتووی حاشای لێدەکەن... دیارە ئێوەش لەم پیلانەدا دەستان

هەیە و ئەگەر وابێت ناچارم تا روون بوونەوەی راستیەکان ئێوە سیانەش بازداشت بکەم یوری بێ ئەوەی خوێنساردی خۆی لەدەست بدات بزەیەکی گرت و وتی:

ئێمە لەیاساکانی وڵاتی ئێوە ئاگادار نین بەڵام ئێمە ئەمریکاییەکان وەك چۆن رێز لەیاساکانی خۆمان دەگرین لەمناڵیەوە عادەتمان گرتوە رێز لەیاسا و رێساکان و تەنانەت داب و نەریتی گەلانی تریش بگرین. لەم شێوەشدا ئێمە لایەنگری یاساکانی ئێوەین بەڵام هێشتا نازانم ئایا دەتوانن دوو گەشتیاری ئەمریکایی بازداشت بکەن. ئەمەش گرنگ نیە رەنگە لەشوێنی خۆتان توانایی ئەم کارەتان هەبێت بەڵام کاتێك دەرکەوت ئەوان بێ گووناحن ئایا دەتوانن وەڵامی پۆلیسی رۆدیۆجانیرۆ بدەنەوە. ئەم لێپرسراویەتیە دەگرنە ئەستۆ!

من لەکاتێکدا یوری بەم لێهاتوویی و پاراویە قسەی دەکرد ئاگاداری حاڵەت و گۆرانی روخساری ئەفسەرەکە بووم و بەجوانی دەمدی ئەو روخسارە رەق و تووڕە جێگای خۆی بەروخسارێی ئارام دەدات یوری بێدەنگ بوو ئەفسەری ئاماژە پێدراو کەسەرۆکی پۆلیسەکانی ئەودێ گەورە بو پرسی:

کەواتە ئێوە گەشتیاری ئەمریکایین، لێرە چی دەکەن و لەکوێوە دێن؟

یوری لەوەڵامدا وتی:

من و هاوڕێکەم دانیشتووی ئەمریکاین. شەش ساڵ پێش بۆ گەشت و راو دوو کەس رۆشتینە جەنگەڵی باران و ئەمڕۆش چوار کەس دەگەڕێینەوە بۆ ئەمریکا لێرە....

ئەفسەر بەسەرسوڕمانەوە پرسی:

کەواتە ئەم دوو کچەتا لەدێکانی سەر رێگا گرتووە! دانیشتووی کام شار یان دێهاتی بەرازیلین.

یوری شانەکانی تەکانداو وتی:

ئەو دووکچە هاوشاری ئێوە نین.

ئەم دوو کچە دانشتووی جەنگەڵن و ئێمە وەك پڵنگ و ورچ راومان کردن و بەدژواری زۆر خووی وەحشیگەریمان لێ سەندن و ئێستا لەگەڵ خۆمان دەیانبەینە ئەمریکا.

ئەو بەسەرسوڕمانەوە سەیرێکی نیکی و یوری کردو دواتر بزەیکی گرت و وتی:

گاڵتە دەکەن.....؟ شتەکە بۆتە راست. من دەبێت وەڵامی خەڵك بدەمەوە داواتان لێ دەکەم ناسنامەی ئەم ژنە دیاری بکەن چونکە بەڕودانی رووداوەکەی ئەمڕۆ هەمووان وادەزانن ئەو دەزگیرانی ریمۆندە و بەپیلانی پێشتر خەنجەری بۆ تەنافەکە هاویشتووە و

پچڕاندوویەتی:

دواتر بەمنجە منج وتی:

بۆ من کەپۆلیسێکی کۆنم گوومانی تیانیە ئەو عاشقی ریمۆندە و لەبەر رزگاری ئەو گیانی خۆی خستۆتە مەترسیەوە.

یوری وتی:

ئەمە راست نیە چونکە مرۆڤ دەبێت زۆر ئەحمەق بێت بۆ رزگاری قاتڵێك گیانی خۆی بخاتە مەترسیەوە. جیاواز لەوە نیگەرانی ئێوە بێ هۆیە چونکە دەتوانن دووبارە لەداری بدەن.

ئەفسەر وتی:

کێشەکە لێرەدایە کەبەپێی نەریتی کۆن ئەگەر بەهۆکارێك لەهۆکارەکان تەنافەکە بپچڕێت، ناتوانن مەحکووم دووبارە لەدار بدەن و دەبێت جارێکیتر لەسەرتاوە دادگایی بکەن ئەمەش لانی کەم شەش مانگ دەخایەنێت.

یوری وتی:

بەهەرحاڵ ئەمە پەیوەندی بەئێمەوە نیە. چونکە ئەم کچە هێشتا زمانی ئێوە نازانێت و بەهەر جۆرێك گوومانی خراپ لەبارەی ئەو بێ هۆیە.

ئەفسەر وتی:

من وتەکانی ئێوە بەگاڵتە لەقەڵەم دەدەم چونکە جەنگەڵ کچی بەم جوانیە لێ نیە.

ئەم جارەیان من وتم:

انشاالله جاری داهاتوو ئێوە لەگەڵ خۆمان دەبەینە ئامازۆن.

ئامازۆن....؟ ئێوە رۆشتبوونە ئامازۆن؟ مەبەستتان ئەوەی ئەم دووکچە لەهۆزی ژنانی ئامازۆنن.

یوری وتی:

بەڵێ.... لاتان سەیرە...!

دەست بەجێ ئاوڕی دایەوە و بەپەنجە قاچە رووتەکانی ئەمانۆی نیشانداو وتی:

سەیرکەن.... هێشتا دوای چەند ساڵ زەحمەت و لەگەڵ ئەوەی لەهەردەفەتێك بۆ راهێنانی ئەوان کەڵك وەردەگرین، خووی وەحشیگەری لەواندا ماوە جار جارە کاروکردەوەی وەحشیانە و سەیر لە خۆیان نیشان دەدەن کە بەقاچی روتی رۆشتن بەڕێگادا یەکێك لەسادەترینیانە.

ئەم جارە بەڵگەکە قەناعەت پێکەڕبوو ئەفسەری پۆلیس بەبینینی قاچە رووتەکانی ئەمانۆ باوەڕی کرد کە ئەو دوو کچە ئامازۆنین و نیکی هیچ پەیوەندیەکی بەریمۆندی قاتڵەوە نیە... کەمێك بیری کردەوەو دواتر وتی:

زۆرباشە. رازی بووم. ئەم کچە ئازادەو دەتوانن لەگەڵ خۆتان بیبەنەوە بۆ میوانخانە. بەڵام رێگە بدەن لەبابەتێکی نامۆو نادیاری تر پرسیار بکەم.

یوری وتی:

فەرموون ئێمە هیچ شتێك داناشارین.

ئەو پرسی:

بۆ ئێوە دوای شەش ساڵ ژیان لە جەنگەڵ هێشتا جل و بەرگی خاوێن و پۆستاڵی تازەتان لەپێدایە، لەوەش گرنگتر لەکوێی جەنگەڵی بەرازیل خەیاتی ژنانەی لێیە کە ئەم جلانە بەمۆدی بەرازیل بۆ ئەم ژنانە بدورن...؟

ئەگەر گوومانی کرد بەم پرسیارە دەمانخاتە گێژاو و ناچارمان دەکات دان بەهەموو شتێکدا بنێین بەڵام یوری دەست بەجێ گەرمی ئەوی بۆ ساردی گۆڕی و وتی:

ئەم جل و بەرگانە هاوڕێی کۆنی ئێوە پێی بەخشیوین، کراسەکەی نیکی و ئەمانۆش ئەو پێی داوین و لەناو جل و بەرگەی دەزگیرانە جیاوازەکانی خۆی هەڵیبژاردوە.

ئەفسەر پرسی:

سەیرە.... هاوڕێی کۆنی من.... چی دەڵێیت.... من هاوڕێیەکم نیە کە.....

یوری بزەیەکی گرت و وتی:

بۆ نا..... ئەو لەگەڵ هەموو پۆلیسەکانی و سەربازەکان هاوڕێیەتیەکی مەترسیداری هەیەو لەهەر شوێنێك روبەڕوی هاوڕێکانی ببێتەوە بەگوولە سینەیان کوون دەکات.... چۆن ئەو هاوڕێ بەرێزە ناناسن.

ئەفسەر سەری سوڕمابو و چونکە مانای وشەکانی یوری نەدەزانی زەق زەق سەیری دەمی دەکردو هەندێ کات سەری بەنیشانەی تێنەگەشتن تەکان دەدا.

سەرئەنجام یوری کۆتایی بەسەرسوڕمانی ئەو هێناو وتی:

ئەم هاوڕێ بەرێزەی ئێوە فرانچی ژواکین کەئێمەی دەستگیرکرد بەڵام کاتێك زانیی گەشتیارین میواندای لێکردین.... دەزانن چ کاتێك.... کاتێك سەری بێ گووناحێکتان لەجیاتی ئەو لەدار دابو بۆ نمایشتن داتان نابو.

کێشەی تازە بوونی جلەکان چارەسەرکرا بەڵام ئەفسەر گیرۆدەی ناڕەحەتیەکی

تازەتر بو.

ئەویش چیرۆکی فرانچی ژواکین بو. بەدەمی کراوەو چاوی زەق و ترساو پرسی:

کەواتە فرانچی ژواکینتان بینیوە....؟ داواتان لێدەکەم شوێنی خۆشاردنەوەی ئەومان پێ بڵێن من ئێستاکە...... بەڵێ.... بەخێرایی بەناوەندی رابگەیەنین.... بەتەلەفۆن، بروسکە.

خۆم قسەدەکەم.

ریمۆندی قاتڵیان بەتەواوی لەبیرکرد. جم و جوڵێکی بێ وێنە و سەیر لەو بینا بچووکەدا دروست بو لێپرسراوانی تەلەفۆن بۆ دروست کردنی پەیوەندی لەگەڵ رۆدیۆجانیرۆ هەوڵیان دەدا دووان بەرەو شوێنی بروسکە رایان کرد تا راپۆرتی ئەفسەرەکە بنێرن.

من و یوری ئیتر لەوێ کارمان نەبو دەستی نیکی و ئەمانۆمان گرت و هاتینە دەر لەرێگادا یوری لەمنی پرسی:

ئەگەر ئەوان داوای شوێنی ژواکین لە ئێمە بکەن، چی بڵێین.

لەوەڵامدا وتم:

کارێکی ناجوامێرانەیە ئێمە هەرگیز شوێنەکەی ئاشکرا ناکەین. ئەو چاکەی لەگەڵدا کردین. لە دژوارترین بارودۆخ میوانداری کردین. جل و بەرگ و ئەسپی پێدایین. مەرجی پیاوەتیە تاگیان لەجەستەماندایە پشتیوانی لێ بکەین.

یوری وتی:

کەواتە دەبێت چی بکەین....؟

وتم:

هیچ. پێش ئەوەی ئەوان وەڵام وەربگرن ئێمە بەرێدەکەوین. ئێستا تاوەڵامی ناوەندبگات لانی کەم بیست و چوار کاتژمێر دەرفەتمان هەیە.

کاتێ رۆشتینە میوانخانە، ناشتایی ئامادەبوو. چوارکەس دانیشتین خواردمان. دواتر بەرێوبەری ئاخورم بانگ کردو بەهێواشی پێم وت:

ئەسپەکانمان ئامادە بکە نزیك نیوەرۆ دەڕۆین. تێدەگەیت.... نزیکەی دوو کاتژمێری تر دەبێت ئەسپەکان ئامادەبن.

کورنوشی بردو دڵنیایی کردین کە ئەسپەکان لەکاتی خۆیدا ئامادە دەبێت.

ئەمانۆ لەنیکی ئاقڵتربوو کەمتر کاری شێتانەی دەکرد بۆیە کاتێك هەستاو

بەپیاسەکردن رۆشتە ناو باخی میوانخانە، دژایەتیم نەکرد و رێگەم دا لەناو باخدا پیاسەبکات بەلاَم بەڵێنم لێ سەند لەوێ نەڕواتە دەر.

دواتر بەنیکیم وت:

برۆ بارەکان ئامادەکە.

ئەو کە لە کردەوەی نەگونجاوی خۆی هەستی بەشەرمەزاری دەکرد بێ کەمترین قسە لەشوێنەکەی هەستاو وەك منالێکی گۆڕایەلی بەرەو قادرمەکان رۆشت. بەلاَم لەسەر یەکەم قادرمە ئاوڕی دایەوەو وتی:

ئێوە بۆ کوێ دەڕۆن؟

وتم:

بۆ کرینی هەندێ شتی پێویست دەڕۆمە ناو شەقام و زۆر خێرا ددەگەڕێمەوە.

نیکی رۆشت و یوری وتی:

دەتەوێت چی بکەیت؟ ئێرە بچووکە، دووکانی گەورەی لێ نیە، شتی باشت دەست ناکەوێت. دەتەوێت چی بکەیت؟

وتم:

دەمەوێت یەك دوو قاڵب سابوونی بۆنخۆش و مەکینەیەکی ریش تاشین و بەستەیەك گوێزان بکڕم و خۆمان لەشەڕی ئەم تەنەکە شکاو کە لەجیاتی گوێزان کەلکی لێوەردەگرین ئاسوودە بکەم. ئەگەر کرا شووشەیەك بۆنیشم پێویستە. هەڵبەت کاتێك گەشتینە سان سالوادۆر پێویستیەکانی تۆ دەکرین.

یوریش رازی بوو پێکەوە هەستاین کە بۆکرین بڕۆینەدەر بەلاَم هێشتا چەند هەنگاو نەڕشتبووین کە رووداوێکی تر رویدا.

ئەگشتینە چەند هەنگاوی دەرگای رۆشتنەدەرەوە کەلەناکاو ئەمانۆ ترساو شڵەژاو هاتە ناو سالۆنەکە. سەیرێکی دەوروبەری کرد و کاتێك من و یوری بینی بەرەنگێکی پەڕاو قیافەیەکی ترساو بەرەو لامان رایکرد. یوری قۆڵی منی گرت و وتی:

چی بوە؟ چی رویداوە وا ئەمانۆ ترساوە. دەبینی رەنگی پەڕاوە ! پێش ئەوەی وەلاَمی یوری بدەمەوە ئەمانۆ خۆی خستە باوەشم و بەدەم گریانەوە وتی:

فریاکەوە..... برۆ سیلاحەکە بێنە، فریای خەڵك بکەوە، ئێستا هەموو دانیشتوانی ئەم هۆزە لەناو دەچن.

پرسیم چی روویداوە؟ قسەبکە.

ئەو لەکاتێکدا لەترسا دەلەرزی و دڵی وەك دڵی کۆتر لێی دەدا وتی:

سەرەتا برۆ تفەنگەکە بێنە.... دواتر تۆ دەبەم کە یارمەتی خەڵك بدەیت... نازانی چەندە مەترسیدارو دڕندەیە.... دەنەڕێنێت.... چاوەکانی دەدرەوشایەوە..... من.....

من لەبێ ئاگایی ئو ئاژەڵە کەڵکم وەرگرت و کلکیم بەتەنافێك کەلەوێ بو بەشتێکی قورس بەستەوە کەنەتوانێت پەلاماری خەڵك بدات... بەڵام ئەگەر فریانەکەویت.... خەڵك لەناو دەچن.

دەرکەوت کە ئەو ئاژەڵێکی دڕندەی بینیوە بۆیە پرسیم:

چ ئاژەڵێکە..... شێرە، پڵنگ.... بەور، کەرگەدەن چیە؟ لە گووریلە سووڕەکانی ئامازۆن مەترسیدارترە؟

ئەو لەترسا سەری خستە سەر سینەم و وتی:

بەڵێ لە هەر ئاژەڵێك لەدنیا دڕندەتر دێتە بەرچاو. ئەورانگووتان ئەگەر دەنگی نەڕەی ئەو ببیستێت رادەکات. گووریلی سووڕ لە چاوە درەوشاروەکانی ئەو دەترسێت.

هەرچی بیرم کردەوە نەمتوانی لەمەبەستەکەی ئەمانۆ تێبگەم بەڵام دیاربو کە درۆ ناکات.

بەدوای ئەمانۆ چەند کەسێك هاتنە ناو ساڵۆنەکە بەڵام کەسیان ترساو نەبوون زۆرئاسایی بەڕێگادا دەڕۆشتن وتێدەپەڕین.

یوری وتی:

چارە نیە...... دەبێت لەگەڵیا بڕۆین...

سەرئەنجام قەناعەتمان پێکردو بەبێ سیلاح ئەو ئاژەڵەمان نیشان بدات تا ئەگەر پێویستی کرد یەکێك لەئێمە بەراکردن بڕواتە سەر وتفەنگەکە بێنێت.

بەترس و لەرز دەستی منی گرت وبەرەو باخەکەی بردم... هەرچەند هەنگاوێك جارێك دەوەستاو دەستی لەسەر دڵی دادەناو کە کەمێك ئارام دەبوویەوە دووبارە بەڕێدەکەوتەوە.

بەم شێوە گەشتینە دەرگای باخەکە. بەخۆشحاڵیەوە کەسی لێ نەبوو کەس لەوحاڵەدا ئێمەی نەبینی.

لەوێش یەکێك لەخزمەتکاران هاتە ناو ساڵۆن بەڵام شوێنەواری ترسی پێوە دیار نەبو کەس نەیدەزانی ئەو ئاژەڵەی ئەمانۆ بینیویەتی چیە کەئەوانیتر لێ ناترسن.

یوری لەپێشەوە دەڕۆشت. منیش بەدوای ئەوداو ئەمانۆ بەدوای مندا بەڵام دەستی

منی رادەکێشا کە نەرۆمە پێش و بەهێواشی بڕۆم.

کاتێك گەشتینە هەیوان سەیرێکی دەوروبەرم کرد و کەهیچم نەبینی وتم:

ئەی ئەو ئاژەڵە دڕندەی دەتوت کوا....؟

ئەمانۆ چاوی بەستبوو بەپەنجە شوێنێکی نیشاندەدا هێشتا من و یوری سەیری ئەوێمان نەکردبو کە لەناکاو دەنگێکی مەترسیدار بەرز بوویەوە و بەدوای ئەودا دەنگی و وردبوونی بڕێکی زۆر دەوری و گیلاس و قاپ و شتی شکێنەری تر بەرزبوویەوە.

قەرەباڵغی دروست بو... ژمارەیەك لەپشت سەرمان هاتنەدەر و خاوەنی میوانخانە لەکاتێکدا لەسەری خۆی دەدا بەرەو جادەکە رایکرد.

ئەمانۆ لەکاتێکدا چاوەکانی بەدەست گرتبو وتی:

نەمووت.... دیتان درۆناکەم.... بەیەك تەکان دنیای شێواند... من ئەوم بەستبوویەوە. هەموو رایانکرد لەدەوری ترومبیلێکی ڕەش رەنگی بچووك کۆبوونەوە. یەکێك لەوان کە خاوەنی ترۆمبیلەکە بو وتی:

کێ دەعامی ترومبیلەکەی منی بەم مێزەوە بەستۆتەوە.

یوری بەبیستنی ئەم قسە پێکەنی بەڵام بۆئەوەی پێمان نەزانن دەستی بەدەمیەوە گرت. ئەو زووتر لەمن هەستی بەڕاستیەکە کردبو، بۆی رونکردمەوە وتی:

سەیرکە.... ئەم دەستە گوڵەیان ئەمانۆ بەئاویداوە.... ترۆمبیلە شەق و شرەکەی ئەم پیاوەی بەئاژەڵ زانیوە و دواتر بەتەناف بەمێزەکەوەی بەستۆتەوە. خاوەنەکی بێ گوێدان رۆشتۆتە پشتی و رۆشنی کردوە تابڕوات و لەئەنجامدا مێزەکە شکاوە.

خاوەنی میوانخانەکە یەخەی خاوەن ترۆمبیلەکەی گرتبوو دەیوت:

تۆ دەبێت زیانەکانم قەرەبو بکەیتەوە.... من ئەم قاپ و قاچاخانەم بەنرخێکی گران لەرۆدیۆجانیرۆ کڕیبو و هێشتا دووجار بەکارم هێنابوون کەترۆمبیلەکەی تۆ هەموویانی شکاند....

بەمن چی.... دەبێت بزانین کێ دەعامی ترۆمبیلەکەی منی بەمێزەکەوە بەستۆتەوە.

بەدڵنیاییەوە دوژمنی من بووە کە ئەم کارەی کردوە ! ئەو دەبێت قەرەبووی بکاتەوە دەمە دەمەی ئەوان کەم کەم بەرزدەبوویەوە.... ئەمانۆ لەترسا دەلەرزی و من و یوری لەپێکەنینا پچڕابووین. بەڵام سەرئەنجام ئەم پێکەنینەش تەواو بو چونکە بینیمان وردە وردە سەرنجیان بۆلای ئێمە رادەکێشێت و ئەوەندەی نەماوە بۆ وەرگرتنی قەرەبو بەرەولای ئێمە بێن.

یوری قۆڵی منی گرت و وتی:

پێمەکەنە... کارەکەمان خراپ بو. دەبینی شۆفێرەکە بۆ ئەوەی زیانی قاپەکان نەدات چۆن بەڵگە دەهێنێتەوە و بەپەنجە ئێمە نیشان دەدات.

یوری راستی دەکرد کاتێک قاقاکانم تەواو بو بیستم کە شۆفێرەکە دەڵێت:

من خۆم بینیم.... من کەسێکی درۆزن نیم نزیکەی سی ساڵە لەم دێیەدا دەژیم. هێشتا ئەوەندە منتان نەناسیوە، نازانن کەمن درۆناکەم و چونکە تووربوو بۆ ترساندنی ئێمە دەمانچەکەی دەرهێناو چەند گولەیەکی بەئاسماندا تەقاند، تاقمێکی تر کە لەدوورەوە بوون بەپێی عادەت و بێ ئەوەی بزانن کێ تاوانبارە دەستیان بەتەقەکردن بەئاسماندا کرد یوری کەبینی بارودۆخ خراپە، دەمانچەکەی دەرهێناو بەچەند هونەر نمایە دەمانچەی چەند کەسێکی لەدەستیان پەڕاند. لەم کاتەدا خاوەنی میوانخانەکە لەترسی ئەوەی بارودۆخ زیاتر خراپ نەبێت، خۆی خستە ناوەڕاست و دەمانچەکەی کۆکردەوە. بەڵام کێشەکە بەم شێوەیە کۆتایی نەهات و کەسی ئاماژە پێدراو کەقیافەی بەجۆرێک پێکەنیاوی بو وەک کەسێک کە لەدادگادا ئامادەبوو بێت و لەبەردەم داواکاری گشتیدا قسەبکات پەنجەی خۆی بەرزکردەوە، بڕۆ پان و ئەستوورەکانی بەرزکردەوە و زۆر بەدڵنیایی وتی:

ئەم کچە جوانە.... کە بەستنی ترۆمبیلەکە بوە هۆی ئەم کارەساتە.... کاتێک دەڕۆشتمە ناو ساڵۆنەکە بینیم شتێک بەدەعامی ترۆمبیلەکەمەوە دەبەستێت بەڵام لەکاتی هاتنەدەر بیرم نەبو کەدەبێت سەیری دەعامیەکە بکەم، بۆیە سوار بووم ورۆشتم. لەم کاتەدا بو دەنگی شکاندنی قاپەکان بەرزبوویەوە.

هەموو چاوەکان بەرەو لای ئێمە سووڕا و ئەمانۆ رەنگ بەرووخساریەوە نەمابو هێشتا ترۆمبیلەکە شەق و پەقەکەی بەئاژەڵێکی دڕندە دەزانی، لەروانینی خەڵک دەترساو خۆی وەک منداڵێک کە لەئاژەڵ بترسێت پشت سەری من داشاردو قۆڵی لەدواوە گرتم....

یوری بۆئەوەی کۆتایی بەم قەیرانە هێنابێت ئەوی لەسەر جێگای خۆی دانیشاندو وتی:

پەیوەندی بەئێمەوە نیە.... خاوەنی میوانخانەکە راستی دەکرد کەتۆ درۆزنیت چونکە....

ئەو قسەی یوری بڕی، دەستی خستە کەمەرو ویستی بەرگری لەشەرافەتی خۆی

بکات و بەدەنگی بەرز وتی:

ها..... چیتان وت..... چی..... بەڵێ..... درۆزن... زۆرباشە.... دەبێت قەرەبووی ئیهانە کردن بەمن لەدادگاییدا بدەنەوە....

یوری لەم قسە پێکەنین گرتبووی بەڵام بەرووی خۆیدا نەهێناو بەهەمان تووڕەیی وتی:

درۆی ئێوە لەوێوە دەردەکەوێت کە...

بەرێزان گوێ بگرن، ئەم پیاوە دەڵێت من بەچاوی خۆم بینیم کە ئەم کچە تەنافەکەی بە دەعامی ترۆمبیلەکەی منەوە بەست بەڵام گوێم نەداوە... سەیرە.... کەسێکی شارستانی ئەم قسە دەکات بەڵام کچێکی وەحشی جەنگەڵی... بەبیستنی ئەم قسانە چاوی خەڵك زەق بوویەوە... تاقمێك گوێیان لەدوایین قسەکانی یوری گرتبو تاقمێك دەیانویست تاوانبار بناسن. کەسی ئاماژە پێدراو قسەکەی دەمی یوری دزی و چەند هەنگاوێك بەرەو ئێمە هات و وتی:

بەرێز... ببورن.... وتتان ئەم خاتوونە جوان و دڵرفێنە وەحشیە.... ئایا راست دەکەن... قاپەکان لەبیرکران و هەمووان لەدەوری ئێمە کۆبوونەوە و داوای رونکردنەوەیان دەکرد.

یوری وتی:

بەڵێ... ئەم کچە و هاوڕێ کەی کەئێستا لەژوورەوەیە، هەردووکیان ئامازۆنین و لەدانیشتوانی هۆزی ژنە وەحشیەکانی ئامازۆنن.

خاوەن ترۆمبیلەکە نەیهێشت قسەکانی یوری تەواو بێت. وەك عاشق سەیری ئەمانۆی کرد گەردنی درێژ و ئێسقانەکانی چەند جارێك تەکاندا و ئاوی دەمی بەدەنگێکی بێزارکەر قووت داو دەست بەجێ دەستی هێنایە پێش و وتی:

زۆر بەناسینتان خۆشحاڵم. رێگە بدەن خۆم بناسێنم.... من (( هوفمان لایك )) رۆژنامە نووس و پەیامنێری گۆڤارە بەناوبانگەکانی رۆدیۆجانیرۆم... چ رێکەوتێکی باش. رێگە بدەن چەند خولەکێك شانازی قسەکردن لەگەڵ ئێوەم هەبێت....

یوری تەکانێکی توندی خوارد، تەنیا شتێك کەهەرگیز بیری لێ نەدەکردەوە کە لەو دێیەدا روبەڕوی پەیامنێرێکی مل درێژی رۆژنامە ببێتەوە....

هەڵبەتە ئێمە لەهاودەمی ئەم کەسانە پێشوازیمان دەکرد. ئەگەر بڕیاربو ناودار بین و لەم رێگاوە سامانێك بەدەست بێنین تەنیا هاوکاری رۆژنامە نووسەکان ئەم

گوومانەمان دەچووە قۆناغی جێ بەجێ کردنەوە.

یوری چاوێکی لەمن داگرت و دەستی پەیامنێرەکەی بەساردی گووشی و دای نیشاند لەم کارە رازی نیە لەکاتێکدا بەتەواوی بەپێچەوانەوە بو.

یوری تەوقەی لەگەڵدا کرد و دواتر بەرەولای من هات. دواتر هەنگاوێك بەرەو ئەمانۆ رۆشت خولەکێك دواتر ئێمەی بردە ناو ساڵۆنەکەو بەزۆر لەسەر مێزێك داینیشاندین و وتی:

فەرموون... گێلاسێك و ویسکی پێکەوە بخۆینەوە.... فەرموون... تکا دەکەم... سەرفرازم بکەن....

وەك پەیامنێران خۆش قسەبو. زۆر قسەی دەکردو لەگەڵ ئەوەی قیافەی پێکەنیناوی بو، هەرچەندە. مرۆڤ زیاتر ئاشنای دەبو، زیاتر هەستی بەخۆشەویستی دەکرد.

من ویوری و ئەمانۆ دانیشتین بەڵام ئەو بەڕاکردن و بەلۆقی درێژ، بەوقیافە ئێسقانی و ناحەزەی خۆی لەساڵۆنەکە رۆشتەدەرو دوای یەك دوو خولەك گەڕایەوە ئەم جارەیان کامێرای وێنە گرتنی بەفلاشەوە لەمل هەڵواسیبو. دیاربو پەیامنێرێکی وشیارەو هەموو شتێکی هەمیشە ئامادەیە.

لەم کاتەدا بوو نیکی لەقادرمەکان هاتە خوار و بەرەولای ئێمە رایکرد. ئەو بەردەوام وێنەی دەگرت. یوری بەردەوام دەیووت:

بەرێز.... تکا دەکەم... ئێمە نامانەوێت وێنەمان لەناو گۆڤارەکاندا بلاّو بێتەوە... ئەم کارە باش نیە.... ئێمە راوچین و لەخۆ نواندن و پڕوپاگەندە بێزارین.

بەڵام لەوکاتە دژوارەدا بەزمانی ئامازۆنی بەمنی دەوت:

ئاگادار بە نابێت هەموو شتێکی یەك جێ پێ بڵێین. تۆ قسە مەکە... بامن قسەبکەم... من ئەم رۆژنامە نووسانە باشتر لەتۆ دەناسم. ئەوان تینوی هەواڵن تابەدوای مرۆڤدا رابکەن. ئەمانە ئەگەر بابەتێکی گەورەیان هەبێت کورتی دەکەنەوە بەڵام ئەگەر بچووك بێت تا ئەوشوێنەی بکرێت دوورو درێژی دەکەنەوە کەوێنەیەکی تایبەتی بێت. کەواتە لەدرێژدادری و زۆر قسەکردن خۆت بەدوور بگرە.

ئەو لەوکاتەدا چەند وێنەیەکی گرت. لەمن و ئەمانۆو یوری و نیکی.... یەك یەك.... پێکەوە.... دووان دووان....

بێ زێدەرۆیی چەندە ئاڵقیەکی فیلم وێنەی گرت تائەوەی قسەکردن دەستی پێکرد.

یوری کەمێك قسەی کرد. لەهۆزی ژنانی ئامازۆن هەندێ شتی وت و دواتر لەکاتێکدا

ئەو تینوو تەماحکار دانیشتبو، هەستا وتی:

ببوورن.... ئێمە کارمان هەیە دەبێت هەرچی زووتر بڕۆین.... تاقمێك چاوەڕێمانن... ڕاستی لێرەوە تا سان سالوادۆر چەندە ڕێگایە.

پەیامنێرەکە وەك ئەوەی سەتڵێك ئاوی ساردیان بەسەردا کردبێت، ناڵاندی وتی:

ئەی هاوار.... بەم زووانە دەڕۆن.... دەمویست لانی کەم تا شەو قسەبکەین.... بۆ پەلەتانە....؟ ئەمشەو میوانی من بن.

یوری بۆئەوەی بیانووی هێنابێتەوە وتی:

ڕاستیەکەی ئەوەیە پۆلیس نایەڵێت ئاسوودە بین. ئێمە لەڕێگادا ڕوبەڕوی فرانچی ژواکین بووینەوە و ئەو زۆر بەگەرمی میوانداری کردین. جل وبەرگی پێداین لەباشترین ئەسپەکانی خۆی خستە بەر دەستمان، بەڵام ئێستا کەپۆلیس لە ڕوبەڕووبوونەوەی ئێمە ئاگادار بۆتەوە داوای شوێنی خۆشاردنەوەی فرانچی و هاوڕێکانی دەکەن و چونکە درکاندنی نهێنی ئەو کەچاکەی لەگەڵدا کردین، لەجوامێری و پیاوەتیەوە دوورە. دەبێت پێش وەخت لێرە بڕۆین کەناچار نەبین نهێنی فرانچی بدرکێنین.

یوری قسەی دەکردو پەمانێرەکەی ئەم قسانەشی یاداشت دەکرد. دیاربو ئەم بابەتە تازە لەگەشتی ئێمە بۆ ئامازۆن بۆ ئەو سەرنج ڕاکێشترە و لەدوایین ساتەکانی هەواڵێکی گرنگتری بەدەست هێناوە. هوفمان لایك پەیامنێری مل درێژ بزیەکی سەرکەوتوانەی کردو وتی:

هەواڵێکی تریشتان بەمندا.... زۆر سوپاس.... بونی ئێوە بەڕاستی پر بەهاو گرنگە.... بەڵام نیگەران مەبەن ئەگەر بەڵێن دەدەن بەدرێژایی ڕێگا باسی سەفەرەکەتانم بۆ بکەن من خۆم بەترۆمبیلەکەی خۆم کە تەنیا ترۆمبیلی ئەم ناوچەیە، دەتانگەیەنمە ڕۆدیۆجانیرۆ و یان لانی کەم تا وێستگەی شەمەندەفەر لەگەڵتان دێم کە لەشەڕی پۆلیس ڕزگارتان بێت.

پێشنیارێکی زۆر باش بو بەڵام ترۆمبیلەکەی ئەوە نەبوو بتوانێت پێنج کەس هەڵگرێت و لەسەحرا وشك و بێ ئاوەکانی بەرازیل تێپەڕبێت.

من ویوری نیگامان ئاڵ وگۆر کردو ئەو وەك ئەوەی هەستی بە مەبەستەکەی ئێمە کردبێت وتی:

نیگەران مەبن. ترۆمبیلەکەی من لەترۆمبیلە تازەو دوایین سیستەمەکان دڵنیاترە خۆم لەمانگدا چەند جارێك بەم ترۆمبیلە دەڕۆمە شارەکانی دەوروبەر و بۆ ئامادەکاری

هەواڵ بۆ دژوارترین شوێنەکانیش دەڕۆم.... دەتوانن تاقی بکەنەوە...

یوری قسەی نەکرد بەڵام من کە لەترۆمبیلەکەی ئەو دەترسام وتم:

زۆر سوپاستان دەکەین بەڵام چونکە ئەسپمان هەیە ناتوانین بەترۆمبیل سەفەر بکەین.

ئەو لەشوێنەکەی هەستاو وتی:

چارەسەری ئەم کێشەیەش ئاسانە. خاوەنی ئەم میوانخانەیە لەئاژەڵدارە بەناوبانگەکانی ئەم ناوچەیە ولەکڕیارە پارەدارەکانی ئەسپ دەژمێردرێت. بەتایبەت ئەگەر بزانێت ئەم ئەسپانە هی ژواکین بووە بەنرخێکی باش دەیانکڕێت... ڕێگە بدەن من ئەم کارانە ئەنجام بدەم و ئامادەکاریەکانی سەفەری ئێوە بکەم.

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبو کەخاوەنی میوانخانەکە بۆ وەرگرتنی قەرەبووی زیانەکان هات.

هوفمان بەلێهاتووییەکی تایبەت دەستی بەوتوێژکرد و ئەسپەکانی بەرنخێکی باش پێ فرۆشت پووڵەکەی گرت دای بەئێمە.

کاتێك ئێمە سەرقاڵی ئەم کارانە بووین پۆلیس سەرقاڵی چالاکی خۆی بو و بۆ دروست کردنی پەیوەندی لەگەڵ ناوەند هەوڵی دەدا. سەرئەنجام دەستوور گەشت کە بەهەر نرخێك بووە شوێنی خۆشاردنەوەی ژواکین لەئێمە بپرسن. تەنانەت ئەگەر پێویست بکات بازداشت مان بکەن.

ئەم هەواڵەش هوفمان پێیداین و وتی:

خێراکەن.... یەکێك لەهاوڕێکانم کە لەبەڕێوبەرایەتی بروسکە و تەلەفۆن کاردەکات هەرئێستا کە ئاگاداری کردمەوە.

من هەواڵی ئێوەم نارد تەنانەت وێنەکانیشم بە پۆستدا نارد. بەیانی فیلمی وێنەکان دەگاتە وێستگەی شەمەندەفەر و رنگە چەند ڕۆژ پێش گەشتنی ئێوە بلاّو ببێتەوە و وێنەکانتان چاپ بکرێت.... ڕۆژنامە بۆ ئەم هەواڵە پارەیەکی باش بەمن دەدەن.... زۆر سوپاسی ئێوە دەکەم.... بەڵام وەك بەڵێنتا داوە دەبێت لەڕێگادا قسەم بۆ بکەن.

ئێمە لەگەڵ قسەکردن لەمبارەوە بەرەو ترۆمبیلەکە دەڕۆشتین. پێشتر هوفمان کۆڵەکانمانی خستبووە ناو سنوقی ترۆمبیلەکەی و ئیتر کارێکمان نەبو. پارەی میوانخانەکەشمان دابو. کاتێك گەشتینە پشت شیشەکە، هوفمان دەستی درێژ کردو بەردەم منی کەلەپێش ئەوانیترەوە دەڕۆشتم گرت و وتی:

بوەستن.... لێپرسراوانی پۆلیس بۆ بردنی ئێوە دێن.... خێراکەن خۆتان داشارن. ئەمەی وت و بەخێرایی ئێمەی بردە پشت قەفەسێکی گەورە.... پۆلیسەکان کە چوار کەس بوون رۆشتنە ژوورو راستەوخۆ لەقادرمەکان رۆشتنە سەرو بەگوومانی ئەوەی لەقاتی سەرەوەین رێگەی ئەوێیان گرتەبەر. لەگەڵ ئەوەی ئەوان لەساڵۆنەکە تێپەرین. هوفمان وتی:

راکەن..... سوراِبن.... من ئاگام لێیە.

من لەپێشەوە رامکردو پەریمە ناو ترۆمیبلەکە. یوری لەدوای نیکی و ئەمانۆ دەهات تازووتر ئەوان سوار بکات بەراوردی بکەن بەو باردوۆخە مەترسیدارەی ئێمە بوومان ئەگەر ئەمانۆو نیکی بەبێ وەستان سوار دەبوون چەند باش بو چەندە لەکارەکانی خۆمان سەردەکەوتین....

بەڵام کاتێك ئەوان گەشتنە بەردەم دەرگا، خۆیان کێشایە دواوەو بەترسەوە وتیان:

ئێمە ناڕۆینە ناو سکی ئەم ئاژەڵە.... ئەم ئاژەڵە بەو دەنگە مەترسیدارەی دەمانخوات و رەنگە دەیەویست ئێمە لەناو سکی بێینەدەر....؟ نا... نا لەم ئاژەڵە دەترسین...

یوری بەزمانی خۆش وتی:

ئەمە ئاژەڵ نیە... ئامرازێکە کە مرۆڤ لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگوازێتەوە. سەیرکە گیانی نیەو لەئاسن دروست کراوە.

ئەمانۆ وتی:

ئەگەر گیانی نیە بۆ دەنەرێنێت، دەناڵێنێت؟ بۆ دەڕوات و هەندێ کاتیش غاردەدات. ئەم ئاژەڵە ئاسنیە هەرئەوەیە کە جادووگەران دەیانوت رۆژێك دێت هەموو دانیشتوانی جەنگەڵ قووت دەدات یوری دووبارە دەیویست بەڵگە بێنێتەوە بەڵام هوفمان کە بەردەوام قاچی لەزەوی دەکووتا و لەچەپ و راست و پێش و دواوەی دەڕوانی و لەپۆلیسەکان دەترسا، دەرفەتی پێنەدا و وتی:

ئەی هاوار.... ئەی هاوار.... گەڕانەوە.... گەشتن... بینیانین.... ئەوەندە درەنگتان کرد کە هەموو شتێك خراپ بو.

من کەزیاد لەرادە تووڕە ببووم بۆیەکەمجار بەتووڕەیی دەستی نیکیم گرت و کێشامە ناو ترۆمبیلەکە و بەپشت دەست کێشام بەروخساریدا.

ئەمانۆ لەترسی ئەوەی نەکا ئەویش وەك نیکی شەقەزلەی بەرکەوێت بەپەلە سواربوو لەسووچێکدا کزۆڵەی کرو لەژێر چاوەوە سەیری دەکردم.

هوفمان و یوریش سوار بوون بەخۆشحاڵیەوە پێش ئەوەی ئەوان بگەن ترۆمبیل ڕۆشن بو لەشەقامە باریکەکانی ناودێکە بەڕێکەوت و ڕۆشتە پێش.

لەپشت شیشەی ترۆمبیلەکە چوار پۆلیسمان دەبینی کەدەست تەکان دەدەن و دەستووری وەستان دەدەن بەڵام گوێمان لێ نەگرتن و چەند خولەك دواتر گەشتینە جادەی دەرەوەی شارو دوورکەوتینەوە. لەوێوە کەئەستێرەی ئاسمان بەرزبوو لەئاسمانی بەختەوەریدا دەدرەوشایەوە، جادەی دەرەوەی دێ ساف بو و ترۆمبیل بەهەموو شەق و شڕی خۆی بەخێرایی دەڕۆشتە پێش. شتێك کە بووە هۆی سەرسوڕمانی ئێمە ئەوەبو کە ترۆمبیلەکەی هوفمان وەك خۆی سەروقیافەیەکی جوانی نەبو بەڵام زۆر جوان کاری دەکردو دەڕۆشت.

نیکی و ئەمانۆ لەترسا نزیك بو زراویان بتۆقێت. کاتێك لەپۆلیسەکان ئاسوودە بووین کەوتینە بیری ئەوان.....

دووکەس یەکیان لەباوەش گرتبوو و چاویان بەستبوو نەیاندەوێرا چاوبکەنەوە. هەرجار کە ترۆمبیل لەتاسەیەکی دەداو تەکانی دەخوارد، هەردوکیان دەیانقیژاند. ڕەنگ بەروخساریانەوە نەمابو، لێوی نیکی شین ببوو دەلەرزی....

دەستی ئەوانم کردەوە بەتووندی وتم:

چاوتان بکەنەوە.

نیکی بەدەم گریانەوە وتی:

دەترسم.... دەترسم.... ئەم ئاژەڵە بۆ کوێمان دەبات. هێلانەکەی لەکوێیە؟ دەیەوێت بمانخوات؟ یان ئێمە دەبات بۆ منداڵەکانی.

پێکەنینم بەم قسانە دەهات و وتم:

ئەمە ئاژەڵ نیە... ئامرازێکە کەمرۆڤ لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەبات. ئاژەڵی چی.... نیکی لەهەڕەشەی من چاوی کردەوە بەڵام هەر ئەوەندەی سەیری دەرەوەی کرد قیژاندی و وتی:

سەیرکە.... دارەکانی بیابانیش لەم ئاژەڵە رادەکەن و دەترسن خۆی لێ بەدوور دەگرن....

سەرەتا لەقسەکەی نەگەشتم. ئەوەندەم بینی کەیوری پێدەکەنێت و کاتێك بۆ موفمایشی گێرایەوە ئەویش قاقای لێدا... سەیری دەرەوەم کرد ئەم جارە زانیم ئەو چی دەڵێت...

کاکتوسەکان بەهۆی ڕۆشتنی ترۆمبیل وادەهاتنە بەرچاو کە رادەکەن و دوور دەکەونەوە نیکی گوومانی دەکرد کە دارەکان لەم ئاژەڵە دەترسن و دووردەکەونەوە.

یوری پێشنیاری کرد بۆئەوەی ترسیان نەمێنێت جارێك ترۆمبیلەکە راگرێت و دووبارە سوار ببینەوە.

هوفمان ترۆمبیلەکەی وەستاند. نیکی و ئەمانۆ دابەزین و وەك ئەوەی لەچنگاڵی مەرگ رزگاریان بوبێت هەناسەیەکیان بەئاسوودەیی هەڵکێشاو جوان لەترۆمبیلەکەیان ڕوانی کەزۆر لایان سەیربو. پەیامنێر لایتەکان، دەرگاکانی پێش و دواوەو هەموو شوێنێکی نیشاندان و کەم کەم ترسی ئەوانی لەناوبرد.

ئەم جارەیان کاتێك سوارببوون تاڕادەیەك ئارام ببوونەوە وئیتری کاری شێتانەیان نەدەکرد. بەڵکو بەشادمانیەوە سەیری دەوروبەریان دەکرد. هەرچی زیاتر دەڕۆشتینە پێش ترسی ئەوان زیاتر نەدەما تا ئەوەی عادەتیان گرت.

بەڵام هوفمان لەهەر دەرفەتێك بۆ ئامادەکردنی بابەت کەڵکی وەردەگرت. تەنانەت ترسی ئەوانیشی بەسەرنج راکێش دەزانی و یاداشتی دەکرد.

یوری بەلێهاتوویی سەرقاڵی دەکردو هەوڵی دەدا تا ئەو شوێنەی دەکرێت کەمتر لەبارەی ئامازۆنەوە قسەبکرێت ئەو ڕۆژە بەم شێوەیە تێپەڕی. دیارنەبو چەند کیلۆمەترێك رێگامان بڕیوە چونکە جادەکان کیلۆمەتریان نەبو و ترۆمبیلەکەش کیلۆمەتر ژمێری نەبو. شەو گەشتینە دێهاتێك بەڵام هوفمان نەوەستا و دەیوت:

ئەگەری هەیە پۆلیسەکان ببنە ئەرك بۆتان و دەستگیرتان بکەن.

ئەو راستی دەکرد چونکە بەدڵنیاییەوە بەبنکەکنی پۆلیسی ناورێگە فەرمانی دەستگیرکردنی ئێمە درابو. هۆشی هوفمان بووە هۆی رزگاری ئێمە و تەنیا کاتێك گەشتنیە رۆدیۆجانیرۆ دەرکەوت تاچەند یارمەتی داوین.

بەهەرحاڵ ئەوشەوەمان لەبیاباندا بەسەربرد. بەیانی دووبارە بەرێکەوتینەوە و هوفمان لارێی هەڵبژاردو ئێمەی گەیاندە شوێنێك کە سەرە رێگا نەبوو بنکەی پۆلیسی لێ نەبو. شەو رۆژێك لەوێ ماینەوە.

بۆ ئاگاداری ئێوە خوێنەرانی بەرێز ناچارم ئامارژە بەم خاڵە بدەم... من بەتایبەت و بەئەنقەست ناوی هەندێ دێهات و شارۆچکەی سەر رێگا نانوسم تا دوایی گەشتیاران نەتوانن تێبگەن کە ئێمە لەکام رێگاوە گەڕاوینەتەوە. رێگەی گەڕانەوەی ئێمە نزیکترین و دڵنیاترین رێگاکانە کە بەجەنگەڵی باران کۆتایی دێت چونکە کێ بەرکێی هاوکاری

ڕێگە نادات لەناو بردنی ئەم شوێنانەی ناوڕێگە داوای لێبووردن دەکەم.

دێی ئامازەپێدراو کە هوفمان بۆ حەوانەوە و بەنزین و چاك کردنی ترۆمبیلەکەی لەبەرچاوی گرتبو ئەوەندە ئاو و هەوایەکی خۆش و سازگاری بو کەنەمدەویست هیچ کات لەوێ بڕۆمەدەر.

دیمەنی دڵرفێنی بو. سروشت ئەوەندە جوانی پێ دەبەخشی کەمرۆڤ هەرچەندە بێ زەوقیش بوایە، شادمان دەبو.

تەپۆڵکەی داپۆشراو لەچیمەن، داری سەرسەوز، باخی میوە و لەهەمووی گرنگتر مەرومالاًت. دانیشتوانی ئەوێ ئاژەڵداریان دەکرد، مەرو مالاًتی زۆریان بو لەچەند کیلۆمەترەیەوە گایەلەکانی مانگاو ئەسپ و مەڕی ئەوانمان دەبینی.

هەمووان لەژن و پیاو و پیرۆگەنج جوان و سەرحاڵ بوون. نیکی و ئەمانۆ بەبینینی دارەکانی میوە زیاد لەرادە شادمان بوون بەلاًم لەدیواری باخەکان تووڕە بوون و بەسەرسوڕمانەوە دەیانوت:

بۆچی جەنگەڵی میوەی بەم جوانیانەیان بەدیوارەکان بەش بەش کردوە. ئەم دڕکانە بۆچیە؟ ئەوان هەموو شتێکیان لەدەلاقەی خۆیانەوە دەبینی. بینینی مەڕو مالاًت و بۆ ئەودوانە سەرنج راکێش بو بەتایبەت کاتێك شیریان خوارد لەچێژەکەی سەرمەست بوون.

ئەمانۆ دەیوت:

دانیشتوانی ئەم هۆزە چ عەقڵێکیان هەیە؟ چۆن لەم ئاژەڵانە کەڵك وەردەگرن.

بەیانی زوو کاتی نان خواردن سەبەتەیەك هێلکەیان خستە بەردەممان. هەڵبەت نیکی و ئەمانۆ هێلکەی باڵندەکانیان بینیبو بەلاًم باوەڕیان نەدەکرد مریشکیماڵی هەبێت و هێلکە بۆ خاوەنەکەی بکات. هوفمان ئێمەی بردە ناو کێڵگەیەکی پەلەوەری گەورە....

نیکی و ئەمانۆ لەبینینی ئەو هەموو مریشك و کەڵەشێرانە شادمانیان دەکرد بەلاًم کاتێك ئێمەی بردە بەردەم دەزگا گەورەکانی ئەوێ، دووبارە ترس دایگرتن.

یوری بۆی روونکردنەوە بەوماشینە لەهەر بیست ویەك ڕۆژدا پێنج سەد جوچکە ئامادە دەبێت. نیکی لیوی خۆی گەست. ئەمانۆ دەستی بەدەمیی خۆیەوە دەگرت تانەقیژێنێت.

خولەکێك دواتر جوچکە ماشینیەکانیان بینی. نیکی وتی:

بەیانی دەگەینە هۆزێك کەمرۆڤ دروست دەکەن.

بەپێکەنینەوە بەڕێکەوتین بەڵام نیکی و ئەمانۆ شادمان ببوون و بەهەردارێکی میوە دەگەشتین یەك دوانێکیان لێدەکردەوەو دەیانکردە کۆشی خۆیان.

کاتژمێرێك دواتر هەتاو هەموو شوێنێکی داگرتبوو گەشتینە ڕێگەی ئاسن... بەڕێکەوت کاتێك بو کەشەمەندەفەر لەوێوە تێپەڕی.

پێشتر بێجگە لەدەرگای تونێل هیچ شتێك نەدەبینرا بەڵام لەنیو کیلۆمەتری ڕێگا کەدەنگی شووتەی شەمەندەفەر لەناو تونێلەکەوە دەبیسترا و دەنگی دەدایەوە. نیکی خۆی بەمنەوە لکاندو وتی:

ئەمە چ دەنگێك بو.

یوری بۆئەوەی گاڵتەی کردبێت وتی:

لەناو سکی ئەم کێوە ئێستا مارێك دێتەدەر کەدەتوانێت هەرچوارمان بەترۆمبیلەکەشەوە لەسووچێکی لیوی خۆی دا جێگەبکاتەوە... بۆ نموونە تۆ بەم باڵایەی کەهەتە دەکەویتە ناو دوودیانی ئەو مارە و ئیتر ناتوانێت بێیتەدەر. ئێستا بزانە ئەومارە چەندە گەورەو مەترسیدارە.

نیکی و ئەمانۆ جوان گوێیان گرتبو ن ڕەنگ بەروخساریانەوە نەمابو. بەقسەکانی یوری باوەڕیان کردبو. کاتێك دووبارە دەنگی شووتی شەمەندەفەر بیسترا، لەناو ترۆمبیلەکەدا دانیشتن و دەستیان کرد بەلەرزین ئێمە جگە لەپێکەنین کارێکمان نەبوو ئەوان سەرسوڕماو بوون کەئێمە بۆ ناترسین. خولەکێك دواتر شەمەندەفەر بەدەنگی بێزارکەری چەرخەکانی خۆی لەتونێلەکە هاتەدەر. ترۆمبیلەکەی هوفمان لای ڕێگە ئاسنینەکەوە وەستابو تا شەمەندەفەر بڕوات. نیکی لەگەڵ ئەوەی شەمەندەفەرەکەی بەو گەورەییە بینی قیژاندی و پشت یەخەی کۆتەکەی هوفمانی گرت و داوای لێکرد لەو مارە مەترسیدارە دووربکەوێتەوە. هەرچی ئەوان دەیانقیژاند شەمەندەفەر نزیکتر دەبوویەوە و گەشتیاران کەلەپشت شووشە بچووکەکانەوە دەبینران. ئەمانۆ کە کەمێك عاقڵانەتر بیری دەکردەوە بزەیەکی گرت و وتی:

درۆتان کرد. ئەمە مارنەبو... شتێك بوو وەك ئەم ئاژەڵەی ئێمە سواری بووین.

وتەکانی ئەو نیکیشی ئارام کردەوەو کاتێك شەمەندەفەر بەتەواوی دوور کەوتەوە بەتەواوی ئارام بوونەوەو بەڕەنگێکی پەڕاو پاڵیان دایەوە.

بەیانی ڕۆژی چوارەم گەشتینە ڕۆدیۆجانیرۆ. لەڕێگا هوفمان هەواڵەکانی ئامادەکردبو بەڵام ئێمە ئاگادار نەبووین ئەو چی کردوە و چ نەخشەیەکی هەیە. لەیەك

کیلۆمەتری شار ترۆمبیلەکەی راگرت لەم کاتەدا چەند ترۆمبیلێکی تر گەشتن و دەوریان گرتین و تازە کاتێك نەفەرەکانی ناو ترۆمبیلە تازەکان دابەزین تێگەشتین کە هەمویان پەیامنێرن چونکە زۆربەیان کامێراو فلاشیان لەملادابو و قەڵەم و کاغەزیان بەدەستەوە گرتبو.

هوفمان پێش هەرکارێك چەند رۆژنامەو گۆڤارێکی لێ وەرگرتن و نیشانی داین وێنەکانمان چاپکرابو. پڕبو. لەدوو رۆژی رابردو هەموو رۆژنامەکانی رۆدیۆجانیرۆ لەبارەی ئێمەوە وتەی دوورو درێژیان نوسیبو تاقمێك لەرۆژنامەکان بێ ئەوەی ئێمەیان بینیبێت قەڵەمیان خەسارکردبو و لەبارەی چاونەترسی و ئازایەتی ئێمە شتیان نوسیبو.

بەخێرایی دەوریان داین و دەستیان بەوێنەگرتن کرد. نیکی و ئەمانۆ لەژێر نووری فلاشەکان دەترسان. هاتوچۆ لەجادەکان پچڕا، هەر ترۆمبیلێك لەوێوە تێدەپەڕی دەوەستا. خەڵك ترۆمبیلەکانی خۆیان بەجێ دەهێشت و بەرەولای ئێمە رایان دەکرد. کار گەشتە شوێنێك کە نزیك بوو بخنکێین و ئەگەر یارمەتی هوفمان و هاوکارەکانیان نەدەبو رەنگە لەژێر دەست وپێ و پاڵەپەستۆی خەڵك یەکێکمان گیانی دەدا.

سەرئەنجام کارگوزارانی رۆژنامەی هوفمان لایك ئێمەیان سواری یەکێك لەباشترین ترۆمبیلەکانی خۆیان کرد بەڵام یوری بەهێواشی وتی:

ئێرە جەنگەڵ نیە پایتەختی وڵاتێکی گەورەی ئەمریکایە و گانگێستەری زۆری هەیە. باشتر وایە بەترۆمبیلەکەی هوفمان بڕۆینە شار و سامانەکەی خۆمان لەسنوقێکدا بپارێزین....

ئەو راستی دەوت و ئەگەر بارەکانی ئێمەیان دەبرد هەرچیمان هەبو لە دەستمان دەچوو و دووبارە دبووینەوە بەسواڵکەر. لەسەر ئەم بیرۆکە لەترۆمبیلەکەی ئەوان دابەزین و دووبارە بەترۆمبیلە شەق وشرەکەی هوفمان رێگەی شارمان گرتە بەر.

لەوێوە دووبارە کارە شێتانەکانی نیکی و ئەمانۆ دەستی پێکرد. لەبینینی بینا گەورەکان لەهەموو دیمەنەکانی شارستانی دەترسان.

کاتێك ترۆمبیل لەبەردەم بیناکان و لەناو شەقامەکانەوە دەڕۆشت نیکی و ئەمانۆ دەستیان لەسەر چاویان دادەناو نەکا ئەو بینا بیست قاتانە بەسەریاندا بڕوخێت.

ئەم کارانە درێژەی بو تاگەشتینە ئوتێلێکی چوار ئەستێرە کەپێشتر لەلایەن هوفمان و رۆژنامەکەیانەوە گیرابو. رۆشتنیە ژوور و بارەکانیشمان لەگەڵ خۆماندا برد.

ئەو رۆژە بەحەوانەوە، حەمام کردن و گۆڕینی جل و بەرگ سەرقاڵ بووین بەڵام

ڕۆژنامە نووسان لەپشت دەرگای ژوورەکەمان دوورنەدەکەوتنەوە. هەواڵی گەشتنی ئێمە بۆ هەموو دنیا نێردرا و وێنەی نیکی و ئەمانۆ لەپشت بەرگی گۆڤارو لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامە گەورەو ناودارەکانی ڕۆژو شەوەی ڕۆدیۆجانیرۆ چاپ و بلاّو کرایەوە.

چونکە هوفمان چاکەی زۆری لەگەڵدا کردین. بەشێك لەبیرەوەریەکانی خۆمان بە ڕۆژنامەکەی ئەو بەنرحی پانزە هەزار دۆلار فرۆشت و پارەکەیمان وەرگرت.

بیرەوەریەکانی تری سەفەرەکەمان دانا تا لەئەمریکا بەنرخێکی گرانتر بیفرۆشین.

ئێستا من و یوری لەنیویۆرك دەژین. شەریکەیەکی گەورەی گەشتیاری و ڕاومان دامەزراندوەو بەو کەرەستانەی لەبەردەستماندایە گەشتیاران و ڕاوچیەکان دەبەینە شوێنە مەبەستەکانیان و دەیانگەڕێنینەوە و هەموو ساڵێك بڕێکی زۆر ئاژەڵی گرانبایی بەسیرك و باخی وەحشەکان دەفرۆشین.

دەوڵەمەندتر بووین. نیکی و ئەمانۆ هێشتا لەگەڵ من دەژین. هێشتا نازانم کام یەك لەو دووانە بێنم. چونکە ناتوانم یەکیان بەسەر ئەویتریانا هەڵبژێرم.

بەلاّم لە نیکی و ئەمانۆ مەپرسن. ئەوان بوونەتە خاتوونە شیك پۆشەکان و بەشارستانیەت عادەتیان گرتوە بەلاّم هەندێ کات هەوای جەنگەڵ لەسەریان دەدات. بەسەر هاتی گەشتەکەی من لێرەدا تەواو دەبێت بەلاّم تەنیا یەك شتم نەوتوە. شتێك کە ئێوە زۆرجار لەخۆتان پرسیوە و نەتانتوانیوە وەلاّمەکەی بەدەست بێنن.

ئەگەر وتتان ئەو شتە چیە؟

ئا ئەها ! ئەوشتە ناوی منە. ببوورن زۆر درەنگ خۆم دەناسێنم چونکە چەندین ساڵە ئێوە من دەناسن بێ ئەوەی ناوم بزانن.

من ناوم جان تایلەرە. هاوڕێکانم تەنیا بەجانی بانگم دەکەن. ئێوەش دەتوانن ئەم ناوەم لێ بنێن.

جانی

لە بەستێنەکانی رووباری ئامازۆن هۆزێك هەیە هەمو کەسەکانی لە ژنانی زۆر جوان و دڵرفێن پێك هاتوون، دەوروبەری ئامازۆن بە دارستانە چڕو مەترسیدارەکان گەمارۆ دراوە و لەم بەشەی دارستانەدا دەژین. تا ئێستا هیچ گەشتیارێکی ناودار و هیچ روداوخوازێکی چاو نەترس نەیتوانیوە بگاتە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەوان چونکە جگە لە مەترسیە زۆرەکانی رێگا، ژنانی ئامازۆن ئەوەندە مەترسیدارن کە گومان ناکرێت بێگانەیەك بەدەست بێنن و بەزیندوویی رزگاری کەن و بۆ شارو دیاری خۆی بگەڕێتەوە.

ئەم کتێبەی خوارەوە لە یاداشتەکەکانی کەسێك ئامادە و نوسراوە کە شەش ساڵ لە ناو دانیشتوانی ئەم هۆزەدا ژیاوە و لەئەنجامدا بە لێهاتوویی تەواو لە دەستیان رایکردوە و گیانی بە سەلامەت دەربردووە.

ئەم کتێبە بۆ زۆربەی زمانە زیندوەکانی دنیا وەرگێڕدراوە و لە هەر زمانێك زیاتر لە دەجار چاپکراوە لە هەمان رۆژەکانی یەکەمی چاپ و بڵاوبوونەوە بەخێرایی فرۆشراوە و چونکە نوسەر بینینەکانی خۆی تیادا رەنگ پێ داوەتەوە، لە راستی و دروستی نوسراوەکان ناتوانین گومانمان بێت، هەر بۆیە ژیانی ژنانی ئامازۆن لە ئەفسانە دەرچووە و بۆتە راستیەکی حاشا هەڵنەگر.



نرخ 6000 دینار

لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا